


# • کورد و بەغدا

● نووسینی: دلشاد مستەفا وەسانی

● نەخشەسازی ناوەوە: سەنگەر دلاوەر عەبدوڵڵا

● بەرگ: ڕێمان

● **نرخ: ( ٥٠٠٠ ) دینار**

● چاپی یەکەم : ٢٠١٤

● تیراژ: ٥٠٠ دانە

● چاپخانە: چاپخانەی موکریانی (هەولێر)

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردن: (٥٧١) لەساڵی (٢٠١٤)ی پێدراوە

**زنجیرەی کتێب (٨٥٣)**

**ماڵپەڕ:** www.mukiryani.com

**ئیمەیل:** info@mukiryani.com

# ناوەرۆك

# لەجیاتی پێشەکی

نووسین لەبارەی ئەو بابەتانەی لە گەرمەی رووداندان، یان لە ئان و ساتی رووداندان، ئەگەر بۆ ئێستاش بە هێند هەڵنەگیرێ، لەوانەیە بۆ سبەی گرنگ بێ کە دەبنە بەشێك لە مێژوو، کەسێك بیەوێ قسە لەسەر ئەو مەسەلانە بکات کە لێرەدا تیشکیان خراوەتەسەر، ئەوا بە سیلەچاوێك لەم جۆرە بابەتانە، وێنەی راستەقینەی ئەم رۆژگارەی دێتە بەرچاو، چونکە دوای تێپەڕبوونی سالآنێکی زۆر نەنووسراون، تا نووسەر بە ئارەزووی خۆی و بە تێپەڕبوونی کات و، بەگوێرەی قۆناغە نوێیەکە بینووسێ، بەڵکو لە گەرمەی رووداندا نووسراون و نووسەر خۆی لەناو جەرگەی رووداوەکاندا ژیاوە، بۆیە بەرچاورووونییەك دەبێ بۆ ئەوانەی، سبەی دێن قسە لەسەر ئەم رۆژگارە دەکەن.

ئەم بابەتانە دیدو تێڕوانینێکن بۆ ئەو رووداوانەی لە ماوەیەکی دیاریکراو و بەخێرایی روویانداوە، هەربۆیە بەپێی مێژووی بلآوبوونەوەیان لێرەدا ریزکراون، چەند بابەتێکیش لەبیرەوەری هەندێ رووداودا نووسراون، کە بۆ وەبیرهێنانەوەیەکن بۆ پەیوەندی نێوان کوردو بەغداو، دیدی بەغدا بۆ کوردو چۆنیەتی مامەڵەکردنی نادروستی بەغدا لەگەڵ جولآنەوەی رزگاریخوازی کوردستاندا، ئەم کتێبە دەمانباتە سەر ئەو بڕوایە، کە وێڕای گۆڕانکاری گەورە لە جیهان و رۆژهەلآتی ناوەڕاست، کەچی هێشتا لەسەردەمی عێراقی دوای دکتاتۆریەت، کە بەعێراقی نوێ ناسراوە، تێڕوانینێك هەیە، دەیەوێ هەر بەچاوی بەغدای جاران سەیری کورد بکرێ.

لەبەرئەوەی بابەتەکان پێش رووداو یان لە گەرمــەی رووداوەکــان نووســراون و، پشــت بــە هەڵوێستی کوردو بەغداو، هەندێ جاریش هەڵوێستی ئەمەریکا بەرامبەر عێـراق و هــەرێمی کوردستان نووسراون، ئاراستەی جۆراوجۆر لە بەرامبەر هەڵوێستە جیاجیاکان بــەدی دەکـرێ، ئەمەش هەر بۆئەوە دەگەڕێتەوە، کە بابەتەکان لە گەرمەی رووداو و قەوماوەکاندا نووسراون.

بەشێکی ئەم کتێبە بۆ ئــەو بەڵگەنامانــە تــەرخان کـراوە، کــە پەیوەنـدییان بــە کرۆکـی بابەتەکانەوە هەیە، زۆربەی بەڵگــەکانیش لێـدوانی رەسمیــی هــەرێمی کوردســتانن دەربــارەی پرۆسەی سیاسی عێراق و کێشەو گرفتەکانی نێـوان هــەرێمی کوردســتان و بەغـدا، دەمــەوێ ئەوەش بڵێم کە لێدوان و وتە رەسمییەکانی هەرێمی کوردستان، لە ماڵپەری سەرۆکایەتی هەرێم و سەرۆکایەتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان وەرگـیراون جێـی بــاوەڕو متمانــەن، هــەروەها هەندێ بەڵگەی دیکە لە چەند ماڵپەڕێکی دیکە وەرگیراون و ئاماژەیان پێکراوە.

دڵشاد مستەفا وەسانی

هەولێر

# كورد دۆستايەتی لەگەڵ عەرەب جۆش دەداتەوە

كورد وەك نەتەوەیەكی ستەمدیدەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بۆ وەدەستهێنانی مافە ڕەواكانی، شێوە جیاجیاكانی خەباتی گرتۆتەبەر، لە نێو شێوەكانی خەباتیشدا، بەو ئاراستەدا كاری كردووە، كە ببێتە توخمێكی سەقامگیری لە ناوچەكەداو، چوونە بازنەی هەڵبژاردنی پێكەوەژیان لەگەڵ نەتەوەكانی تردا، وەلێ ئەوەی كوردی ناچاركردووە، پەنا بباتە بەر چەك و خەباتی شاخ، دەستی سیستەمە تۆتالیتارەكان بووە، كە بە جۆرێك كاری كردووە، خەباتی بە ئاقارێكی دیكەدا ببا، بەڵام لەگەڵ پەرەسەندنی جوڵانەوەی رزگاریخوازی كوردستان و، دوای دامەزران و هاتنە مەیدانی پارتی دیموكراتی كوردستان، كە لەو ڕووەوە بەرنامەی كار ڕاگەیاندرا، پەردە لەسەر مەرام و پیلانی گڵاوی بەغدا هەڵدرایەوەو، وێنەیەكی جوانی خەباتی كوردان و چۆنیەتی پێكەوەژیان لەگەڵ عەرەبدا خرایەڕوو، لەو سۆنگەیەوە بارزانیی نەمر هەمیشە بەلای ڕێگەچارەیەكدا چووە، كە بتواندرێ فۆرمۆڵەیەكی پێكەوەژیانی كوردو عەرەبی لێبكەوێتەوە، گفتوگۆكانی نێوان سەركردایەتی سیاسی كورد لەگەڵ دەسەڵاتی ناوەندی (بەغداد) دا، هەر لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولەوە تا بە ئەمڕۆ دەگات، گەواهیدەری ئەم ڕاستییەن.

بارزانیی نەمر لە گەرمەی خەباتی جوڵانەوەی كوردایەتیدا، هەڵوێستی مرۆڤدۆستانەی لەگەڵ عەرەبدا پیشانداوە، وەك ڕووداوەكانی ساڵی ١٩٦٧ و ١٩٧٣ ، هەوڵ و كۆششەكانی بارزانیی نەمر بۆ هەڵبژاردنی پێكەوەژیان و لە ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ دا گەیشتە لوتكە، بەم پێیە بارزانیی نەمر بناغەیەكی پتەوی لە پەیوەندییەكانی نێوان كورد و عەرەبدا دانا، دوای ڕاپەڕینی ئاداری ١٩٩١ و هاتنەوەی ئەزموونی دیموكراتی هەرێمی كوردستان، لەگەڵ سیستەمی نوێی جیهاندا، جوڵانەوەی سیاسی كوردستان و دۆزی ڕەوای گەلەكەمان چووە قۆناغێكی ترەوە، وێڕای بەرە بەرە چوونەپێشەوەی ئەزموونەكەو پەرەپێدانی زیاتری دامودەزگا

شەرعییەکان، دوور لە خۆ بەزۆرزانینی نەتەوەیی و، بە هەمان ڕێبازی بارزانیی نەمر، ڕێگەی لێك حاڵی بوون لەگەڵ عەرەبداو، برەودانەوە بە بایەخدانی زیاتر بەو پردەی بارزانیی نەمر لە نێوان کوردو عەرەبدا دروستی کردبوو، چەندین هەوڵی لەو شێوەیە دران و، ناوەندە عەرەبییەکان لە چەند وڵاتێکی بەوەجی عەرەبیدا، ئەو هەنگاوەی کوردیان بە هەند هەڵگرت، ئەوەبوو لە ساڵانی ١٩٩٨ و ١٩٩٩ دا، بەری ئەو پەیوەندییانە گەیشتە ئەنجامدانی حیواری کوردی — عەرەبی لە میسرو دامەزراندنی کۆمەڵەی دۆستایەتی لەگەڵ فەلەستیندا.

لە ١١ ی ئاداری ٢٠٠٠ داو لە ٣٠ یەمین ساڵەی ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ دا، پایتەختی هەرێمی کوردستان کۆنگرەی دامەزراندنی (کۆمەڵەی دۆستایەتی کوردی — عەرەبی)ی بەخۆوە گرت، سەرۆك بارزانی لە میانەی وتارەکەیدا، لە ڕێورەسمی کردنەوەی کۆنگرەکەدا، جەختی لەسەر ئەوە کردەوە کە "کوردو عەرەب لە عێراقدا هەمیشە پێویستییان بە ڕۆحی ڕێککەوتننامەی ئادار هەیە"، چونکە ڕێککەوتننامەی ئادار بنەمایەکی دروست و زانستیی سەبارەت بە پەیوەندی دۆستانەی کورد و عەرەب داناوە، جێبەجێ کردنی تەواوی بەندەکانی ئەو ڕێککەوتننامەیە، هەردوو گەلی کورد و عەرەبی لە سەرجەم نەهامەتییەکان دوور دەکردەوە، کە بەداخەوە، ئاوڕنەدانەوە لەو دەسکەوتە مێژووییەی نێوان کورد و عەرەب، بەڵاو کارەساتی بەسەر کورد هێناو بووە بەربەست لەڕێی دۆستایەتی ئەو نەتەوە مەزڵومە لەگەڵ عەرەبدا، ئەمەش لە کاتێکدا بووە، کە کوردو بزووتنەوە هەقخوازییەکەی، هەمیشە بەلای ئەو دۆستایەتییەدا چووە، سەرۆك بارزانی لەم بارەیەوە دەڵێ:"هەموو شایەدی دەدەن، برایەتی عەرەب و کورد و خەبات کردن بۆ چەسپاندنی ئەو مەفهومە، پانتاییەکی دیاری لە خەباتی میللەتی کوردو بزووتنەوە ڕزگاریخوازییەکەیدا گرتووە، ئەمەیش لە ستراتیژی پارتی دیموکراتی کوردستان، هەر لە ڕۆژی دامەزراندنییەوە، پایەیەکی گرنگی پێکهێناوە، ئەم گرنگیدانەش لە قەناعەت و ئیدراکی قووڵەوە هاتووە، نەك لەبەر ئیعتیباراتی سیاسەتی تەکتیکییەوە". دەبا ڕۆحی ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ ببێتە هەوێن و داینەمۆی درێژەدان بە دۆستایەتی کوردو عەرەب و، بەغدا وەئاگا بێتەوە و چی دی نەبێتە سەبەبکاری لێکترازانی کورد و عەرەب.

٢٠٠٠/٣/١٣

# کورد و ئۆپۆزسیۆنی عێراق
# کامیان گرەنتی لەویتریان دەخوازێ؟

دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم ردیارترین ماوەیە، بۆ زیاتر بڵاوبوون و دەرکەوتنی وجـودی ئۆپۆزسیۆنی عـێراقی، خۆشترین زەمینەی کاریشی لـە کوردسـتاندا بـۆ هەڵکـەوتووە، ئەگـەر جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستانیش، وەك بەشێك لە ئۆپۆزسیۆنی عێراقی سەیرکرابێ، ئەوا هەمیشە جووڵانەوەی کورد قورساییەکی گەورەی لەنێو ئۆپۆزسیۆندا هەبووە. بەڵام لە واقیعدا هەردووکیان لێك جیاوازن، چونکە ئامانجی هەر یەکێکیان جیایە، کورد لە پێناوی وەرگـرتنی دەسەڵات لە عێراقدا کاری نەکردووە، بەڵکو لەپێناوی وەدیعێنانی ئامانجە ڕەواکانیدا خـەباتی کردووە، وەلێ ئەگەر بە وردی لێی ڕامێنین، ئەوا ئەو دوو لایەنە(کوردو ئۆپۆزسیۆن)، تەنیا لە وەختێکدا لێکتر نزیك کەوتوونەتەوە، کە قسە دەربارەی گۆڕانکارییەکانی عێراق کرابێ.

بەوپێیەی، لەوەتی دەوڵەتی عێراق دامەزراوە، عـەرەبی سوننە مەزهەب دەسـەڵاتداربوون، عەرەبی شیعە مەزهەب خۆیان لە ئۆپۆزسیۆندا بینیوەتەوە، هەربۆیە مێژینەی پەیوەندیی کورد لە بازنەی ئۆپۆزسیۆندا، زیاتر لەگەڵ عەرەبی شیعە مەزهەب بووە، هاتنە مەیـدانی عـەرەبی سوننە بەشـێوەیەکی دیـار، بـۆ نـاو بازنـەی ئۆپۆزسـیۆن، زیـاتر بـۆ دوای ڕاپـەڕینی ١٩٩١ دەگەڕێتەوە، زۆربەشیان ئەو تۆخمانەن لە ژینگەیەکدا پـەروەردەبوون، کـە حیسـاب بـۆ هـیچ گرووپێکـی نەتـەوەیی و مەزهـەبی نەکـەن، تەنانـەت زۆر لـەوان ژەنەراڵانـەی ناویـان وەك جێگرەوەی سەدام دێت، تا درەنگانی ئامێری بەڕێوەبردنی ماشێنی جەنگەکانی عێراق بـوون، ئەوانەی لەم دواییە بەغدایان بەجێ هێشت و، خۆیان وەك رموزی ئۆپۆزسیۆن پیشـان دەدەن، ناتوانن خۆیان لە کاریگەرییەکانی ژینگـەی حـەفتا سـاڵەی رابـردوو دابـڕن، کـە تیایـدا

دەوڵەتی عێراقی تا ئێرە هێناوە، ناروونی دیدی هەندێ لە ڕەگەزە دیارەکانی ناو ئۆپۆزسیۆنی عێراقی، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، ئەوانە نەوەی ئەو ماوەیەن، کە تیایدا تەنیا کار بۆ دژایەتیکردنی کورد کراوە، بۆیە سەیر نییە یەکێکی وەك وەفیق سامەڕایی، لەوەختێکدا بەرنامەی گۆڕانکاری عێراقی لەگۆڕێدایە، (وەك ئاژانسەکانی هەواڵ بڵاویان کردەوە)پێشنیاری ئەوە بکات فەلەستینییەکان بهێندرێنە عێراق و بەتایبەت کوردستان و، هەر بەهۆی ئەوانیشەوە، درێژە بە پرۆسەی زیاتر بەعەرەبکردنی کوردستان بدرێ.

دەبێ بزووتنەوەی سیاسی کوردستان، ئەوە بزانێ، ئەو رموزانە وا پەروەردەو تەیار نەکراون، بیر لە شێوە پێکەوە ژیانێکی نێوان کورد و عەرەب بکەنەوە، کەسێکی وەك وەفیق سامەڕایی تا ڕاپەڕین ئاگای لەهەموو وردەکارییەکانی سوپای عێراق بووە، کەچی ساڵی ١٩٩٥ لە هەولێر، وەك کەسایەتییەکی شۆڕشگێڕ سڵاوی لەو خەڵکانە دەکرد، کە کۆکرابوونەوەو ئەویش ئاماژەی بە ئایندەی عێراق دەدا، ئێستاش داوای هێنانی فەلەستینی بۆ کوردستان دەکات، لە زاری یەکێك لەو پێشمەرگانە دەگێڕنەوە، کە ساڵی ١٩٩٥ لە ژێر سەرپەرشتی ئەحمەد چەلەبی و وەفیق سامەڕایی پەلاماری سوپای عێراقیان دەدا، ئەو پێشمەرگەیە گوێی لە ئەحمەد چەلەبی ببوو، کە گوتبووی هەوا ساردەو ناتوانم بمێنمەوە، ئەو پێشمەرگەیە کە دیتبووی ئەحمەد چەلەبی تاقەتی نییە، چەند سەعاتێك لە قوشتەپەی نزیك هەولێر بمێنێتەوە، چیدیکە نەیتوانی بوو بەشداری لە هەڵڵایەکی ئەوهادا بکات.

ئێستاش جارێکی دی لە گەرمەی ئامادەباشی بۆ گۆڕانکاری لە هێراقدا، باس لە کوردو ئۆپۆزسیۆن دەکرێتەوە، بەڵام ئەوەی گرنگە بەلای ئۆپۆزسیۆن و ئەو رموزانەوە کە چاویان لە هێزی کوردە، ڕێگایان بەرەو بەغدا بۆ خۆشبکا، دەیانەوێ زەمانەتێك پەیدابکەن، کە تواناکانی کورد بخرێتەگەڕ لە پرۆسەی گۆڕانکاریدا، ئەوان لەو ڕۆژانەدا هەمیشە چاویان لە بزاڤی سیاسیی کوردستانە، جا ئۆپۆزسیۆنێك کەسانێکی گرتبێتەخۆ، کە لەو رەوشە بەزۆر سەپاوەی عێراقدا پەروەردەبووبن و، بادانەوەی هەندێکیان بۆ ناو بەرەی ئۆپۆزسیۆن لەسەر بنەمای ترس و ڕاکردن بێ لە ئاگر، نەك زەرورەتی دروستکردنی ئۆپۆزسیۆنێك هەڵگری ئاڵای گۆڕانکاری بێ لەپێناوی گۆڕاندا، ئەرێ هەق نیە بزاڤی سیاسیی کوردستان هەڵوەستەیەك بکات؟ لە هەلومەرجی ئەمڕۆدا، دەکرێ زەمینە بۆ ئەوە خۆش بکرێ، گەرەنتی لەو ئۆپۆزسیۆنە وەربگیرێ کە ئایندەی عێراقی دەکەوێتە دەست،

لەڕێی سازدانی کۆنفرانسێك بۆ ئەو مەبەستە، بە ئامادەبوونی هێزە گەورەکانی جیهان و پەیوەندیدار بە عێراق و ناوچەکەوە. بەر لە سەربەخۆیی ئەریتریا (کە ئەسیوپیا داگیری کردبوو) ئەوانەی ئێستا وڵاتەکە بەڕێوەدەبەن، لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنی ئەسیوپیا ڕێککەوتن پاش گۆڕانکاری لە ئەسیوپیادا، ئەریتریا سەربەخۆیی بەدەست بێنێ، هەروەها لێهات، بەرەی ئۆپۆزسیۆنی ئەسیوپیا کە ئەرتیریەکان بوون و خەباتیان لە پێناوی ئەریتریا دەکرد، وڵاتی خۆیان کەوتەوە دەست و، بزاڤی ڕزگاریخوازی ئەریتریاش دوای سەربەخۆیی، بۆ یەکەم جار حوکمی وڵاتی خۆیان کەوتە دەست، ڕەنگە ڕێککەوتنێکی ئاوا بۆ ئەمڕۆی کورد زۆر پێویست و لەجێی خۆی بێ، چونکە کورد تەماعی لەوەدا نییە دەسەڵاتی عێراق بۆخۆی کۆنترۆڵ بکات، لەولاشەوە ئەوان (ئۆپۆزسیۆنی عێراق) خوازیارن هێزو توانای کورد بەشێك بێ لە پرۆسەی گۆڕانکاریدا، کەواتە دەکرێ کورد بەپێی شوێنی لە پرۆسەی گۆڕانەکەداو، زەرورەتی دوای گۆڕانکاری بەشدارێکی کارابێ و ببێتە هێزی بەرچاو، لانی کەم لە قۆناغەکانی بەراییدا، ناوچە تەعریبکراوەکانی سەر ڕێگای کشان بەرەو بەغدا، ببنەوە بەشێکی ناوچەی ئازادکراو(ئیدارەی هەرێمی کوردستان) و، کورد ببێتە توخمێك کە چیدی جینۆساید نەکرێ و، لە ئایندەی عێراقدا بە مافە ڕەواکانی شادبێت.

٢٠٠٢/٥/١٥

# کورد لەوەرزێکی نوێدا

هەڵبژاردنی پارێزگاکان جوولەیەکی خستە پرۆسەی سیاسی، ئەگەرچی بەرلە هەڵبژاردن بەرە بەرە سیمای دەرکەوتنی قۆناغێکی نوێی پرۆسەی سیاسی وەدەر دەکەوت، لێ لەدوای هەڵبژاردن و دەرکەوتنی ئەنجامی بەرایی، بانگی هاتنەکایەی قۆناغێکی نوێ درا، ئەوهەڵبژاردنە زۆر بۆچوون و لێکدانەوەی ئاوەژوو کردنەوە، ئیدی ئەوەیە ئیرادەی خەڵك، ئەگەر سندوق و دەنگی میللەت سەنگی مەحەك بێت، ئەستەمە تاکرەوی و زەمینەی دیکتاتۆری برەخسێ، هەرچەندە لەولاتانی ناوچەکەدا و لەو کۆمەڵگەیانەی تالاوی مەرگیان بەدەست دەسەلاتی رەهاو تاکرەوی چەشتووە وەك ئێراق، ئەگەر هێشتا کەسان و بۆچوونی واهەبن بەهەرەشەو چاوسوورکردنەوە و قۆستنەوەی پلەو پایەی دەولەت دەنگی زیاتر بۆخۆیان مسۆگەر بکەن، لێ دەنگدەر بتوانێ گۆران بەسەر نەخشەی سیاسی ولاتدا بهێنێت هێشتا میللەت قازانجیەتی.

کورد لەکاتێکدا کەوتە ناو پرۆسەی هەڵبژاردنی پارێزگاکان کەچەندین پرسی چارەنووسسازی لەگەل بەغدا بەهەلواسراوی ماونەتەوە، لەگەل ئەوەشدا بەشداریی کورد و پێکهاتەکانی دیکەی نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبی، هەنگاوێك بوو دەبوو بێ دوودلی هەلبهێندرێ، چونکە ئەنجامی ئەو هەڵبژاردنە سەرەداوی دۆزینەوەی پاسۆردی قۆناغی دوای هەڵبژاردنە، دیار بوو هەر کوردو پێکهاتەی دیکە لەچاوەروانی ئەنجامی هەڵبژاردندا نەبوون، بەلکو UN و واشنتۆن و بەغدا و دەرو جیرانیش چاوەروان بوون، هەموو ئەو ناوەند و پایتەختانە جیا لەئەنجامی ناوەراست و باشووری ئێراق، چاویان لەئەنجامی ئەو ناوچانەش بوو کە بەناوچەی ناکۆکی لەسەر ناسراون.

لەئێراقی نوێدا بارودۆخ بەخێرایی گۆرانی بەسەردا دێت و قۆناغ بەقۆناغ گۆران بەسەر پرۆسەی سیاسیدا دێت، دیارە قۆناغی دوای هەڵبژاردن تایبەتمەندی خۆی هەیە، بۆ کوردیش گرنگە وێرای خێرا دەرکەوتنی شکل و شێوەی ئەو قۆناغە تازەیە، لەگەل هەنگاو هەلێنان

بۆچوونە نێو ئەوقۆناغە، چاوێك بەئەنجامی هەڵبژاردندا بخشێنیّ و زەمینەی چوونە نێو قۆناغە تازەکە بڕەخسێنیّ و بزانیّ کە:

* ئەو هێزەی دەیتوانی زۆر لەداوا دەستوورییەکانی کورد جێبەجیّ بکات بەلاّم پشتی تێکرد، لەزۆربەی پارێزگاکاندا لەپێشەوەیە، بەوپێیەی هەڵبژاردنی پارێزگاکان وەك بنەماو سەرەتایەکی دیکە بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمان دەبیندریّ، بۆیە کە لیستی مالیکی لەزۆر پارێزگا لەریزی پێشەوەیە، ئەوا دەبیّ چاوەڕێی هەڵوێستی دیکەی لیّ بکەین، با زۆرینەش نەبیّ، بەلاّم ئەو ئەنجامە پێگەیەکی دیکەی پیّ دەبەخشیّ و رەنگە دەوروبەرو واشنتۆن و هێزی دیکەش تارادەیەك ئەو ئاراستەیە بۆ ئەو دۆخەی ئێراقی تێکەوتووە بەخراپ نەزانن، بۆیە دەبیّ لەم وەرزەشدا چاوەڕێی گردبوونەوەی تەمموزێکی دیکە بکەین.

* گرنگترین ئەنجامی هەڵبژاردنی پارێزگاکان بۆ کورد ئەنجامی ئەو ناوچانە بوو کە ناکۆکییان لەسەرە، ئێستا دەرکەوت ئەو شوێنانە لەگەڵ هەولێردان نەك بەغدا، بۆیە لەم وەرزە نوێیەدا دیمستۆراش شتی تازەی دەست دەکەویّ و بۆ دەکردنی بڕیار هێندە ئەو سەرو ئەمسەر ناکات، ئەو هەڵبژاردنە بۆ راپۆرتەکانی دیمستۆرا جۆرە ریفراندۆمێك بوو، بۆ هەولێریش پێش چاو روونییەکی باشە و پێویستە لەکاتی هەر بڕیارێکی پێچەوانەی ئەم ئەنجامە گورج بێتە مەیدان، بەمەش وێڕای چاوەڕێکردنی راپۆرتی دیمستۆرا، پێویستە بۆ کەرکووك بەبەرنامەیەکی دیکەوە تێهەڵچێتەوە، چونکە دوای چەندین مانگ، ئەوا ئەولێژنەیەی بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ٢٣پێکهێنرابوو لەسەرەتای ئەم مانگەوە دەستی بەکار کرد.

* لەم هەڵبژاردنەی پارێزگاکاندا ژمارەیەکی زۆری لیست بەشداریان کرد، کە ڕەنگە بۆ پەرلەمانیش بەهەمان شێوە بێت یان چەندین جۆر هاوپەیمانی سەرهەڵبدەن، ئەنجامی ئەم هەڵبژاردنە پایەی هەندیّ هێزی سیاسیی دابەزاندو خەڵکی دیکەش هاتنە مەیدان، بۆیە ئەو وەرزە تازەیە، دۆخی تازەش دێنێتە پێشەوە، کە وا لەکورد دەکات زۆر بەجدی چاو بەهاوپەیمانیەتی و دۆستایەتی لەگەڵ هێزە سیاسییەکاندا بخشێنێتەوە، پێویستە لەو وەرزە تازەیەدا سلّ لە دۆستایەتی و هاوپەیمانیەتی لەگەڵ هیچ هێزێك نەکرێتەوە و بەرژەوەندی سەنگی بادانەوە بەلای هەر هێزێکدا بێت، لەم وەرزەدا گەمەی هاوپەیمانیەتی و لێك نزیك

بوونەوەی هێزە سیاسییەکان خۆشترین گەمەو بزاڤ دەبێت لەسایەی ئەو هەموو لیستە بەشداربووانەدا.

* دروشمی پێکەوە ژیان لەناوچە ناکۆکی لەسەرەکان قوولتر بکرێتەوە، چونکە زۆرترین ژمارەی پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینیەکانی لەکوردستان دەژین لەوناوچانەدان.

* بەغدا کەهەمیشە دەگوترا ملیۆنێك کوردی لێیە، ئەوە سالْ بەسالْ ژمارەی دەنگدەرانی کورد لەپایتەختی ئێراقی فیدرالْ لەکورتی دەدات و(سالْی بەسالْ خۆزگەم بەپار) پڕبەپێستی ئەنجامی هەڵبژاردنی بەغدایە. پێویستە بەدوای نهێنی ئەو ئەنجامە خراپەدا بگەڕێین و بەلای هەموومانەوە مایەی سەرسوڕمانە کە بۆ لەبەغدا لەکەمی دەدەین؟ (ئەگەر بڕیارە ئینتیمای نەتەوەیی پشتگوێ بخرێ و پەرۆشی بۆ ئەو ئینتمایە نامێنێ، ئەوا بەخۆداچوونەوەیەکی وردی گەرەکە، خۆ ئەگەر کەموکوڕی لەبەرپرسان و لیستی هاوپەیمانی و حزبەکانە، ئەوا ئەو بەخۆداچوونەوەیەش هێندە زەحمەت نییە. ) هەقە لەم وەرزەدا گرنگیی زیاتر بەپەیوەندییە ئیقلیمییەکان بدرێت و سەفەری ئەمجارەی سەرۆکی کوردستان بۆ کەنداو ئاماژەیەکی گرنگە بۆ پەرەپێدانی ئەو پەیوەندییە، کە بەیەکێك لەکۆڵەگەکانی ئەو وەرزە تازەیەی کورد دادەنـدرێت. لەم وەرزەدا پێویستیمان بەمیکانیزمی گونجاو هەیە بۆ هەڵکردن لەنێو ئاپۆرای هێزە سیاسییەکان و کارکردن بەچەندین ئاراستەی جیاجیادا، هەقە لێنەگەڕێین لەتەمموزی ئەمساڵدا پیلانگێڕانی دژی دەستوور و پرەنسیپی تەوافوق لەیادی ئەو گردبوونەوەیەدا جارێکی دی لێمان گردببنەوە، بەپێی ئەنجامی هەڵبژاردنی پارێزگاکان کورد هێشتا ئەو هێزەیە لیست و هێزی دیکە لەپرۆسەی سیاسیدا پێویستیان پێ بێت، ئیدی رێگای کارکردن دیارەو لێرەڕا قۆڵ و باسکی لێهەڵکەین.

٢٠٠٩-٢-٩

# کاری سیاسی لەسەر زەمینێکی پڕ لە دڕکودالّدا

کاری سیاسی بەپێی ژینگەی جیاوازەوە دەگۆڕێت، هەمیشە لەو سەر زەمینانەی دەمێکە ئۆقرەیان گرتووەو کەفوکوڵی دەمارگیرییان تێدا نیشتۆتەوەو خاوەنی کولتووری دیموکراسی و دەوڵەتدارین، ڕێگەی کاری سیاسی خۆش کراوەو بە دامەزراوەیی بوون ئەرکی سیاسەتمەدارانی ئاسان کردووە، بەڵام بە پێچەوانەوە، لەو سەر زەمینانەی هێشتا گرووپە جیاجیاکانیان چەقۆ لێك تیژ دەکەن، دەرەتانێکیان بۆ قبووڵ کردنی بەرامبەر نەهێشتۆتەوەو کەشێکی پڕ لە بێ متمانەییان خولّقاندووە، کاری سیاسی بە ڕێگەیەکی هەورازو ڕکدا دەڕوات.

لە عێراقدا بە درێژایی ٨٢ ساڵ، بە تایبەتیش لە ٤٠ ساڵی رابردوو، کە بووە مەیدانی ناسیونالیستانی عەرەب و چاوگی عروبە، هەمووی ٦ ساڵە کەشێك دروست بووە کە تیایدا قسە لە بارەی دیموکراسی و مەسەلەی مافی مرۆڤ و کاری پێکەوەیی دەکرێ، بۆیە سەردەمی دوای رووخاندنی رژێمی سەدام ٢٠٠٣ بە عێراقی نوێ دەناسرێ. کەواتە بە هەموو پێوەرێك دەبێ کاری سیاسی لەسەردەمی عێراقی نوێدا جیاواز بێ لە چاو سەردەمەکانی پێشووتر، بەڵام ئەگەر چاوێك بە مێژووی حوکمڕانی عێراقدا بخشێنین و دۆخی سیاسی ئەو مێژووەو کردەوەی دەسەڵات و هەڵوێست بەرامبەر پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبیەکانی ئەو وڵاتە ڕەچاو بکەین، دەبینین ٦ ساڵی سەردەمی نوێ پاشخانێکی ئاڵۆزو پڕ لە ترس و تۆقاندنی هەیە.

عێراق ژینگەیەك بووە هەمیشە دەسەڵاتداری توندڕۆی بەرهەم هێناوەو، دەسەڵاتیش تەواوی توانا ئابووری و سیاسی و سەربازییەکانی لە خزمەت بیری ناسیونالیزمی عەرەب و نەخوێندنەوەی کورد و نەتەوەو پێکهاتەکانی دیکەدا داناوە، ئیدی ئەو مێژووە دووردرێژە کولتوورێکی دروست کرد، کە هەمیشە قسە بۆ عەرەب و بڕیار بۆ عەرەب و دەسەڵات بۆ ناسیونالیستی عەرەب بێت، کوردو خەڵکی دیکە پلەیەکی نزمتری هاووڵاتیان درایێ، ئەو بۆچوونە پێی وابوو ئێستاشی لەگەڵدابێ، کورد مافی ئەوەی نییە لە کورسی دەسەڵات نزیك

بێتەوە، دەرکەوتنی کوردیان وەك نەتەوە بە هەڕەشە بۆ خۆ زانیوە، ئیدی چ توانایەکی لەبەر دەستیان بووە لە دژی ئەو هەڕەشەیە بە کاریان هێناوە، بۆیە کورد ناچار بووە بە دروشمی (یان کوردستان یان نەمان) بچێتە مەیدانی رووبەڕووبوونەوەو سەنگەری داکۆکیکردن لە ناسنامە، لەبەرئەوەشە مێژووی کورد لە ژینگەی عێراقدا مێژوویێکە خوێنی لێ دەچۆڕێ، جولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان بە گۆڕانی دەموچاوەکانی دەسەلاتدارانی بەغدا، هەرگیز نەحەساوەتەوە، هەر هەموو حکوومەتەکان درێژەپێدەری بەرنامەی لە ناوبردنی کورد بوون، جولانەوەی رزگاریخوازی کوردستان کە زادەی میللەتێکی زولملێکراوە، قەت دەرفەتی گفتوگۆو چارەسەری ئاشتی رەت نەکردۆتەوە، ئێستا لە هەندێ بلاوکراوەو رۆژنامەدا بە ئاراستەیەك قسە دەکرێ، وەك بلێی سەرکردایەتی سیاسی بە زەوقی خۆی کاری نەکردووەو، هەروا نەیویستووە ناوچە دابڕاوەکان بگەڕێنەوە سەر هەرێمی کوردستان.

ئەو کەس و رەوت و رۆژنامانەی خۆیان وەك ئۆپۆزسیۆن نمایش دەکەن، بە جۆرێك قسە لەو بابەتە دەکەن، وەك بلێی ئەگەر ئەوان دەسەلاتیان کەوتە دەست رێگەی بەغدایان بە گولێ بۆ دەڕازێتەوەو چی بیانەوێ وەدەستی دێنن، ئاخر لەسەر زەمینێکی پڕ لە دڕکودالدا، چۆن گفت بە خەلك دەدەن کە ئەوەی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان نەیکردووە ئەوان دەیکەن؟ ناهەقی بەرامبەر هاوولاتیان دەکرێ کە ئەو قسانەیان بۆ دەکەن، بە ڕاستی ئەو جۆرە قسەیە لە دۆخێکی وەهادا بۆ خافلاندنەو نایەتەدی، کورد گوتەنی قسەی شەوە.

ئەگەر کەمێك سەیری گۆڕەپانی سیاسی لە عێراقی نوێدا بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کاری سیاسی چ کۆسپ و کەندێکی لە پێشەو رێگەیەکی پڕ لە دڕکو دالی هەیە، ئەمە لە کاتێکدایە کە کورد لە بەغدا ئامادەیی هەیە، لە ٦ سالی رابردوودا (دوای ٢٠٠٣) ، هەمیشە چەندین فشاری نێوخۆو هەرێمایەتی تەنانەت بەرنامەی کاری ئەمەریکاییەکان لەبەردەم جوولەی هەولێردا وەستاون، ئیدی ئەمڕۆ کورد لەسەرمێزی گفتوگۆ لەگەلێ بەغدا، چەندین بۆچوون و بەربەستی لەبەردەمدا قیت دەبنەوە.

مالیکی چەندین پرسی گرنگی بەهەلواسراوی هێشتۆتەوەو هێشتا هەنگاوی کردەنی بۆ چارەسەرکردنیان هەلنەهێناوە، بانگەشەی نەهێشتنی تەوافوقیشی هاتە سەر، ئەگەر تا ئێستا بەغدا وای پیشان دابێ کە بڕوای بەکاری پێکەوەیی هەیە، ئەوا ئێستا نییەتی ئاشکرا کرد، دەی باشە کەسێك بڕوای بە تەوافوق نەمێنێ چۆن چۆنی لەسەر مێزی گفتوگۆ باسی مافەکانی

هەرێمی کوردستانی لەگەڵ دەکرێ، ئەوە واقیعی دۆخی ژینگەی بەغدایە، بۆیە ئەوەی کراوە، هەر بەسەرکردایەتی سیاسی بە سەرۆکایەتی سەرۆك بارزانی و هیممەتی سەرۆك کۆمار کراوە، سەرۆك بارزانی بە هەڵوێستە نیشتمانی و کوردایەتیەکەی چەندین جار لە کاتی خۆیدا وەدەنگ هاتووە، ئەگەر کاری سیاسی هێندە ئاسان بووایە، نەدەبوو هەندێ جار کار گەیشتبا ئەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان خۆی گەیاندبا بەغدا.

لەو سۆنگەیەوە دەکرێ بڵێین لە عێراقدا کاری سیاسی یان سیاسەت کردن کارێکی هێندە ئاسان نییە، وەك هەندێ رەوت و گرووپ و رۆژنامە قسەی لە بارەوە دەکەن، ئایا کە بەغدا ماددەی ١٤٠جێبەجێ ناکات، لەبەر سەرکردایەتی سیاسی کوردستان جێبەجێی ناکات، یان لە بنەڕەتدا بڕوای پێ نییە ئەگەرچی ماددەیەکی دەستووریەو خەڵکی عێراق دەنگی بۆ داوە؟ هەموو هەڵڵای ئێستا لە هەندێ رۆژنامە دەکرێت، بۆ ئەوەیە ئەو وێنەیەی سەرکردایەتی سیاسی کوردستان کە لە یادگەی خەڵکی کوردستاندایە، بە وێنەیەکی تەڵخی بگۆڕنەوە، دەنا چ سەرکردەیەکی کورد هەیە حەز نەکات لەسەر دەستی ئەو گەورەترین دەسکەوت بۆ میللەتەکەی بێتەدی، ئەوانەی دەیانەوێ دەسەڵات وەربگرن، نابێ حکوومەت بە ناشەفاف لە قەڵەم بدەن و لە ئێستاشەوە خۆیان ناشەفاف بن و راستی لە خەڵك بشارنەوە، ئەمە گەورەترین گورزە لە بزووتنەوەی ئۆپۆزسیۆن دەدرێت، چونکە وای پیشان دەدەن هیچ گرفتێك نییە و ڕێگای بەغدا بە گوڵ رازاوەتەوە بەڵام سەرکردایەتی خۆی نایەوێ ئەو کارە بکات، ئەمە ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو کەسانە یەقینن دەنگ ناهێنن و لە ئێستاوە دەزانن ئەو کارە هی ئەوان نییە، یان ئەوەتا خەڵك بە چاوێکی دی دەبینن و بە بێ ئاگای قەڵەم دەدەن، چونکە کەسێك بیەوێ بە کردەنی دەسەڵات وەربگرێ و سەدا سەد لێی دیاربێ دەگاتە دەسەڵات، بە شێوەیەکی واقیعی قسە دەکات و هەنگاوەکانی پێش خۆی دەبینێ کە هەڵێنراون، ئەگەر بە ویژدانیشەوە سەیری رەوتی ڕووداوەکان بکەین، گۆڕانی زۆر لە دوای راپەڕینەوە روویداوە ناکرێ لەبەرچاو نەگیرێ، بۆیە ئەوەی راستگۆبێ لەگەڵ میللەت، دەبێ رابگەیەنێ کە کاری سیاسی لە عێراقی نوێدا پڕ لە دڕکوداڵە، نەك راستیی لێ بشادردرێتەوە و رابگەیەندرێ کە ئەو سەرزەمینە بۆ کاری سیاسی پڕ لە گوڵ و گوڵزارە، هەق نییە بانگەشەکردن بۆ هەڵبژاردن و گەیشتن بە دەسەڵات بگاتە ئەو ئاستە خەڵك بخافڵێندرێ و هەوڵی لە خشتەبردنی بدرێ.

٢٠٠٩/٥/٣١

## کورد له خاکی خۆیدا

## به ڕێگایەکی بە (مین) چێندراودا خۆی گەیاندە نەوت

ڕۆژی ٢٠٠٩/٦/١ ڕۆژێکی مێژوویی بوو لە کوردستاندا، بۆ یەکەم جار نەوتی کوردستان بە ویستی خەڵکی کوردستان ڕەوانەی بازاڕەکانی جیهان کرا، لەو ڕۆژەدا پێمان ڕاگەیاندرا ئیدی لێرە بە دوا چیدی نەوت بۆ کوردستان هەر تەنیا مایەی دەرد و بەڵا نابێ، بەڵکو دەبێتە مایەی بوژانەوەو هەستانەوە. ڕێورەسمی هەناردەی نەوت بە جۆرێك بوو کە زیاتر لە ١٠٠ کەناڵ و بواری میدیا، ئەو ڕێورەسمەیان گواستەوەو بە هەموو سوچێکی جیهانیان گەیاند. هەناردنی نەوتی هەرێمی کوردستان بۆ بازاڕەکانی جیهان وەڵامی زۆر پرسیاری لە نێوخۆو عێراق و ناوچەکە و جیهاندا دایەوەو بووە مایەی وروژاندنی چەندین پرسیاری دیکە.

### کاروانێك بە ڕێگایەکی پڕ لە (مین)دا

دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق لە ١٩٢١ پاش ٦ ساڵ لە تەمەنی ئەو دەوڵەتەدا نەوت لە کوردستاندا لە١٩٢٧ دۆزرایەوە، دۆزینەوەی نەوت لە کاتێکدا بوو، ساڵێك بەسەر لکاندنی باشووری کوردستان بە عێراقدا تێپەڕی بوو ١٩٢٦، ئیدی لەگەڵ گەورەبوونی تەمەنی دەوڵەتی عێراقدا. نەوتیش بەرە بەرە بەو ئاقارەدا برا، کە کورد مافی ئەوەی نەبێ باس لە نەوت بکات بەتایبەتیش دوای ئەوەی ناسیونالیستانی تەنگبینی عەرەب لەسەرەوەڕا هەڵیانکوتایە سەر کۆمەڵگاو کۆنترۆڵیان کرد. بەمەش تا دەهات شوێنی کورد تەنانەت لە نێودامەزراوەکانی دەوڵەتدا بەرتەسك دەبۆوە، بۆیە نەوت بەناوی دەوڵەت و حکوومەتایەتی، لە خزمەت ناسیونالیزمی عەرەب داندراو کوردیش سەرەڕای ئەوەی لەو سامانەی خاکی کوردستان بێ بەشکرا بە هەڕەشەش لە قەڵەمدراو هەمیشە بەغدا بە ئاراستەی نەهێشتنی ئەو هەڕەشەیەدا کاری کردووە، تاوای لێهات لە هەندێ ئاستی کورددا حاڵەتێکی لە بیرچوونەوەی ئەو سامانە بهێننە کایە.

بەغدا چەند بەرنامەو کاری بۆ زوو تێکشاندنی کورد داڕشتووە هێندەش لەبەرامبەر ئەو بەرنامەیەدا شۆڕشی کوردستان پەرەی سەندووە لەگەڵ بەهێزبوونی شۆڕش و باسکی بزووتنەوەی رزگاریخوازی پرۆسەی گەڕان بە دوای نەوت و لێدانی بیری نەوت حسابی دیکەی لەلایەن بەغداوە بۆ کراوە. بەو پێیەی بەغدا ناوەندێکی ناسیونالیزمی عەرەب بووە، بۆیە پرۆژەی نەوت و راکێشانی بۆڕیی نەوت لە کوردستاندا، هەر لەو روانگە ناسیونالیزمیەوە کاری بۆ کراوە بۆ نموونە نەوتی کەرکووك براوەتە قولایی عەرەبی سوننەوەو، بە ناچاری لە رێی بردنی بۆڕیی نەوت بۆ تورکیا بە خاکی کوردستاندا رۆیشتووە. هەروەها وێڕای ئەوەی نەوت لە زۆر ناوچەی دیکەی کوردستان هەبووە، وەك ئێستا دەرکەوتووە، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی داوە تەنیا کەرکووك وەك ناوچەیەکی نەوتاوی پێشان بدرێت، ئیدی لە ناوچەکانی دیکە ئەگەر بیری نەوتیش لێدرابێ بەکار نەهێندراون و هەوڵدراوە بە نهێنی بمێننەوە و پارێزگاریان لێکراوە، تەنانەت دوای راپەڕین زۆر لەو بیرە نەوتانە لە زۆر جێگەی کوردستاندا بە دیارکەوتن.

دوای رووخاندنی رژێمی سەدام دەرفەتێکی گرنگ هاتە پێشەوە، کورد توانی لەبەر رۆشنایی دەستووری عێراق کە سەرکردایەتی سیاسی کورد رۆڵێکی بەرچاوی لەداڕشتنی دەستوورەکەدا هەبوو، هەوڵی ئەوەبدات لەڕێی چەند گرێبەستێکەوە دەست بەلێدانی بیری نەوت بکات، بەلام ئەو بڕیارەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان، بووەی مایەی ورووژاندنی پرسیار لای بەغدا و دەوروبەر و تەنانەت کوردستانیش، بەداخەوە لەکوردستان لەڕێی چەند رۆژنامەیەکەوە کاری زۆر بۆ ناشرینکردنی ئەوپرۆژەیە کرا، ئیدی ئەو ئاراستەیەی ناو رۆژنامەوانی کوردی هەوڵی زۆریدا زیاتر کاربکاتە سەر ئەو توێژو بوئرانەی دانیشتوان کە رۆژگار وای لێکردبوون، نەوت بەموڵکی خۆیان نەزانن، لەسەر لاپەڕەی ئەو جۆرە رۆژنامانە هەمیشە پەلاماری ئەو بڕیارەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان دراوە، هەوڵیان دا کار بکەنە سەر ڕای گشتی کە (سەرکردایەتی سیاسی کوردستان هێندەی مەبەستی نەوتە، هێندە مەبەستی بابەتی دیکەی وەك ناوچە دابڕاوەکانی کوردستان نییە).

بۆیە حکومەتی هەرێمی کوردستان لەژینگەیەکی ئالۆزدا بەجورئەتەوە بڕیاری لێداو دەستی بۆ نەوت برد، کەواتە ئەو رێگەیەی حکومەتی کوردستان بەتەواوی بە(مین) چێندرا، لەلایەك وەزیری نەوتی عێراق حوسێن شەهرستانی بەردەوام قسەی لەبارەی ئەوپرۆژەیەی کوردستان کردووەو بەکارێکی نایاسایی زانیوە، هەڕەشەی دەوروبەر و بەکەم زانینی لەلایەن

هەندێ گرووپ و رۆژنامەشەوە لەولا بوەستێ. کەواتە کورد لەسەر خاکی خۆی بەنێو کێڵگەی بە (مین) چێندراودا خۆی گەیاندۆتە نەوت، باشە بۆ شەرم بێ داوای سامانی ولاتی خۆت بکەین، کەهەوڵی ئەو پڕۆژە گرنگەی نەوت درا، ئەوە ناگەیەنێ پشت لەمەسەلەکانی دیکە کرابێ، بەڵکو لەهەموو ئاراستەیەکدا کارکراوە و، نەوتیش یەکێك لەو تەوەرە گرنگانەیە کە حکومەتی کوردستان توانی سەرکەوتن وەدی بهێنێ، بەداخەوە لەهەندێ رۆژنامەدا بەردەوام ئەوجۆرە هەواڵ و بابەتانە بلاو دەکرانەوە، کە دژایەتی ئەو پڕۆژەیەی کوردستانیان دەکرد، ئەمەش هەوڵێك بوو بۆ ئەوەی بەکارێکی سوك و نەکردەو خەون و خەیاڵەوە سەیر بکرێ، مەسەلەی ئازادی رۆژنامەوانی لێگەڕێ کە ئازادی دەرفەتی ئەو قسانەی داوە، بەلام بۆچی بەوجۆرە بابەت بلاوبکرێتەوە وەك ئەوە ئاو لەئاشی دوژمن بکرێ، بۆچی لەکوردستان دژایەتی پڕۆژەیەکی ستراتیژی لەبابەتی نەوت بکرێ، ئێ ئەگەر مەسەلە ئۆپۆزسیۆن و چاو برینە دەسەلات بێت، ئەوا نەوت رێگەی خۆی گرت و بەدامەزراوەیی کراوە و بەپێی دەستوور، کەواتە هەر گرووپ و لایەنێکی سیاسی دەسەلاتی کوردستانی بەدەستەوەبێ ئەوا ئەو دەسکەوتە بۆ گەل هاتۆتەدی و دەبێ لەئێستاوە پشتیوانی لێبکات و بیپارێزێ، بۆیە رۆژی ٢٠٠٩/٦/١ رۆژی جاڕدانی سەرکەوتنی پڕۆژەی حکومەتی هەرێمی کوردستان و گەلی کوردستان بوو، لەماوەی چوار پێنج ساڵدا بێ گوێدانە هەوڵی تێکدەرانەو قسەی بێ جێوڕێ، کورد سڵی لەو (مین )انە نەکردەوە کەلەڕێی هەنگاوی بەرهەمهێنانی نەوتدا بۆی چێندرابوون.

## نەوت لە حوزەیرانی بەغدا و حوزەیرانی هەولێرد

٦/١ لە دوو سەردەمی جیاواز بۆ نەوت، لە عێراق و کوردستاندا، وەك دوو ڕووداو سەیر دەکرێن، لە ١٩٧٢/٦/١ حکوومەتی عێراق نەوتی (خۆماڵی) کردو، لە ٢٠٠٩/٦/١ شدا نەوتی هەرێمی کوردستان نێردرا بازاڕەکانی جیهان.

دەکرێ ئاماژە بە قۆناغی دوای ١٩٧٢/٦/١ بکەین، ئاخۆ ئەو خۆماڵی کردنەی نەوت، عێراقی بەکوێ گەیاند، ئەوانەی بەهۆی خۆماڵی کردنی نەوتەوە، منەتی زۆریان بەسەر خەڵکی عێراقدا کرد، ٤ ساڵ بوو لەڕێی کۆدێتاوە دەسەلاتیان زەوت کردبوو، ٢ ساڵیش بوو ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداریان لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوولدا مۆرکردبوو، حکوومەتی عێراق

لەجیاتی ئەوەی هەوڵ بدات نەوت بخاتە خزمەت گەلانی عێراقەوە، خستییە خزمەت بەرنامەی ناسیونالیزمی عەرەبییەوە، لە کوێ؟ لە عێراقێکدا کە پێکهاتەی جیاواز ناعەرەبی تێدایە.

١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ سەرەتای قۆناغێکی ترسناکی لە عێراق و ناوچەکە هێنایە پێش، لەو ڕۆژەوە کە لەلایەن ئەحمەد حەسەن بەکری سەرۆك کۆماری ئەوسای عێراقەوە، نەوتیان لە کۆمپانیاکان سەندەوەو کەوتە ژێر دەسەڵاتی حکوومەتی بەغداوە، لەجیاتی چارەسەرکردنی گرفتەکانی ئەو وڵاتە، چەندین گرفت و قەیرانی دیکەیان دروست کرد، کە تا ئێستاش عێراق باجەکەی دەدات، بەغدای ئێستاش خوازیارە نەوت بۆ هەمان مەبەستی بەغدای دوێنێ بەکاربهێنێ، بەهۆی دەوڵەمەندبوونەوە عێراق چەك و تفاقی جەنگی پەیداکردو، لە شۆڕشی کوردستان قیت بۆوەو، پشتی لە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار کرد، نەوت بووە مایەی کاول بوونی کوردستان و ٤٥٠٠ گوندو شارۆچکە وێران کران.

نەوت بەغدای غرور کردو، بەهۆی شەڕەکانی بەغدا-کوردستان و شەڕی عێراق-ئێران و پاشان داگیرکردنی کوێت و، سیاسەتە چەوت و چەوێڵەکانی دیکەوە، عێراق تا ئەمڕۆش باجی غروری بەغدای نەوت دەدات، ئاخر بەغدای سەردەمی عێراقی نوێش، وێڕای ئەوەی هاتەسەر حازری نەوت، کەموکوڕی زۆری لەبواری نەوتەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا تا ئێستا وەزیری نەوتی عێراق نەیتوانیوە بەرهەم زیاد بکات، لە کاتێکدا چەندین ملیار دۆلار بۆ ئەو لایەنە تەرخان کراوە، بۆیە ١ی حوزەیرانی بەغدا وێرانیی بۆ کوردستان و مەینەتی بۆ خەڵکی عێراق هێنا، سەیر لەوەدایە لە بەغدای سەردەمی عێراقی نوێدا، ئەوانەی هاتوونەتە سەر میراتی (خۆماڵیکردن)، ناتوانن خۆیان لەو چوارچێوەیە دەربێنن و، هەنگاو بۆ بوژاندنەوەی هەم کەرتی نەوت و هەم لایەنەکانی دیکەی ژیانی خەڵك هەڵبێنن، بەعس بە حیساب نەوتی خۆماڵی کردو وەرگرتنەوەی لە کۆمپانیاکان بەشۆڕشێك لەقەڵەمدا، بەغدای ئەمڕۆ هاتەسەر ئەو میراتەو نەیتوانی ئەو کەرتە ببوژێنێتەوە، هەندێ گرووپ بە ئاشکراو بێ منەت کەوتنە تالان کردنی نەوت و، ئەو بێسەروبەرییەی کەوتە بواری نەوت تا ئێستا چارەی نەکراوە.

ئەگەر(خۆماڵیکردن) بۆ کاولکردنی وڵات بووبێ، لە ئەمڕۆشدا بەوپێیەی کەوتۆتە دەست حکوومەت، حکوومەتیش لە عێراقدا بەپێی ناوچەو شوێن و قەبارەی حزب و گرووپ و هێزە سیاسییەکان دەگۆڕێ، دزینی نەوت مانای حیساب نەکردنە بۆ حکوومەت، لەولاشەوە وەزارەتی نەوت نەیتوانی بەرهەم زیادبکات، چونکە تاکە سەرچاوەی داهاتی عێراق بە پلەی یەکەم نەوتە، کە نەتواندراوە بەوجۆرە کاری بۆ بکرێت و بەرهەم زیاد بکرێت.

١ی حوزەیرانی هەولێر پێچەوانەی حوزەیرانی بەغدا، سەرەتایەکی گرنگی بۆ عێراق و کوردستان هێناکایەوە، هەرچەندە بەغدا بەوپرۆژەیەی لە ٢٠٠٩/٦/١ لە هەولێر، لە لایەن سەرۆك کۆمارو سەرۆکی هەرێمی کوردستان کرایەوە هێندە خۆشحاڵ نییە، لەبەرئەوەی بەوهۆیەوە هەولێر لەڕووی نەوتەوە سەرکەوت و، توانی لە نەبوونەوە دەست پێبکات و بیر لێبدات و بەرهەم بهێنێ و ڕەوانەی بازاڕەکانی جیهانی بکات، ئێستا هەولێر بووە پشتیوانێکی بەهێزی داهاتی عێراق و، بەسەر هەموو ئەو کۆسپانەدا رەت بوو، کە بەناوی جیابوونەوەو پێکهێنانی دەوڵەت خرابوونە ڕێگایەوەو هێزە ناوخۆیی و ئیقلیمی و عەرەبییەکانیان پێ هان دەدا، کە دژی هەرێمی کوردستان بووەستن و لێ نەگەڕێن لەو کارەیدا سەرکەوێت.

١ی حوزەیرانی بەغدا کیمیابارانکردن و ئەنفال و وێرانکردنی کوردستان و نەهامەتی بۆ تەواوی عێراق هێنا، ١ی حوزەیرانی هەولێریش خزمەت بە خەڵك و مرۆڤایەتی دەکات، بەکورتی لە بەغداوە بڕیاری شەڕوماڵوێرانی دراو لە هەولێریش بڕیاری خزمەتکردنی خەڵك و بەشداریکردن لە پەرەپێدانی داهاتی خەڵکی عێراق. بەهەموو پێوەرێك گرنگیدان بە کەرتی نەوت لە کوردستاندا، گرنگییەکی زۆری بۆ تەواوی عێراق هەیە و هەوڵێکی جددیە بۆ ڕاستکردنەوەی باری گلاوی عێراق و کۆڵەگەیەکی باخدارە بۆ ئابووری کوردستان و عێراق، هەرئەوەشە وامان لێدەکات بڵێین ئەی ئەو دڕدۆنگیەی بەغدا لە هەولێر چییە؟ ڕاستیەکەی ئەوەیە ئەگەر بارودۆخی ناسك و هەستیاری عێراق نەبایە، زۆر ئاسایی بوو بەغدا هەمان دروشمی سەردەمی بەعس "نەوتی عەرەب بۆ عەرەب" بەرزبکاتەوەو پشت لە هەموو پێکهاتەکانی دیکەی ئەو وڵاتە بکات.

لە ماوەی ٦ ساڵی ڕابردوودا، دەرکەوت کە لەگەڵ بەرزبوونەوەی نرخی نەوت، دیسان کەڵکەڵەی بەهێزبوونەوەی سەربازی و بادانەوە بەلای مەرکەزییەتدا، بەغدای بە ئاقارێکی دیکەدا برد، ئەمەش مەترسییەکی گەورەیە، چونکە بەدرێژایی ماوەی حوکمی بەعس نەوت مایەی خێرو چاکەو خۆشگوزەرانی نەبوو، بەڵکو ماڵوێرانی بوو.

وەك شارەزایانی بواری ئابووری باسی لێوە دەکەن، ئەمساڵ بودجەی عێراق ٢٠ ملیار دۆلار کورتی هێنا، دەبوایە بە ناردنەدەرەوەی بەرمیلێك نەوت لە هەرێمی کوردستانەوە، بەغدا دەستخۆشی کردبا، چونکە کاریگەری هەیە بۆ ئابووری عێراق، لەو سۆنگەیەوە ناردنە دەرەوەی نەوتی هەرێمی کوردستان پشتیوانە بۆ ئابووری عێراق. لە ماوەی دوای ڕووخاندنی

سەدام، دەرکەوت بڕیاری نەوت، لە بەغدا یان هەولێر خزمەتی خەڵکی عێراق دەکات؟ ئاشکرایە، ئەوەی ئالآی خزمەتکردنی مرۆڤایەتی بەرزبکاتەوە، لە ئەنجامدا ئەو هەوڵەی لە ئاستی جیاجیادا بەرز ڕادەگیرێ، ئەگەرچی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەجورئەتەوە دەستی بۆ نەوت بردو، لە ماوەیەکی دیاریکراودا توانی بەرهەمی بهێنێ و ڕەوانەی بازاڕەکانی جیهانی بکات، بەڵام لە بەرزکردنەوەی ئەو ئالآیەی خزمەتکردن، تەقەی زۆری لێکراو کۆسپی زۆری خرایە سەر ڕێگای کارکردن، بەڵام ئیرادەی خزمەتکردن و مرۆڤدۆستی لەوە بەهێزنربوو، جێی داخە بۆ بەغدای سەردەمی نوێ، کە تەواوی میراتی نەوتی بە دروشمە ڕەگەزپەرستییەکەشەوە وەرگرتووە، دەکرێ بڵێین هەولێر دروشمی لەپێناوی مرۆڤایەتی و ئاوەدانکردنەوەی وڵات و خۆشگوزەرانی خەڵکی بەرزکردەوەو، کاری لێرە بەدواوە لە سایەی ئەو دروشمە بەڕێگایەکی بە مین چێندراودا نەوتی بەرهەمهێنا، کەچی هەقمانە گومان بڕیاری نەوت لە بەغدا بکەین و بڵێین چۆن قەناعەتمان پێ دێنن، کە ئێستا لە دەوری دروشمی "نەوتی عەرەب بۆ عەرەب" ناخولێنەوەو هەمان پرۆژەی ١ی حوزەیرانی ١٩٧٢ تان نییە؟ ١ی حوزەیرامی ٢٠٠٩ دەریخست هەولێر لە دروشمی فیدراڵی و پێکەوەژیان لە چوارچێوەی عێراقدا، لە بەغدا ڕاستگۆترە.

## نەوت لە قۆناغی ئێستا و ئایندەدا

کە دەگوترێ بۆ یەکەم جار لەمێژووی کوردستاندا نەوت رەوانەی بازاڕەکانی جیهان کرا، لەڕووی مێژووییەوە دەکەوینە هەڵەیەکی دیار، چونکە لەراستیدا دەمێك ساڵە نەوتی کەرکووك و ناوچەکانی کوردستان دەڕواتە بازاڕی جیهان، بەڵام ئەمجارە بۆ یەکەم جارە نەوت لەهەرێمی کوردستانەوە بەرهەم دێت و ڕەوانەی بازاڕەکانی جیهان دەکرێت، هەروەها جیاوازیەکە لەوەدایە، دەسەڵاتێك (حکوومەتی هەرێمی کوردستان) هەوڵی بەرهەمهێنان و ناردنە دەرەوەی داوە کە لەلایەن گەلەوە هەڵبژێردراوە، دەکرێ گرنگی ئەو پرۆژە ستراتیژییە بۆ ئێستاو ئایندەی هەرێمی کوردستان لەچەند خاڵێکدا چڕ بکەینەوە:

* وەك ئاژانسەكانی هەواڵ رایانگەیاند دوای ئەوەی لەرۆژی ٢٠٠٩/٦/١ نەوتی هەرێمی كوردستان هەناردەی بازاڕەكانی جیهان كرا، هەردوو كۆمپانیای "دی.ئێن.ئۆ" و ئاداكس كە نەوتی كوردستانیان هەناردەكرد بەڕێژەی ٥٪ بۆرسەیان بەرزبۆوە، هەروەها بەپێی شارەزایانی بواری نەوت و ئابووری چەند وڵاتێك داوایان كردووە نەوت لەو دوو كۆمپانیایە بكڕن، بەهۆی ئەوەی نەوتی هەرێمی كوردستان لە جۆرێكی باشە، بەرزبوونەوەی پشكی ئەو كۆمپانیایانەی نەوتی هەرێمی كوردستانیان هەناردەكرد، كاریگەری خۆی دەبێت لەسەر هاندانی كۆمپانیاكان و هاتنی كۆمپانیای دیكە.

* یاسای وەبەرهێنانی حكوومەتی هەرێمی كوردستان باشتر جێگەی خۆی دەگرێت، چونكە دوو كۆمپانیای نەوت توانیان لەسایەی یاسای وەبەرهێنانەوە پرۆژەیەكی ستراتیژی تەواوبكەن. بەمەش متمانەی كۆمپانیاكانی جیهان لەهەموو بوارێكدا بەهۆی ئەو سەركەوتنەوە بەهەرێمی كوردستان و یاسای وەبەرهێنان زیاتر دەبێت و سەرمایەی زیاتر روو لەهەرێمی كوردستان دەكات.

* بۆ یەكەم جار لەهەرێمی كوردستاندا پیشەسازی نەوت دادەمەزرێ و بەو هۆیەشەوە هەلی كاركردن بۆ ژمارەیەكی زۆری خەڵكی كوردستان دەڕەخسێت.

* وەك لەرۆژی رێوڕەسمی كردنەوەی قوفڵی بۆڕی هەناردەی نەوت راگەیاندرا، كەپێشبینی دەكرێت لەكۆتایی ئەمساڵ بڕی هەناردەی نەوت بگاتە ١٠٠ هەزار بەرمیل لەرۆژێكدا و لەماوەی سێ ساڵی دیكەدا بەرهەم زیاد بكات و بگاتە ملیۆنێك بەرمیل لەرۆژێكدا، ئەمەش دەبێتە هۆی بەشداریكردنی زیاتر لەپەرەپێدانی نەوت و پشتیوانێكی بەهێزی ئابووریی ئێراق.

* لەگەڵ زیادبوونی بەرهەمی نەوت، بەرهەمی "غاز"یش زیاد دەكات، بەمەش هەرێمی كوردستان دەبێتە خاوەنی غازێكی زۆرو هەناردەی نەوت دەبێتە هۆی ئاسانكارییەك بۆ هەناردەی غازی كوردستان بۆ ئەورووپا كە ئێستا لەوبارەیەوە گرێبەست ئیمزاكراوە.

* زیادبوونی بەرهەمی نەوت جگە لەناردنە دەرەوە بۆ پێداویستی ناوخۆش رۆڵێکی گرنگ دەگێڕێ، ئەو گرفتەی چەندین ساڵە خەڵك لەبەری ناڵاندویەتی بەهۆی نەبوونی سووتەمەنی، ئەمجارە سەرچاوەکانی ئەو سووتەمەنیە بۆ پێداویستی رۆژانەی هاوولاتیان دەکەوێتەوە کوردستان، ئەگەر بێتوو پالاوگەکان زوو بکەونەکار.

* هەروەها سەرچاوەی وزە بۆ زۆر بواری دیکەی وەك بەرهەمهێنانی کارەباو پیشەسازی زیاتر دەبێت، چونکە بەهۆی ئاوەدان بوونەوەی کوردستان و گەورەبوونی شارەکان و زۆربوونی کارگە، تادێت پێویستیمان بەوزەی زیاتری کارەبا دەبێت، لەم قۆناغەشدا زیاتر پشت بەو سەرچاوەیە دەبەسترێ بۆ بەرهەمهێنانی وزەی کارەبا.

* لەڕووی سیاسییەوە بەهۆی دەنگدانەوەی ڕێورەسمی هەناردەی نەوتی هەرێمی کوردستان بۆ بازاڕەکانی جیهان، هەرێمی کوردستان بەتەواوی لەڕووی ئارامی و جێگیری سیاسی و پاراستنی ئاسایشی هاوولاتیان لەبەشەکانی دیکەی ئێراق جیابۆوە ئەگەر تا ئێستا کەسانێك لەئەورووپا ترس لەتیرۆرو تەقینەوە وای لێکردبن نێنە کوردستان بەوەی بەشێکە لەئێراق، ئەوا ٢٠٠٩/٦/١ باشترین ئاگاداری و رێکلامێکی گرنگ بوو بۆ هەموو دنیا، چونکە ئەگەر بەرقەراربوونی ئاسایش و ئارامی نەبێت دوو کۆمپانیا چۆن دەتوانن لەهیچەوە دەست پێبکەن و بیرلێبدەن و نەوت بەرهەم بهێنن و ڕەوانەی بازاڕیشی بکەن؟ بۆیە چاوەڕێ دەکرێ گەورە کۆمپانیای جیهان ڕوو لە هەرێمی کوردستان بکەن.

* پەیوەندی هەرێمایەتی گۆڕانی زیاتری بەسەردا دێت، بەتایبەتیش لەگەڵ تورکیا، دیارە هەناردەکردنی نەوت جارێکی دی ئەوانەی پێیان باش بووە پەیوەندی لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا هەبێت، دیسان دێنەوە سەر خەت و ئەو دەستکەوتە ئابوورییە بەگرنگ دەزانن بەو پێیە بەخاکی تورکیادا رەت دەبێت و دەرفەتی کۆمپانیاکانیشیان زیاتردەبێت بەتایبەت لەبواری نەوت دا.

* ئەگەر مەسەلەی هەناردەی غازی کوردستان بۆ ئەورووپا زیاتر بەرەو پێشەوە بچێت، ئەوا پەیوەندی هەرێمی کوردستان و ئەوروپا کەتا ئێستاش سەرەتایەکی هەبووە،

بەتایبەتیش دوای گەشتە سەرکەوتووەکانی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ ئەورووپا، توندوتۆڵتر دەبێت.

* ١ی حوزەیران مەسەلەیەکی دیکەی زۆر گرنگی بۆ دووپات کردینەوە، ئەویش هاوپەیمانی پارتی و یەکێتی و گرنگیی ڕێککەوتنی ستراتیژی نێوان هەردوولا، ئامادەبوونی بەڕێزان مام جەلال سەرۆك کۆماری ئێراق و مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە ڕێوڕەسمی هەناردەکردنی نەوت بۆ بازاڕەکانی جیهان و کردنەوەی قوفڵی بۆڕی نەوت بۆ ئەوەی دەست بەهەناردەکردن بکرێت، ئاماژەیەکی گرنگە کە لەسایەی هاوپەیمانی و ڕێککەوتنی ئەو دوو لایەنە گرنگەی کوردستان بەرهەمی وا گرنگی دەبێت و ڕێککەوتنی ستراتیژی بەرهەمی ستراتیژی لێدەکەوێتەوە.

٢٠٠٩/٦/٧

# یەکەم سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان گەڕاندنەوەی بەها بۆ ناوەندی بڕیاردان

ناوەندی بڕیاردان لەتەك دامەزراوەکانی دیکەی بەڕێوەبەردنی وڵاتدا گرنگی خۆی هەیە، بۆ یەکلایی کردنەوەی مەسەلە بایەخدارو چارەنووسسازەکان و رووداوی لەناکاو، کەپێویستیی بە بەبڕیارێکی لەجێ بێت، لە کوردستاندا ئەو ناوەندەو پرۆسەی بڕیاردان بەشێوەیەکی گشتی لەچەند قۆناغێکی جیاوازدا بەهەڵبەز و دابەزدا رۆیشتووە.

تا دوای ١٩٩١کورد بۆی رێك نەکەوتووە خەمی دروستکردنی ئەو دامەزراوانەی بەڕێوەبردنی وڵاتی هەبێ کەزادەی هەڵبژاردنن، تا ساڵی ١٩٩١ بڕیاری کوردستان لەنێو جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان شەرعیەتی شۆڕشگێڕی سەرچاوەی بووە، لەگەڵ ئەوەشدا لەهەندێ قۆناغدا ئەو بڕیارەش پەرشوبڵاوی تێکەوتووە، ئەگەر بمانەوێ گرنگیی ناوەندی بڕیار لەشۆڕشەکانی کوردستان بزانین، ئەوا شۆڕشی ئەیلوول نموونەیەکی دیار و بەرچاوی یەك بڕیارە، ئەو سیمایەی ئەوێ رۆژێ تایبەتمەندییەکی تایبەتی بە شۆڕش و جێبەجێ کردنی بڕیار و یەکڕەنگی خەڵك بەخشی بوو.

لەقۆناغی دوای ١٩٧٥ بڕیار لەشۆڕشی کوردستاندا شێوەیەکی بەربڵاوی وەرگرت، ئەمەش بۆ دۆخی سیاسی و کاری حزبایەتی ئەو قۆناغە دەگەڕێتەوە، کەچەندین حزب لەگۆڕەپانی خەبات بوون، بەڵام لەهەمان کاتدا دیاردەی فرە بڕیار و فرە سەرکردایەتی و چەندین هێزی سەربازی کە هەریەکە و خاوەن بڕیاری خۆی بوو سەریهەڵدا، لەم قۆناغەدا پەرشوبڵاوی بڕیار و نەبوونی ناوەندێکی بڕیاردان، خاڵێکی لاوازی جوڵانەوەی رزگاریخواری کوردستان بوو، رژێمی لەناوچووی بەعس لەو دەڵاقەیەوە، خۆی دەخزاندە نێو ریزی هێزە سیاسییەکان و تەنانەت چەندین هەوڵی لابەلا و بەتەنیای لەگەڵ تاکە حزب دەدا کە گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا بکەن، بۆیە گفتوگۆکانی ئەم قۆناغە ١٩٧٥-١٩٩١ لەگەڵ گفتوگۆی کورد و بەغدا لەسەردەمی شۆڕشی ئەیلول جیاواز بوون.

لەکۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوو بەرەی کوردستانی هەوڵێك بوو، بەهۆیەوە ناوەندەکانی بڕیاری هێز و لایەنەکان لەژێر چەتری بەرەی کوردستانی کۆبوونەوە و ئەمجارە بەرەی کوردستانی بووە خاوەن بڕیار و سەرەتایەکی گرنگ بۆ بڕیاری نەخشەدانان بۆ راپەڕین. لەسەرەتای رۆژانی راپەڕینی ١٩٩١سەرۆك بارزانی لەبەردەم ئاپۆڕای جەماوەرێکی زۆر لەکۆیە، رایگەیاند کە دەبێ هەڵبژاردن بکرێ و دامودەزگای شەرعی دابمەزرێن و خەڵك خاوەنی بڕیاربێت، ئیدی ئەم داوایەی سەرۆك بارزانی چووە واری جێبەجێکردنەوە، بەرەی کوردستانی لەبڕیارێکی بوێرانەدا، دۆخی کوردستانی بەرەو قۆناغێکی یاسایی و بڕیاری خەڵك بردو رۆژی ١٩٩٢/٥/١٩ یەکەم هەڵبژاردنی ئازاد لەکوردستان کرا، بەمەش پرۆسەی بڕیاردان چووە قۆناغێکی دیکە و سایەیەکی شەرعیی بەهۆی هەڵبژاردنەوە وەرگرت، هەرلەهەمان رۆژدا هەڵبژاردنی رابەری بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان کرا، بەڵام ئەو مەسەلەیە بێ دەنگی لێکرا، یەکێك لەکارە هەرە گرنگەکانی قۆناغی دوای هەڵبژاردن بڕیاری یەکخستنی دروشمی هێزە سیاسیەکان بوو، کەلەلایەن پەرلەمانەوە شێوەی پێکەوەژیان لەگەڵ بەغدا بەفیدرالیزم بڕیاری لێدرا، ئەمەش وەك بڕیارێك کۆتایی بەفرە دروشمی لایەنە سیاسیەکان هێنا.

لەچەند ساڵێکی شەڕی ناوخۆ و دووئیدارەییدا، ناوەندی بڕیاردان بەقۆناغێکی ناسکدا رەت بوو، پرۆسەی ئاشتی جارێکی دی کوردستانی بەرەو یەك ناوەندی بڕیار بردەوەو زەمینەی بۆ خۆشکرد، تا لەساڵی ٢٠٠٥دا لەگەڵ هەڵبژاردنی پەرلەمان بڕیاردرا سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان بێتەکایەو، لەرۆژی ٢٠٠٥/٦/١٢بەڕێز مسعود بارزانی لەلایەن پەرلەمانی کوردستانەوە بەسەرۆکی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردرا، بەمەش چوار ساڵی سەرۆکایەتی بناغەیەکی بۆ ناوەندی بڕیار دانا و ئەوچوار ساڵە بەماوەیەکی گرنگی ئەم قۆناغەی کوردستان دادندرێت و تایبەتمەندی خۆی هەیە و سیماکانی بەم شێوەیە تێبینی دەکەین:

* سەرۆك بارزانی وەك چەترێك بۆ کوردستان بناغەیەکی بۆ لەمەودوای سەرۆکایەتی دانا و کوردستانی لەقۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی دیکە برد، لەم چوار ساڵەی سەرۆکایەتی کە قۆناغێکی راگوزارییە و زەمینەی کاری پێکەوەیی زۆر بەگەرمی ئیشی لەسەرکرا، ئەو دۆخە زەمینەی لێك نزیك بوونەوەی پارتی و یەکێتی و کاری پێکەوەیی خۆشترکرد و رێککەوتنی ئەو دوو هێزە گەورەیە لەم چوار ساڵەدا سەلماندی کەچەند گرنگە.

* چوار ساڵی سەرۆکایەتی کوردستان دەریخست ناوەندی بڕیاردان چەند گرنگە، بەتایبەتیش بۆ ئەم قۆناغە کە پڕە لە رووداوی گەرم و بڕیاردان لە ئاست ئەو رووداوانە زەروورەتی ئەو سەرۆکایەتیە پیشان دەدات، لەپڕۆسەی بڕیاری گەرم و بڕیاردان لە ئاست ئەو رووداوانە زەروورەتی ئەو سەرۆکایەتیە پیشان دەدات، لە پرۆسەی بڕیاری گەرما و گەرم لەبەرامبەر رووداوەکان، ئەزموونی چەندین ساڵەی پێشمەرگایەتی وکاری سیاسی و رێبەرایەتی سەرۆك بارزانی و پایە و شوێن و ناوبانگی سەرۆك بارزانی لە ناوچەکەو ئاستی جیهاندا رۆڵی سەرەکی هەیە.

* تا سەرۆکایەتی کوردستان بەتەواوی نەکەوتبووە کار، بەغدا لەدوو دەروازەوە کوردستانی دەدواندو بۆ گفتوگۆ پیرمام و دوکان بەسەر دەکرایەوە بەتایبەتیش لەسەردەمی جەعفەریدا، بەمەش بەغدا هەستی دەکرد دوو ناوەندی بڕیار هەیەو هەر بەو ئاراستەیەشدا کاری دەکرد کەهەمیشە رووبەڕووی بڕیاری بەهێز نەبێتەوە، بەڵام سەرۆکایەتی کوردستان ئەو دەروازەی قوفڵ داو هەولێر بوو ناوەندی بڕیار و تۆکمەیی ئەو ناوەندەی هەرێمی کوردستان لە چەند مەسەلەیەکدا لەگەڵ بەغدا رەنگی دایەوە.

* سەرۆکایەتی بێجگە لەپەیوەندی لەگەڵ بەغدا لە رووی دیپلۆماسیەوە لەگەڵ ناوەندە گەورەکانی بڕیار لەجیهاندا کارابووەو لەهەر پێداچوونەوەیەکی هاوپەیمان بەئێراق بەتایبەتیش ئەمەریکا هەولێر لایەکی هاوکێشەکەبووەو گفتوگۆی لەگەڵ کراوە. هەروەها گەشتە سەرکەوتووەکانی سەرۆکی کوردستان بۆ ئەمەریکاو ئەوروپا رۆڵی دیاری لەبەرەوپێش بردنی هەرێمی کوردستان هەبووە و زەمینەی هاتنی کۆمپانیای جۆراوجۆری خۆش کردووە.

* لەرووی ئیقلیمیەوە سەرۆکایەتی کوردستان حەکیمانە مامەڵەی کردووەو هەندێ جار گرژی بەجۆرێك کەوتۆتەوە گەیشتۆتە ئاستی هەڕەشەی سەربازی وڵاتانی ئیقلیمی، بەتایبەتی تورکیا، بەڵام سەرۆکی کوردستان بەهۆی سیاسەتی راست و ڕەوانەوە، دۆخە ناخۆش و گرژەکانی هێور کردۆتەوەو رێچکەیەکی دیکە هاتۆتە پێش، بۆنموونە ئێستا پەیوەندی هەرێمی کوردستان و تورکیا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووەو دوای هەناردنی نەوت لەرێی تورکیاوە بۆ بازاڕەکانی جیهان ئەو پەیوەندییە هەنگاوی دیکە هەڵدێنێ.

* لـەم چوارسـاڵەی سـەرۆکایەتی کوردسـتاندا هـەوڵی زۆر بـۆ تۆخکردنـەوەی مەسـەلە نەتەوەییەکان درا، بەو پێیەی سەرۆکایەتی وەك دەزگایەکی نەتەوەیی و نیشتیمانی دەرکـەوت و هەولێدا نیشانە زەقەکانی حزبایەتی کاڵ بکاتەوە بەمەش ئاڵای حزبەکان کەمتر هـەڵ دەدرێ و تەنیا لەسەر بارەگاکان مایەوە. ئاڵای کوردستان لەم چوارسـاڵەدا بـەجۆرێك گرنگـی پێـدرا کەچـووە نێـو یادگـەو لای هـەموو کـەس ئامـادەیی هەیـە و لەهـەموو بۆنەیەکـدا بەبۆنـە حزبیەکانیشەوە لەئاسماندا دەشەکێتەوە.

* گرد بوونەوەی جـەماوەری لەبەرامبـەر پـیلان و هـەوڵی بەکـەم زانـینی مافـەڕەواکان سیمایەکی دیکەی یەکەم سەرۆکایەتی کوردستانە، بۆنموونە کەلە ۲۲ی تەمموزی ۲۰۰۸ بـەبێ ئامادەبوونی لیستی هاوپەیمانی کوردستان لە دژی کورد دەنگیان بۆمـاددەی ۲٤داو ئـەو ڕۆژە بە(سێ شەممەی رەش) و کۆدەتا ناسرا، دوای ٦رۆژ و لە ۲۸ی تـەموز خـەڵکی کـەرکووك لـە ڕێپێوانێکی هێمنانەدا دژی گرووپی ۲۲ی تـەموز خۆیـان نیشـاندا و جـارێکی دی دوژمنـان ڕێپێوانە هێمنەکەیان لەرێی خۆکوژێك بەخوێن سوور کرد، تەواوی شارەکانی دیکەی کوردستان هەولێرو سلێمانی و دهۆك و شارو شارۆچکەکانی دیکە پشتیوانی خەڵکی کەرکووك وەستان و هاو هەڵوێستیان پیشاندا، سەرۆك بـارزانی لـەو کـات و سـاتەدا پـەیامی نـاڕەزایی خـەڵکی کوردستانی گەیاندە بەغدا.

* لەهەولێکی دیکەی دیپلۆماسی و فراوانکردنی بازنـەی دۆسـتایەتی، سـەرۆك بـارزانی گەشتێکی بۆچـەند وڵاتێکـی کەنـداو کـرد، هـەروەها لەپـەیامێکی راشـکاوانەدا بۆناوچـەی عەرەبی، سەرۆکی کوردستان پەیامێکی ئاراستەی گەل و دەسەڵاتە عەرەبیەکان کرد سەبارەت بە هەڵوێستیان بەرامبەر بەهەرێمی کوردستان.

* لەیەکەم سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستاندا، سەرەڕای ئەوەی پارتی و یەکێتی زۆرینـەی کورسیەکانی پەرلەمانیان وەدەست هێنا، بەڵام بۆ ئـەوەی گـوێ لەهـەموو بـیرو بۆچـوونێکی لایەنە سیاسیەکانی بگیرێ ئەنجوومەنێکی باڵای پارتە سیاسیەکان پێکهات و ئـەو ئەنجومەنـە بەسەرۆکایەتی سەرۆکی کوردستان کۆبوونـەوەی دەکـرد، * لەگـەڵ کۆتـایی هـاتنی مـاوەی سەرۆکایەتی جۆرج بۆش لەلایەن هەندێ کەسەوە وا لێك درایـەوە ئەمـەریکا ئیشـی بـەکورد

نەما. بەڵام سیمای سیاسەتی سەرۆکی نوێی ئەمەریکا بەرامبەر بەئێراق زوو دەرکەوت و لەیەکەم سەردانیدا بۆبەغدا دوای وەرگرتنی پۆستی سەرۆکی ئەمریکا، باراك ئۆباما لە بەغدا ٣ لای بینی، سەرۆکایەتی کۆمار، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و سەرۆکی هەرێمی کوردستان. ئەمەش ئاماژەیەك بوو کە لەسیاسەتی دادێی ئەمەریکادا، واشنتۆن هەموو پێکهاتەکان دەبینێ و لەپرسەکانی ئێراقدا رای سەرۆکی هەرێمی کوردستان وەردەگیرێ.

٢٠٠٩/٦/١١

# سەدای دەنگێك لەئەنكاراوە دێت تۆ بڵێی بەغدا گوێی لێبگرێت؟!

ماوەیەکە دەنگێك لەئاستێکی باڵای ئەنکارا بۆ چارەسەرکردنی پرسی کورد لەتورکیا بەرزبۆتەوە، کە هەنگاوێکی گرنگە و یەکەم جارە لەمێژووی ئەو وڵاتەدا بەوشێوەیە دەست بخرێتە سەر برین و هەوڵی چارەسەرکردنی بدرێت، ئەم گوتارە تازەیەی ئەنکارا سەدایەکی گەورەی لەناوچەکەو جیهاندا پەیدا کرد و کاریگەری لەسەر دۆزی کورد بەشێوەیەکی گشتی دەبێت، بۆیە بۆتە بابەتی سەرەکی ناوەندە سیاسی و رۆژنامەوانیەکانی جیهان.

گرنگی ئەوگوتارەی ئەنکارا لەوەدایە کە لەئاستە باڵاکانی وەك سەرۆك کۆمار و سەرۆك وەزیران و ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی یەوە بەرز بۆتەوەو کاری بۆ دەکرێ، ئەمە پێشکەوتنێکی گەورەیە لەو وڵاتەدا هاتۆتەدی، وڵاتێك کە بۆماوەی ٨٥ ساڵە کار بۆ پشت کردن لەو چارەسەریەی تێدا کراوە، ئەوەی گرنگە ئاماژەی پێ بکەین کاریگەری ئەو دەنگەی ئەنکارایە بەسەر ناوەندەکانی ئەو وڵاتانەی بەشێکی کوردستانیان گرتۆتەخۆ، ئێمە لەم بابەتەدا قسە لەسەر بەغدا دەکەین، ئاخۆ گوێ لەو سەدایە دەگرێ کە لە ئەنکاراوە دێت؟ گومانی تێدا نییە کە چارەسەری خێرای پرسی کورد، بە دروست بوونی قەناعەتی هەوڵی چارەسەرکردن لەلایەن نەتەوەی سەردەستەوە گرێدراوە، بەدرێژایی مێژوو شۆڕش و ڕاپەرینەکانی کورد دژی ناوەند و عەقڵیەتێك بەرپاکراوە کە هەرگیز گوێی لە داوای میللەتێك نەگرتووە، بۆیە دروست بوونی قەناعەتی چارەسەرکردنی پرسی کورد لەتورکیا لەلایەن دەسەڵاتەوە هەنگاوێکی گەورەیە، هەر ئەمەشە وای لەسەرۆك وەزیرانی تورکیا کرد کە بڵێ چی دەبوو ئەگەر زووتر ئەو هەنگاوە نرابا.

بۆ دەنگدانەوەی سەدای ئەنکارا لەبەغدا پێویستە لەچەندین لاوە بۆی بچین و شیکاری پرسی کورد لەهەردوو وڵات و ئاستی قبوڵکردنی بەرامبەر و وەئاگاهاتنەوە لەسەردەمی تازەدا

بکەین. هەردوو دەوڵەتی تورکیا و عێـراق زادەی قۆنـاغی دوای جـەنگی یەکـەمی جیهـانن، تورکیا پاشماوەی ئیمپڕاتۆریەتی عوسمانی و کۆمـاری تورکیـای نـوێ کـە لـە ١٩٢٤ لەلایـەن مستەفا کەمال ئەتاتورك راگەیەندرا، لەدامەزراندنی کۆمارەوە تـا بەئـەمڕۆ دەگـات بـەهیچ شێوەیەك بەلای چارەسەری پرسی کورد دا نەچوون، نەك هەر ئەوە بـەڵکو هەمیشـە شوناسـی کورد هەڕەشەی لێکراوە، ئەوەتا ئێستا قسە لەوە دەکرێ کە هەزاران گوندی کورد ناوی گۆڕاوە و رێگە دەدرێ ناوی کوردیان بۆ بگەڕێندرێتەوە، تائێستاش دەستووری ئەو وڵاتە دانی بـەوەدا نەناوە کورد هەیە، ئێستا لەمیانەی ئەو دەنگـەی بۆچارەســەری بەرزبۆتــەوە، بـەنیازە گـۆڕان بەسەر ئەو بڕگە و ماددەیەدا بهێنێ کەهەموو هاووڵاتیانی تورکیا بـەتورك دەزانێـت، کەچـی لەعێراقدا کە لەساڵی ١٩٢١وە بووەتە دەوڵەت و لە ١٩٢٦وە کوردستانی پێوە لکێنـدراوە و، لە دەستووری ساڵی ١٩٥٨دا بەئاشکرا لەماددەی سێدا دان بەنەتـەوەی کـورد دادەنێـت، کـە لەگەڵ عەرەبدا لەنیشتمان هاوبەشن و بەدرێژایی مێژووی کۆماری عێراق لە ١٩٨٥وە تائێستا هەمیشە لەگفتوگۆی نێوان بەغدا و کورد هەوڵ دراوە بەهۆی کات درێژکردنەوەو پەنابردنە بەر فڕوفێڵ پشت لەداوای کورد بکرێ و بەردەوام بەغدا لەجیاتی چارەسەر شەڕی سەپاندوە.

* جارێکیدی دوای رووخاندنی رژێمی سەدام لە ٢٠٠٣ لەدەســتووری نوێـدا نـاوی کـورد هاتۆتەوە وەك نەتەوەیەکی سەرەکی، بەپێی دەستوور بەشێکی چارەسەرکردنی نـاکۆکی نێـوان بەغدا و هەرێم کەخۆی لەماددەی ١٤٠دەستووردا دەبینێتەوە بەحکوومەتی عێراقـی فیـدراڵ سپێردرا کەچی بەردەوام پشتی تێکردووە.

* لەعێراقدا لەجیاتی حوکمی تاکەکەسی و تاکە حزبی چەندین حزب و رێکخراو و گروپی سیاسی لەمەیدانـدان، و سـەردەم گـۆڕاوە کەبەهـەموو پێوەرێـك دەبـێ ئـەو دۆخـە رێگـەی چارەسەری پرس کورد خۆش بکات، بەڵام بەپێچەوانەوە.

* لەتورکیا سەرۆکی حکوومەت لەپەرلەماندا بەرگری لـەگوتاری چارەســەرکردنی پرسـی کورد دەکات و وەڵامی ئۆپۆزسیۆن دەداتەوە کە ئەوچارەسەرە بەدەستکردی ئەمەرکیا دەزانن، کەچی لەعێراقدا حکوومەت خـۆی لـە دەســتووری وڵات دەدزێتــەوە، جیاوازییەکـە لێـرەدا، لەدەستووری تورکیا بەهیچ شێوەیەك ناوی کورد نەهاتووە سەرۆك کۆمـار و سـەرۆك وەزیـران

داوای چارەسەری پرسی کورد دەکەن، کەچی لەعێراقدا دەستوور دەڵـێ: ئـەو پرسـە چارەسـەر بکەن حکوومەت خۆی لێ دەدزێتەوە. * تورکیا وڵاتێکی گرنگ و بەهێزی ناوچەکەیە لە چاو عێراقێك کە بە چەندین دەرد دەناڵێنێ، کەچی ئەنکەرە چارەسەری پرسی کورد بە هەنگاوێکی چوونە پێشەوەی زیاتری ئەو وڵاتە دادەنێت و حکوومەتی ئێستا بەسەرۆکایەتی رەجەب تـەیب ئەردۆگان باکی بەوە نییە لە هەڵبژاردنی دادێ باجی ئەو گوتارە بدات، کەچی عێراقێکی لاواز بەداخەوە گرووپ و پێکهاتەی سیاسی تەسلیمی ناسیونالیزمی تەسك بـینی عـەرەب بوونـەو هیچ لایەك جورئەت ناکات رێگەی ئەنکەرا بگرنەبەر.

* لەبەغدا نەك ئاراستەیەکی وا دیار نییە کە جورئەت بکـات و هـەوڵی چارەسـەرکردنی کێشە هەڵواسراوەکانی نێوان هەرێمی کوردستان بەغدا بدات، بەڵکو هەسـت نـاکرێ گوێیـەك ئامادەبێت بۆ بیستنی ئەو دەنگ و سەدایەی لە ئەنکەرەوە دێت، بەداخەوە ژینگـەی بەغـدا، سەرەڕای ئەو هەموو گۆڕانانەی بەسەر جیهان و ناوچـەکەدا هـاتوون هێشـتا پـاك نەبۆتـەوەو کەسیش جورئەت ناکات خاوێنی بکاتەوە، نەك هەر ئەوە بەڵکو تـازە بـە تـازە کەسـانی وەك ئوسامەو ئەسیل نوجەیفی قیت دەبنەوەو قووڵکردنەوەی زامی عێراق بەپاڵەوانیەتی دەزانـن و پشتیوانیشیان لێ دەکرێ، لەنێو ئەو پاشاگەردانیەی عێراقدا تەنها دەستوور تاکە چارەسـەریە کەچی کەس ئامادە نییە پەنای بۆ ببات، ئیدی چ هیوایەك بەو ژینگەیەی بەغدا هەبێت، کـە هەوڵ دەدات دەسکاری دەستوور بکـات بـۆ ئـەوەی ئەوەنـدەی هـەرێمی کوردسـتان دەسـتی کەوتووە ئەوەشی لێ بەسەنێتەوەو عێـراق بـەرەو مەرکەزیـەت و دیکتاتۆریـەت بگێڕێتـەوە، کەچی تورکیا هەوڵدەدات دەسکاری دەستوور بکات و ئەو ماددەیەی هەموو هاووڵاتی بەتورك دەزانێ بۆ هاووڵاتی تورکیا بگۆڕێ، ئەمە لەکاتێکدایە کە پرسی کورد لە عێراقـی نوێـدا زۆر چۆتە پێش و بە بەشە هەرە ئارامەکەی عێراق لە قەڵەم دەدرێت، بۆیە تا لە بەغدا قەناعـەت بۆ چارەسەرکردنی کێشەکان دروست نەبێت، ئەستەمە ئەو کێشە و گرفتانـەی نێـوان بەغـداو هەولێر چارەسەر بکرێن، بۆیە پێ دەچـێ هێشـتا ژینگـەی بەغـدا لـە بەرامبـەر ئـەو جـۆرە دەنگانەدا خۆی کەڕ بکات، چونکە بەڕاستی گرنگـە قەناعـەتێکی وەك ئـەوەی لـە ئەنکـەرە دروست بووە لە بەغداش دروست ببێت، تۆ بڵێی ئەو ژینگەی هـەوڵی هەناسـە تـەنگ کـردن دەدات لێبگەڕێت بەم زووانە ئەو قەناعەتە دروست ببێت؟!

٢٠٠٩/٨/٢٦

# کورد لە یەک هەڵوێستیدا

زۆر پرسی گرنگ هەن بوونەتە مایەی قسە لەسەرکردن و دەربڕینی هەڵوێستی جیاجیا لەبارەیانەوە، ئەمڕۆ کورد لەبارودۆخێکدایە وێڕای ئەوەی هێشتا چەند پرسێکی چارەنووساز بەچارەسەرنەکراوی ماونەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا، بیروڕای جیاوازی لەبەرامبەریاندا هەیە، تا دێت ئەو بیروڕا جیاوازانە لە روانگە و گروپ و هێزی سیاسی جیاوازدا خۆیان دەنوێنن، نەک هەر ئەوە، بەڵکو خەریکە قسەکردن لەبارەی کاری پێکەوەیی و چوونە مەیدانی هەڵبژاردن لەکوردستان چەندین ئاراستەی جیاجیا و هەر یەکەی بەلایەکدای لێ دەکەوێتەوە، بە تایبەتیش بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و هەڵبژاردن لە کەرکووکدا، ئەوەی لێرەدا دەخرێتە ڕوو بەشداریەکی دیکەیە لەقسەکردن دەربارەی ئەو مەسەلەیە.

## ئاوڕێك بۆ رابردوو

زۆربەی ئەو نووسەر و رووناکبیرانەی قسەیان لەبارەی دۆزی کورد کردووە، بەتایبەتیش نووسەر و رووناکبیری کورد، لەسەر ئەوە کۆکن کە نەبوونی دەوڵەتی کوردی بۆ پەرتەوازەیی کورد و نەبوونی یەکگوتار و یەکهەڵوێستی دەگەڕێتەوە. هەندێ جار ئەو بۆچوونە بە جۆرێك لێکدراوەتەوە، ئەوەندی بەلای ئەو هۆکارەدا چووە ئەوەندە پەنجەی بۆ هۆکارە دەرەکیەکان رانەکێشاوە. هۆکاری پەرتەوازەیی و پەرش و بڵاویی کورد و شەقار شەقار بوونی نیشتمان بۆ ئەوە گێڕدراوەتەوە، کە کورد یەکگرتوو و یەکریزنین، لە قۆناغە جیاجیاکانی مێژوودا بەردەوام نەبوونی یەکڕیزی ئەو دەردەبووە کە لەلایەن حەکیمانی کوردەوە دەستنیشان کراوە. ئیدی هەر سەرکردە و رابەرێك هەوڵی یەکڕیزی و یەکگرتوویی کوردی دابێ و لەو روانگەیەوە خەباتی کردبێ، ئەوا لەیادگەی کوردیدا شوێنی هەبووە و هەرگیز نەسڕاوەتەوە و ناسڕێتەوە.

کاریگـەریی ئـەو دەردە لـەنێو ئـەدەبی کوردیشـدا ڕەنگـی داوەتـەوە و دنیایـەك بەرهـەمی ئەدەبیمان هەیە کە داوای یەکگرتنی کورد دەکەن.

مەسەلەی یەکڕیزی و یەکگرتووی کورد لە نێو کولتووری کوردیدا ڕەنگی داوەتـەوە، هـەر ئەوەشە لەو ڕۆژگارانەوە تا بەئەمرۆ دەگات، پشتکردن لە یەکڕیزی و تێکدانی یەکڕیزیی کورد بەتاوانێکی گەورە دانـدراوە، وەکـو خیانـەتێکی گـەورە سـەیر کـراوە، دیـارە هۆکارەکەشـی ئاشکرایە، ئەویش ئەوەیە کە وەك زۆر توێژەر باسی دەکەن کە دیلـی جوگرافیـا بـووە، ئیـدی دوژمنانی کورد هەمیشە بەو ئاراستەیەدا کاریان کردووە کە درز بخەنە ڕیزی ئەو میللەتـەوە، ئەو هاوکێشەیەی بەهێز و لاواز لەنێوان کورد و دوژمنانی کە نەتەوەی سەردەستن لەوەدا خۆی بینیوەتەوە کاتێ کورد لاوازبووە و درز کەوتۆتە ڕیزەکـانی، هاوکێشـەکە بـەلای دوژمنـان دا کەوتۆتەوە. بەم پێیە دوژمنانی کورد هەوڵیانداوە هەمیشە کـورد بـە پەرتـەوازەیی و پارچـە پارچەکراوی بهێڵنەوە، هەر بۆیە لە سەرهەڵدانی میرنشینەکانیشـدا سـوودیان لێوەرگرتـووە و لەسەر ئەو بنەمایە دەوڵەتی عوسمـانی مامەڵـەی لەگـەڵ میرنشـینەکان کـردووە، بادانـەوەی میرنشینەکانی کورد بەلای دەوڵـەتی عوسمـانی لەبـەر ئـەوە بـووە شـا ئیسـماعیل سـەفەوی بەشێوەیەکی توندوتیژ ڕەفتاری لەگەڵ کردوون، هەر ئەو هۆکارەش بوو پاڵی بەهێزی میرنشینە کوردیەکانەوە نا لەشەڕی چاڵدیراندا پاڵ بدەنە دەوڵەتی عوسمـانی، بـەم شـێوەیە کـورد چـەند لەیەکتری دوورەدەست بووبن و ناوچە جیاجیاکان ئاگایان لەیـەکتری نـەبووبێ، ئەوەنـدە کـاری کردۆتە سەر هەستی خۆکۆکردنەوە و پاراسـتنی یـەکڕیزی و سـەرەنجام دروسـتبوونی هەسـتی نەتەوەیی، هەربۆیە کەی لە میرنشینێکدا بۆنی سەربەخۆیی و فروانبوون کرابێ، ئـەوا مێـژوو پێمان دەڵێت ئەو میرنشینە بـە چ دەردێـك چـووە، دەوڵـەتی عوسمـانی وێـڕای پـەیڕەوکردنی سیسـتەمی ئیـدارە لـە ناوچـەکانی ئـەو دەوڵەتـەدا، لـە کوردسـتاندا دەسـتی بەئیـدارەی میرنشـینەکانەوە گرتـووە، لەمەشـدا سـوودێکی زۆری لێکـردووە و سـنووری ڕۆژهـەڵاتی دەوڵەتەکـەی لەبەرامبـەر دەوڵـەتی سـەفەوی پـارێزراوبوو، خـۆ ئەگـەر سـەیری نـاوەڕۆکی ڕێککەوتنی عوسمانی و میرنشینەکان بکەین، زۆرترین قازانج و کەڵك لەو ڕێککەوتنـەدا بـەر دەوڵەتی عوسمانی کەوتووە، ئەویش ئـەوەبووە ئەگـەر دەوڵـەتی عوسمـانی کەوتەشـەڕ دەبێـت میرنشینەکان هاوکار بن و بەشداری شەڕ بکەن، لەبەرامبەردا میرەکان داوای ئەوەیان کـردووە لە میرنشینەکانیاندا دەسەڵات بەشێوەی پشتاو پشت بێت و دەوڵـەتی عوسمـانی پارێزگاریـان بکات و لەدەسـتدرێژی بیانپارێزێـت، ئیـدی بـەم شـێوەیە لەبەرامبـەر دەسـکەوتی تایبـەتی

میرەکانی کورد، دەوڵەتی عوسمانی سنووری خۆی لە ڕۆژهەڵاتدا پاراست، کاتێك مانەوەی میرنشینەکان لەبەرژەوەندی دەوڵەتی عوسمانیدا شوێنی بەرچاویان نەما کۆتاییان پێهات، ئەگەر کۆتایی بە میرنشینەکان هێندرا و سیستەمی کارگێریی دەوڵەت لە کوردستانیشدا پیادەکرا، لێ لەگەڵ ئەوەشدا جۆرە لێك نزیکبوونەوەیەکی ناوچە جیاجیاکانی کوردستان هاتە کایە، بەمەش لەقۆناغی دواتر بەرە بەرە هەستی نەتەوەیی زیاتر پەرەی دەسەند، لەنیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و وردتر لە ساڵی ١٨٨٠ شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵڵای نەهری بەرپابوو کە مۆرکێکی نەتەوەیی هەبوو و داوای سەربەخۆیی کوردستانی دەکرد، شۆڕشەکەی نەهری خێرا بەشی ڕۆژهەڵات و باکووری کوردستانی تەنیەوە، هەر بۆیە ئێران و دەوڵەتی عوسمانی دژایەتی ئەو شۆڕشەیان کرد، لەو مێژووەوە داخوازی ڕابەرانی شۆڕش داخوازی میللەتێك بووە نەك داوای تایبەتی، هەر بۆیە هەوڵی لەناوبردنیان دەدرا و لەسەر پرسی گەورەی نەتەوەی کورد ڕاپێچی زیندان دەکران و لەسێدارە دەدران، وەك چۆن شێخ عەبدولسەلامی بارزانی کە داوای دەکرد زمانی ڕەسمی لەناوچە کوردیەکاندا کوردی بێ و فەرمانبەر و کاربەدەست کوردبن و ئەو باجەی حکوومەت وەری دەگرێ لەئاوەدانکردنەوەی کوردستان سەرف بکرێ، بۆیە بەپیلانێك دەستگیرکراو لەساڵی ١٩١٤ لەموسڵ لەسێدارەدرا. لێرەدا پرسیارێك سەر هەڵدەدات ئەویش ئەوەیە ئایا ئەو ویستەی دوژمن بەدرێژایی مێژوو، لەبەغدای ئێستاشدا بەدی ناکرێ؟ ئایا بەغدای ئەمڕۆ حەز ناکات کورد پارچە پارچە بێت و یەکهەڵوێست نەبێت؟ بۆیە بۆمان دەردەکەوێت هێشتا ئەو ویستە ترسناکە بوونی هەیە و هەر وەختێك دەرفەت هەڵکەوێ پشتی تێناکەن و بەهۆی پەرتەوازەیی گورزی خۆیان دەوەشێنن.هەروەها پرسیارێکی دیکە خۆی قوت دەکاتەوە، ئایا ئێستا یەکگوتاری باوی نەماوە؟ ئەگەر جاران دەردی هەرە گەورەمان بووبێت، ئێستا وەك دەردێك نابیندرێت؟

## فرە لیستی زادەی فرەهەڵوێست

ئەمڕۆ لە کوردستاندا باس و خواسی هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و هەڵبژاردنی پارێزگای کەرکوك، لەریزی پێشەوەی بابەتەکاندایە، تەواوی گروپ و هێز و ئاراستە سیاسیەکان بەسەر دوو بۆچووندا دابەشبوون، یەکیان پێی وایە بەشداری لەو هەڵبژاردنانە بەیەك لیست بێ و ئەوی

دیکەیان پێی وایە بەفرە لیستی بێت، ئیدی هەر لایە و پاساو بۆ بۆچوونی خۆی دەهێنێتەوە، گرنگ ئەوەیە ئەو هەڵبژاردنە لە پێشەو پێویستە کورد خۆی بۆ ئامادە بکات، نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێت کە قۆناغی داهاتوو قۆناغێکی گرنگ و چارەنووسسازە، ئەگەر فرەلیستی ئاسایی بێت بەو پێیەی یەکهەڵوێستی لێ دەکەوێتەوە، ئەوا دەبێت زەمانەتێك هەبێت، چونکە لە راستیدا فرە لیستی لە فرە هەڵوێستیەوە سەرچاوەی گرتووە، ئەگەر بۆچوون و تێڕوانین وهەڵوێستی جیاواز نەبێت فرە لیستی پەیدانابێت. هیوادارم خوێنەر بەهەڵە لێم تێنەگات کەدوژمنی سەرسەختی فرەلیستم، چونکە مەبەستی ئێمە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و کەرکووکە، هەقە ئەو مەترسیە هەمووومان وەئاگابێنێ، چونکە پەیوەندی بەپەرش و بڵاوبوونەوەی دەنگی کوردەوە هەیە لەپەنای فرەلیستیدا، ڕاستە لەکوردستان زۆر ئاساییەو ئەوەتا لەپەرلەماندا لیستی جیاواز هەیەو مەسەلەیەکی ئاساییە. ئەگەر لاپەڕەکانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان هەڵدەینەوە، ئەوەمان بۆ ڕووندەبێتەوە کەلەهەر وێستگەیەکدا، هەڵوێستی جیا لەبەرامبەر پرسە چارەنووسسازەکان و پەرتبوونی بڕیارهەبووبێت، ئەوا بەغدا بەهێزو کورد لاوازبووە، هەمیشە بەغدا لەلاوازیدا بەردەوام ڕێگەی کوردستانی کوتاوەتەوەو داوای گفتوگۆو چارەسەری پرسی کوردی کردووە، بۆنموونە لەسەردەمی شۆڕشی مەزنی ئەیلوولدا گفتوگۆکارانی بەغدا لەئاستی بەرزەوە دەهاتنە کوردستان، تەنانەت سەرۆك کۆماری ئەوسای ئێراق عەبدولڕەحمان عارف خۆی هاتۆتە لای بارزانیی نەمر، بەدرێژایی ئەو شۆڕشە کەتەواوی چین و توێژەکانی کوردستانی لەدەور کۆببووەوە، بەغدا هەموو هەوڵی خۆی خستبووەگەڕ بەڵام لەمەیداندا سەرەڕای هێزی زۆر هیچی پێنەدەکرا، چونکە میللەتی کورد هەمووی یەك هەڵوێستبوو، لەڕووی سیاسیەوە کورد ناوەندێکی بڕیاری هەبوو، کە هەم بۆ ناوخۆی کوردستان و هەم لەبەرامبەر بەغدا کاریگەریی هەبوو، بەغدا کەلەبەرامبەر شۆڕشی کوردستاندا هیچی بۆنەکرا بەهۆی ڕێککەوتنی جەزائیر لەساڵی ١٩٧٥ نسکۆی شۆڕش ڕوویداو. تەنازولێکی زۆری لەو ڕێککەوتنەدا کرد تەنیا بۆئەوەی کۆتایی بەشۆڕش بێت. لەقۆناغی دوای ١٩٧٥دا، حاڵەتێکی نوێ لەنێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان هاتەپێشەوە، ئەمجارە شۆڕشی کوردستان چەندین ناوەندی بڕیاری هەبوو، بۆیە بەغدا هەرجارەو وەفدی دەنارده دۆڵێك و بەتەنیا داوای گفتوگۆی لەلایەنە سیاسیەکان دەکرد، ئەمەش وایکرد کورد فرە هەڵوێست بێت بەمەش لەبەرامبەر بەغدا لاوازبوو. کەسەرنج لەبارەی فرە لیستی دەدرێ، هەندێ کەس وای لێکدەدەنەوە کە ڕووبەری

دیموکراسی تەسك دەکرێتەوە، ئینجا ئەو لێکدانەوەیە بەوەندەش ڕاناوەستێ و پێیوایە دیموکراسی لای ئێمە زۆر لەکورتیداوەو بەغدا زۆر دیموکراسیە، کەچی ئەوەی ڕاستیبێت قەناعەتی دیموکراسی لەبەغدا زۆر ئەستەمە بەخێرایی دروستبووبێت، ئەوەی لەبەغدا دەبیندرێ ململانێی هێزە سیاسیەکانە لەسەرئەوەی کامەیان ئامادەیە قسەیەکی هەق وەك پشتیوانی دەربارەی پرسی کورد بکات، ڕاستەوخۆ لایەنەکانی دیکە لێی دەکەنە تەقە، هێشتا ئەو قەناعەتە دروست نەبووە، کەبەغدا لەڕوانگەی بڕوابوون بەپرەنسیپە دیموکراسیەکان و بەسوود وەرگرتن لەئەزموونی تاڵی سالانی ڕابردوو، لەچوارچێوەی دەستووری هەمیشەیی ئێراقی نوێدا دان بەو مافانەدا بنێت کەلەدەستووردا هاتوون، لەسایەی ئەو کەشوهەوایەی کە هەندێ کەس پێیوایە ژینگەی بەغدا ژینگەیەکی تەندروستەو لەو ژینگەیەدا بێ ئەوەی خەبات بکرێ و بێ ئەوەی هیچ کاریگەرییەکی دەرەکی کاری لێبکات، ئەو ژینگە ڕێگرنابێت لەدەستەبەرکردنی تەواوی مافە ڕەواکانی کورد، لەو حاڵەتەدا ئەگەر پێمان وابێ عەیب لەبەغدا نییە هەموو عەیبەکە لەخۆمانە، ئەوا فێڵ لەخۆمان دەکەین، ئایا شنەبای دیموکراسی وای لەبەغدا کردووە لەکوردستاندا بەدوای دەلاقەیەکدا نەگەڕێ، کەتیایدا بێتە ژوورەوەو فرسەت بێنێ و لەپەنای فرەلیستی و فرە هەڵوێستیدا گورزی خۆی بوەشێنێ، هەست دەکرێت لەوبوارەوە لێڵییەك هەیەو ئەوانەی پێیانوایە پەرشوبڵاوی دەنگی کورد هیچ مەترسیەکی نییە، هەقە تێمان بگەیەنن کەمافی کورد لەژینگەی بەغدا پارێزراوەو ئەگەر فشاریشی لەسەرنەبێت، بەغدا ئامادەییەکی بەقەناعەتەوەی تێدا دروستبووە، کەمافی کوردستان بەمافێکی ڕەوا بزانێ و ئیدی ئەو مافە لەسەر زەویدا بەپراکتیکی بە رەوا بزانێ نەك تەنیا قسەی سەرکاغەز بێت و بۆمەبەستی تایبەتی و مانۆڕی سیاسی و هەڵبژاردن بەکاری بهێنێ. هۆی هەرەسەرەکی کەحکوومەتی بەغدای هێنایە ئەوباوەڕە سەرژمێری دانیشتوان دوابخات پرسی کوردە، ئاشکرایە دەمێکە دەنگێك لەبەغدا بەرزبۆتەوە داوای گۆڕینی دەستوور دەکات، ئەم گۆڕینەش بۆئەوەیە لەڕێی گۆڕینی دەستووردا گورزێکی گەورە لەکورد بدرێ و ئەوەی لەو دەستوورە بەکورد ڕەوابیندراوە ئەوەشی لێ بسەنێتەوە، جا کەئەمەی بۆ چووەسەر ئیدی سەرژمێری دەکەن و ئەوکاتە کەئەوەی مەبەستیانە لەدەستووردا هێنایانەدی ئیدی ئەگەر ژمارەی کورد زیاتریش دەرچێت بەهۆی ئەو کۆت و بەندانەی گەڕەکیانە لەجوڵەمان دەخەن، لەسۆنگەی ئەمەوە بەغدا بەفرەلیستی کورد بۆهەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و پارێزگای کەرکوك خۆشحاڵە، کەواتە مەیلێکی بەهێز لەژینگەی بەغدادا هەیە، کەدەستوورێکی نوێ دابڕێژرێ

کورد تیایدا مایەپووچ دەردەچن، لەوحاڵەتەشدا ئەو دەستووره بەباشترین دەستوور دەزانن، با لەدەستووریشدا ئاماژەی پێکرابێت کەکورد نەتەوەیەکی سەرەکی ئێراقە، بەلأم لەڕاستیدا ژینگەی بەغدا بەوچاوە سەیری کورد ناکات، کەواتە تا هێزی کورد لەبەغدا بچووك بێتەوە بەغدا بەپێی ئەو قەبارەیە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، نەك بەوپێیەی کورد نەتەوەیەکی سەرەکییەو مافی لەچوارچێوەی دەوڵەتی ئێراقدا هەیەو هەقە ئەو مافەی پارێزراوبێت، کەواتە بەغدا هەوڵدەدات فرە هەڵوێستی و پاشان فرەلیستی لەکوردستان هەبێت، بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و ئەنجوومەنی پارێزگای کەرکووك، چونکە لەو ڕوانگەیەوە کوردستان بەلاواز دەبینێ و لەسەر ئەو بنەمایە مامەڵەی لەگەڵدا دەکات، دەی لێرەوە دەپرسین ئەی ئەگەر یەکهەڵوێستی و یەك لیستی لەبەرامبەر ئەو ژینگە ئاڵۆزو تەمومژاوی و ناپاکیەی بەغدا عەیبە بێت، جێگرەوەی ئەو یەکهەڵوێستیە چییەو تاچەند لەئاسۆمان نزیك دەکاتەوە؟

## ئەزموونی یەك هەڵوێستی و یەك لیستی...
## پارتی و یەکێتی بەنموونە

ماوەیەکە وەك مۆدیلێك، کار بۆ ئەوە دەکرێت هێرش بکرێتەسەر شێوەی کاری پێکەوەیی یەك هەڵوێستی و یەك لیستی، وەك ئەوەی کورد هەمیشە یەك هەڵوێست و یەکگرتوو بووبێت و بەدرێژایی مێژوو بەهۆی ئەو یەکهەڵوێستی و یەکگرتووییەیەوە زیانی گەورەی بەرکەوتبێت. هەر ئەو ئاراستەیەی ئەو مۆدیلەی داهێناوە، تاچوار پێنج ساڵ لەمەوبەر، نەبوونی یەك گوتارو پارچە پارچەبوونی هەڵوێستی کوردی وەك دەردێك دەستنیشان دەکرد. ئەو ئاراستەیەی یەکدەنگی و یەك هەڵوێستی کورد لەڕۆژگاری ئەمڕۆدا بەعەیبەو بیدعە دەزانێت، بەوپێیەی دژایەتی پارتی و یەکێتی بەئەرك زانیوەو، یەك هەڵوێستی و یەکدەنگی و کاری پێکەوەیی ئەو دوو هێزە(پارتی و یەکێتی)ی بەچاوێکی کەم سەیرکردووە، ئەمجۆرە تێڕوانینە هەوڵێکە بۆ پەردەپۆشکردنی ڕاستی و سەرەنجام بەهەڵەبردنی نەوەی نوێ، کەبەلاڕێدا بچێت و لێی بشێوێ و ڕێگەی خۆی نەدۆزێتەوە، چونکە ڕەخنەگرتن لەپارتی و یەکێتی مەسەلەیەکی زۆرئاساییەو دەستنیشانکردنی کەموکوڕی و هەڵەی ئەو دووهێزە گەورەیە ئەوە ناگەیەنێت کەکاری

پێکەوەی هەردوو لا بـەکارێکی بچـووك و هـیچ لـەباردا نـەبوو سـەیربکرێت، نـاکرێ کاریگەریی گەورەی پارتی و یەکێتی لەسەر ڕووداو و کاروانی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا نادیدە بگیرێ و بەڕوودانێکی بچووك لەناوچەکەدا بخوێندرێتەوە، ئـەم دوو هێزە پارتی(لەساڵی ١٩٤٦)ـەوەو یەکێتیش(لە ١٩٧٥)ـەوە، هەریەکەو بـەجۆرێك و بـەپێی سـەردەمە جیاوازەکـانی بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کوردسـتان، کاریگـەرییان هەبووەو هەیەو قورسایی هەردوو هێز بەسەر ڕەوتی ژیانی سیاسی کوردستاندا دیـارە. دیارە پەیوەندی نێوان ئەو دووهێزە بۆ دوای دامەزراندنی یەکێتی١٩٧٥ دەگەڕێتـەوە، قۆناغی دوای ١٩٧٥ قۆناغی فرە حزبی و فرە هەڵوێستە لەبەرامبەر ڕووداوەکاندا، جا بۆ ئەوەی کـاری پێکـەوەیی پـارتی و یـەکێتی بەکـەم نەخوێندرێتـەوە، پێویسـتە لـە ١٩٧٥ەوە تا ئـەمڕۆ هەڵسـەنگاندنێکی ورد بـۆ پەیوەنـدی ئـەو دوو هێـزە و ڕەوتـی ڕووداوەکـانی کوردسـتان بکـەین، چـونکە بـە داخـەوە بـۆ پڕۆپاگەنـدەو بانگەشـەی هەڵبژاردن، هەوڵ دەدرێت بۆ کەمکردنەوەی کاریگەری کاری پێکەوەیی ئەو دوو هێزە، بۆیە پێویستە بزانین ئاخۆ لە ماوەی زیاتر لە ٣٠ ساڵی ڕابـردوودا، کاریگـەریی یـەك هەڵوێستی و یەك دەنگی هەردووکیان چەند گرنگ بووە؟ بێگومان لەو ماوەیەدا پارتی و یەکێتی چەند لێك دوور بووبن و کاریان پێکەوە نەکردبێ، ئەوەندە کاریگەریی کردۆتە سەر کاروانی جولانەوەی کوردایەتی و خەڵکی کوردستان دڵ تـەنگ بـوون و هـەردوولا کەوتوونەتە بەر ڕەخنەی خەڵك و هێزە سیاسییەکانی دی، لەلایەکی دیکەشەوە، بەغدا کەوتۆتە خۆ و بەردەوام پێی خۆش بووە ماوەی نێوان پارتی و یەکێتی زۆر لێك دووربێ و بۆ ئەمەش ڕۆڵی خـۆی لـە ڕێـی بلاوکردنـەوەی پڕۆپاگەنـدە لـە نێـو خـەڵك و بـێ ئومێدکردنی جەماوەردا داوە، بەلام لەلایەکی دیکەوە هەرچەند پارتی و یەکێتی یـەك دەنگ بووبن و پێکەوە کاریان کردبێ، باسکی جوولانەوەی کوردایەتی ئەستوورتر بووەو خەڵکی کوردستان بە ئومێدتربوونەو بەغداش بێ ئومێـد. دەکـرێ ئامـاژە بـە چـەند قۆناغێکی یەك هەڵوێستی ئەو دوو هێزە بکەین، کە لـە هەریـەکێك لـەو قۆناغانـەدا شوێن پەنجەی بەسەر ڕەوتی ڕووداوەکاندا بەجێهێشتووە. لە نیوەی دووەمی هەشتاکانی سەدەی ڕابردوو تا دەهات شەڕی نێوان ئێراق و ئێران دادەمرکاو تا لە ١٩٨٨ کۆتـایی پێهات، بەمەش لەو قۆناغە جینۆسایدکردنی کورد لەلایەن ڕژێمی بەعسـەوە گەیشـتە لوتکە، هەر لەو قۆناغەدا جارێکی دی پارتی و یەکێتی لێك نزیك بوونەوەو بەری ئـەو

هەوڵەش لە دایکبوونی بەرەی کوردستانی بوو، جێبەجێکردنی هەنگاو بە هەنگاوی بەرنامەی بەرەی کوردستان کە لەلایەن سەرکردایەتی هەردوولا داڕێژرابوو و بەو هۆیەشەوە بەهۆی ڕۆڵی دیاری لەو نێوەدا ئیدریس بارزانی هەمیشە لەیاد بە ئەندازیاری ئاشتی ناوزەدکرا، وێڕای ئەوەی بەغدا شەڕی ئێرانی لە کۆڵ ببۆوەو هەموو هێزەکانی بۆ شەڕی کوردستان تەرخانکردبوو و برینێکی قووڵی خستبووە جەستەی کوردستان لە ڕێی بێ سەروشوێنکردنی بارزانییەکان لە ١٩٨٣ و بۆردومانکردنی چەند شوێنێکی خۆشناوەتی لە ١٩٨٧ و هەڵەبجە لە ١٩٨٨ بە چەکی کیمیاوی و ئۆپەراسیۆنەکانی ئەنفالی بەدناو، لەگەڵ ئەوەشدا بەرەی کوردستانی وەك میکانیزمێکی پێویستی ئەو سەردەمە، بووە چەترێك بۆ کۆکردنەوەی هێزو لایەنە سیاسییەکان. بەرەی کوردستانی دەسکەوتێکی گرنگی کاری پێکەوەیی پارتی و یەکێتی بوو، ئەو بەرەیە لە ڕۆژگارێکی ناخۆش و وەك بەرەنگاربوونەوەکانی ئەوێ ڕۆژێی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بوو، ئیدی کە ڕاپەڕین وەك خاڵی وەرچەرخان هاتە پێشەوە هێزە سیاسییەکان بەیەك دەنگ لەو ڕووداوە گرنگەدا بەشداربوون و یەك سەرکردایەتی لە پەنای کاری پێکەوەیی پارتی و یەکێتیدا بۆ سەرپەرشتیکردنی ڕاپەڕین داندرا. هێشتا ڕاپەڕین بڵێسەی دەسەند سەرۆك بارزانی لە ڕۆژانی سەرەتای ڕاپەڕین ١٩٩١ لە کۆیە لەبەردەم ئاپۆڕای جەماوەردا داوایکرد هەڵبژاردن بکرێ و دامودەزگای شەرعی دابمەزرێ و حکوومەت بۆ بەڕێوەبردنی وڵات پێکبهێندرێ، ئەو داوایەی سەرۆك بارزانی وەك بیرۆکەیەك بووە بەرنامەی بەرەی کوردستانی، زۆری نەبرد بەرەی کوردستانی بڕیارێکی گرنگیداو ڕۆژی ١٩ / ٥ / ١٩٩٢ بۆ یەکەمجار لە مێژووی کوردستاندا هەڵبژاردنێکی ئازادکرا، بەمەش ڕۆڵی بەرەی کوردستانی کۆتایی هات و قۆناغێکی نوێ لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری دەستی پێکرد، لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ئەویش ئەوەیە، ئەگەر پارتی و یەکێتی یەك هەڵوێست نەبووبان و لە ڕاپەڕین بەرەی کوردستانی لە دایك نەبووبایە ئایا راپەڕین و خێرا هەنگاونان بەرەو هەڵبژاردن و دامەزراندنی حکوومەت هێندە کارێکی ئاسان دەبوو؟ دوای ٢٠٠٣ قۆناغێکی نوێ دەستی پێکرد، وێڕای ئەو رەخنەیەی لە پارتی و یەکێتی دەگیرێ لە دوای ئەو قۆناغەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کاری پێکەوەیی و یەك هەڵوێستی پارتی و یەکێتی رۆڵی بەرچاوی هەیە، چونکە ئەمجارەش لەگەڵ ڕوودانی ئەو ڕووداوە گەورەیەی رووخاندنی رژێمی سەدام، پارتی و یەکێتی

هەنگاوی گەورەیان لە یەکخستنەوەی ماڵی کوردی هاویشتبوو، ئەم یەکخستنەوەیەی ماڵی کوردی داوای خەڵکی کوردستان و خودی پارتی و یەکێتی و هێزە سیاسییەکانی دیکە بوو، لەسەر درەنگ یەکخستنەوەی ماڵی کوردی رەخنەی زۆر لە پارتی و یەکێتی گیرا کە بەردەوامە، بەڵام ئێستا رەخنە لە کاری پێکەوەیی ئەو دوو هێزە دەگیرێ. ڕۆڵی ئەو دوو لایەنە سیاسییە گەورەیە لە ٢٠٠٥-٢٠٠٩ لە رێی هەڵبژاردنەوە دامەزراندنی کابینەی پێنجەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بوو بە سەرۆکایەتی بەڕێز نێچیرڤان بارزانی، کە بە سەرکەوتوویی بونیادی قۆناغێکی نوێی دانا و رێگەی بۆ کابینەی شەشەمی حکوومەتی هەرێم دروستکرد، کە رێگە خۆشکردن بوو بۆ هەڵبژاردنی ٢٥ / ٧ / ٢٠٠٩ و بەبەشداری ٢٤ لیست و ٥ کاندیدی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان. ئەگەر یەك هەڵوێستی و ئەزموونی کاری پێکەوەیی پارتی و یەکێتی و ڕۆڵی کابینەی پێنجەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان نەبوایە، بە قوڵکردنەوەی چەمکی پێکەوەژیان و پێکەوە کارکردن و برەودان بە دیموکراسی و فراوانکردنی پانتایی ئازادی، هەرگیز بەو ئاسانییە زەمینەی هەڵبژاردنێکی گرنگ نەدەرەخسا، لەبیرمان نەچێ د. ئیبراهیم جەعفەری وەك سەرۆك وەزیرانی ئێراقی فیدراڵ بۆ دروستکردنی دەلاقەی تایبەتی ژینگەی بەغدا و بۆ پیشاندانی شێوەی کاری سیاسی کوردستان کە فرە بڕیارو هەڵوێستە لە دوو دەروازەوە دەهاتە کوردستان و پیرمام و دوکانی بەسەر دەکردەوە و خوازیاربوو بەجیا لە هەردوو دەرگا بدات. بەڵام گرنگی یەك هەڵوێستی و کاری پێکەوەیی پارتی و یەکێتی کوردستانی بەرەو یەك ناوەندی بڕیاردان بردو سەرۆك بارزانی لەیەکەم سەرۆکایەتی کوردستان دا توانی بە حەکیمی و ئەزموونی دوورودرێژی خۆیەوە کوردستان بباتە قۆناغێکی دیکە و لە ناوچەکە و جیهاندا بەشێوەیەکی دی مامەڵە لەگەڵ کوردستان کرا. بینا لەسەر ئەزموونی کاری پێکەوەیی پارتی و یەکێتی، قۆناغی داهاتووی کوردستان درێژەپێدانی ئەو ئەزموونەی کاری پێکەوەیی و یەك هەڵوێستی دەخوازێ، هەقە بەپێی قۆناغی رابردوو و ئێستا، بەشێوەیەکی واقیعی سەیری ڕووداوەکان بکەین و وەك خۆیان بیانخوێنینەوە و راڤەیان بکەین، کە بەو شێوەیە ڕووداوەکانمان هەڵسەنگاند دەزانین کاری پێکەوەیی و ئەزموونی یەك لیستی و یەك هەڵوێستی بۆ قۆناغی داهاتوو لە ئێراقی نوێدا چەند گرنگە.

## دوای هەڵبژاردنی کوردستان

ئەگەر سەیری مێژووی سیاسی کوردستان بکەین، دەبینین زۆر جار یەك هەڵوێستی و یەکدەنگی لەبەرامبەر مەسەلە چارەنووسسازەکاندا تووشی قەیران بووە، لێ دەکرێ لەدوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ هەست بە قەیرانێکی دیکەی یەك هەڵوێستی و کاری پێکەوەیی بکەین، دەشێ لەم وێستگەیەدا قەیرانەکە بەشێوەیەکی بەرچاو و زەقتر بێت، کە زادەی دەرهاویشتەکانی هەڵبژاردنە، دیارە هۆکاری سەرەکیی ئەو قەیرانە بۆ جیاوازی رەوت و گرووپە سیاسییەکانی گۆڕەپانی کوردستان دەگەڕێتەوە، بەڵام سەرەکیترین هۆکار بۆ جیابوونەوەی باڵ و لێکترازانی حزبەکان دەگەڕێتەوە، لێرەوە ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە هەمیشە ئەو لێکترازان و جیابوونەوەی باڵ و گرووپە لە حزب دۆخێکی گرژیی لێکەوتۆتەوە، لەم هەڵبژاردنەشدا ئەوە ڕوویدا، بۆیە ئەنجامی هەڵبژاردن کەشێکی وای هێناکایە کە جارێکی دی مەسەلەی یەك هەڵوێستی و کاری پێکەوەیی لە بەرامبەر پرسە چارەنووسسازەکاندا کۆسپی بێتە رێگا، ئەوەی زیاتریش ئەو مەسەلەیەی کردە بابەتی هەرە لە پێشی رۆژ ئەو ماوە کەمەیە تا رۆژی هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە ٢٠١٠، چونکە چۆن بانگەشەی هەڵبژاردن هەندێك جار بەلای سوکایەتی کردندا دەچوو، هەمان ئەو گرژیە لەو ماوەیەی پێش هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق ئامادەیی هەیە، ئەمەش وای لەو ڕەوتە کردووە زیاتر لەسەر هەڵوێستی بەجیاچوونە نێو پرۆسەی هەڵبژاردن بەردەوام بێ و هەندێك جار لەو لێدوان و دیدارانەی رۆژنامەوانیدا ئەو گرژییە بەردەوامیی پێ دەدرێت و ئەو رستەیە دووبارە دەکرێتەوە و دەگوترێت: (هەوڵدەدەین دەنگ بەستاقی ئێستای کورد لە بەغدا نەدەین)، ئەم جۆرە لێدوانانە لەزاری ئەوانە دەبیسترێ کە وەك ئۆپۆزیسیۆن دەبیندرێن، لێ وەك ئاماژەمان پێدا هەمیشە لێکترازان گرژی لێکەوتۆتەوەو ئەو رەوتە تازەیەش کە لەبنەڕەتدا لە حزب جیابوونەتەوە، هەرچەندە حەز ناکەن پێیان بگوترێ لە حزب جیابوونەتەوە، بەگوێرەی لێدوانە رۆژنامەوانیەکان و ئاراستەی کارکردنیان، وەك تۆڵەستێن و گەڕان بۆ هەلێك بۆ تۆڵەکردنەوە دەبیندرێن، دیارە مەیدانی ئەو تۆڵەکردنەوەیەش بەغداو کەرکووکە. لەڕێی خوێندنەوەی روانگەی جیاواز بۆ هەڵبژاردنی کوردستان، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە بەشێك لەو خوێندنەوانە، بەجۆرێك سەیری ئەنجامی هەڵبژاردن دەکەن کە هاوکاربێت بۆ دروست کردنی دۆخێك فرە هەڵوێستی و فرەلیستی بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق لێبکەوێتەوە، خوێندنەوەی ناوخۆیی بەدوو جۆرە،

لەنێوان ناشرین کردنی پرۆسەی هەڵبژاردن و بەسەرکەوتن زانـینی ئـەو پرۆسـەیە، هەرچـەندە دواتر هەمووان ئیرادەی میللەتیان قبووڵ کرد، لـێ لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو کەشـە دیموکراسـیە وایکرد لەدەرەوەی کوردستانیش بەجۆرێکی دی سەیری هەڵبژاردن بکرێت، لەئاستی ئەوروپا و ئەمەریکادا هەڵبژاردن پرۆسەیەکی سەرکەوتوو بوو و پیرۆزباییان کرد، لـە بەغـداو ئیقلیمـدا بەجۆرێکی دی، هەندێ رەوتی دەستڕۆیشتووی ناو دەسەڵات لە بەغـدا، بـەو شـێوەیە سـەیری ئۆپۆزیسیۆن لە کوردستان دەکەن کە گۆڕەپانی مانۆڕو گەمەی سیاسـییان بـۆ خـۆش بکـات، تەنانەت هەندێ لایەنی غەیرە کـورد هـەر بـەو مەبەسـتە دوای هەڵبـژاردن خۆشـحاڵیان بـۆ دەرکەوتنی ئۆپۆزیسیۆن دەربڕی، کە دەبوو ئۆپۆزیسیۆنی کوردستان رێگەی ئەوەی نەدابا، ئەو رەوتە دەستڕۆیشتووەی بەغدا گرەوی لەسەر ئۆپۆزیسیۆنی کوردستان دەکردو ئێستاش خوازیارە ئۆپۆزیسیۆن وەك کۆسپێك لە کوردستاندا ببێتە هۆکاری خولقانـدنی کەشـێك بەغـدا تیایـدا سوودمەند بێت، هێشتا هەڵبژاردن نەکرابوو چەندین ناوەندی سیاسی و رۆژنامەوانی لە بەغـدا رایانگەیاند کە چاویان بڕیوەتە ئەنجامی هەڵبژاردن و دەیانگوت ئەگەر ئۆپۆزیسیۆن پەیدا ببێت بەغدا دەتوانێ باشتر قسە لەسەر پەیوەندی خۆی و هەرێمی کوردستان بکات، ئاشـکرایە ئـەو خواستەی ناوەندە رۆژنامەوانیەکانی شۆڤێنیزمی عـەرەبی بۆچییەو چـی لـە پشـتە، وای بـۆ چووبوون کە ئـەمجارە لەگـەڵ رەوت و گروپێکـی دیکـە درێـژە بـەگفتوگۆ دەدەن و لەلایـەکی دیکەشەوە ئەو یەك دەنگی و یەك هەڵوێستیەی پارتی و یەکێتی لەبەریەك دەبەن و دۆخێکـی هاوکار بۆ مەرامی ئەوان دێتەکایەوە. لەنێوان هەموو ئەو روانگە جیاوازانەی خوێندنەوەیان بۆ هەڵبژاردنی کوردستان هەیـە و راشـکاوانە ڕای خۆیـان دەربڕیـووە، ئـەوروپا و ئەمەریکایـە، ئاشکرایە هەڵوێستی ئەوروپایی و ئەمەریکاییەکان بەلای خوێندنەوەی بەغداو ئیقلـیم قبـووڵ نییە، ئەوەی جێی سەرنجە ئۆپۆزیسیۆنی خۆشـمـان حـەزدەکات ئـەوروپایی و ئەمەریکاییـەکان خوێندنەوەی خراپیان بۆ هەڵبـژاردنی کوردسـتان هـەبێت، لەکاتێکـدا هەڵوێسـتی ئـەوروپا و ئەمەریکا گرنگە کە پێی وابێت کوردستان هەنگاوێکی دیکەی هەڵێناوە، کەچی ئۆپۆزیسیۆن بەدوای هەندێ راوبۆچوونی دیکەدا دەچن کـە هەڵوێسـتی جیاوازیـان هەیـە و لـە کوردسـتان ڕەواجیان بۆ پەیدا دەکەن. هەقە ئۆپۆزیسیۆنی کوردستان رێگـە بـەو ناوەنـدە رۆژنامـەوانی و سیاسـییانەی شـۆڤێنیزمی عـەرەبی نـەدات کـە هەوڵـدەدەن ئۆپۆزیسـیۆن بـەکوڕی چـاك و دەسـەڵاتیش بـە خـراپ نیشـان بـدەن و ئـەو ناوەندانـە پەیـدابوونی ئۆپۆزیسـیۆن وەك سەرهەڵدانی درز و کەلێنێك لەنێو ریزەکانی خەڵکی کوردستان سەیر بکات، چونکە دژایـەتی

کردنی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و حکوومەتی هەرێمی کوردستانیان نەشاردۆتەوە، بەردەوام لەهەوڵی ئەوەدان پارتی و یەکێتی لە لوتکەی دەسەڵاتی کوردستان نەمێنن، بۆیە دەرکەوتنی ئۆپۆزسیۆنیان بەگرنگ لە قەڵەمدا و رایانگەیاند ئۆپۆزسیۆن رێگەچارەی گرفتەکانی نێوان بەغداو هەولێر دەستنیشان دەکات، ئەمە لەکاتێکدایە کوردستان پێویستی بە ئۆپۆزسیۆنێکە خۆی لەپارتی و یەکێتی بە نەتەوەییتر بزانێ، نەك بەغدا بەسەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن زەردەخەنەی بێتێ و پێی وابێ گورزی سەرەواندۆتە دۆزی نەتەوەو هەستی نەتەوایەتیی لاوازکردووە. بۆیە ئاماژەکانی ئەم قۆناغە پێمان دەڵێن دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ جارێکی دیکە یەك هەلوێستی تووشی قەیران بۆوە، خەڵکی کوردستان بەپێی ئەزموونی ساڵانی پێشووی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، حەزناکەن جیابوونەوەی گروپ و دەستەو باڵ خۆیان بخزێننە دالانێك سەرئێشەی بەدواوەبێت و بەهۆیەوە خەڵك بەبێ ئومێدی بڕواننە دوارۆژ و داشی دامەی ناسیونالیزمی عەرەبی سواربێت. بۆیە هەر کەسێك لەسایەی دۆخی دیموکراسی و دوای هەڵبژاردن هەوڵی ئەوە بدات بەچاوی تۆڵە بەرپێن بداتە ستافی ئێستای کورد لە بەغدا، نابێ چاوەڕێی ئەوە بکات خەڵکی کوردستان دەستخۆشیی لێ بکات، دەبێ هەموو لایەك ئەوە بزانێت ناسیونالیزمی عەرەبی تا ئەو ئاستە لەگەڵ دیموکراسی دایە، کە پشت دەکرێتە داوای کورد، کاتێ دەنگی کورد بەرزدەبێتەوەو داوای ئەو مافە دەکاتت کە چەندین ساڵە خوێنی لەپێناودا بەخشیووە، ناسیونالیزمی عەرەبی ئامادەیی هەیە، جێبەجێ کردنی ماددەی ١٤٠ی دەستووری ئێراق بە هەڕەشە بۆ خۆیان دەزانن، بەکورتی لەبارەی کوردەوە کۆدەنگییەکیان لەنێواندا هەیە، لێرەوەیە یەك هەلوێستی وەك پێویستییەك خۆی دەسەپێنێ کە لەیەك لیستیدا بۆ هەڵبژاردنی ئێراق و هەڵبژاردنی پارێزگاکان »کەرکوك« خۆی دەبینێتەوە.

## یەك لیستی...

## هۆكارێك بۆ بەهێزكردنی یەكڕیزی

دوای هەڵبژاردنی كوردستان لە ٢٠٠٩/٧/٢٥، بابەتی یەك لیستی و فرە لیستی بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و هەڵبژاردنی پارێزگاكان لە كەركووك، بۆتە مانشێتی سەرەكی و بابەتی گەرمی رۆژنامە و گۆڤارەكانی كوردستان، لێرەوە دوو بۆچوون هەن، یەكێكیان لە روانگەی هەستكردن بە لێپرسراویەتی بەرامبەر پرسی نەتەوەیی پێی وایە كورد بەیەك لیست دابەزێت، ئەویدی پێی وایە ئەمە تەنیا قازانجی دەسەڵاتی تێدایەو پارتی و یەكێتی پێ ناشرین و تاوانبار دەكەن، بۆ ئەمەش فرە لیستی بە چاك دەزانن، ئەو رەوتە هێزی خۆی لەوەدا دەبینێتەوە كە قەناعەت بە خەڵك بكات یەك لیستی قازانجی حزبەكان بەتایبەتی پارتی و یەكێتی تێدایە، بێ ئاگا لەوەی خەڵك تەنیا سەیری پارتی و یەكێتی ناكات و ئەوانیش دەبینێت و ئەو پرسیارەیان لا دروست دەبێت، ئایا ئەو لایەنەی هەوڵی فرە لیستی دەدات بۆچی بە قازانجی گروپێك لێك نەدرێتەوە، چونكە لای هەموو كەس ئاشكرایە فرە لیستی دەبێتە هۆی پەرتبوونی دەنگ، ئەدی چۆن پەرتبوونی دەنگی كوردو سەرەنجام كەمبوونەوەی كورسی لەبەرژەوەندی خەڵكی كوردستاندایە؟ لەلایەكی دیكە فرە لیستی بەدیموكراسی و یەك لیستی بە تاكڕەوی دەچوێنن، هەقە لەو ڕووەوە راستگۆیانە خەڵكی كوردستان بدوێندرێت، لەو هاوكێشەیەدا واقیعی ئەمڕۆ لەبەرچاو ناگیرێت، ئەمەش سەرەتای رووداونی كارەساتە، هەمیشە چاونووقاندن لەئاست واقیعدا چەوت و چەوێڵیی لێكەوتۆتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ لە هەندێ رۆژنامەو گۆڤاری كوردستان بەرچاو دەكەوێت، زیاتر دەچێتە خانەی گەمەكردن بەهەست و سۆزی خەڵك، وەك ئەوەی خەڵكی كوردستان هیچ پرسیارێكی نەبێ، هەڵەیەكی دیكە ئەوەیە پێمان وابێت دیموكراسی لەهەموو شوێنێكی ئێراقدا وەك خۆی پراكتیزە دەكرێت، لێرەدا مەبەستم ئەوە نییە لە كوردستاندا بێ كەموكوڕییە، بەڵام ئەو پێكەوەژیانەی نێوان پێكهاتەكان لەكوردستاندا، لەئاستی ئێراقدا قبوڵە یان پێچەوانەیە؟ لە كوردستاندا لەدوای راپەڕین بەشێوەیەكی جدی و چالاكانە كار بۆ برەودان بە پێكەوەژیان و لێبوردەیی كراوە و بەكردەوە ئیشی بۆ كراوەو وێنەیەكی جوانی پیشانداوین، ئایا هەمان وێنەی پێكەوەژیان لە بەغدا هەست پێدەكرێت، بێگومان كوردستان و بەغدا دوو وێنەی جیاوازن، لە كوردستان

پێکەوەژیانی پێکهاتەکان و گروپ و دەستەو لایەنە سیاسییەکان بەڕاستی پێکەوە ژیانە، بەڵام لە بەغدا قسەی سەرزارەکییە و پاکتاوی نەژادی و یەکتری قبوڵ نەکردن لە فۆرم و شێوازی دیکەدا لەوپەڕی دایە، پێویستە لەسۆنگەی ئەمەوە قسە لەدیموکراسی و مافی پێکهاتە نەتەوەیی و ئایینی و مەزهەبەکان بکەین، لەوێشەوە قسە دەربارەی حاڵی کورد بکەین ئاخۆ بەلیستێك یان چەند لیستی جیاوازەوە بچێتە مەیدانی هەڵبژاردن، کام مەیدان ئەو مەیدان و گۆڕەپانەی ژینگەی بارگاوی کراو بە رەگەزپەرستی تیایدا بالادەستە، کاتێك ئەو وێنە ئاڵۆزو تێکەڵ و پێکەڵەو ناسیونالیزمی عەرەبی تیایدا براگەورەیی بخوازێت و تەنیا خۆی ببینێ، چۆن قسە لەدیموکراسی دەکرێت، ئەی باشە لەو دۆخەدا کورد بەکاوەخۆ بچێتە مەیدان و باکی بەپەرت بوونی دەنگ نەبێت چ بەرێکی دەست دەکەوێت، کاتێك ئەو تابلۆ ترسناکە لەبەرچاوبێت ئەوە چ پڕۆژەیەکی سیاسی کوردستانە فرەلیستی بەکارێکی سیاسی پرۆفیشناڵ دەزانێت، ئایا دەکرێ لەودۆخ و بارەی یەکتری قبوڵکردنی تیادا نا ئامادەیە، کورد پێی وابێت چەندلیستێك بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق نیشانەی بڕوا بوونە بەدیموکراسی، رەنگبێ زۆربەی خەڵك ئەو سەرەتایە بزانێت کە فرەلیستی شێوازێکی دیموکراسی گرنگە و بواری ململانێ و کێبەرکێ دەدات، لەولاشەوە یەك لیستی ئەوە ناگەیەنێ کەدژی دیموکراسی بێت، بەڵکو ئەمەشیان لەروانگەی دیموکراسیەوە هاتووە و لەگەڵ لیستەکانی تر دەچێتە مەیدانی ململانێ، پێویستە ئەوە لەبەرچاو بگیرێ کە فرەلیستی لەکوردستاندا مەسەلەیەکی ئاساییە و پەرلەمان لەچەندین لیست پێکهاتووە، دەبێ ئەوەش بزانرێت کەدیسان پارتی و یەکێتی زۆرینەی پەرلەمانن و جارێکی دی سەرۆك بارزانی لەلایەن ٧٠٪ی خەڵکی کوردستانەوە متمانەی پێبەخشراو ئەمانەتی سەرۆکایەتی کوردستانی وەرگرتەوە، ئیدی ئەگەر مەسەلە دەسەڵات بێت، ئەوا جارێکی دی و لەپەنای فرەلیستیدا دەسەڵاتیان وەرگرتەوە، ئەی دژایەتی کردنی ئەوستافە تاوەکو بەغدا چ قازانجێکی بۆ کورد تێدایە، بۆچی یەك لیستی والێك دەدرێتەوە کەتەنیا لەقازانجی پارتی و یەکێتیدایە؟ هەندێ جار دەوترێت لیستەکانی دیکەی پەرلەمانی ئێراق پارچە پارچە بوون و چی تێدایە لیستی هاوپەیمانی کوردستانیش ببێتە چەند لیستێك؟ بەڵام لەوە ناپرسن ئەو لیستانەی دروست دەبن چەند قەوارەی سیاسییان گرتۆتەخۆ، پاشان کەی واقیعی ئێمەو عەرەب وەکو یەکە تا چاو لەوان بکەین، ئەوان زۆرینەی ئێراقن و دەیان لیستی دیکەش بن هەر زۆرینەن، ئەگەر ئەو چاولێکەرییە بەڕاست بزانین بەو قەبارەیەی ئێستا هەمانە لەچاو قەبارەی عەرەب و بەگوێرەی ئەوتیوریزەکردنە بۆ لیستی جیاواز ئەوا

زیان بەخۆمان دەگەیەنین، هەندێ بۆچوون سەبارەت بەلیستی جیاواز کەپێیان وایە گەرموگوڕی دەخاتە بەشداری کردنی خەڵك، ئەمە زۆر راستە بەڵام دەبێ کورد ئـەوجۆرە بەشـداریە بکاتـە شێوەی هەڵبژاردنی کوردستان، لێرەدا پێویستە ئەوە بڵێین کە بـۆ بەغـدا چـی تێدایـە ئەگـەر گرووپ و هێزە سیاسیەکان لەناو یەك لیستی دا توانای خۆیان بخەنە گەڕ، ئەو هەوڵەی بۆ فـرە لیستی دەیدەن هەمان هەوڵ و توانا بۆ یەك لیستی بخەنە گەڕ.پێویستە لەبابەتی یەك لیستی و فرەلیستیدا سەیری هەڵوێستی ئاسیونالیزمی عەرەب بکەین، چۆن دەڕوانێتە ئەو مەسـەلەیە، بۆچی بەشداری کورد لەهەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق بەشێوەی فرەلیستی بـەئاوات دەخـوازێ، ئایا لەپەرۆشییە بۆ دیموکراسی یان وەك تەڵەیەك بۆ کورد سەیری دەکات، کاتێ ئەو تێڕوانینـە رەچاو دەکەین، گرنگی یەك لیستیمان بۆ بەدیار دەکەوێت، کەواتە ئەگەر واقیـع ببیـنین ئـەوا بەرپێی خۆمان دەبینین و بەئاگاوە هەنگاو هەڵدێنین و سەرچـیخ ناچـین، پێویسـتە لەباسـێکی واگرنگ و چارەنووسسـازدا قسـەکردنمان لـەپێناوی وەعـزدادان نـەبێت، خـەڵکی کوردسـتان پێویستی بەراستەڕێ بوونی ئەو ئاراستەیە کە دەربڕی خواستە نەتەوەیی و نیشتمانیەکان بێت، دیـارە پرسـی نەتـەوەش پێویسـتی بەراسـتگۆیی هەیـە، نـابێ هـیچ گـرووپ و دەسـتەیەك لەونێوەندەدا لەگۆترە قسەبکات و هەرخۆی پێ راست بێ و بـەڵێنی زل و بـێ ئـەنجام بـدات، تەنیا بۆئەوەی دژی بەرامبەری بوەستێتەوە، هەر گرووپ و رەوتێك بەو ئاقارەدا بچـێت کـورد گوتەنی ( قسەی ناچـێتە هـەمان و گیرفانـەوە)، هـەر هـەوڵێك بەئاقارێکـدا بێـت کـارێکی ناهۆشیارانە بێت و ئەنجام تیاچوون بێت، ئەوا رەچاوکردنی بەرژەوەندی دەستەو گرووپەو پشـت گوێ خستنی بەرژەوەندی باڵای میللەتـە، لەسـۆنگەی ئەمـەوە ئەگـەر سـەرەنجام کـورد بـەو ئاراستەیەدا بڕێ پەرت بوونی دەنگ و کەم بوونەوەی کورسی بەمەسەلەیەکی ئاسایی بزانـێ، شـتێکی بـاش چـاوەڕێی ناکـات، ئەمـە کـارێکی ناهۆشـیارانەیەو بـەرەو تیاچـوونە، کـورد گوتەنی(سواری کەڵـەکی پـەڕۆ بـووە) دیـارە کەڵـەکی پـەڕۆ تیاچـوونی بەدواوەیـە، کەواتـە هەموومان پێمان وابێت لەکوردستان ئەوپەڕی جیاوازی، بەڵام لەبەغدا یەکگرتوو و یەك دەنگ و یەك لیست بین.

٢٠٠٩ / ٩ / ٢٧

# هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانیی نەمر
# لە پەنای ئاشتییەوە... پیلانێك لە بەغدا داڕێژراو
# لە حاجی ئۆمەران جێبەجێ کرا

نیەت پاکی هۆکاری سەرەکیی هەر گفتوگۆیەکی نێوان لایەنەکانە، کورد هەمیشە لە گفتوگۆی لەگەڵ بەغدا، ڕووبەڕووی لایەنێك بۆتەوە، کەگفتوگۆی وەك تاکتیکێك بۆ کات بەسەربردن بەکارهێناوەو بەکردەوە نیەتی پاك نەبووە، ئەو ئاراستەیەی ڕژێمی بەعس لە حەفتاکانی سەدەی بیستەم لە گەرمەی گفتوگۆی نێوان کوردو بەغدا گەیشتە ئەوپەڕی و هەوڵی ئەوەیاندا لە حاجی ئۆمەران بارزانیی نەمر تیرۆر بکەن، ئەوەبوو لە ڕۆژی ٢٩ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٧١ نەخشەی ئەو پیلانەیان جێبەجێ کرد، بەڵام ئامانجەکەیان نەهاتەدی.

## لەپەنای ئاشتی دا

گفتوگۆی کورد- بەغدا لە ١١-٣-١٩٧٠ دا بە ڕێککەوتنێك گەیشت، کە بە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار ناسراوە، ئیدی لە ١٩٧٠-١٩٧٤ شەڕ ڕاوەستاو ئەو ماوەیە بە ماوەی ئاشتی ناسرا، لێ بەردەوام لە بەغداوە پیلان دادەڕێژرا بۆ لەباربردنی ئەو دۆخە. زیاتر لە هەشت مانگ بەسەر ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداردا تێپەڕی بوو، ڕۆژی ١ی کانوونی یەکەمی ١٩٧٠ ئیدریس بارزانی هەمیشە لەیاد بۆ بەدواداچوونی جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار چوو بۆ بەغدادو چاوی بە سەرکۆمارو جێگرەکەی و هەندێ بەرپرسی دیکە کەوت، لەو سەفەرەدا هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزنیی سەرکردەیان دا. بەمەش هەر لەو ساڵەی ڕێککەوتنێکیان لەگەڵ کورد ئیمزا کرد، شۆڤێنیەکان کەوتنەخۆ بۆ تێکدانی بارودۆخ و سەرنەگرتنی ڕێککەوتنەکەو تێکدانی کەشوهەوای ئاشتی، کە هەموو

گەلانی ئێراق  ئومێدیان پێ بوو. ئیدی ئاراستەی پیلانگێڕی ڕژێمی بەعس بە ئاقارێکدا دەچوو، کە بەوەندە نەوەستێ و وێڕای ناردنی وەفدو نامەی سەددام بۆ بارزانیی نەمر و پاکانەکردنیان لەو کردەوە تیرۆریستیەدا، لە پیلانگێڕی نەکەوتن و نەخشەیان بۆ تیرۆرکردنی بارزانیی نەمر دانا.

## ڕێ خۆشکردن
## بۆ پیلانی ٢٩ی ئەیلوول

لە درێژەی پیلانەکانی حکوومەتی بەغدا، بە چەندین شێوە پیلان بۆ تیرۆرکردنی بارزانیی نەمر داندرا، لەوانەش هێنانی چەند پاسێکی هێزی کۆماندۆ  بەجلوبەرگی ئافرەتەوە بۆ کانیی شێخی باڵەکان لە حاجی ئۆمەران و لەوێوە دەستبکەن بە هێرشبردن، بەڵام ئەم هەوڵەیان بەلاوەنا، پاشان بیریان لەناردنی ئۆتۆمبێلی بۆمبڕێژکراو کردەوە، کە ڕێ بە بارزانی بگرێ و بەکۆنترۆڵ بتەقێندرێتەوە. شۆڕش لەڕێی دەزگای پاراستنەوە دەنگوباس و هەواڵی ئەو پیلانانەی پێ دەگەیشت و بۆ ئەو پیلانانە ڕێوشوێنی  دادەنا. بۆ پیلانی ٢٩ی ئەیلوولی ١٩٧١ حکوومەتی بەغدا هەموو وزەیەکی خۆی بەکارهێنابوو و پەنای بۆ دەزگای هەواڵگری وڵاتی پێشکەوتووی وەك ئەڵمانیا بردبوو تا شارەزایی زیاتر بکات. لەرۆژی ١٥ی ئەیلوولی ١٩٧١دا  دوو مەلا بەقەسەی خۆیان بۆ ئەوە هاتبوون کە خراپ بوونی بارودۆخی نێوان شۆڕش و ڕژێمی بەغدا پێویستی بە چارەسەرە، رایانگەیاندبوو دەیانەوێ لەو بارەیەوە ڕای بارزانیی نەمر وەربگرن، تا بە هەوڵی زانایانی ئایینی وخەڵك ئەو بارە خراپە چارەبکەن و کەلێنەکان پڕبکەنەوە. بارزانیی نەمر ئەو پێشنیارە پەسند دەکات و خۆشحاڵی خۆی پیشاندان و هانیدان کە جێبەجێی بکەن، ئەو شوفێرەی ئۆتۆمبێلەکەی لێدەخوڕی سەر بەدەزگای موخابەرات بوو، هاتنی بۆ حاجی ئۆمەران بەهەل زانیبوو بۆ شارەزابوونی ناوچەکە و زانینی شوێنی دانیشتنی بارزانی.

## جێبەجێکردنی پیلانێك کە مەبەستی
## خۆی نەپێکا

رۆژی ٢٩ی ئەیلوول وەفدێك کە لە دوو ئۆتۆمبێل پێکهاتبوو گەیشتە حاجی ئۆمەران، پاش ئەوەی بارزانی ئاگادارکرایەوە کە مەلاکان هاتوون و چاوەڕێن، بارزانیی نەمر وتبووی: نوێژی عەسر دەکەم و سەعات پێنج ونیو لایان دەبم. دوای گەیشتنی بۆ ئەو شوێنەی مەلاکانی لێبوو، بەخێرهاتنی لێ کردبوون و دانیشتبوو سەعات چوارو‌پەنجاوپێنج خولەك بۆمبەکان تەقینەوەو لەو کاتەدا ئەوەی چای بۆ میوانەکان هێنابوو، کەوتبووە نێوان بارزانیی نەمر و بۆمباکە کە لەناو جلەکانی ئیبراهیم خوزاعی دابوو،کە ئەویش یەکێك بوو لە مەلاکان، ئیدی ئەوەی چای بۆ میوانەکان هێنابوو بووە دیوارێك و شەهیدبوو بارزانی بە موعجیزە بە سەلامەتی لەو پیلانە رزگاری بوو.

## بارزانی فەرمانی دا
## کەس هەڵاتووان نەکوژێ

چوار کەس لەوانەی هاتبوون بە تەقینەوە کوژرابوون. ئەوانەی لای راست وچەپی بارزانی دانیشتبوون بریندار‌بوون هەڵاتبوونە دەرەوە، بارزانیش لەو کاتەدا، لە نێو تەپ و تۆزی تەقینەوەدا ژوورەکە بەجێ دەهێڵێ و هاوار دەکاتە پێشمەرگەکان: کەسیان مەکوژن، دوو شوفێرەکەش وەك ئەوەی نەخشەیان بۆ داندرابوو، کە خۆیان بگەیێننە ئۆتۆمبێلە بۆمبێرێژکراوەکە و رۆکێت لە جێگەی لایتەکانی دواوەیدا قایم کرابوو وە قایمکارییەك بۆ هەڵاتن، ئیدی دوو شوفێرەکە، کە نەیانتوانی بوو بگەنە ئۆتۆمبێلەکە نارنجۆکیان فڕێ دابوو. ئەگەرچی زەحمەت بوو لەو کات و ساتە ناخۆشەدا دەنگی کەس بەسەر هەراوجووڵەی پێشمەرگەدا زاڵ بێ، کە بەدوای دوو شوفێرەکەوە بوو بوون، ئەو دوو شوفێرە لە نزیك میوانخانەی بارزانی تا کوژرا بوون هەر نارنجۆکیان هەڵدابوو. بارزانیی نەمریش کە ساچمەیەکی بچووك بەر  ڕوومەتی کەوتبوو، فەرمانی دابوو کەس هەڵاتووەکان نەکوژێ. سەعات پێنج

وبیست وپێنج خولەك بە كوژرانی پیلانگێڕەكان هەموو شتێك كۆتایی دێت، بەڵام پاش ئەوەی خەڵكەكە بڵاوەی لێدەكەن ئۆتۆمبێلی تۆیۆتا كە كاتی بۆ داندرابووەوە، دەتەقێتەوەو بەهۆی دەرەنگ تەقینەوەكەشی زیانی نەگەیاندبوو. ئەنجامی ئەو پیلانە ئەوەبوو ٩ كەس لەمەلاكان و ٢ شوفێرەكەیان كوژران، ٢ پێشمەرگەش بەناوەكانی سەلیم زوبێر بارزانی و مەحموود شەریف نزاری شەهیدبوون و چواردە كەسی دیكەشی برینداربوون.

## دوای دڵنیابوون لە ژیانی بارزانی، خەڵك سوپاسی خوایان كرد

وای بڵاوبوونەوەی هەواڵی پیلانەكە لەنێو هاوڵاتیاندا، خەڵكێكی زۆر رووودەكاتە حاجی ئۆمەران بۆ دڵنیابوون لە سەلامەتی بارزانی، بەڵام ئەو جەماوەرە بە هیچ رازی نەبوون و بۆ ئەوەی قەناعەتیان بێ كە بارزانی سەلامەتە داوایان كردبوو بەچاوی خۆیان ببیننن، پاش ئەوەی دڵنیابوون، كە بارزانی بە سەلامەتی لەو پیلانە رزگاری بووە، ئارام دەبنەوە زۆر سوپاسی خوا دەكەن.

## بروسكەیەك لە حاجی ئۆمەرانەوە، یەكێكیش لە بەغداوە

پیلانەكە كاریگەریی كردبووە سەر هاوڵاتیان و پێشمەرگە، هەموویان كەوتبوونە حاڵەتێكی هەڵچوونەوە، بۆ ئەمەش پێویستی دەكرد سەركردایەتی ئەو بارە هەڵچووەی جەماوەر و پێشمەرگە بباتەوە دۆخێكی دیكەو رێگە لە پشێوی بگرێ، لەو بارەیەوە سەرۆك بارزانی لە كتێبی ((بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی كورد)) دەڵێ: (بۆ شەوەكەی بروسكەیەكمان بۆ هەموو لق وبارەگا و بنكەكانی پێشمەرگە لێ دا، رامانسپاردن كە خۆیان بگرن و كارێكی وانەكەن كەسی پێ تووڕە ببێ). لە بەغداشەوە، حزبی بەعس بۆ پیشاندانی هەڵوێست و پیرۆزبایی بەبۆنەی رزگاربوونی بارزانیی نەمر، بروسكەیەك دەنێرنە كوردستان و

ئامادەیی دەردەبڕن، کە هاوکاربن بۆ پەردە هەڵماڵین لەڕووی ئەوانەی پیلانەکەیان سازکردووە، دیارە بەعس بۆ هەوڵی تیرۆکردنی ئیدریس بارزانی هەمیشە لەیادیش، وایان خۆپیشاندا بوو کە ئەوان لێی بێ ئاگان، بۆ پیلانی تیرۆرکردنی بارزانیی نەمریش بە هەمان شێوە خۆیان پیشاندایەوە. لە بارەی وەڵامدانەوەی ئەو بروسکەیە سەرۆك بارزانی دەڵێ: ((وەڵاممان دانەوە کەوا ئەوانەی پیلانەکەیان جێبەجێ کرد لە بەغداوە هاتبوون).

## هاتنی وەفدێك لە بەغداوە...

## پێکهێنانی لیژنەیەك

سەرەڕای ئەوەی بەعس برووسکەیەکی ناردبوو، پاشان ئەحمەد حەسەن بەکری سەرکۆمار د. عەبدولسەتار جەواری وەزیر بە نوێنەرایەتی خۆی دەنێرێتە لای بارزانیی نەمر بۆ پیرۆزبایی کردن بەبۆنەی بەسەلامەتی دەرچوونی بارزانیی نەمر و دەربڕینی ناخۆشی بۆ ئەو رووداوە و جەختکردنەوە لەوەی کە سەرکۆمار بەهیچ جۆرێك ئاگای لەو پیلانە نەبووە. بەمەبەستی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون، لیژنەیەك لە هەردوو لا پێکهات، بەڵام وەك سەرۆك بارزانی لە کتێبەکەیدا دەڵێ: (لێکۆڵینەوەکە لەبەر هۆیەکی سادە هیچ ئەنجامێکی بەدەستەوە نەدا، هۆیەکەش ئەوەبوو بە گوێرەی ئەو زانیارییانەی دەزگاکانی هەواڵزانینی شۆڕش دەستیان خستبوون، رژێم خۆی پیلانەکەی سازکردبوو.)

## کۆبوونەوەی سەرکردایەتی..

## بارزانیی نەمر نەیهێشت شەڕ لەسەر ئەو دەست پێبکرێتەوە

پیلانی ٢٩ ی ئەیلوول بووە مایەی گرژی و چوونە دۆخێکی دیکەوە، کە پێویست بوو لەو هەلومەرجەدا سەرکردایەتی لەو دۆخە تازەیە بکۆڵێتەوە. ئەوەبوو لە کۆبوونەی سەرکردایەتی پارتی و شۆڕشدا، بۆچوونێك بەلای ئەوەدا چوو بوو، کە هەندێك لە ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە داوایان کردبوو پەیوەندی لەگەڵ ڕژێم بپچڕێندرێ و شەڕ دەست پێ بکرێتەوە. سەرۆك بارزانی لە کتێبی ((بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد)) لە بارەی ڕای بارزانیی نەمر لەو کۆبوونەوەیەدا دەڵێ: (بارزانی دژی ئەو بۆچوونە بوو و وتی: نەخێر، ئەگەر دەست بکەینەوە بەشەڕ با لە پێناوی کەرکووك و خانەقین و شنگاردا بێت نەك بەهۆی منەوە) . ئەو پیلانەی ڕژێم زەبرێکی کوشندەی لە چارەسەری ئاشتیانەدا و مایەی خۆدزینەوەی بەغدا بوو لەڕێگەی ئاشتی. لەو بارەیەوە، سەرۆك بارزانی دەڵێ: ( ئەم دەستدرێژییەی لە ٢٩ی ئەیلوولدا رووی دا دوا هیوای چارەسەرکردنی بە ئاشتیی پرسی کوردی لەناوبردو. دەرکەوت پرسەکە مایەوە سەر تەنیا کات و، متمانە لەنێواندا نەما).

## بەرنامەی سەرکردایەتی لە ئاست

## دۆخی نوێدا

تا دەهات ویستی شەڕانگێزانەی ڕژێمی بەغدا بارودۆخی بەرەو گرژی و ئاڵۆزی دەبرد، سەرکردایەتی لە ئاست ئەو دۆخە تازەیەدا بەرنامەی لێکۆڵینەوەی لەو رووداوە دانا، ئەوە بوو لە ٥ ی تشرینی یەکەمی ١٩٧١ دا، کۆبوونەوەیەکی سیاسی _ سەربازیی بەسترا، بەپێی کتێبەکەی جەنابی سەرۆك بارزانی لەو کۆبوونەوەیەدا ئەندامانی کۆمیتەی ناوەندی و سەرکردەی هێزەکانی پێشمەرگەی تێدا بەشداربوون، هەروەها چەند کەسێکی نیشتمانپەروەریش لە بەشێکی کۆبوونەوەکانی ئەم دانیشتنەدا بەشداربوون و لەو هەنگاوانە کۆڵرایەوە کە دەبێ لەبەر رووناکیی ئەو شتە تازە رووداوانەدا بنرێن.

لەو کۆبوونەوەیەدا بڕیار دەدرێ کە وەفدێك ڕەوانەی بەغدا بکرێ تا گوێ لەبەرپرسانی ڕژێم بگرن و دڵنیابن نیازی چییان هەیە، راسپێرییەکانی بارزانی ئەوەیان دووپـات کردبـووەوە کـە خۆیان بگرن و کارێکی وا نەکەن بیانوویەك بدەن بەدەست ڕژێمەوە.

## نامەی کریملین ...

## هاتنی وەفدێکی سۆڤییەت بۆ کوردستان

لەلایەکی دیکەشەوە کریملینش چەندین نامەی بۆ بـارزانی نـارد، کـە لـە هـەموو ئـەو نامانەدا جەختیان لە خۆدوورخستنەوە لەشەڕ دەکردو باسی ئەوەشیان کردبوو، کە لەم بارەیەوە وەفدێك بۆ لای بارزانی دەنێرێ.

لە ٢٥ ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٧١ دا وەفدێکی سۆڤیەتی بە سـەرۆکایەتی بابـەجان غەفوورۆڤ ئەندامی کۆمیتەی ناوەندی حزبی شیوعی سۆڤیەتی و ئەندامیەتی نیچکین و هەندێ لە ئەندامانی باڵیۆزخانەی سۆڤیەت دەگەنە کوردستان وچاویان بە بارزانی کـەوت و بەبۆنـەی بەسـەلامەتی دەرچـوونی لەپیلانەکـە پیرۆزباییـان لێکـرد. وەفدەکـە رایگەیانـدبوو کـە دەستپێشخەری بۆ دەستپێکردنەوەی شەڕ لە بەرژەوەندی میللـەتی کـورددا نییـە، ئـەوانیش دەزانن کە لە سەرکردایەتی بەعسدا کەسانێکی پیس و نەفام هـەن و پێیـان ناخۆشـە ئاشـتی جێگیرببێ وپرسی کورد لەرێگەی ئاشتییەوە چارەسەر بکرێت، بەڵام کەسـانی واشـیان تێدایـە حەزیان لەگەڕانەوەی شەڕ نییە. سەرۆك بارزانی لە کتێبەکەیدا لە بـارەی وەفـدی سـۆڤیەتەوە دەڵێ: ( بەرژەوەندی سۆڤیەت لەم قسەدا ئاشکرایە، چونکە هەموو هەوڵ و تەقەلای سۆڤیەت بۆ ئەوە بوو شۆڕشی کورد لەگەڵ ڕژێم بگاتە رێککەوتنێك با لەسەر حسابی کوردیش بێ).

## لەڕێی یاداشتێکەوە

## داوا لە ڕژێم کرا هەڵوێستێکی دیاری هەبێت

گەرموگوڕی هاتن وچوونی وەفد و بروسکەو کۆبوونەوەکان بەوە گەیشتن، کە لە ٢٥ ی تشرینی دووەمی ١٩٧١ دا ئەنجوومەنی سەرکردایەتی شۆڕشی کورد کۆبووەوەو بڕیاردرا یاداشتێك بەڕژێم بدرێ و داوای دەستنیشانکردنی هەڵوێستێکی دیاری تێدا بکرێ و ئاماژە بۆ ئەوە بکرێ کە ئەو دۆخەی ئێستا هەیە دۆخێکی نائاساییە و پێویستی بەکارێکی ئەرێنی هەیە. ڕژێمیش دەستبەجێ وەڵامی داوەتەوە، کە: وەفدێك دەنێرێت بۆ چاوپێکەوتن لەگەڵ بارزانی، ئەگەر بارزانی ئارەزووی لێ بێ. لە ٢ ی کانوونی دووەمی ١٩٧١ دا وەفدەکە دەگاتە لای بارزانی و بڕیاردرا کە ساردی نەهێڵدرێ و چارەی دۆخەکە بکرێ و لەسەر بەرەڵڵاکردنی گیراوەکانی هەردوولا و دانانی رادەیەك بۆ تێکدەری و کردنەوەی لاپەڕەیەکی نوێ رێککەوتن.

لەرۆژی ١٦ ی هەمان مانگدا دوو نێردە لەلایەن ئەحمەد حەسەن بەکری سەرکۆماری ئێراق دەگەنە لای بارزانی و لەنامەیەکی زارەکیدا بێ ئاگایی سەرکۆماری ئێراق لەو پیلانەیان بە بارزانی راگەیاندبوو، کە تاخمێك گوێ بۆ سەرکۆمار شل ناکەن. سەرۆك بارزانی لەبارەی ئەو قسانەی ئەحمەد حەسەن بەکر، کە لەڕێی نێردەکانیەوە گەیاندرانە بارزانی، دەڵێ: (نازانم ئاخۆ بەکر لە قسەکانیدا بەڕاستی بوو یان ئەوە بەشێکی شانۆنامەیەك بوو کە ئەکتەرەکان رۆڵەکانیان لەناوخۆیاندا دابەش دەکەن و دەسەڵاتیش لەراستیدا خۆی مەلاس دابوو بۆ شۆڕش و بڕو بیانووی دادەهێنا بۆ ئەوەی هەرچی بەدناوی و ئەنگییەك هەیە هەمووی بە پارتیەوە بنووسێنێ و بیکات بە بەڵگەو پاساودەری دەستدرێژیکردن یا لەکەدارکردنی ناوبانگی شۆڕش).

## بەغدای ئەمڕۆ و هەڵەی بەغدای دوێنێ

پیلانی ٢٩ ی ئەیلوولی ١٩٧١ ڕووداوێك بوو، لەکاتێکدا روویدا، کە چەندین گەڕی گفتوگۆی کورد – بەغدا بەوە گەیشت بوو رێککەوتننامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ ی لێکەوتبووەوە، ماوەی ١٩٧٠ – ١٩٧٤ وەك قۆناغێکی ئاشتی ناودەبرا، لەپەنای ئەو دۆخە نوێیەدا ڕژێمی بەغدا لە دەرفەت دەگەڕا بۆ لەباربردنی ئەو بارە نوێیەی هاتبووە دی، هەمیشە دەسەڵاتدارانی بەغدا خۆیان وەك نیازپاکێك پیشان دەدا، بەڵام لەراستیدا هەوڵی تێکدانی بارودۆخیان دەداوپێیان وابوو لەڕێی پیلانی تیرۆرکردنی بارزانیی نەمر مەرامەکانیان دێتەدی، رۆژگار دەریخست ئەو رەوتە شۆڤێنیە تەسکبینیە، بەڵای گەورەی بەسەر گەلانی ئێراق دا هێنا، راستە لەرێی پیلانی جەزائیر شۆڕشی ئەیلوول تووشی نسکۆ هات و راستە لە ماوەی نێوان ١٩٩١- ١٩٧٥ ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی بەغدا چی لە دەستیان هات دەرهەق بە کوردستان کردیان، بەڵام ئاکامی ئەو بیرکردنەوەیە ماڵوێرانی نەك هەر بۆ کورد، بەڵکو بۆ هەموو ئێراق لێکەوتەوەو چارەنووسی سەرانی ڕژێمی بەعس بەکوێ گەیشت، کە هەموو لایەك ئەو رووداوانەی لەبەرچاوە، بەڵام ئەوەی مایەی نیگەرانیە ئەوەیە، لەئێراقی دوای رووخاندنی بەعس هێشتا بیرکردنەوەیەکی لەو جۆرە ماوەو دەیەوێ رەوتی رووداوەکان بە هەمان ئاقاری سەددام و بەعسدا ببەن، ئەوان لەپەنای ئاشتی وگفتوگۆی کورد- بەغدا هەوڵی پیلانی تیرۆرکردنی رابەری کوردیان دەداو و سەری زمان وبنی زمانیشیان ئاشتی و برایەتی بوو، لەکاتێکدا دوای ٣٩ ساڵ یادی ئەو رۆژە ناخۆشە دەکەینەوە، دەبینین جووڵەیەك لەبەغدا بە هەمان ئاراستەی جاران دەڕوات و دەیەوێ پشت لەمافەڕەواکانی کورد بکات، هەقە بیر لەوە بکرێتەوە، ئەگەر دوێنێی بەغدا بەهەموو توانایەك لەهەوڵی لەناوبردنی کوردا دا بوو و بۆی نەچووە سەر، پێویستە ئەمڕۆ لە بەغدا وەك پەندێك سەیری ئەو پیلانەو دەیان پیلانی دیکە بکەن، لە کۆتاییدا دەڵێین ئەوەی لەسەر هەمان ئەو رەوتە بڕوات، کە لەجیاتی کارکردن بۆ جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار خۆیان لێ دزییەوەو بەوەش نەوەستان، ویستیان بارزانیی نەمر لە پەنای ئاشتی تیرۆر بکەن، ئەوا نایەوێ پرۆسەی سیاسی و پێکەوەژیان لە ئێڕاقی تازەدا سەرکەوێ. هەرچەندە لە بەغدا دەستەوگرووپگەلێك بەلای ئەوەدا بچن، کات بە فیڕۆبدەن و پیلانگێڕی لە کورد بکەن. ئەوا نایانەوێ ئێراق سەقامگیری بەخۆیەوە ببینێ،

کاروانی بەرەو پێشەوەچوونی پرۆسەی سیاسی پاشەکشە پێدەکەن، باشترین دەرس وپەند ئەو رووداو و پیلانانەن کە بەغدای جاران دژی کورد کردوویەتی، کە دیارترینیان پیلانی ۲۹ ی ئەیلوول بوو، دەبێ لەخۆیان بپرسن ئێراق دوای پیلانی ۲۹ ی ئەیلوول و نسکۆی ۱۹۷۵ بە کوێ گەیشت؟ ئایا ئەو جووڵەیەی لە بەغدا خۆی بە هەمان ئاراستەی بەغدای جاران دەجووڵێنێ، دەیەوێ ئێراق بەهەمان دەرد بباتەوە؟

تێبینی: بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە سوود لە کتێبی جەنابی سەرۆك بارزانی بەناوی (بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد – بەرگی سێیەم – بەشی دووەم – چاپی یەکەم ۲۰۰٤) وەرگیراوە.

**۲۰۰۸-۹-۲۹**

## پەیامێك لە هەولێرەوە...

## بڕیاری یەكدەنگی لە وڵاتی پیاوە ئازاكاندا

بەو پێیەی رۆژی ٢٠١٠/١/١٦ بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق دیاری كراوە (دواتر كرایە ٢٠١٠/٣/٧)، ماوەیەكە حزب و قەوارەو لایەنە ساسییەكان كەوتوونەتەوەخۆ و، هەریەكەیان لە روانگەی جیاوازو، هەندێك جاریش لێك نزیك بۆ هەندێ پرس سەیری هەڵبژاردن دەكەن، ئەوەی تێبینی دەكرێ، ناسیونالیزمی عەرەبی ئەجندەیەكی بۆ هەڵبژاردن هەیە، كە تیایدا مافی كورد پشتگوێ دەخات، هەرئەوەش بوو بۆ دەنگدان لەسەر یاسای هەڵبژاردن، تەنیا لە روانگەی بەرژەوەندی خۆیەوە پێشنیاری خستەڕوو، ئەو پێشنیارەی دەیانەوێ جێبەجێ بكرێ، گەڕانەوەیە بۆ دەسەڵاتی تاكڕەوەی.

بۆیە هەوڵ دەدەن كەركوك لە پارێزگاكانی دیكەی عێراق جیابكرێتەوەو دۆخێكی تایبەتی پێ بدرێت، لێ پێداگرتنی كورد لەسەر رەتكردنەوەی ئەو پێشنیارە، بووە هۆی ئەوەی پەرلەمانی عێراق نەتوانێ دەنگ لەسەر یاساكە بدات و، رەوانەی ئەنجوومەنی سیاسی كرا، ناسیونالیستانی عەرەب و هەندێ توركمانی توندڕەو كە واقیع وەك خۆی ناخوێننەوە، پێیان وابوو بە ئاسانی بۆیان دەچێتەسەرو، بە پێداگرتن لەسەر پێشنیارو داواكانی خۆیان، دەتوانن دۆخی دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ ی كوردستان بقۆزنەوەو، پێیان وابوو زەمینەیەكیان بۆ دەرەخسێ، كە دەتوانن درزو كەلێن لەنێو بزووتنەوەی سیاسی كوردستان دروست بكەن و، بەو هۆیەوە مەرامەكانیان دێتەدی.

ئەوەی خەڵكی كوردستان چاوەڕێی دەكرد ئەوەبوو، كە لە كوردستاندا یەكهەڵوێست لە بەرامبەر پیلانی ناسیونالیستانی عەرەبدا هەبێ، ئەو داخوازییەی خەڵكی كوردستان هاتەدی، دوای ئەوەی كورد داوا نارەواكەی رەتكردەوە، ئیدی ئەو هەڵوێستە پێویستی بە پشتیوانی كوردستان هەبوو، ئەوەبوو رۆژی ٢٠٠٩/١٠/٢١ پەرلەمانی كوردستان هەڵوێستی خۆی پێشان داو، بڕیاری دا دۆخی تایبەت بە هەڵبژاردن لە كەكووك رەت بكرێتەوە، رۆژی دواتریش

٢٠٠٩/١٠/٢٢ لەسەر بانگهێشتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، نوێنەرانی سەرجەم ئەو پارت و لایەنە کوردستانیانەی کە لە لایەن کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانەوە تۆمارکراون لە هەولێر کۆبوونەوەو راگەیاندراوێکیان راگەیاند، بڕیاری پەرلەمانی کوردستان و لایەنە کوردستانیەکان تین و تاوێکی دیکەی دایەوە خەڵکی کوردستان و، پەیامێك بوو بۆ ئەوانەی هەمیشە بۆ کورد لە بۆسەدان، کە چاوەڕێی ئەوە نەکەن کورد یەکهەڵوێست نابێ لە بەرامبەر پێشنیارو داوا ناڕەواکانیان.

سەرۆك بارزانی دوای کۆبوونەوەی لایەنە کوردستانییەکان بۆ دەزگاکانی راگەیاندن دواو لەبارەی کەرکووك و ناوچە دابڕێندراوەکان وتی:"خۆشبەختانە لەسەر مەسەلەی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی تر هەموو یەکهەڵوێست بووین و، بڕیاردرا کە بە هیچ شێوەیەك، ئێمە وەکو کوردو کوردستانی، قبووڵ ناکەین هیچ جیاوزییەك بخرێتە نێوان کەرکووك و پارێزگاکانی تری عێراق و، نابێت کەرکووك جیابکرێتەوەوهیچ یاسایەکی تایبەت یان ماددەیەکی تایبەتی لەسەر کەرکووك نابێت، تەنها ماددەی ١٤٠ ، ئەمە هەڵوێستی هەموو لایەکمانە". ئەم یەکدەنگی و یەکهەڵوێستییە، جارێکی دی هەموو خەڵکی کوردستانی دڵخۆش کردو لە پێش هەموانیشدا سەرۆکی هەرێمی کوردستان رایگەیاند:" من زۆر زۆر خۆشحاڵم، کە میللەتی کورد لەمەشدا، دیسان یەکڕیزی نواندو بە هەموو لایەنەکانیش رادەگەیەنین کە ئێمە وەکو کورد یەکهەڵوێستین".

لە راگەیاندراوی کۆبوونەوەی حزب و لایەنە کوردستانییەکاندا، یەکدەنگی و یەکهەڵوێستی بە پێویستییەکی ئەم قۆناغە لە قەڵەمدراو، بۆ ئەم مەبەستەش بڕیاری بەردەوامبوون و پەرەپێدانی ئەم جۆرە دانیشتنانەیان داوە، بەمەبەستی قووڵکردنەوەی کاری هاوبەش لە هەموو بوارەکاندا، هەروەك لە راگەیاندراوەکەیاندا هاتووە.

ئەم یەکدەنگی و یەکهەڵوێستییە لەبەرامبەر شۆڤێنیەکاندا، جارێکی دی دەبێتەوە داینەمۆی پتەوبوونەوەی یەکڕیزی و توندبوونی بەرەی ناوەخۆ، لەبەرامبەر هەر هەڕەشەیەك کە لە کوردستان و مافی رەوای کورد دەکرێ، ئەگەرچی شۆڤێنیەکان هەوڵی ئەوە دەدەن ماددەی ١٤٠ جێبەجێ نەکرێ، لێ زۆر گرنگە، ئەمڕۆ هەموو لایەك، بە پەرلەمان و حزب و لایەن کوردستانییەکان، پابەندبوون بە جێبەجێ کردنی ماددەی ١٤٠ دووپات دەکەنەوە.

کۆبوونەوەی پەرلەمان و حزب و لایەنە کوردستانیەکان، ئەوەی پێڕاگەیاندین جیاوازی لە کوردستان و یەکدەنگی لە بەغدا، ئەو وێنەیەیە کە خەڵکی کوردستان شاگەشکە دەکات،

دەکرێ بڵێین لێرەوە قۆناغێکی دی دێتەپێشەوە، دەخوازرێ ئەم یەکـدەنگی و یەکهەڵوێسـتییە بەردەوامی پێبدرێت، بەرژەوەندی باڵای وڵات لە هـەمووان دەخـوازێ، هەمیشـە یەکـدەنگی لەبەرامبەر هەر پیلان و هەڕەشەیەکی سەر کوردستان پێشان بـدرێت، ئـەو یەکهەڵوێسـتییەی پەرلەمان و دواتریش کۆبوونەوەی حزب و لایەنە کوردستانییەکان، ئازایەتی و هاتنەدەنگە لـە ئاست مەسەلە چارەنووسسازەکانی گەلەکەمان، ئەو ئامادەبوونە ئەوەشمان پێ دەڵـێ، کـە زۆر زەحمەتە بۆ هەر لایەن و بۆچوونێك، خۆی لە مەسەلە نەتەوایەتییەکان ببـوێرێ، جـارێکی دی ئەو پەیامە دەدرێتە ئەوانەی نایانـەوێ عێراقـی نـوێ عێراقـی هـەمووان بێـت، کـە پرسـی نەتەوایەتی و چارەنووسی گەلی کوردستان هێڵـی سـوورەو، نـابێ بـە دیـتنی جیاوازییـەکانی کوردستان بچنە سەر ئەو باوەڕەی کورد پەرتەوازەیە، سەرۆکی هەرێمی کوردستان کـە خـەڵك متمانەیان پێداوەو سوێندی خـواردووە پارێزگـاری لـە گـەلی کوردسـتان بکـات، ئەنـدامانی پەرلەمانی کوردستانیش پابەندن بە بەرگری کردن لە کوردستان.

بێگومان ئەم خولەی پەرلەمانی عێراق زۆر گرنگە، ئەگەر یەکدەنگ نەبین هەمیشە بە بـە لاواز دەبیندرێین، ناسیونالیزمی عەرەبی دەیەوێ بـەم هێنـان و بردنـەو، زیـادکردنی ژمـارەی دانیشتوانی چەند پارێزگایەك و، خۆدزینەوە لە سەرژمێریی دانیشتوانی تەواوی عێراق، گـورز بوەشێنێ و بە فرت و فێڵ و تەڵەکەبازی و بەشێوەیەکی سەپێندراوو هەل قۆستنەوە، لـە رێـی دەنگدان بەو یاسانەی خۆیان گەرەکیانە، مافەکانمان زەوت بکەن و پاشان بە یاسـایی دابنـێین، لێرەوە یەکدەنگی و یەکهەڵوێسـتی ئەوپـەڕی ئازایـەتی و جوامێرییـە، ئازایەتییـەك رەمـزی نەتەوایەتی کورد بارزانیی نەمر و سەرکردەو تێکۆشەرانی دیکەی گەلەکەمانی پـێ ناسـراوە، دوێنێ خوێن بەخشین و شەڕی قارەمانانە بەرگری بوو لـە داوای رەواو چارەنووسـی میللـەت، ئەمڕۆ پارێزگاریکردن لە دەسکەوتەکان و خەبات لەپێناوی  چارەنووسی خـەڵکی کوردسـتان، لەرێی یەکدەنگی و یەکهەڵوێستی دەبێت، ئەوانەی دوێنێ تا ئەمڕۆیان هێنـا ئـازابوون، بۆیـە رۆژنامەنووسێکی وەك دانا ئادەم شمیدت بە ماندووبوون و هیلاکییەکی زۆرەوە، لـە سـەرەتای شەستەکانی سەدەی بیستەم خۆی گەیاندە ناوچە ئازادکراوەکانی شۆڕشی مـەزنی ئـەیلوول و، دوای دیدار لەگـەڵ بـارزانیی نـەمر و بەسـەرکردنەوەی زۆربـەی ناوچـەکانی کوردسـتان، کـە گەڕایەوە کتێبێکی دەرکردو ناوی لێنا "سەفەرێك بۆ ناو پیاوە ئازاکان لە کوردسـتان" ، جـا ئەگەر بەدیدی دانا ئادەم خۆڕاگری و سەنگەرگرتن لە دوژمن ئازایەتی بێ کە هەروایـە، ئـەوا

ئەمڕۆش سەرۆك و تێكۆشەرانی وڵاتی پیاوە ئازاكان، لە قۆناغێكی دیكەی خەباتدا، یەكدەنگی دەنوێنن و لە ریزی پێشەوەی پارێزەرانی وڵاتن.

لە سۆنگەی ئەمەوە، ئەم یەكدەنگییەی كورد، دەبێتە هۆی ئەوەی لایەنەكانی عێراق و ئەمەریكاییەكان، جارێكی دی رێگەی هەولێر بگرنەبەر، لێ وەك لە هەڵوێستی هەموولایەك بەدی دەكرێ، ئەمجارە سنوورێك بۆ داخوازییەكانی بەرامبەر دابندرێ، هەستاری قۆناغەكەش ئەوە دەخوازێ، بۆیە پێ دەچێ فشارەكان زیاتربن، لێ یەكدەنگی و یەكهەڵوێستی بەردەوام، كەشێكی دیكە بۆ قسەكردن لەسەر ئەو بارودۆخە تازانە دێنێتەپێش، كە كورد بە ئامادەیی لە گۆڕەپانەكەدا دەهێڵێتەوە.

تێبینی: (پیاوە ئازاكان)ی ناونیشانی ئەم بابەتە لە ناونیشانی كتێبی دانا ئادەم شمیدت(سەفەرێك بۆ ناو پیاوە ئازاكان لە كوردستان) سەرچاوەی گرتووە، كە ئەمساڵ لەلایەن برای بەڕێزم كاك ئەبوبەكر ساڵح كراوە بە كوردی.

٢٠٠٩/١٠/٢٥

# هەڵوێستێك...

# نەخشەی ڕێگایەکی دوور و درێژ

تادێت ناسیونالیزمی عەرەبی لەسەردەمی کرانــەوەو مــافی مــرۆڤ و دیموکراســی دا زیــاتر دەمامك لادەدات و هێندەی دەیهێنێ و دەیبات نازانێ چۆن لەگــەڵ ســەردەمدا هــەڵ بکــات، ئەوەندەی ئەمڕۆ لە ئێراقی نوێدا ناسیونالیزمی عەرەبی بەلای ڕەوتی ناواقیعیدا دەڕوانێ، نیو ئەوەندە بەلای کرانەوەو قبوڵ کردنی بەرامبەردا ناڕوانێ، ئیــدی ئــەو مەیلــەی ناســیونالیزمی عەرەبی زادەی چەندین قەیرانە لە ئێراق و ناوچەکەدا، هەر وەختێك هــەوڵی دابێــت تێکــەڵی لەگەڵ چەمکەکانی سەردەمدا بکات، ئەوە تــەنیا بــۆ کــات کوشــتن و گــەڕان بــووە بــە دوای قۆستنەوەی هەل و دەرفەت. ناسیونالیزمی عەرەبی لە ٤٠ ساڵی ڕابردوو کــە لەوپــەڕی هێــزو تواناداا بووە بۆ ئەوەی لەسەر حسابی شوناسی میللەتانی دیکە خۆی بێنێتە پێش دۆخــی ئــەو ماوەیەش لە بەرژەوەندی دابووە، هەمیشە زانیاریی دەربــارەی میللــەتانی نــاو جوگرافیایــەك لەگەڵ عەرەبدا هەبووە، لەنێو ئەو میللەتانەش کورد، دەکرێ بڵێین لــە مــاوەی نزیکــەی نیــو سەدەی ڕابردوودا ناسیونالیزمی عەرەبی لە ئێراقدا ســامانی وڵات و تــەواوی وزەی خــۆی بــۆ شوێن بزرکردنی شوناسی کورد خەرج کردووە لەو پێناوەشدا زانیــاری زۆری دەربــارەی کــوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان کۆکردۆتەوە، ئەو شکڵ و شێوازانەی هەر جارەی لەسەردەم و کاتێکەوە بە ناوی ناسیونالیزمی عەرەبی لە دەسەڵات بوون زۆر بــاش دەزانــن مــافی کــورد چییەو چی دەوێت و جوگرافیای کوردستان کوێیە، لێ لە هەر سەردەمێکدا لە سفرەوە لەگــەڵ کورد دەست پێدەکەنەوەو سادەترین ماف کە ڕەنگە وەك بابەتی سەردەم نەمابن چەندین گەڕی گفتوگۆو دانوستانی ویســتووە ئیــدی ئــەوەی دوێــنێ دکتاتۆریــەت بــەزەبرو زەنــگ وەڵامــی داوینەتەوە ئەمڕۆ لە سایەی دیموکراسی و ئازادیدا پەنا بۆ فڕوفێڵ و تەڵەکەبازی دەبــەن. ئــەو

مامەڵەیەی ئەمڕۆ ناسیونالیزمی عەرەبی بەرامبەر کەرکووك دەیکات هەمان مامەڵەی نەوەکانی پێشووی ناسیونالیزمی عەرەبە لەگەڵ کورد و مەسەلەی کەرکووك ناسیونالیزمی عەرەبی هەمیشە هەوڵ دەدات، فاکتەری ئیقیلیمی و نێودەوڵەتی لە بەرامبەر کورددا بەلای خۆیدا بشکێنێتەوە لەلایەکی دیکەشەوە بەردەوام گرەو لەسەر نێومالّی کوردو کوردستان دەکات لێ گەورەترین کۆسپی بەردەم ناسیونالیزمی عەرەب بەرەی ناوخۆی کوردستانە، کەی ئەو بەرەیە لاوازبوو ئاگای لەوە نامێنێ سەردەم سەردەمی دیموکراسی و قبوولّ کردنی بەرامبەرە بۆیە لە رۆژگاری ئەمڕۆشدا هەولّی ئەوە دەدات دیواری مالّی کورد بسمێ و لێی بێتە ژوورەوە، ئینجا لە بەغدا دەروازەکانی گفتوگۆ دابخات و سواری سەری خۆی بێت و هەر خۆی ببینێ ئەمڕۆ ناسیونالیزمی عەرەبی بەغەدرێکی گەورەی دەزانێ لە دەستووری هەمیشەیی ئێراقدا ناوی کورد و هێشتنەوەی واقیعی هەرێمی کوردستان و چەندین مەسەلەی پەیوەست بە مافی مرۆڤ و ئازادی هەیە، بەردەوام لە فورسەتێکدا دەگەڕێ بە رەزووی خۆی هەمواری بکاتەوەو جارێکی دی لێنەگەڕێ مافی کورد و نەتەوەکانی دی لە دەستووردا پارێزراوبێت. ئەمڕۆ ناسیونالیزمی عەرەبی بۆ بەرێ کردنی یاسای هەڵبژاردن لە پەرلەمانی ئێراقدا پەلاماری کەرکووکی داوەتەوەو لەگەڵ هەندێ تورکمانی توندڕەو و ناواقیع بین، لەهەولّی ئەوەدایە لە رێی سەپاندنی پێشنیارو پرۆژەکانی خۆیەوە چەند یاساو پێشنیارێك بکاتە ئەمری واقیع و بەسەر کوردیدا بسەپێنێت ئەوەی ناسیونالیزمی عەرەبی گرەوی لەسەر دەکات تێکدانی ریزەکانی کورد و لاوازکردنی کوردستانە لە ناوەوەڕا لێ بەرامبەر ئەو رەوتە خۆسەپێنە پرسی نەتەوەیی لە کوردستاندا زیاتر دەبێتە خەتی سوورو هێزو لایەنە کوردستانیەکان خۆبواردن لە بەزاندنی ئەو خەتە سوورەدا بە خەتێکی سووری دیکە دەزانن بۆیە خەڵکی کوردستان چاوی بریوەتە سەرۆکایەتی هەرێم و پەرلەمان و حکوومەت و هێز و لایەنە کوردستانیەکان کە هەڵوێستی هەمووان لەو رووەوە دیارو ئاشکرایە، لە رێوڕەسمی سوێندخواردنی ستافی وەزیرانی کابینەی شەشەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە پەرلەمانی کوردستاندا، جارێکی دی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکان بوونەوە باسی گەرمی رێوڕەسمەکە چ وەك خستنەڕووی چەند تەوەرێکی بەرنامەی حکوومەت بۆ خزمەتکردنی ئەو ناوچانەو چ هەڵوێستی سەرۆکی کوردستان لە کاتی خوێندنەوەی وتاردا بەو بۆنەیەوە بەڕێز سەرۆك بارزانی وەك پارێزەری خاك و مافی خەڵك و سووربوون لەسەر پرسی گرنگی نەتەوەیی، جارێکی دی هەڵوێستی هەرێمی کوردستانی دەربارەی مەسەلەی کەرکووك راگەیاند کە نابێت

هیچ تایبەتمەندییەك بدرێتە كەركووك و زۆر راشكاوانە فەرمووی لێناگەڕێین هیچ خسوسیەتێك بدرێتە كەركووك ئینجا چی دەبێت بابێت، لەلایەكی دیكەدا سەرۆكی كوردستان لەو خاڵ و تەوەرانەی لە وتارەكەیدا هاتبوون جەختی لەسەر پێكەوە كاركردن و خزمەتكردنی خەڵكی كوردستان كردەوەو ئاماژەن بۆ قۆناغێكی تازەی هەرێمی كوردستان كە تیایدا هەوڵی زیاتری دیبلۆماسی دەدرێت و درێژە پێدەرێ كاری كابینەی پێنجەم دەبێت بە گرنگ زانینی خزمەتكردنی خەڵك و برەودان بە ئازادی رۆژنامەوانی و كاری سیاسی و گرنگی دان بە نوێنەرایەتی هەرێمی كوردستان لە دەرەوەو راگەیاندنی كردنەوەی دەرگای دیوانی سەرۆكایەتی بۆ لێپێچینەوەو بەدواداچوون، هۆكارێكی گرنگی توندبوونەوەی بەرەی ناوخۆو بەهێزبوونی ئینتمیای نەتەوەیە، هەموو ئەو هەڵوێستانەی سەرۆكی كوردستان ئاماژەیەكن بۆ پێچانەوەی ئەم قۆناغە و هاتنە پێشەوەی قۆناغێكی تازە، كە تیایدا یەك هەڵوێستی ببێتە بنەمای دواندنی بەغدا جەخت كردنەوەی سەرۆك بارزانی لەسەر كەركووك دەبێتە فاكتەری بەهێزبوونی ئیرادەی خەڵكی كوردستان و یەك دەنگی خەڵكی كوردستانیش سەرمایەكی گەورەو لە بن نەهاتووە بۆ سەرۆكی كوردستان، لەلایەكی دیكەشەوە پەیامێكە بۆ ئەوانەی دەیانەوێ فشار بخەنە سەر كورد و تەسلیمی ئیرادەیان ببێت ئەو سەدای دەنگی هەڵوێستەی لە هەولێری پایتەختی هەرێمی كوردستانەوە دێت، پەیامێكە بۆ ناسیونالیزمی عەرەب كە ئەگەرچی هەولێر كەناڵی گفتوگۆ لەگەڵ بەغدا بە گرنگ دەزانن، بەڵام لەولاشەوە ئەوە دەگەیەنێ كە بە گرنگ زانینی گفتوگۆ لە روانگەی لاوازییەوە نییەو لە بەرامبەر هەر هەوڵێك بۆ سەپاندنی پرۆژەو پێشنیاری ناڕەوا بەسەر كورد وەك ئەوەی بۆ كەركووك هەیانە هەڵوێستی دەبێت ئەو دەنگەی لە هەولێرەوە بەرز دەبێتەوە دەنگێكە لە واقیعەوە هەڵقولاوەو تەنیا بەرزكردنەوەی دروشم نییە، بەڵكو لە رۆژی رێورەسمی سوێند خواردنی ئەندامانی كابینەی شەشەمەوە بەرزبۆتەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ ئەو دەنگەڕەوایە دەبێتە بەشێك لە بەرنامەی كاری قۆناغی دادێ چونكە بەرامبەر بڕیاری داوە گوێ نەگرێ، تا ئەو شێوە بیركردنەوەیەی ناسیونالیزمی عەرەبی بەردەوام بێت، رێگای تێكۆشان دوورو درێژتر دەبێتەوە.

٢٠٠٩/٩/١

# ئەمجارەش بۆ کورد

شەش ساڵی رابردوو بـۆ کـورد پـڕن لـە جموجـۆڵی سیاسـی و کێشمەکێشـمی گفتوگـۆی دوورودرێژی بەغدا، بەدرێژایی ئەو ماوەیە، کورد هەمیشە دەستی بـۆ دیـالۆگ درێـژکردووە، کەچی بەرهەمی هەڵوێستی کورد بەمرۆ گەیشتووە، کە گەلەکۆمەکییەکی گەورەی لێ دەکرێ و، دوای ئەوەی بەغدا خۆی لە جێبەجێ کردنـی مـاددەی ١٤٠ دزیـەوە، ئێسـتا کـەرکووکی کردووە بە گرێ کوێرە، ناسیونالیزمی عەرەبی پێ لەسەر ئەوە دادەگرێ، کە لەگـەڵ تورکمانـە توندڕەو و ناواقیع بینەکان، کەرکووك لە پارێزگاکانی دیکەی عێراق جیابکەنەوە.

لە گەرمەی خۆئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق، قـەوارە گـەورەکانی شـیعە لێك نزیك بوونەوە، سوننەش دەمێکە خەریکی خۆکۆکردنەوەن.

تەوەری سەرەکی ئەو خۆکۆکرنەوەیەی هەردوولا، لەسەر حیسابی کورد دەبێت و، دەیانەوێ بەتەواوی پاشەکشە بە کورد بکەن، یەکێك لە ئامانجەکانی گردبوونەوەی عـەرەبی بـۆ ئەویـە، کورد لە پۆستی سیادی نزیك نەکەوێتەوە، هەر لە ئێستاوە چەندین کەسی عەرەب خـۆی بـۆ پۆستی سەرۆك کۆمار ئامادەکردووە، ئەمەش وەك ئاماژەیەك کە چیدی ئەو پۆستە نەدرێتەوە کورد، بۆ مەسەلەی کەرکووکیش چەندین دەستی دیکەیان لەدەرەوەڕا هێناوەتـە نـاوەوەو، بـە هەموان دژی دەستوور دەوەستنەوە، بەشداری کورد لـە هەڵبـژاردنی ٢٠٠٥ پێگەیـەکی لـە بەغدا پێداین، ئەو پێگەیە بۆ کـورد گرنگـە، بۆئـەوەی لـە بەغـدا جێگەوڕێگـەمان هـەبێ، پێویستە ئەمجارەش هەموومان لە پێناوی کورددا یەکدەنگ بین، هەقە لێـك نزیـك بوونـەوەی لیستە گەورەکانی شیعە، زەنگێکی دیکەبێت بۆ کورد، ئاخر شیعە بەو سـەنگەی خۆیانـەوەو سوننەش هەروا، هەردووکیشیان وەك عەرەب کە زۆرینـەن، وێـڕای نـاکۆکی دێـرینی شـیعەو سوننە، کەچی لەبەرامبەر کورد خۆیان لێك نزیك دەبنەوە، ئەمە لە کاتێکـدا سـوننەو شـیعە وەك مەزهـەب و وەك عـەرەبیش، قـووڵایی سـتراتیژی خۆیـان هەیـە، فاکتـەری ئیقلیمـی و

نێودەوڵەتیش بەلای ئەواندا دەشکێتەوە، لە چەند مانگی رابردوو کردمانە هەڵلا، گوتمان قەیدی ناکا ئەگەر بە یەك لیستیش نەچینە هەڵبژاردن، لەمەشدا دەمانویست لاسایی عەرەب بە شیعەو سوننەوە بکەینەوە.

پێمان وابوو کەرت بوونی لیست و قەوارەکانیان، حاڵەتێکی ئاساییەو بەلای ئەوەدا دەچین کە چاویان لێبکەین، ئێستا ئەوان بەگەرمی خۆیان کۆدەکەنەوەو فشارمان بۆ دێنن، کەچی تا ئێستا دەنگێکی وامان لە کورد نەبیست، بلێ کاتی ئەوە هاتووە ئێمەش هەموو ناکۆکییەکان وەلا بنێین، دەبا ئەمجارە چاو لەوان بکەین، هەقە ئەمجارەش بۆ خاتری کورد بکەوینەخۆ، وادیارە تا ئێستا هەڵوێستی نوێنەرانمان لە بەغداو، پشتیوانیی کوردستان بە خەڵك و هێزو لایەنە کوردستانییەکان، وای کردووە رێگری لە سەپاندنی پرۆژەی ناواقیعی بەسەر کورددا بکرێ، هەقە گردبوونەوەی زۆرینەی عێراق کە عەرەبە، ببێتە مایەی پرسیارێکی جدی، ئەوە ئێمەی کورد بەتەمای چین ئەگەر لە بەرامبەر عەرەبی زۆرینە خۆمان کۆنەکەینەوە؟ بۆ دەبێ لەو نێوەدا فشاری چارەسەرکردنی گرفت و کردنەوەی گرێ کوێرە، هەر بۆسەر کورد بێت، ئەوەی ئێمە لەبەرامبەر ئەو شاڵاوە رەگەزپەرستییە رادەگرێ یەکدەنگییە، ئەو یەکدەنگییە لە یەکلیستیدا بەدی دەکرێت، دەبا ئەمجارەش بۆ کورد کاربکەین، دەنا کات بەسەر بچێت، هاوارو فیغان دادمان نادات و پەنجەی پەشیمانی دەگەزین.

٢٠٠٩/١١/٨

## کەرکووك

## لە سیاسەتی رۆژی ناسیونالیزمی عەرەبیدا

دیموکراسی بوون تەنیا بەوە تەواو نابێت ژمارەیەکی زۆری حزب و گۆڤار و رۆژنامە دەربچن، بە تایبەتیش لە ولاتێکی فرە نەتەوە و ئایینی وەك عێراق، زۆرجار دەگوترێت بەغدا زۆر لە پێش هەرێمی کوردستاندایە، راستە لە عێراقدا حزب و رێکخراوی سیاسی زۆر و زەوەند هەیە، بەڵام ئەمە لایەنێکی دیموکراسییە، عێراق ولاتێکی فرە نەتەوەو ئایینە، کەی لە عێراقدا ناسیونالیزمی عەرەبی نەتەوەو پێکهاتەکانی دیکەی قبوڵ کرد، ئەوا دەکرێ بڵێین دیموکراسی چەند هەنگاوێك چووەتە پێشەوە.

ئەوەی تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە ناسیونالیزمی عەرەبی ناتوانێ لە کەشێکی دیموکراسیدا هەڵ بکات، بە تایبەتیش لە عێراقدا کە جگە لە عەرەب نەتەوەی دیکە هەن و لە دەستووری هەمیشەیی عێراقیشدا ئاماژە بە کورد و پێکهاتەی دیکە کراوە، سەبارەت بە کورد پێشتریش و لە ١٩٥٨ ناوی کورد لە دەستووردا هاتووە وەك شەریکی عەرەب، لێ ئەوەی ئەمڕۆ ناسیونالیزمی عەرەبی دەیکات کارێکە بە پێچەوانەی دەستوور، رەنگە ئەمەش بۆ ئەوە بگەڕێتەوە کە ناتوانێ لەگەڵ سەردەمدا بڕوا و ناتوانێ لە دۆخێکدا بژی تیایدا نەتەوەو پێکهاتەکانی دی بە مافی خۆیان شاد بن، بۆ ئەوەی لەو رێیەوە پەڕو باڵی پرۆسەی سیاسی بکات و رێگەی پراکتیزەبوونی دیموکراسی بگرێت، پەنا دەباتە بەر بە

باروت کردنی کەرکووك، ئەمە قسەیەکی ناسیونالیستانی عەرەبە و هەر کاتێك ویستیان پرۆسەی سیاسی پەك بخەن، کەرکووك دێننەوە سەر مێزو دەیکەن بە بابەتی سەرەکی، ئێستاش ناسیونالیزمی عەرەبی هەست دەکات دەستوور و هەڵبژاردن و بەرەو پێشەوەچوونی پرۆسەی سیاسی و رێگە خۆشکردن بۆ پراکتیزەکردنی دیموکراسی لەبەرژەوەندی خۆیدا نابینێت، بۆیە پەلاماری کەرکووك دەدات و دەیکاتە بابەتی سەرەکی سەر مێزی گفتوگۆی پێکهاتەکانی عێراق، ئەمەش بۆ ئەوە نییە کە بە دوای چارەسەرێکی ریشەییدا بگەڕێت، بەڵکو بۆ ئەوەیە گەلەکۆمەکی لە کەرکووك بکەن، کە بەو هۆیەشەوە کورد قبوڵ ناکەن، ئیدی بەو رێگەیە حاڵەتێك دروست دەکات هیچ لایەنێکی عەرەبی نەتوانێت هەنگاوێك لە کورد بێتەپێشەوە، بەمەش لە ڕێی کەرکووك دژی مافەکانی کورد دەوەستنەوە و کۆسپ دەخەنە ڕێی پێشکەوتنی عێراق.

ناسیونالیزمی عەرەبی دۆخێکی خولقاندووە، ناسیونالیستانی عەرەب نەتوانن راستی دەربارەی کەرکووك ببینن، بۆیە هەر لایەنێك بە چاوێکی واقیعی سەیری کەرکووك بکات، ئەوا ژینگەی ناسینالیستانی عەرەب سەرزەنشتی دەکات، ئیدی هەر لایەنی عەرەبیە، سواری سەری خۆی دەبێت و دژی چارەسەری کەرکووك دەوەستیٚ، بەمەش زیان لە کورد دەدات، ئەو زیان لێدانە لە کورد ئامانجی ناسیونالیزمی عەرەبییە.

بۆ رێگەگرتن لە هەڵبژاردن هاتن دۆخێکی تایبەتیان بۆ کەرکووك دانا، ئەمەش مایەی بێزارکردنی کوردە، بۆ ئەوەی کۆسپ بخرێتە بەردەم پرۆسەی سیاسی، مەرج بۆ کەرکووك دادەنێن، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە واقیع نابینن، بۆیە لە ناسیونالیستانی عەرەب دەبیستین کە ماددەی ١٤٠ ی دەستوور بەسەرچووە، لەولاشەوە جارێکی دی دژی دەستوور رادەوەستنەوەو هەڵبژاردنی کەرکووك لە هەڵبژاردنی هەموو عێراق جیا دەکەنەوە، هەموو لایەك دەزانیٚ لە سەرژمێری ١٩٥٧ کورد زۆرینەی کەرکووك بووە، دواتر ئەو هەموو خێزانەی کورد لە کەرکووك دەرکرا دەستوور رێگەی پێدان بگەڕێنەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆیان، کەچی ئەو مافە بە کورد رەوا نابینن.

ناسیونالیزمی عەرەبی پرۆژەی سەیرو سەمەرە بۆ کەرکووك دەخاتە ڕوو، ئەمەش لەوەوە دێت کە هێشتا عەرەب بە برا گەورە دادەنێت، بەلاّم چ برا گەورەیەك ئەو برا گەورەیەی تەنها خۆی بڕیاردەر بێت و حساب بۆ هیچ کەسێکی دیکە نەکات، لەلایەن ناسیونالیستانی عەرەب زۆر روون و ئاشکرایە کە کورد زۆرینەی کەرکووکن، ئەمەشیان

پێ هەرس ناکرێت، بۆیە پرۆسەی بە بەرمیلی باروت کردنی کەرکووك بە بەدیل دادەنێن، لێرەشەوە دەیانەوێ نێوەندە جیهانیەکانی پێ بترسێنن، هەر پرۆژەیەك بخرێتە ڕوو و لە بەرژەوەندی گشتیدا بێت دژی دەوەستن.

ئەوەی جێگەی سەرنج و تێبینیە ئەوەیە کە پێییان وایە دەبێ کورد بەبێ مەرج بە پرۆژەکانی ئەوان رازی بێت، بیر لەوە دەکەنەوە کە بە حوکمی زۆرینەی عەرەب هەموو ئەو پرسانەی ئالۆز دەبن وەك مەسەلەی کەرکووك لە پەرلەمان بخرێتە دەنگدانەوە، بەو حاڵەش لە هەموو دەنگدانێکدا ئەوان بە حوکمی زۆرینە دەیبەنەوە.

بۆیە هەقە نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی عێراقدا بە هیچ جۆرێك ڕێگە نەدەن کێشەی کەرکووك بەئاراستەیەك ببرێت، لێمان وەزەحمەتتر بکەوێت، ئەوەی مایەی خۆشحاڵیە نوێنەرانی کورد لە پەرلەمانی عێراق ڕێگری باشیان لە تێپەڕاندنی ئەو جۆرە پرۆژەو یاسایانە کردووە، کە دەخوازرێت بەسەر کورددا بسەپێندرێت.

لە کوردستانیش لە ئاستی پەرلەمان و هێزە کوردستانیەکاندا یەکدەنگی لەبەرامبەر هەڵوێستی بەغدا هەیە، بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی کوردستان لە ڕێورەسمی متمانە بەخشین بەئەندامانی کابینەی شەشەمی حکومەتی هەرێمی کوردستان، ئاماژەی بەوەکرد کە نابێ بە هیچ شێوەیەك غەدر لە کەرکووکیەکان بکرێت و قبوڵ ناکرێ هیچ تایبەتمەندییەك بدرێتە کەرکووك، لە راستیدا ئەو راشکاوی گۆیەی سەرۆك بارزانی زۆر گرنگە، هەڵوێستەکانی سەرۆك بارزانی دەربارەی کەرکووك داینەمۆی کۆبوونەوەی تەواوی خەڵکی کوردستان و هێزو لایەنە سیاسیەکانە لەبەرامبەر ویستی ناواقیعیی شۆڤێنستان.

لێرەوەیە بە چاوی گومانەوە سەیری دۆخی خوڵقێندراوی ئێستای عێراق دەکەین، ئەگەر کەرکووك بەو شێوەیە لە لایەن ناسیونالیستانی عەرەبەوە سەیر بکرێت، ئەوا هەق نیە کەس باس لە دیموکراسی بکات، عێراق بەبێ چارەسەری ریشەیی کەرکووك و ڕەچاوکردنی واقیع و لەبەرچاوگرتنی سەنگی کورد، عێراقێك دەبێت لە شێوەی عێراقی جاران و دکتاتۆریەت شوێنی ئەو دیموکراسیە دەگرێتەوە کە هێشتا بەتەواوی جێگیر نەبووە.

کورد دەمێکە چاوەڕێی بەغدا دەکات، کە نەیتوانی هەنگاوێکی جدی بهاوێ و ماددەی ١٤٠ ی دەستور جێبەجێ بکات، ئەمەش مەرامێکی کار بۆ کراوی ناسیونالیزمی عەرەبی لە پشتەو دوای تەواو بوونی قۆناغەکانی جێبەجێکردنی ئەو ماددەیە، کردیانە هەراو هۆریا کە ماددەی ١٤٠ بەسەرچووە، دەرکەوت وێڕای گۆڕانی دۆخی سیاسی هێشتا ناسیونالیزمی

عەرەبی هەڵگری  پرۆژەی پشت گویٚ خستنی کـوردە، بۆیــە کـوردیش بــە دوای میکـانیزمی دیکە بۆ قۆناغی دادێی کەرکووکدا دەگەڕێت.

نابێت چیدی کەرکووك بە پێی سیاسەتی رۆژی ناسیونالیزمی عەرەبی مامەڵـەی لەگەڵـدا بکرێت، کەی بە پێویستی زانی و لە بەرژوەندی بوو بیکاتە بابەت و پرۆژەی خـۆی بخاتــەڕوو، کە لە بەرژەوەندیشیدا نەبوو خۆی لیٚ بدزێتەوەو پشت لە ماددەی ١٤٠ بکـات، کـاتی ئـەوە هاتووە کورد لە دۆخی چاوەڕوانی دەرچێت و بە دوای میکانیزمی تازەدا بگـەڕیٚ و رێگـە لـە پرۆژەی بەرچاو تەنگانە بگرێـت، کـارکردن و خســتنە ســەر مێـزی ئـەو پـرۆژە شـۆفێنیانە، مراوەحەمان پێدەکات و دەمانگێڕێتەوە دواوە، بەراستی ئەو جـۆرە پرۆژانــەی ناســیونالیزمی عەرەبی بۆ کەرکووك هەیەتی هی ئەوە نین کورد بەلایاندا بچێت و گفتوگۆیان لە بارەوە بکات، چونکە لەراستیدا زیاتر پرۆژەیەکن بۆ کات کوشتن و تەڵە دانانەوە بۆ کورد.

٢٠٠٩-١١-١٢

# ئەورووپاییەکان گوێ لە کورد دەگرن

ئەگەرچی هەرێمی کوردستان وەك واقیعێکی دروستبووی دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ لەدەستوری عێراقی نوێدا دانی پێدانراوە، لێ هێشتا ژینگەی ناسیونالیزمی عەرەب بەدوای ئەوەدا دەگەڕێت، ئەو واقیعە دانپێدانراوە کەم بکاتەوە، ئەگەر بۆی بچێتەسەر هەموو دەروازەکانی کوردستان دەگرێت و لێ ناگەڕێت ئەو پەیوەندییە دیبلۆماسیەی هەرێمی کوردستان هەیەتی درێژەی هەبێت، بەڵام هەرێمی کوردستان وەك واقیعێك لەماوەی ١٨ساڵی رابردوو زۆر دەروازەی بۆ کراوەتەوە، لەنێو ئەو ناوەندە جیهانیانەی دەرگا بۆ کورد دەکەنەوە ئەورووپایە.

گەشتی ئەمجارەی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ ئەورووپا، چەند مانایەك دەبەخشێت، چونکە لەگەرمەی گفتوگۆی چڕو کێشمەکێشی نێوان پێکهاتەکانی عێراق بوو دەربارەی یاسای هەڵبژاردن. ئەو یاسایەی دەمێکە زۆرینەی پێکهاتەکانی عێراق هەوڵی ئەوەیان بۆ دەدا، بەجۆرێك بێت، تەنیا بەرژوەندی لایەنێکی تێدا رەچاو بکرێت، بۆ ئەم مەبەستەش جەمسەرەکانی ناسیونالیزمی عەرەبی بەچەند ئاراستەیەکدا هاتنە مەیدان، بۆیە دەکرێ لە چەند ڕوویەکەوە ئەم سەردانە دیبلۆماسییەی سەرۆك بارزانی بۆ ئەورووپا بخوێنینەوە.

* جیا لەوەی سەرۆك بارزانی سەنگی تایبەتی لەنێوەندە سیاسیی و دیبلۆماسییەکانی جیهان هەیە، بەڵام ئەمجارە یەکێتی ئەورووپا پێشوازی لە سەرۆکێکی هەڵبژێردراو لەلایەن خەڵکی کوردستانەوە کرد، کە ٪٧٠ی خەڵکی کوردستان متمانەیان پێ بەخشیووە.

* له بەغدا هەوڵێکی زۆر لە ئارادایە رۆڵی کورد کەم بکەنەوە، هەربۆیە پەیوەندی نێوان هەولێرو بەغدا بە ئاقارێکدا دەبەن، بۆ ئەوەی ئاڵۆزتری بکەن و دەیانەوێ سەرەداوەکانی دۆزینەوەی چارەسەری بزر بکەن، کاری زۆر لەسەر پەراوێزکردنی دەستوور دەکەن، چونکە لەدەستووردا چارەسەری هەیە، دەستوور هەرێمی کوردستانی وەك واقیعێکی دوای ١٩٩١ناسیووە، ناسیونالیزمی عەرەبی پێیوایە دەستوور ئامرازێك نییە بۆ پەڕوباڵ بەستنی هەرێمی کوردستان و پەکخستنی جموجۆڵی دیبلۆماسی و سیاسی هەولێر. ئەم سەردانەی سەرۆکی کوردستان بۆ ئەورووپا پەیامێکە بۆ ئەوانەی واقیع وەك خۆی ناخوێننەوە، کە پاشەکشەکردن بەو واقیعەی هەرێمی کوردستان، پاشەکشەکردنی پرۆسەی سیاسی و دیموکراسیە لە عێراقدا.

* دەمێکە ناوەندە جیاجیاکانی ناسیونالیزمی عەرەبی وێڕای دروستکردنی کۆسپ لەڕێی هەولێرو بەغدا و گەلەکۆمەکی کردن لە هەرێمی کوردستان، هەوڵی ئەوەش دەدەن ئەورووپا و جیهان تێبگەیەنن، کە کورد هۆکاری ئاڵۆزی و پەشێوییە لە عێراقدا، بۆیە ئەم سەردانەی سەرۆکی کوردستان بۆ ئەورووپا لەکاتێکی گرنگدا بوو، ئەوەی لێ دەخوێندرێتەوە کە ئەورووپا تەنیا گوێ لە بەغدا ناگرێت، بەڵکو گوێ لە هەولێریش دەگرێت.

* بەپێچەوانەی داوای ناسیونالیزمی عەرەب لە ئەورووپاو هەموو ئەو ناوەندە جیهانیانەی شاندی بۆ ڕەوان دەکەن، کە هەمیشە داواکارییەکانیان بەجۆرێك بووە رۆڵی ئەورووپاو ئەو ناوەندانە لە عێراقدا بەشێوەیەك بێت تەنیا بەرژەوەندی ئەوان ڕەچاو بکرێ، داوای کورد لە ئەورووپا کە لەوتاری سەرۆکی هەرێمی کوردستان رۆژی ٢٠٠٩/١١/١٠ لە پەرلەمانی ئەورووپا دەرکەوت، داواکردن بوو لە ئەورووپاییەکان هاوکاری هەرێمی کوردستان بکەن، لەڕووی بەدامەزراوەیی کردنی دەزگاکان و لەڕووی پەروەردەو تەندروستییەوە، بۆیە ئەورووپا داواکانی کورد کە بۆ گەشەپێدانی کۆمەڵایەتی و ئابووری کۆمەڵگای کوردستانەو خزمەت بە مرۆڤایەتی دەکات، باشتر قبووڵ دەکات، تا داوایەك کە ببێتە هۆی ئاڵۆزتربوونی پەیوەندی نێوان پێکهاتەکانی عێراق.

* ئەم سەردانە روونکردنەوەی زیاتری بە ئەورووپاییەکان بەخشی، کە ئەگەر ترسیان لە تەقینەوەی بارودۆخی عێراق هەبێت، ئەوە کورد هۆکار نین، لەو ڕووەوە سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە ئەورووپاییەکانی راگەیاند کورد خۆی لە عێراق جیاناکاتەوە، ئەگەر شیعەو

سوننه بەو ئاقارەدا ئیش بکـەن ئـەوان لـە دۆخەکـە بەرپرسـیارن، بەمــەش رۆڵـی کـورد لـە بەرقەرارکردنی ئارامی لە عێراقدا لای ئەورووپپاییەکان وەك راستیەك دەرکەوت.

* ئەورووپاییــەکان بۆیــان دەرکــەوت لــە عێراقــدا دوو بــەرە هەیــە، بەرەیــەکیان پشــت لەدەستوور دەکات و پێشنیاری ناواقیعی بۆ چارەسەری گرفتەکان هەیە، بەرەیەکیش کە بەرەی دەستووره نابێته کۆسپ لە رێی بەرەوپێشەوەچوونی گەلانی عێراق، کورد لە بــەرەی دەســتوور ویستەکاندایە، ئەورووپاییەکان لەوە حـاڵێن کـە کـورد لــە دەرەوەی دەسـتوورێك کـە ٨٠٪ی گەلانی عێراق دەنگیان پێداوە زیاتریـان داوا نـەکردووە. جـارێکی دیکـە سـەرۆکی هــەرێمی کوردستان پابەندبوونی هەرێمی کوردستانی بەدەستووری عێراق بـۆ ئەورووپاییــەکان دووپـات کردەوە، ئەمەش تێگەیشتنی ئەورووپاییەکان بەرامبەر بەگرفتەکانی عێراق زیاتر دەکات، کە کورد فاکتەری پاشەکشە پێکردنی توندوتیژین لەو وڵاتەدا.

* کەرکووك کە لەلایەن ناسیونالیزمی عەرەبییەوە بۆ بەرێوەبردنی سیاسـەتی رۆژ کراوەتــە بۆمبی تەوقیتکراو، ئەم سەردانەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، راستیی مەسەلەی کەرکووکی وەك خۆی بەئەوروپاییەکان گەیاند، ناسیونالیزمی عەرەبی کەرکووکی کردە بەهانەو پاساو، بۆ خۆدزینەوە لەپرۆسەی سیاسی و هێنانەدی مـەرامێك، کـە لەگـەڵ ئـاواتی گـەلانی عێراقـدا نــاگونجێ، ئــەویش پاشەکشــەپێکردنی پرۆســەی سیاســی و پەکخســتنیەتی، ئەوروپاییــەکان لەوەگەیشتن کە ئەوچارەسەرەی دەستووری عێراق بۆ کەرکووکی داناوە لــەرێی جێبــەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوور، نەخشە رێگای چارەسەریە و ئەو نەخشە رێگایە دەستوورێك داینـاوە کە زۆرینــەی هــەرەزۆری گــەلانی عێــراق دەنگــی بــۆ داوە، لەمەشـدا ئەوروپاییــەکان کـورد بەهاریکار نەك رێگر لەرێی چارەسەرکردنی ئەو کێشەیەدا دەبینن.

* کرانەوەی تورکیا بەرووی کورد و دیموکراسی تەوەرێکی دیکەی وتاری سەرۆك بــارزانی بوو، ئەوروپاییەکان رۆڵی هەرێمی کوردستان لەوبارەیەوە بــەگرنگ هەڵدەســەنگێنن، ئەمــەش لەو ئامادەبوونەی سەرۆکی کوردستاندا دەبینن، کە پێی راگەیاندن هەرێمی کوردستان توانــای خۆی بۆ بەرقەراکردنی ئاشتی دەخاتــە گــەڕ، گــرنگترین شــت ســەرۆکی هــەرێمی کوردســتان تەئکیدی لێکردەوە ئەوەبوو، کە رایگەیاند تورکیا بەدوای چارەسەری هۆکارەکاندا دەگـەڕێت، ئەمەش پەیامێکی دیکەبوو کە ئەوروپاییەکان ئەمــە بەمەســەلەیەکی گــرنگ ســەیر بکــەن، گەڕان بەدوای هۆکاری دروست بوونی ئاڵۆزی و پەنانەبردنە بــەر چــەك، باشــترین رێگەیــە بــۆ

چارەسەری ریشەیی ئەو پرسە لە تورکیا، کەدەبێتە هۆی رێگە خۆشکردن بۆ گەڕانەوەی چەکدارانی کورد بۆ وڵات و گەڕانەوەی خەڵکی دی وەك سەرۆك ئامـاژەی بەکـەمپی مـەخمور کرد بۆ بەشداری کردن لە پرۆسەی سیاسی، دەکرێ ئەوروپاییەکان ئـەم جەختکردنەوەیەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ رێگەگرتن لەتوندوتیژی بکەنە بنەمای کارکردن بۆ چارەسەری پرسی کورد لە تورکیا و کێشەی هاوشێوە لەشوێنەکانی دیکەی جیهاندا.

پرسێکی دیکە کە لەلایەن سەرۆکی هەرێمی کوردستانەوە راگەیاندرا، کەپەیوەندی بەداهاتەوە هەیە لەعێراقدا، ئەمەش مەسەلەیەکی گرنگە، چونکە داهات بۆ هەموو خەڵکی عێراقە، لێ ئەوەی ئەمڕۆ لەعێراقدا دەبیندرێت شتێکی دیکەیە، بەغدا بەڕەوای نازانێ هەموو پێکهاتەکان سوود لەسامانی وڵات ببینن وەك نەوت کە تاکە سەرچاوەی داهاتی عێراقە، لەم رووەوە سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەئەوروپاییەکانی راگەیاند، کە هەرێمی کوردستان رێگەیەکی راستی گرتووەتەبەرو ئەو نەوتەی لە کوردستانەوە ڕەوانەی دەرەوە دەکرێت، داهاتەکەی دەچێتەوە بەغدا، ئەوەش بۆ ئەورووپاییەکان ئاشکرابوو، کە هەولێر لە بەغدا سەرکەوتووتر بووە لەمەسەلەی نەوتدا، لێرەوە مەترسیەك هەیە ئەویش ئەوەیە بەغدا ئەو داهاتە وەك کارتێك بەکاربهێنێ، بۆیە سەرۆکی هەرێمی کوردستان داوای لە ئەورووپاییەکان کرد کە هەوڵبدرێت بەشە داهاتی هەرێمی کوردستان بچێتەوە سەر حسابی هەرێمی کوردستان، چونکە بەغدا ئەو داهاتە وەك کارتێکی فشار بۆ سەر کورد بەکاردەهێنێ، هەڵوێستی بەغدا لەو رووەوە مایەی نیگەرانی ئەورووپایە، چونکە دەبێتە مایەی ئاڵۆزبوونی زیاترو زەق کردنەوەی زیاتری کێشەکان، بۆیە داوای سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە داهاتی هەرێمی کوردستان، داوایەکە چەندین سەرنج و تێبینی لای ئەورووپاییەکان دروست دەکات و، وایان لێ دەکات ئەو مەسەلەیە بەهەند وەربگرن و، رێگری لەو هەڵوێستەی بەغدا بکەن و مەسەلەی دابەشکردنی داهات بەشێوەی یەکسانی ونەکردنی بەکارتی فشار بەگرنگ دابنێن.

* ئەگەرچی ئەوروپاییەکان زووهاتنە بواری وەبەرهێنان لەکوردستاندا، تەنانەت لەوەبەرهێناندا لەمەیدانێکی گرنگی وەك نەوت خۆیان دەرخست، کە لایەنێکی هێندە ئاسان نەبوو لەوکاتدا بۆ وەبەرهێنان، لێ ئەو هەولانە و رۆڵی حکومەتی هەرێمی کوردستان لەخۆشکردنی زەمینەی وەبەرهێنان و، خۆڵقاندنی دۆخێکی ئارام و گونجاو بۆ وەبەرهێنان و هێنانەکایەی یاسای وەبەرهێنان لەپەرلەمانی کوردستاندا گرنگ بوو. لەگەڵ

ئەوەشدا ئــەم ســەردانەی ســەرۆکی هــەرێمی کوردســتان زەمینــەی زیــاتری بــۆ کۆمپانیــا ئەوروپاییەکان خۆش دەکات کەبێنە کوردستان، کابینەی پێنجــەمی حکوومــەتی هــەرێمی کوردستان توانی هەرێمی کوردستان بخاتە سەر نەخشەی ئەو شوێنانەی وزە بۆجیهــان دابــین دەکەن، بەمەش ئەم سەردانەی سەرۆکی هەرێمی کوردســتان، ئەوروپاییــەکان زیــاتر دڵنیــا دەکاتەوە کە بۆ وەبەرهێنان روو لەکوردستان بکەن.

* ئەم سەردانە تــەکانێکی گــەورەتر دەداتــە پەیوەنــدی ئــەوروپا و هــەرێمی کوردســتان، هەرچەندە چەندین کونسولگەری و نوێنەرایەتی وڵاتانی ئەوروپا لە هەرێمی کوردستاندا هــەن، لێ ئەو سەردانەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، پەیوەندی نێوان هەردوولا دەباتــە قۆنــاغێکی دیکە، دەبێتە هاندانی وڵاتانی دیکــەی ئــەوروپا، کەئــەوانیش کونســولگەری و نوێنەرایــەتی لەهەرێمی کوردستاندا بکەنەوە، لەلایەکی دیکەشەوە دەبێتە هۆی کارکردن بۆ زیاتر گرنگیدان بەنوێنەرایەتیەکانی هــەرێمی کوردســتان لەئــەوروپا، مەســەلەی نوێنەرایەتیــەکانی هــەرێمی کوردستان لــەدەرەوە، یــەکێك لــەو کارنامــە و خاڵانەیــە کــە ســەرۆکی هــەرێمی کوردســتان لەرێوەڕەسمی متمانە بەخشین بەکابینەی شەشەمی حکوومەتی هەرێمی کوردستان رایگەیانــد، کەبریتی بــوو لەگرنگیــدان بەنوێنەرایەتیــەکانی هــەرێمی کوردســتان و پاشەکشــە پێکردنــی نوێنەرایەتی حزب و لایەنە سیاسیەکان بەناوی هەرێمی کوردستان، بۆیە ئەم ســەردانە دەبێتــە بنەمایەکی تۆکمە بۆ دانــانی نوێنەرایەتیــەکان لەئــەوروپا، کەســەرەنجام دەبنــە کــەناڵێك بــۆ توندوتۆڵکردنی پەیوەندی کوردســتان و ئــەوروپا. ئەوروپاییــەکان لــەم ســەردانەی ســەرۆکی هەرێمی کوردستاندا گوێیان لەکورد گرت، بەمەش دەتوانن لــەرێی رەوتــی هــێمن و شــێنەیی کورد، سەرە داوی چارەسەری گرفتە ئاڵۆزکاوەکانی عێراقیان دەست بکــەوێت، چــونکە بۆیــان دەرکەوت کە کورد توانیویەتی هەرێمی ئارام و سەقامگیر بپــارێزێ و دەرفــەتی وەبــەرهێنانی فەراهەم کردووە، لەو سۆنگەیەشەوە دەبێتە فاکتەری بەرقەرارکردنی ئاشــتی و خۆشــگوزەرانی بۆ تەواوی عێراق.

٢٠٠٩/١١/١٥

# ڕێبـژارێکی خراپ

پرۆسەی سیاسی لە عێراقی نوێدا هێشتا ڕاستەڕێ نەبووە، ئەو پرۆسەیە بەهەورازو نشێوو ڕێگایەکی پڕ لە کۆسپ و تەگەرەدا دەڕوات، ڕێگایەك پـێچ و گـەوەی زۆری تێدایـەو چـارەش نییە هەردەبێ بگیرێتەبەر، ئەو هەموو گرفت و کێشە کەڵەکەبووانە لەولا بوەستێ، زۆربـوونی ئەجندە ناوخۆیی و دەرەکییەکانیش سەربار، کە هۆکاری سەرەکی ئالۆزبوونی دۆخـی سیاسـی ئەو وڵاتەن. گومانی تێدا نییـە تـا پـرۆژەی سیاسـی زۆربـن و ئەقڵیـەتی سیاسـی ژینگـەی ناسیونالیزمی عەرەبی، بە بەرنامەی پێداگرتن لەسەر پرۆژەی نـاواقیعی و چاوپۆشـین لـەمافی خەڵکی دی کاراکتەرەکانی سەرمێزی گفتوگـۆو هـۆڵی پەرلـەمان ئاراسـتە بکـات، ڕێگاکـە ناخۆشتر دەبێت و دەروازە لەبـەردەم ئەجنـدەی دەرەکـی بـۆ فشـار و پاڵەپەسـتۆ خستنەسـەر لایەنەکان زیاتر دەبێت، بەمەش پرۆسەی سیاسی تووشی مراوەحەو چەقین دەبێت.

ڕەنگە بەهەڵەدا نەچین ئەگەر بڵێین زۆرترین پاڵەپەستۆ، لە هەموو قۆنـاغ و وێسـتگەیەکی گفتوگۆ و قسەکردن لەسەر پرسە گرنگ و چارەنووسسـازەکاندا لـە کـورد دەکرێـت. لـەنێوان چەندین ڕێبژار (خیار)ی بەردەم لایەنەکان کە لە ئـەنجامی هێنـان و بـردن و پێـداگیری پەیـدا دەبن، بۆ گرژنەبوونی دۆخەکە ڕێبژاری پاڵەپەسـتۆ دەگیرێتەبـەر، نـزیکترین نموونـە گفتوگـۆو دەنگدان بوو بە یاسـای هەڵبـژاردن کـە دوای ١٢ دانیشـتن و مشـتومڕی زۆر پەسـەند کـرا، درێژخایاندنی دەنگدان بەو یاسایە لە پەرلەمانی عێراقدا بـۆ داوای ناسـیونالیزمی عـەرەبی و ڕەوتی تورکمانە توندڕەوەکان دەگەڕێتەوە، کە کەرکوکیان کردە بەهانەو پاساو لەڕێی دەنگدان بەیاسای هەڵبژاردن.

هەرچەندە خۆڕاگری کورد لەبەرامبـەر پاڵەپەسـتۆو سـوور بـوون لەسـەر ئـەوەی بـارێکی تایبەتی بۆ هەڵبژاردنی ٢٠١٠ نەدرێتە کەرکووك، دەریخست کە چەند گرنگە کوردیش لەکاتی خۆیدا پێداگربێ، ئەوەشی دەرخست کە ناسیونالیزمی عەرەبی چەند بەپەلەیە لـە نەهێشـتنی پرەنسیپی تەوافوق و هێنانەکایەی پرەنسیپی زۆرینەو کەمینە، کە دەمێکە کاری بۆ دەکرێت.

ئەو ڕێبژارەی تەنیا بەمەبەستی بزواندنی پرۆسەی سیاسی لەسەر حسابی کورد هەڵدەبژێردرێ، ڕێبژارێکی خراپەو چارەسەری دۆخی ئاڵۆزی عێراق ناکات، هەقە ئەوانەی شایان بەو ڕێبـژارە خراپە دێت و شاگەشکە دەبن، ئاوڕێك لە بیست سی ساڵی رابردووی عێراق بدەنەوە، کـە ئـەو جۆرە ڕێبژارانە چییان لێ شین بۆوە.

ئەوەی تێبینی دەکرێ ئەوەیە، کە ناسـیونالیزمی عـەرەبی هەمیشـە چـەندین داوای نـاڕەوا دەخاتەڕوو پێیان لەسەر دادەگرێت، ئیدی ئەو داوایانە دەبنـە بابـەتی گفتوگـۆ، وەك ئـەوەی بـۆ گفتوگۆی دەنگدان بەیاسای هەڵبژاردن لە پەرلەمانی عێراق خرایەڕوو، هەقە لێرە بەولاوە کوردیش چەندین داوای هەبێت و ببنە بابەتی گفتوگۆ، چونکە ئەو ئەگەرە دووبـارە دەبێتـەوە، ئاشکراشـە کەڵەکەبوونی گرفتەکان و هێشتنەوەی پرسە هەڵواسراوەکان، بۆ ئەوەن ببرێنە ئەو قۆناغـەی دادێ کە عەرەب کاری بۆ دەکات. جا لەبـەر ئـەوەی ئەجنـدەکانی سـەر گۆڕەپـانی سیاسـی کـار بـۆ پێکهاتەکانی دیکە دەکەن، هەمیشە بەو ئاراستەیەدا کاردەکرێ کە ڕێگـەی ڕێبـژارە خراپەکـەش خۆش بکرێ، وەك چۆن ئەو پێداگیریەی ناسیونالیزمی عەرەبی و ڕەوتی نـاواقیع بـینی تورکمـان پێیان لەسەر ئەوە دادەگرت لە کـەرکووك هەڵبـژاردن نـەکرێ، ئیـدی ڕێبـژارە خراپەکـە وایکـرد لەیاسای هەڵبژاردندا ٤ جار ناوی کەرکووك بێت. بۆ ڕێگەگرتن لە ڕێبژارە خراپەکە، یان لانی کەم ئەو ڕێبژارە کەمترین زیانمـان پێبگـەیێنێ، پێویسـتە بـەمیکانیزمی نـوێ و لـەبارەوە بچـینەوە مەیـدان، نـاڕەزایی سـەرۆکایەتی هـەرێمی کوردسـتان لـەبارەی کەمکردنـەوەی کورسـییەکانی کوردستان و بڕیاری بەشـداری نـەکردن لـە هەڵبـژاردن ئەگـەر چـاو بـە ژمـارەی کورسـییەکاندا نەخشێندرێتەوە، سەرەتایەکی باشە وەك میکانیزمێك بۆ فشار خستنە سـەر ڕێبـژارە خراپەکـەو ڕێگەگرتن لە دووبارە بوونەوەی تاکڕەوی.

٢٠٠٩/١١/٢٢

# هەولێر..
# ناوەندێك بۆچارەسەری وڵاتێكی پڕ لەقەیران

لەئێراقی نوێدا لایەنە سیاسیەكان، كە سیمای پێكهاتەكانی ئەو وڵاتەیان پێوە دیارە، لەبەر پێداگری لەهەندێ بابەتی بەسەرچوو، كە ناكرێ لەم سەردەمەدا پەنایان بۆ ببرێتەوە، ئەوەندە زەمینەی رێگەی چارەسەریان خۆش نەكردووە، بۆیە لەدوای ٢٠٠٣وە پرۆسەی سیاسی لەقەیراندابووە، زۆرجار ئەو پێداگیریەی لایەنی زۆرینەی ئێراق، تەنیا بەرژەوەندی خۆی رەچاوكردووە، بۆیە هەمیشە دۆخی سیاسی لەئالۆزییەوە بۆ ئالۆزتر چووە، بەردەوام لەو نێوەندەدا هەولێر پێشنیاری واقیعی بۆ پرۆسەی سیاسی ئێراق هەبووە، بەڵام بەرامبەر بەغرورەوە سەیری كردووە، بۆیە قەیران لەدوای قەیران سەری هەڵداوە.

ئەگەر سەیری ئەرشیفی دوای ٢٠٠٣بكەین، بۆمان دەردەكەوێ كە هەرێمی كوردستان چەند فاكتەری ئارامی بووە بۆ ئێراق و ناوچەكە، لە هەمان كاتدا ناسیونالیستانی عەرەب خۆیان لە چارەسەری گرفتەكانی ئێراق دزیوەتەوە. زۆرجار ناوەندە ناسیونالیزمەكانی عەرەب نەیانویستووە هەولێر بەو قەبارەیە ببینن، كە لەناوچەكەو لەئاستی جیهاندا بەهەند هەڵگیراوە.

گرفتی هەرە سەرەكی ئەوەیە ناسیونالیستانی عەرەب خۆیان لە دەستوور دەدزنەوە، لەكاتێكدا دەستوور باشترین سەرچاوەو ناوبژیوانی هەموو تەنگ و چەڵەمەكانە. لەمەسەلەی تێپەڕاندنی یاسای هەڵبژاردندا، ئەوەندەی پەنایان بۆ چەندین جۆری فرۆفێڵ برد، نیو ئەوەندە بەلای چارەسەری راستەقینەدا نەچوون. هەرێمی كوردستان وێڕای ئەو مافە دەستووریانەی لەدەستووردا هەن، هیچ داوایەكی دیكەی نەبووە، سەرەڕای ئەوەش هەمیشە فاكتەری دروستكردنی زەمینەی چارەسەری بووە بەشێوەیەكی واقیعی.

بۆ هەڵسەنگاندنی رۆڵی هەرێمی كوردستان، باشترین بەڵگە راگەیاندنی پابەندیی ئەمریكایە كە رۆژی ٢٠٠٩/١٢/٧ لە كۆشكی سپی دەرچوو، زۆر راشكاوانە باس لەرۆڵی

هەولێر لەدۆزینەوەی چارەسەری دەكات، لـەو ڕاگەیەنـدراوەی كۆشـكی سـپیدا دەردەكـەوێت كەوێرای پشتیوانی لە دۆزی كورد، جەخت لەهەندێ چارسەری دەكاتەوە دەمێكە لەهـەولێرەوە ڕاگەیاندراون لەوانەش مەسەلەی سەرژمێری دانیشـتوان. ئـەوەی لەناسـیونالیزمی عـەرەبی دەخوێندرێتەوە ئەوەیە كەپێی وابووە تەنیا بەغدا ناوەنـدێكی چارەسـەری گرفتـەكان ئێراقـەو ئەمەریكا و ئەوروپاش تەنیا گوێ لەبەغـدا دەگـرن، بـەڵام قورسـایی هـەرێمی كوردسـتان و سـەنگی بـەڕێز مسـعود بـارزانی سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان، لەنێوەنـدە جیهـانی و هەرێمایەتیەكان وای كردووە هەولێر ناوەندێكی گرنگ بێ و لەگەرمەی ڕووداواندا قسەی خۆی هەبێ و گوێی لێبگیرێ، چونكە تێـزی سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان بـۆ چارەسـەری تێـزی مەعقولن لەروانگەی هەست كردن بەبەرپرسیارێتی و دیدێكی واقیعبینانەدا سـەرهەڵ دەدەن، بەمەش ئەمریكا و ئەوروپا ئەو باوەڕەیـان لادروسـت بـووە، كەپێشـنیارو تێزەكـانی سـەرۆك بارزانی گرنگن، بۆیە لە هـەر هـەنگاو هـەڵێنانێك بـۆ راسـتەرێ كردنـی پڕۆسـەی سیاسـی، پەیوەندی واشنتۆن و هەولێر گەرم دەبێتەوە، وەك ئـەوەی بـۆ تێپەڕانـدنی یاسـای هەڵبـژاردن لەپەرلەمانی ئێراق كرا، دوا پەیوەندی لەرۆژی ٢٠٠٩/١٢/٦ بوو كە باراك ئۆبامای سـەرۆكی ئەمەریكا و جۆزیف بایدنی جێگری سەرۆكی ئەمەریكا تەلەفۆنیان بۆسەرۆكی كوردستان كردو داوایان لێ كرد رۆڵی خۆی ببینێ بۆ تێپەڕاندنی یاسای هەڵبژاردن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ كە هەولێر لە هاوكێشەی چارەسەرییەكانی ئێراق و قسەكردن لەئاینـدەی ئـەو وڵاتـە ناوەنـدێكی گرنگە، دەریخست ناكرێ لەئێراقدا تەنیا لایەن و پێكهاتەیەك قسەی هەبێت و بەئارەزووی ئەو ئێراق راستەڕیێ بكرێ.

رۆژی٢٠٠٩/١٢/١١ ڕۆبەرت گێنس وەزیـری بـەرگری ئەمـەریكا گەیشـتە هـەولێر و لەگەڵ سەرۆكی هەرێمی كوردستان كۆبۆووە، وەك ڕاگەیەندرا وەزیری بەرگری ئەمـەریكا رایگەیاند كە بۆ دڵنیاكردنەوەی سەرۆكی كوردستان هاتووە، چونكە پێشتر سەرۆك بارزانی نیگەرانی خۆی پێ ڕاگەیاندبوون و لەپەیوەندیە تەلەفۆنیەكانی ٢٠٠٩/٦/٢١ كە نـاكرێ چارەسەری بەجۆرێك بێ ناعەدالەتی تێدابێ و نابێ كەس غـەدری لێبكرێ، ئەمجارە بـەرێز مسعود بارزانی سەرۆكی كوردستان دوای ئەوەی لێكردن بۆ دڵنیاكردنەوەی لەپشـتیوانی هەرێمی كوردستان بەرەسمی لێدوانێك دەربكەن، ئیدی ڕۆژی ٢٠٠٩/٧/١٢ ئەو لێدوانە لە كۆشكی سپی دەرچوو، هاتنی وەزیری بەرگری ئەمەریكا بۆ هەولێر جارێكی دی سەرۆكی كوردستانی لەو پابەندییەی ئەمەریكا دڵنیا كردەوە. هاتنی وەزیری بـەرگری ئەمـەریكا

لەکەرکووکەوە وەك لە لێدوانی ڕەسمی کۆشکی سپیدا هاتبوو، هەولێر لایەنێکی گرنگـە، ئەمەش پەیامێکە بۆبەغـدا کـە قسـەکردن دەربـارەی کـەرکووك و ناوچـەکانی دی کـە لەماددەی ١٤٠ی دەستووردا چارەسەریان بۆ داندراوە تەنیا بۆ بەغدا نییە بەڵکو هەولێر لایەنێکی گرنگە، ئیدی بەپێی ئەو لێدوانەی لەکۆشکی سـپی دەرچـوو، کەجـەخت لـەوە دەکاتەوە ئەمەریکا ڕۆڵ لەچارەسەری کێشەکانی نێوان هەولێر و بەغدا ببینێ و پشتیوانی لێبکات، ئەوە دەگەیەنێ بە هەڵپەی ناسیونالیستانی عـەرەب کـە دەیانـەوێ بـەفرۆفێڵ لەپەرلەمانی داهاتوو هەمووشتێك بەویستی خۆیان بێ ناچێتەسەر، هـەرێمی کوردسـتان فاکتەری دروست بوونی ئێراقی نوێیەو هەولێریش لەتەك واشـنتۆن و بەغـدا ناوەنـدێکی گرنگە ڕۆڵی لەبڕیاردان لەهەر هەنگاوێکی نوێی ئەو وڵاتە دەبێت.

٢٠٠٩-١٢-١٤

# بەغدا- هەولێر

# لە تێڕوانینی کۆشکی سپیدا

دوای دەرپەڕاندنی سوپای ئێـراق لـە کوێـت لەلایـەن ئەمــەریکاو هێـزە هاوپەیمانـەکانی، ئۆپەراسیۆنی دەرکردنی هێزەکانی سەدام بە بۆردومان کردنی پێگە گرنگ و سـتراتیژیەکان لـە ١٩٩١/١/١٧ دەستی پێکرد، پاشان هێزی هاوپەیمانان جولاو زەبـری کوشـندە لـە ماکینـەی شەڕی رژێمی بەعس درا، دوایش راپەڕینی کوردستان و باشـووری ئێراقـی بـە دواداهـات و، دۆخێکـی نـویێ لـە کوردســتان هاتەکایــەو دوای هەڵبــژاردنی ١٩٩٢/٥/١٩ هــەولێر بــووە ناوەندێکی سیاسی و ئیداری کوردستان. لێرەوە تێڕوانینی ئەمەریکا بۆ بەغداو هــەولێر بــووە دوو تێڕوانینی جیاواز، بەغدا رێگرو هەولێریش یارمەتیدەری کارە ئینسانیەکانی un بوو بۆ یارمەتیدانی گەلانی ئێراق، لە ١٩٩١-٢٠٠٣ بەغدا مایەی سەریەشەو پشێوی نانەوەو رێگر بوو لە بەردەم سیاسەتی ئەمەریکا و هەولێریش ناوەندێکی جیاواز لـە بەغـدا، بەمــەش لـە ماوەی ١٢ ساڵدا (١٩٩١-٢٠٠٣) هەرێمی کوردستان بووە هەرێمێکی جیاواز لە ناوچەکانی دیکەی ئێراق و بووە ئەمری واقیع.

دوای رووخانــدنی رژێمــی بــەعس، هــەرێمی کوردســتان پێگەیــەکی گــرنگ بــوو بــۆ بنیاتنانەوەی ئێراقی نویێ و ئەمەریکا بە رۆڵی هەولێر لە بنیاتنانەوەی ئەو وڵاتــەدا خۆشــحاڵ بوو، بۆیە نەدەکرا بە هیچ شێوەیەك واقیعی هەرێمی کوردستان لە یاسای کاتی بـەرێوەبردنی دەوڵەت و دەستووری هەمیشەیی ئێراقدا شوێن بزر یان پەراوێز خـرا، هــەر چـەندە لـە دوای رووخاندنی رژێمی سەدام ناوەندە سیاسیەکانی بەغدا هێنان و بردنی زۆریان بە واقیعـی نـوێی ئێراق کرد بۆ ئەوەی قەبارەی سەنگی هەرێمی کوردستان نەخرێتە ناو دەســتوورو هــەولێر وەك ناوەندێکی سیاسی سەیر نەکرێ.

لەگەڵ دانانەوەی یەکەم بەردی بناغەی قۆناغی نوێی ئێراق کورد فاکتەرێکی هاوکار بووە، ئەمەریکاش هەر لە سەرەتاوە لە هەموو ساتەوەختەکاندا ئامادەیی تــەواوی هەیــەو ســەنگی

خۆی لە زۆر کێشە و گرفتی ئەو وڵاتە بۆ یەکلایی کردنەوە بە کارهێناوە، هەر لە دوای ٢٠٠٣ وە ئاماژەکانی ناکۆکی بەغداو هەولێر زوو دەرکەوتن، تا وای لێهات لەگەڵ تێپەڕبوونی کات ئەو ناکۆکییە گەورەتر بوو و بە هۆی ئەجندەی دەرەکییەوە زیاتر ئاڵۆز بوو، بۆیە بۆ ئەوەی ئەمەریکا پێ بە پێ سیاسەتی خۆی پیادەبکات و بەرنامەکانی خۆی جێبەجێ بکات، پێویستی بەوەکرد بۆ جوڵاندنی پرۆسەی سیاسی و جێبەجێکردنی بڕگە بڕگەی بەرنامەو پڕۆژەی سیاسی خۆی واشنتۆن بێتە مەیدانەکەوە، ئامادەیی واشنتۆن لە نێوان بەغدا و هەولێر لە سێ قۆناغی گرنگدا، بە روونی و راستەوخۆ دەرکەوت، بە تایبەتی خۆشکردنی زەمینەی رێککەوتنی واشنتۆن-بەغدا و قۆناغی تێپەڕاندنی یاسای هەڵبژاردنی ئێراق و خۆ ئامادەکردن بۆ هەڵبژاردنی ٢٠١٠ و چوونە قۆناغێکی نوێوە.

لە هەموو ئەو قۆناغانەو کاتەکانی دیکەدا بەغدا لەلایەن ناسیونالیزمی عەرەبی بەو شێوەیە تەیارکراوە کە ئەگەر سەربگرێ لەو نێوەندەدا هەولێر قسەی نەبێ، بۆ ئەوەی کاتی چوونە هەر قۆناغێکی نوێ تەنیا بەغدا وەك لایەنێك لە بەرامبەر واشنتۆن بێت، بەڵام ئەمە ئاراستەیەکی ترسناکەو لەگەڵ دۆخی تازەی ئێراق ناگونجێ، نەرمی نواندن بۆ ئیرادەی ناسیونالیزمی عەرەبی مانای گەڕانەوەیە بۆ سەرەتا، چونکە ئەوەی ئەو ناوەندە ناسیونالیزمەی عەرەبی دەیەوێ، تەنیا رەچاوکردنی بەرژەوەندی خۆیەتی و مافی خەڵکی دیکەش پشت گوێ دەخات، بۆیە ناکرێ ئەمەریکا تەنیا و تەنیا گوێ لە بەغدا بگرێ، بەڵکو بۆ هەر هەنگاو هەڵێنانێك لە ئێراقدا ئەمەریکا هەرێمی کوردستان لەبەرچاو دەگرێ و قسەی هەولێریش بەهەند وەردەگرێ، دوا هەڵوێستی ئەمەریکا لەسەروبەندی تێپەڕاندنی یاسای هەڵبژاردن لەپەرلەمانی ئێراقدا دەرکەوت، ئەمەش دوای پەیوەندی تەلەفۆنی باراك ئۆبامای سەرۆکی ئەمەریکاو جۆزیف بایدنی جێگری سەرۆکی ئەمەریکا دێت کە رۆژی ٢٠٠٩/١٢/٦ پەیوەندییان بە سەرۆك بارزانی کرد و داوایان لێ کرد رۆڵی خۆی ببینێ، بەرێز سەرۆك بارزانی هەڵوێستی هەندێ لایەنی ئێراقی بەناهەق وەسفکرد کە پێیان لەسەر کەمکردنەوەی کورسی هەرێمی کوردستان و ئەنجامدانی هەڵبژاردنی کەرکوك بە تەنیا دادەگرت، بۆیە لەو پەیوەندییەدا سەرۆك بارزانی داوای لەسەرۆکی ئەمەریکا کرد، کە هەڵوێستی دیارو نووسراوی واشنتۆن بەرامبەر بە زەمانەتی کورد لە ئێراقدا دەربکرێ، ئەوە بوو رۆژی ٢٠٠٩/١٢/٧ کۆشکی سپی پابەندبوونی خۆی بە پشتیوانی کردن لە ماددەی ١٤٠ و چارەسەرکردنی پرسی کەرکوك و پەیوەندی هەولێر و بەغدا راگەیاند،

ڕۆژی ٢٠٠٩/١٢/١١ ڕۆبەرت گەیتسی وەزیری بەرگری ئەمەریکا بۆ دڵنیاکردنەوەی بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی کوردستان سەردانی هەولێری کردو جارێکی دی پابەندی واشنتۆنی دووپات کردەوە.

ئەمە ئەوەمان پێ دەڵێ کە ئەمەریکا چارەسەری پرسە هەڵواسراوەکانی نێوان هەولێر و بەغدا بە گرنگ دەزانێت و بۆ ئەمەش سەرژمێری دانیشتوان بە گرنگ دەزانێ و ئامادەیی هاوکاری لەو ڕووەوە دەربڕیوە، کەواتە ناکرێ لە ئێراقدا بە هۆی زۆرینەی عەرەب مافەکانی خەڵکی کوردستان پشت گوێ بخرێن و واشنتۆن ئاگای لە وردەکاری ئەو گرفتە هەیە و بەیاننامەی کۆشکی سپی وەك بەڵگەیەکی گرنگە کە ئەو کێشەیە پێویستی بە چارەسەرە.

٢٠٠٩-١٢-٢١

# پتەو كردنی بەرەی ناوخۆ

# لە سایەی سیاسەتێكی دروستدا

هیچ پێكهاتەیەك لە عێراقدا، هێندەی كورد پێویستی بە پتەوكردنی ریزەكانی نییە، ئاوڕدانەوەیەكی خێرا بۆ رابردوو ئەو پێویستیەمان بۆ دەسەلمێنێ، لە رۆژگاری ئێستاشدا ئەو زەرورەتە دێتە پێشەوەو، خۆی لە ریزی پێشەوەی ریزبەندی ئەركەكاندا دەبینێتەوە.

جێی داخە هەندێ جار لێرەو لەوێ، یەكڕیزی خەڵكی كوردستان بەچاوێكی دیكە سەیر دەكرێ، هەر ئەو سەیركردنە وای كردووە، هەندێ جار پتەوكردنی ریزەكانی خەڵك بە گرنگ تەماشا نەكرێ، بەڵام لەگەڵ هاتنەپێشەوەی رووداوێك، تاكە شتێك كە پەنای بۆ ببرێ و بەبیری هەركەسێكدا بێت، مەسەلەی یەكدەنگی و بەهێزكردنی ریزەكانی خەڵكە.

ئەگەر بەچاوێكی واقیعبینانە بڕوانینە دۆخی پێكهاتە جیاوازەكانی عێراق و، ئەو ئەجندانەی لە پشت هەندێ لەو پێكهاتانەن، ورد بخوێنینەوەو مەیلی ناسیونالیزمی عەرەبیش لەبەرچاو بگرین، بۆمان دەردەكەوێ ئەو پتەوكردنەی ریزەكانی خەڵكی كوردستان چەند گرنگە، بەڕاستی خوێندنەوەی بەدیقەتی رووداوەكانی عێراق، تێمان دەگەیەنێ، كە پتەوكردنی ریزەكانی گەلی كوردستان، زۆر گرنگەو دەگەینە ئەو قەناعەتە، كە هێشتا بۆ خەڵكی كوردستان و، هەلكەوتەی هەرێمی كوردستان مۆدیلێكی بەسەرچوو نییە، وەك هەندێ جار دەكەوینە هەڵەوە، كاتێ مامەڵە لەگەڵ هەندێ چەمك و دەستەواژەی سیاسیدا دەكەین، سەرپێیی بڕیاری بەسەرچوونی هەندێ لەو دەستەواژانە دەدەین و دەڵێین سەردەمیان نەماوە، بەڵام هەقە ئەو مامەڵەیە لەكاتێكدا بێت، كە هەموو ئەو مەترسیانەی چەندین ساڵە هەن، نەمێنن و زەمینەی كاری سیاسی بە جۆرێك لە عێراقدا خۆش بێت، كە خەڵكی دیكە بە دەمامكەوە نەهێنە سەر رێگامان و بەرپێنمان بدەنێ.

هەندێ جار ئەو پرسیارەم لەلا دروست دەبێت، کە ئەوە هۆی چییە عەرەب سەرەڕای ئەوەی لە عێراقدا زۆرینەن، با بەسەر دوو مەزهەبیشدا دابەش بووبن، بەڵام وەك نەتەوە زۆرینەی عێراقن، ئەدی ئەو هەموو هەوڵەی هێنانەپێشەوەی پرسی نەتەوەییان لە چییە؟ ئەوان وێڕای ئەوەی زۆرینەن وا هەڵسوکەوت دەکەن، کە هەڕەشەیان لەسەربێ و خۆیان بە مەغدوور دەزانن، بۆ دەبێ بەو هەموو پشتیوانیەی لێیان دەکرێ، هێشتا پرسی نەتەوەیی و خۆکۆکردنەوە لە خزمەتی نەتەوایەتیدا، بە ئەرکی هەرە لەپێش بزانن و، بۆ ئەو مەبەستەش قەت نالێن سەردەمی ئەو جۆرە کارکردنە بەسەرچووە، هەرگیز دەستبەرداری میکانیزمی خەباتی نەتەوەیی خۆیان نابن و بە مۆدیلێکی بەسەرچووی نازانن، ئەدی هۆی چییە هەندێ جار لای ئێمە، ئەوەندە کار بۆ کاڵکردنەوەی کۆبوونەوە لە دەوری بەرنامەی سیاسی و، پتەوکردنی ریزەکانی خەڵکی کوردستان دەکرێ، تا ئەو رادەی ئەو مەسەلەیە وای لێبێت، بەلای نەوەی نوێوە هەر گرنگ نەبێت؟، لە کاتێکدا زەرمەندی یەکەم ئەو نەوەیە دەبێت.

رەنگە لە بەکارهێنانی وشەی (بەهێزکردن) و (توندکردنەوە) ی بەرەی ناوخۆ، ئەو پرسیارە بکرێ ئایا بەرەی ناوخۆی کوردستان لێك هەڵوەشاوەتەوە تا توند بکرێتەوە؟ لە وەڵامدا دەڵێین قسەکردن لەوبارەیەوە بەو مەبەستە نییە کە رەشبینی پێشان بدرێت، بەڵام وردبوونەوە لە دۆخی کورد، لە نێو پێکهاتەکانی دیکەی عێراق و، ئاڵۆزبوونی پرۆسەی سیاسی و، خۆدزینەوەی بەغدا لە جێبەجێ کردنی ماددەی ١٤٠ ی دەستوورو، ئەو هەموو دەستانەی لە دەرەوەی ئەو وڵاتە بۆ پرۆسەی سیاسی درێژدەکرێن و، پەیدابوونی بەرژەوەندی جیاجیا، پەنابردنەوە بۆ پتەوکردنی ریزەکان، لەبەرامبەر رەوتی رووداوەکاندا کارێکی بایەخدارە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە بە گرنگی دانانی پتەوکردنی ریزەکانی میللەت، پشت لە هۆکارە دەرەکییە گرنگەکان بکرێن.

بەدرێژایی ساڵی ٢٠٠٩ کە خەریکە لە چەند رۆژی دادێ ماڵئاوایی لێ دەکەین، مشتومڕێکی زۆر دەربارەی ئەوە کرا، کە کورد بۆ هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق و نوێنەرایەتی کردن لە بەغدا یەك لیستی هەبێت، ئەگەرچی کۆبوونەوەی تەواوی هێزە سیاسییەکان و رەنگە جیاوازەکانی خەڵك لە لیستێکدا، شێوەیەکی بەهێزی یەکدەنگی بە خەڵکی کوردستان دەبەخشێت، لێ لەگەڵ ئەوەشدا، مەسەلەکە بەوە گەیشت کە فرەلیستی بێت، دیارە ئەو شێوە کارکردنە رەچاوکرا، کە دۆخێکی ئاسایی وەرگرتووە.

لە سۆنگەی ئەمەوە، گرنگە ئەو فرە لیستیە لە ناوچە دابڕێندراوەکاندا، ببێتە مایەی کۆکردنەوەی دەنگی زۆر لە ناوچە کوردستانییەکانی ئەو پارێزگایانەدا، کە لە دەرەوەی ئیدارەی هەرێمی کوردستاندان، لە هەمووشی گرنگتر بەر لەوەی هەڵبژاردنی سەتاسەری عێراق دەست پێبکات، لە کوردستان هەڵبژاردن کراو، وێڕای هاتنەپێشەوەی پەرلەمانێکی فرەڕەنگ و پەیدابوونی ئۆپۆزسیۆن، ٧٠٪ ی خەڵکی کوردستان متمانەیان بە سەرۆك بارزانی بەخشی، کە ببێتەوە سەرۆکی هەرێمی کوردستان، جێی خۆیەتی ئاماژە بە رۆڵی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بکەین، لە خۆشکردنی زەمینەی کاری پێکەوەیی، چونکە یەکێك لەو مەسەلە گرنگانەی هەمیشە جەختی لێ دەکاتەوە، یەکدەنگی و یەکهەڵوێستی خەڵکە لە بەرامبەر مەسەلە چارەنووسسازەکاندا، هەر بە دەستپێشخەری سەرۆکی هەرێمی کوردستان دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ تەواوی ئەو لایەن و قەوارانەی بەشداری هەڵبژاردنیان کرد، لە پایتەختی هەرێمی کوردستان کۆبوونەوەو بڕیاریاندا، هەر هەموو یەك هەڵوێست بن، لە بەرامبەر مەسەلە چارەنووسسازەکانی خەڵکی کوردستان، ئەو هەڵوێستە لە پەرلەمانیشدا بەر لە کۆبوونەوەی لایەنە سیاسییەکان جەختی لێکرایەوە.

گرنگە لێرە بەولاوە، زیاتر کار بۆ بەهێزکردنەوەی بەرەی ناوخۆ بکرێت، بوونی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و پەرلەمانی کوردستان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان، هۆکاری گرنگن بۆئەوەی لە ڕێی خۆشکردنی زەمینەی پتەوکردن و بەهێزکردنی ریزەکانی خەڵك وەگەڕبخرێن، چونکە مەرجی چوونەپێشەوەو سەرکەوتن، بەهێزبوونی بەرەی ناوخۆیە، کە ئێستا سەرۆکی هەرێمی کوردستان کاری بۆ دەکات.

توندکردنەوەی بەرەی ناوخۆ لە چەند لایەکەوە دەکرێت، لە پێشدا پێویستی بە پێداچوونەوە بەکارەکانمان هەیە لە هەموو ئاستەکاندا، لە ئاستی دیبلۆماسی پەیوەندی نێوان هەولێرو پایتەختە بڕیاربەدەستەکانی جیهان و ناوچەکە، جووڵەی گەرم بەخۆیەوە دەبینێ، لەو نێوەندەدا سەنگی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کاریگەری بەسەر پتەوکردنی ئەو پەیوەندییانەدا هەیە، سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە میانەی ئەو سەردانانەی بۆ ناوچە جیاجیاکان دەستی پێکردووە، کە لە نزیکەوە گوێ لە خەڵك دەگرێ، بۆ ئەوەی خزمەتیان بکرێ، هەروەها بە بایەخەوە سەیری ناوچە جیاجیاکانی هەرێمی کوردستان دەکات و، حکوومەت رادەسپێرێ کە درێژە بە خزمەتگوزاری بدرێت، لە لایەکی دیکەشەوە ئاوەدانکردنەوەی زیاتری گوندەکانی کوردستان، بە کارە هەرە لەپێشەکانی حکوومەت دادەنێت، بەمەش کارکردن بە هەموو

ئاراستەکاندا، بەتایبەتیش خزمەتکردنی زیاتری خەڵکی کوردستان، دەبێتە هۆکاری بەهێزکردنەوەی بەرەی ناوخۆ، کە بۆ کورد مەسەلەیەکی گرنگە، لە پاڵ قورسایی هەرێمی کوردستان لە لە جیهان و ناوچەکەدا بایەخی پێبدات، چونکە بەهێزکردنی بەرەی ناوخۆ، ئامادەیی هەرێمی کوردستان وەك توخمێکی بەهێز، لە بەرامبەر دەنگەکانی دیکەی عێراق پێشان بدات، راستە عەرەب زۆرینەن و پشتیوانیان زۆرە، بەڵام بۆ ئێمە، بەهۆی نەبوونی ئەو قوڵاییە ستراتیژییەی عەرەبی سوننە و شیعە هەیەتی، توندکردنی بەرەی ناوخۆ لە ریزی پێشەوەی ئەرکی هەموو لایەکدایەو مەرجی سەرکەوتنە.

٢٠٠٩/١٢/٢٨

# کەرکووک

## لەنێوان دروشمبازی و چارەسەری راستەقینەدا

کەرکووك وەك پرسێکی مێژوویی، پێویستی بە چارەسەری راستەقینە هەیە، لێ گرفت ئەوەیە، بەزۆری زۆرداری دەخرێتە ناو ئەو دروشمانەی، چەندین ساڵە ناسیونالیزمی عەرەبی دەرخواردی خەڵکیان دەدات، بەمەش لە رۆژگاری ئەمرۆماندا، هێندەی ئەو رەوتەی بەدوای چارەسەری راستەقینەدا دەگەڕێ، هێندەش رەوتێك هەیە پەنا بۆ کولتووری چەندین ساڵەی دروشمبازی دەبات، هەر ئەمەشە کەرکووکی کردۆتە کێشەیەکی ئاڵۆز.

دەبێ ئەو راستییە فەرامۆش نەکەین، کە خەڵکی رەسەنی کەرکووك، وێڕای ئەو زوڵمە زۆرەی لێیان کراوە، هێشتا ئەوانن بەدوای چارەسەری راستەقینەدا دەگەڕێن، لە راستیدا ئەوانەی بەدوای چارەسەری راستەقینەی کێشەی کەرکووکدا دەگەڕێن، ئەوانەن کە خوێنیان لە پێناوی ئەو پرسەدا بەخشیوەو سامان و خاکیان لێ داگیرکراوە، لەگەڵ ئەوەشدا چارەسەر دەخوازن، لێ ئەو عەرەبانەی سامانی وڵاتیان بۆ تەخشان و پەخشان کراوەو، سیاسەتی بەغدایان لە پشت بووە، بۆ داگیرکردنی خاك و ماڵی خەڵکی دی، هێشتا بە ئاوازی ئەو سەفەرە خۆشەیانەوە دەخوێنن، کە بە چ پشتیوانی و هاوکاری کردنێکەوە هاتنە کەرکووك و داگیریان کرد، ئێستا خۆیان بە خاوەن ماڵ دەزانن و کوردیش بە بێگانە، بەداخەوە هێشتا لە عێراقی نوێدا هەن بە ئاواتی رێکخستنی چەندین سەفەری دیکەی لەو شێوەیەن، کە دەسەڵات و پارەیان لە دەوڵەتەوە بۆ تەرخان بکرێ و (کەرکووك خۆت بگرە هاتین).

ئێ لایەنێك بەو عەقلیەتەوە قسەی لەبارەی کەرکووکەوە هەبێ، دەیەوێ رێگای چارەسەری پڕ لە کەندو کۆسپ بکات و دووری بکاتەوە. لەماوەی ٥٠ ساڵی رابردوو، دروشمی گەورەو هەڵخەڵەتێنەر بەرزکراوەتەوە، ئەو دروشمبازییەی لە عێراقدا پەرەی سەند، بۆ هەندێ شوێنی دیکە پەڕیەوەو، لەو شوێنانەشدا ئەوەندەی بووە مایەی لەخشتەبردنی خەڵك، نەبووە چارەسەر، دەنا ئەوە چییە پاڵ بە سودانییەکەوە دەنێ، لە رادیۆی بی بی سی هەڵداتێ و بڵێ: "نابێ عێراق پارچە پارچە بێت و کورد خزمەتی داگیرکەران دەکەن"، ئەمە لەکاتێکدایە سودان بەدەست کێشەی نەژادی و قەیرانی سیاسییەوە دەناڵێنێت، ئاخر گرفتەکە ئەوەیە ئەو

کولتوورەی زیاتر لە نیو سەدەیە خەڵك بەخێوو دەکات، دەیەوێ لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بۆ کێشەی کەرکوك بە هەمان زمانەوە قسەکەربێت.

ئەو تێڕوانینە هێشتا حیساب بۆ پێکهاتەکانی دیکەی عێراق ناکات و، ناسیونالیزمی عەرەبی بە تاکە سەرچاوەی چارەسەری هەموو کێشەیەك دەزانێ، مێژوو ئەوەی پێڕاگەیاندین، کاتێ ئەو تێڕوانینە تەنگ بینە، تاکە لایەن بێ و لە کێشەکاندا قسەی هەبێ چ دەقەومێ، ئەزموونی ساڵانی رابردوو، دیدی ئەوانەی بۆ ئاشکرا کردووین، کە تەنیا لە روانگەیەکەوە سەیری رووداوەکان دەکەن، بەتایبەتیش ئەو کێشانەی چەندین پێکهاتەی پێیەوە بەندە، بەدروشم هیچ لە خۆیان ناهێڵنەوە، بەڵام کە پێشنیارێکی واقیعبینانە بۆ چارەسەری دێتە مەیدان، هەراو زەنایەك دەنێنەوە مەپرسە، هێشتا بەیاننامەی پابەندبوونی کۆشکی سپی ئەمەریکا، بۆ جێبەجێ کردنی مادەی ١٤٠ لە ٢٠٠٩/١٢/٧ بەتەواوی بڵاونەبۆوە، لایەنی ناسیونالیزمی عەرەبی لێی کەوتنە تەقەو، بە هەڵوێستێکی نارەواو نایاساییان لە قەڵەمدا، پاساویشیان ئەوەیە ئەم کێشەیەی کەرکوك و ماددەی ١٤٠ بە کێشەیەکی ناوخۆی عێراق داددەنێن، یەڵام ئامادەش نین هیچ هەنگاوێکی جدی بۆ ئەو (کێشە ناوخۆییە) بێنە پێشەوە.

ئەرێ کێ رێگەی لە بەغدا گرتووە ماددەی ١٤٠ لەکاتی خۆیدا جێبەجێ نەکات، کەواتە ئاڵۆوبوونی کێشەی کەرکوك، هۆیەکەی بۆ تێڕوانینی تەسکی ناسیونالیزمی عەرەبی دەگەڕێتەوە، ئیدی هەر کەس و لایەنێك قسەی خێر بۆ ئەو کێشە ئاڵۆزە بکات، لێی دێنە دەنگ، ئەمەش ئەو راستییە دەردەخات، کە نایانەوێ چارەسەری راستەقینەی کێشەی کەرکوك بکرێ، بەرزکردنەوەی دروشم و رێگەگرتن لە چارەسەری راستەقینە، ئاڵۆزکردنی زیاتری کێشەکەیەو، پێشنیاری ناواقیعی بۆ ئەو پرسە، لە کۆسپ دروست کردن بەولاوە هیچی دی لێ شین نابێتەوە، ئیدی کاتی ئەوەیە بە چاوێکی واقیعبینانە سەیری پرسەکە بکرێ، هەر هێزێك پشت لە واقیعی ئەو شارە بکات، لە ئاژاوە بەولاوە هیچ چارەسەرێکی پێ نییە، بۆ لەمەودوای عێراقیش نابێ چیدی پشت لە کورد و خەڵکی دیکەی زوڵم لێکراو بکرێ، چونکە هەموو ئەو دەمە سیاسییەی دروشمبازان گەڕانەوەیە بۆ تاکڕەوی و دکتاتۆریەت، ئەم شێوە حوکمڕانییەش لە عێراق کۆتایی پێهات و نابێ دووبارە ببێتەوە، بۆیە دەبێ پێشنارو تێزی واقیعبین، کە کوردو بەشێك لە پێکهاتەکانی کەرکوك هەڵگریەتی، ببێتە بابەتی گفتوگۆو چارەسەری راستەقینە.

کانوونی دووەمی ٢٠١٠

# دیموکراتیزەکردن و سەقامگیریی عێراق

# بەندە بە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ ی دەستوورەوە

لە عێراقی نوێدا کورد ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە، ئەو ڕۆڵەی کورد لە سەرەتای قۆناغی دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، لە بنیاتنانەوەی عێراقێکی تازەدا دیارە، بەجۆرێك کە لە نێو ناسیونالیستانی عەرەبدا، دەنگێك بەرزبۆوەو دەیگوت کورد بەغدای داگیرکردو، دەستی بەسەر دامەزراوەکانی دەوڵەتی عێراقدا گرتووە. ئەم تێڕوانینەی ناسیونالیزمی عەرەبی، لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە قبوولی نییە، پێکهاتەو گرووپی دیکەی ناعەرەب، بەشداری حکوومەت و بڕیاری وڵاتێك بن، کە پڕە لە نەتەوەو ئاین و مەزهەب، هەر ئەم تێڕوانینەبوو لە نیو سەدەی رابردوودا، عێراقی خستە ژێر بارێکی قورس.

هەر لەدوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام، هەنگاوی عێراقی تازە هەڵێندرا، بەڵام زۆرجار ڕێگە لەو هەنگاوهەڵێنانە گیراوە، ناسیونالیزمی عەرەبی زۆرترین کۆسپی خستە ڕێی بەرەوپێشەوەچوون، هەموو ئەو ڕێگریانە، ڕێگایان لە بەرەو نووسینەوەی دەستوورێکی نوێ، کە لەگەڵ واقیع و سەردەمدا بگونجێ گرت، بەهەر جۆرێك بێ دوای مشتومڕێکی زۆر، دەستوورێك نووسرایەوە کە لە ٨٠٪ی خەڵکی عێراق بە ەڵێ دەنگیان بۆ دا.

کورد وێڕای ئەوەی کە دەستوورەکەی بۆ ژیانی ئاسایی خۆی بە پەسند زانی، داواکاری نیشتمانی و نەتەوەییشی کە بریتییە لە خاك، لە ماددەی ٥٨ یاسای کاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا، گواستەوە بۆ ماددەی ١٤٠ ی دەستووری عێراق، ئیدی دوای داڕشتنی دەستوور، هەموو پرسەکە لە ماددەی ١٤٠ ی ئەو دەستوورەدا کۆکرایەوەو، بڕیاربوو بە سێ قۆناغ جێبەجێ بکرێ، بەڵام حکوومەتی عێراق خۆی لێبوارد. دواتر لەساڵی ٢٠٠٨ لە نێو پەرلەمانی عێراقدا، گەلەکۆمەکی لە کورد کرا، ئیدی لە دوای ئەو گەلەکۆمەکییە، کە بە کۆدەتای ٢٢ ی تەمموز دژی کورد ناسرا، دەنگی زیاتر لە ژینگەی عەرەبی و تەنانەت

تورکمانیش دژی کورد بەرزبۆوە، بەڕادەیەك کە لە نێو ناسیونالیستانی عەرەبدا، گرەو لەسەر ئەوە دەکرا، کێ ئازایە لەڕێی کۆسپ خستنە بەردەم ماددەی ١٤٠ ـەوە، دژایەتی کورد بکات، ئەوا ناسیونالیستێکی ڕەسەنە.

لەم سەردەمەدا، ناسیونالیزمی عەرەبی، هەر بە هەمان حیسابی جاران، مامەڵە لەگەڵ خەڵکی دیکەی ناعەرەبی عێراقدا دەکات، ئەم دژایەتییە، ئاماژەیەکی ئاشکرای تێڕوانینی ناسیونالیزمی عەرەبییە، دەیەوێ جاریکی دیکە بەو ئاراستەیەدا کاربکات، کە هیچ پێکهاتەیەکی دی جگە لە عەرەب نەخوێندرێتەوە، ئیدی دەرکەوت، ناسیونالیستانی عەرەب دەیانەوێ جارێکی دی هەموو پێکهاتەکانی تر پەراوێز بخرێن، هەر لەو ڕوانگەیەوە، شاڵاوێکی بەربڵاویان دژی ماددەی ١٤٠دەست پێکرد، ئەمەش بۆ کورد بووە کەندو کۆسپی ڕێگا، چونکە کورد هەوڵێکی زۆری دا بۆ ئەوەی عێراق بەرەو دیموکراسی بەرێت، لێ دەرکەوت بە دژایەتی کردنی ماددەی ١٤٠ ، هەم دژایەتی کورد وەك نەتەوەیەك دەکرێ، هەم گورزێکی کوشندە لە ڕەوتی دیموکراسی دەدرێ.

خوێندنەوەی تێڕوانینی ناسیونالیزمی عەرەبی بەرامبەر ماددەی ١٤٠ ، کە دژایەتییەکی ڕاستەوخۆی کوردە، دەمانباتە سەر مەسەلەیەکی دیکە، ئەویش هاوکاریی بەشێکی تورکمانە، کە خۆیان لە بەرەی دژایەتی کردنی ماددەی ١٤٠ دا دۆزیوەتەوە، ئەمە لە کاتێکدایە، تەنیا کوردو تورکمان، بەتایبەتی لە شوێنێکی وەك کەرکوکدا، لە پرۆسەی بەعەرەبکردندا زیانیان بەرکەوتووە، ئەوە باسی برایانی کریستیان هەرناکەم، کە ناسیونالیزمی عەرەبی و توندڕەویی مەزهەبی، ئێستاش حیسابیان بۆ ناکەن، ئەوەتا لە عێراقی نوێدا، لە باشوورو ناوەڕاستی ئەو وڵاتەدا جێگەیان نابێتەوەو دەردەکرێن بەشێکی زۆریان ڕوو لە هەرێمی کوردستان دەکەن. لێرەدا پرسیارێك قیت دەبێتەوە، دژایەتی کردنی کورد چی بە پێکهاتەکانی دیکەی ناعەرەب دەبەخشێت؟ لە عێراق کورد لە دوای عەرەب نەتەوەی دووەمە، ئێ ئەگەر ناسیونالیزمی عەرەبی حیساب بۆ دووەمین نەتەوەی وڵات نەکات، چۆن حیساب بۆ تورکمان دەکات، هەقە تورکمان ئێستا چاوێك بە شوێنی خۆیان لە عێراقدا بخشێننەوە، کە تا چەند لە پرۆسەی سیاسی و لە نێو ژینگەی عەرەبیدا دیارن؟ ئەوان کە دژایەتی ماددەی ١٤٠ دەکەن بۆئەوەی خۆیان لەگەڵ عەرەبدا بدۆزنەوە، بەڵام پرسیار ئەوەیە ئایا شوێنی خۆیان لەناو ژینگەی عەرەبیدا دەبینن؟ ئەی ئەگەر لە هەرێمی کوردستاندا خۆیان ڕێك بخەنەوە شوێنیان چۆن دەبێت؟ بێگومان تورکمان لە هەرێمی کوردستاندا نەتەوەی دووەمن و، شوێنیان لەچاو هەموو

عێراقدا دیارترە، کەواتە بەدژایەتی کردنی ماددەی ١٤٠ قەبارەیەکی بچووکیان دەبێ، کە لەگەڵیشی دابین ئەوا قەبارەی ڕاستەقینەی خۆیان دیاردەبێت. هەقە ئەوەش لەبەرچاو بگیرێ، کە لە نووسینەوەی دەستوورو تەواوی پرۆسەی سیاسیدا، کورد تاکە پشتیوانی ڕاستەقینەی تورکمان و تەواوی پێکهاتەکان بووە.

دوای ئەوەی ماددەی ١٤٠ لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا جێبەجێ نەکرا، بیانووی جۆراوجۆر هێندراوەتەوە، هەموویشی بۆ بەهەدەردانی کات بووە، بۆئەوەی ماددەی ١٤٠ جێبەجێ نەکرێ، ئەم ئاڵۆزییە لە سەروبەندی بڕیاردان لەسەر یاسای هەڵبژاردن لە پەرلەمانی عێراقدا جارێکی دی سەری هەڵدایەوە، بەمەش مەترسی کەوتە سەر ئەو یاسایەو تەواوی پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا، لەگەڵ هەڵوێستی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەرامبەر ئەو فروفێڵ و هەوڵانەی دژی کورد لە ئارادابوون، کە ڕایگەیاند بەوشێوەیە بەشداری هەڵبژاردن ناکەین،جارێکی دی ئەمەریکاییەکان لە ئاستێکی بالادا هاتنەوە سەرخەت و، ئێوارەی ڕۆژی ٢٠٠٩/١٢/٦ باراك ئۆبامای سەرۆکی ئەمەریکاو جۆ بایدنی جێگری سەرۆکی ئەمەریکا، لە پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ سەرۆك بارزانی، باس لە ڕێوشوێنی دەربازبوون لەو قەیرانە کراو، ڕۆڵی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە دەربازبوون لەو قەیرانەدا بە گرنگ داندرا، لە بەرامبەردا سەرۆکی هەرێمی کوردستان داوای لە سەرۆکی ئەمەریکا کرد، کە هەڵوێستێکی دیاریان بەرامبەر بە نیگەرانیی کورد لە عێراقدا هەبێت، ئەوەبوو ڕۆژی ٢٠٠٩/١٢/٧ کۆشکی سپی بەیاننامەیەکی دەرکردو تیایدا پشتیوانی لە ماددەی ١٤٠ ی دەستوور کرد، هەروەها دواتر وەزیری بەرگری ئەمەریکا سەردانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانی لە هەولێر کردو، تەئکیدی لە هەڵوێستی ئەمەریکا لەوبارەیەوە کردەوە، بەمەش ماددەی ١٤٠ جارێکی هاتەوە نێو باسان و، ناسیونالیستانی عەرەب دژی وەستان و، ئەو کارەی ئەمەریکایان بە دەستێوەردان لەقەڵەم دا.

ماددەی ١٤٠ بەلای کوردەوە گرنگە، ئەمەریکاییەکان هەست بەو لایەنە دەکەن، دەزانن کە بەلای کوردەوە چەند گرنگە، بۆیە لە هەوڵی بەرەو هەڵبژاردن لە عێراقدا، لەو شوێنانەی جێی ناکۆکی هەرێمی کوردستان و بەغدایە، هێزی هاوبەشی پێشمەرگە سوپای عێراق و سوپای ئەمەریکا جێگیرکران، هەرچەندە دیسان ناسیونالیستانی عەرەب دژی وەستان، بەڵام ئەمە واقیعێکە ناکرێ لەبەرچاو نەگیرێ. سەیر لەوەدایە،

ئەو هەراوهوریایەی ناسیونالیزمی عەرەبی، بەدژی ماددەی ١٤٠ ، بابەتی یەکپارچەیی خاکی عێراق دەوروژێنێ، وەك بڵێی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ بە پارچە پارچەبوونی عێراق بزانن، گرفتەکە لێرەدایە کە دەستوور بە مایەی دابەشبوونی عێراق بزاندرێ، ئەمە ئەو تێڕوانینەیە ناسیونالیستانی عەرەب، شەقامی عەرەبیی پێ دەجولێنن، لە کاتێکدا دەستوور مایەی هێشتنەوەی عێراقە بە یەکپارچەیی، ئەو ئاراستەیەی پێی وایە دژایەتی کردنی ماددەی ١٤٠ خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی عێراق دێنێ، ئەوە هەمان ئەو فروفێڵەیە پێشتر ناسیونالیستانی عەرەب لە شەقامی عەرەبییان کردووە، سەقامگیری لە عێراقدا بەوە دەبێ کە دەستوور بکرێتە بنەمای کارکردن.

ئەگەر بڕیارە عێراق وڵاتێکی دیموکراسی بێت، ئەوا ناکرێ پشت لە دەستوور بکرێ، دیموکراسی لە وڵاتێکی فرە نەتەوەی وەك عێراق لە سایەی دەستووردا دێتە، بەتایبەتیش دەستوورێك کە هەموو پێکهاتەکان بخوێنێتەوە، ئەم پرسە لە سەردانی سەرۆك بارزانی بۆ واشنتۆن، کە لە ٢٠١٠/١/٢٥ چاوی بە سەرۆکی ئەمەریکا کەوت، تەوەرێکی گرنگی دیدارەکەبوو، سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەو دیدارەو دیدارەکانی دیکەی واشنتۆن جەختی لەو مەسەلەیە کردۆتەوە، بە ئەمەریکاییەکانی ڕاگەیاندووە، سەقامگیری و دیموکراسی بەوە دێتەدی کە خەڵکی عێراق پابەندی هەموو ماددەو بڕگەکانی دەستووربن، ئەمەش ئاماژەیەکە بۆ ماددەی ١٤٠ کە ناکرێ پشتگوێ بخرێ. لەودیدارەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، ئەمەریکاییەکان ڕۆڵی هەرێمی کوردستانیان لەبەرەوپێش بردنی عێراق و دیموکراتیزەکردنی ئەو وڵاتەدا بە گرنگ زانیووە، بۆیە بەڵێنیان بە سەرۆك بارزانی داوە کە پشتیوانی لە دیموکراسی بکەن و، دەیانەوێ عێراق لە ڕەوتی دیموکراسیدا پاشەکشە نەکات، بۆیە سەرۆك بارزانی پێی ڕاگەیاندوون کە لەو ڕەوتەدا هاوکارە، بەڵام ئەگەر پاشەکشە لەو ڕەوتەدا هەبێت، ئەوا هەرێمی کوردستان هەڵوێستێکی دیکەی دەبێت.

هاوکات لەگەڵ بڕیاردان لەسەر بودجەی عێراق، بۆ کارەکانی بەڕێوەچوونی ماددەی ١٤٠ یش بودجە داندراوە، بەمەش جارێکی دی زیندوویەتی ئەو ماددەیە سەلمێندرایەوەو، پاشەکشە لە ماددەی ١٤٠ ، لەلایەن کوردەوە بە پاشەکشە لە مافەکانی دادەندرێ. بۆیە دۆخەکە بەو ئاراستەیە چووە، کە جێبەجێ نەکردنی ماددەی ١٤٠ قەیرانی لێ دەکەوێتەوە، ئیدی ئەگەر ناسیونالیستانی عەرەب پێیان وابێ تەنیا

گوێ لەوان دەگیرێ کە دەڵـێن جێبـەجێ کردنـی مـاددەی ١٤٠ ناسـەقامگیری دروسـت دەکات، ئەوا بەلای ئەمەریکاییەکانـەوە جێبـەجێ نـەکردنی ئـەو ماددەیـە قەیرانێکـە پێویستە چارەسەربکرێ. ئەمەش گەورەیی پرسی کورد پیشـان دەدات، کـە نـاکرێ بـەو ئاسانییە سەیربکرێت وەك ناسیونالیستانی عەرەب گەرەکیانە، ئیدی سەقامگیری عێراق و پرۆسەی سیاسی و دیموکراتیزەکردنی عێراق بە ماددەی ١٤٠ ـەوە بەندە، چونکە سەقامگیری بـەوە بەرقـەرار دەبـێ کـە دەسـتوور بەتـەواوی ماددەکانییـەوە ببێتـە حەکـەم. بۆیـە ئەمەریکاییەکانیش بەگرنگی دەزانن کە دەستوور بنەمای کارکردن بێت.

٢٠١٠/٢/٦

# پەیامی خەڵکی کەرکووك

دوای رووخاندنی رژێمی بەعس لە ٢٠٠٣، شۆڤێنیەکان جارێکی دی لە پرۆسەی سیاسی عێراقدا کەوتنەوە جوولە و دارشتنی پیلان بۆ پاکشەکشەکردن بەدۆخی تازەی عێراق، بەرنامەی سەرەکیی خۆدەرخستەوەیان لەبەرزکردنەوەی دروشمی گەرانەوە بۆ مەرکەزیەت و دژایەتی کردنی کورددا پیشاندا.

شۆڤێنیەکان ئەو راستیە دەزانن کە کەرکووك کوردستانیە، لێ هەمیشە لەهەولدان بۆ دابرینی لەکوردستان، دواترین هەولیان دروستکردنی کۆسپ بوو بۆ کەرکووك و گفتوگۆی ناوپەرلەمانی عێراق بۆ دەنگدان لەسەر یاسای هەلبژاردن بەزۆری لە دەوروبەری کەرکووك دەخولایەوەو، ویستیان لە پارێزگاکانی دیکەی عێراقی جیا بکەنەوە و لەم هەلبژاردنەدا(٢٠١٠/٣/٧) دانیشتوانی کەرکووك دەنگ نەداو حالەتێکی تایبەتی پێبدرێت، بۆ پێداگرتنیان لەسەر پێدانی دۆخی تایبەت بەکەرکووك پێشنیازێکی نەگونجاویان هەبوو، کەکەرکووك بکرێتە چەند بازنەیەکی وەکویەك بەگوێرەی پێکهاتەکان، ئەمەش گوزرێکی دیکەبوو بۆ کورد ئامادەکرابوو.

نابێ ئەوەشمان لەبیر بچێ کە خۆ دزینەوەی بەغدا لەسەرژمێری دانیشتوان هەربۆ ئەوەیە سەنگی کورد لەکەرکووك و ناوچە دابراوەکانی دیکەی کوردستان بەدیار نەکەوێت، لەبەرئەوەش بوو شۆفێنیەکان هەولیان دەدا لەرێی تێزو بەرنامەیەکەوە فشار لەسەر کورد بکەن و زۆرجاریش مەسەلەی زۆرینەی دانیشتوانی عێراق و بەم پێیەش زۆرینەی پەرلەمانتاری عەرەبیان پیشان دەدان و دەیانگوت دەبێ پەرلەمان و تەواوی سیستمی سیاسی عێراق پابەندی زۆرینە بکرێ، لێ هەلوێستی خەلکی کوردستان و لەسەروویانەوە هەلوێستە دیارەکانی سەرۆك هەرێم و پەرلەمانتارانی کورد لەبەغدا، پاشەکشەی بەتێزی سەقەتی ئەو شۆفێنیانەکرد، بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان رایگەیاند

بەهیچ شێوەیەك قبوڵ ناكەین دۆخی تایبەت بدرێتە كـەركووك و لـە هەڵبـژادن بـێ بـەش بكرێت، ئەم هەڵوێستەی سەرۆكی هەرێمی كوردستان كە ڕاست و دروست بـوو و لـە جێـی خۆیدا بوو، وێڕای ئەو هەموو فشارو پاڵەپەستۆیە هەڵوێستی تونـدی سـەرۆك بـارزانی كـە هەڵوێستی خەڵكی كوردستانە، ڕێگەی لە پیلانی شـۆفینێنیەكان گـرت و سـەرەنجام یاسـای هەڵبژاردن بە جۆرێك دەنگی لەسەردرا، كە كەركووك جیا نەكرێتەوەو لەگـەڵ پارێزگاكـانی دیكەی عێراق هەڵبژاردنی تیا بكرێت.

لە كاتی بانگەشەكردن بۆ هەڵبژاردن، كەركووك پرسێكی گـرنگ بـوو لـە نێـو بەرنامـەی بانگەشەی لیستی هاوپەیمانی، دوای كۆتایی هاتنی بانگەشەی هەڵبـژاردن سـەرۆكی هـەرێمی كوردستان پەیامێكی ئاراستەی خـەڵكی كوردسـتان كـردو كەشـوهەوای ئـازادو بـە ئـازادی بانگەشەكردنی لە كوردستان بە گرنگ وەسف كرد هەر لەو پەیامەدا سەرۆك بارزانی داوای لە خەڵكی كەركووك كرد كە ئەو دەرفەتە لە دەست نەدەن و بەشداری كارا لە هەڵبژاردندا بكـەن ئیدی كەركووكیەكان ئەو پەیامەی سەرۆكی كوردستانیان لەبەرچاو گرت و بـە ئاوڕدانـەوە لـە مێژووی ئەو شـارە كـە چ زوڵـم و سـتەمێكی لێكـراوە، بـۆ ئـەوەی جـارێكی دی غـەدریان لێنەكرێتەوە، ڕێژەیەكی زۆری خەڵك بەشداری هەڵبژاردنیان كردو بە گوێرەی كۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردن ٧٠٪ی دەنگدەرانی كەركووك بەشداربوون بۆ ئەوەی وەڵامی شۆڤێنیەكان بە دەنـگ و مۆركردنی پەنجەیان بدەنەوە، دەنگیان بە لیستی هاوپەیمانی كوردستان دا، ئەم بەشداریكردنە خۆی لەخۆیدا سەركەوتنێكی گەورەیە، پرۆسەی سیاسی دەباتە قۆنـاغێكی نـوێ و بردنـەوەی كورد لە كەركووك بناغەیەكی تۆكمەو سەرەتایەكی گرنگە بـۆ قۆنـاغی دادێ و بەرچـاورروونی دەداتە تەواوی لایەنە پەیوەندیدارەكان بە كەركووك بە تایبـەتیش un و ئەمـەریكاو كـورد و بەغدا بۆ قسەكردن دەربارەی كەركووك. بەڵێ كەركووك بە بەشدارێكردن لە دەنگـدان بڕیـاری خۆی بۆ گەڕانەوەدا و ئێستا بۆ هەموو لایەك جـارێكی دی ئـەو راسـتیە دووپـات بـۆوە كـە كەركووك كوردستانیە.

٢٠١٠-٣-١٠

## پشوویەك لەهەولێر ئینجا بەرەو بەغدا

بەر لەهەڵبژاردن زۆر قسە دەربارەی گۆڕینی نەخشەی سیاسی عێراق کرا، ئەو بابەتە لەکوردستان بەگەرمی چووە نێو بانگەشەی هەڵبژاردنەوە، هەندێ جار بەجۆرێك پیشان دەدرا، بچووك بوونەوەی قەبارەی کوردی لەئایندەدا بەدوابێت، هەرچەندە بەگوێرەی ژمارەی کورسیەکان وایە، بەڵام ئەوە رەچاونەدەکرا کە کورد دووەم نەتەوەیە و یەکێك لەپێکهاتە سەرەکیەکانی عێراقە، دوای هەڵبژاردن جارێکی دیکە سێ پێکهاتەکەی عێراق شیعە و سوننە و کورد دەرکەوتنەوە، بەڵام لەچەند لیستێکی جیاوازدا.

ئەوەی روویدا لەنێو پێکهاتەکاندا ژمارەی لیست و قەوارە زیادبوون، لەکوردستانیشدا جگە لەهێزە سەرەکیەکان کە لیستی هاوپەیمانی پێکدەهێنن، چەند لیستێکی دی هەن، بەم شێوەیە ئێستا کورد چوار لیستی هەیە.

رۆژێك دوای هەڵبژاردن لێدوانێکی تاریق هاشمی دەربارەی پۆستی سەرۆك کۆمار کەدەبێ بۆ عەرەب بێ، هەرایەکی گەورەی لەناوەندە رۆژنامەوانیەکان لێکەوتەوە، ئیدی لەگەڵ دەرکەوتنی ئەنجامی سەرەتایی هەڵبژاردن، لێرەو لەوێ لێدوانی رۆژنامەوانی دەدرا، هێزە سیاسی و لیستەکان ئەجندەکانیان بۆ قۆناغی دوای هەڵبژاردن و پێکهێنانی هاوپەیمانی راگەیاند، ئەوەی بووە مایەی خۆشحاڵی خەڵکی کوردستان بەیاننامەی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان بوو، کە جەختی لەوە کردەوە مەرجی کورد لەگەڵ لیست و قەوارەکانی دیکەی عێراق پابەندبوون بەدەستوور و جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوور و پۆستێکی سیادیەو، هەر لەو بەیاننامەیەدا راگەیاندرا کە بەرێز تاڵەبانی وەك سەرۆك کۆمار لەخولی دووەمدا کاندید دەکرێتەوە، ئەوەی لەم بەیاننامەیەدا دەبیندرێ

ئامادەبوونە بۆ دۆخی دوای هەڵبژاردن، کەجێی خۆیەتی ئەو ئامادەبوونە بۆ دۆخی دوای هەڵبژاردن بکرێت، بەتایبەتیش لەکاتێکدا هێشتا خەڵکی کوردستان و عێراق زەماوەندی سەرکەوتنی هەڵبژاردنیان دەگێڕا، سەرەتای قۆناغی نوێ بەتەقینەوەی مین دەستی پێکرد کە هەوڵێك بوو بۆ تەڵخ کردنی روانین بۆ قۆناغی تازە، لێرەشەوە گرنگیی یەك لیستی دەردەکەوێ کەنەکرا.

بەڵام ئەوەی جێی هەڵوەستە لەسەرکردنە ئەوەیە، کەدەبێ یەك هەڵوێستی ببێتە سەرمەشقی کاری ئەم قۆناغە، ئەمە واقیعێکە، هەقە جیاوازیەکانی کوردستان بخرێنە خزمەت بەرەوپێشەوە چوونی وڵات و بۆ بەغداش خۆمان یەکبخەینەوە، بۆ هێنانەکایەی دۆخێك کە ببێتە مایەی زەمینەسازی بۆ یەك هەڵوێستی لەبەرامبەر پرسە چارەنووسسازەکانماندا، پێویستمان بەوەیە هەموو لیستەکان لە هەولێر پشوویەك بدەن و قوڕگی نووساوی بانگەشە ئاسایی بێتەوەو تەپوتۆزی ڕۆژانی بانگەشە بنیشێتەوە، هەقە پێشبڕکێ لەسەر دەستپێشخەری باش بۆچوونە بەغدا بکرێت.

بارودۆخی دوای هەڵبژاردن و کۆبوونەوەی چەندین ئەجندە، لە کورد دەخوازێ لیستەکان لەهەولێر پشوویەك بدەن ئینجا باس لەکارنامەی چوونە بەغدا بکەن، ئەمەش میکانیزمێکی هێندە زەحمەت و گران نییە، چونکە دوای هەڵبژاردنی ٢٠٠٩/٧/٢٥ بەسەرپەرشتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کۆبوونەوەیەکی هەموو لیست و لایەنە بەشداربووەکانی هەڵبژاردنی کوردستان کرا و بڕیاری یەك هەڵوێستی بەرامبەر پرسە چارەنووسسازەکان درا، بەر لەو کۆبوونەوەیەش پەرلەمانی کوردستان ئەو هەڵوێستەی ڕاگەیاند.

هەموو ئاماژەکان ئەو کۆبوونەوەیەی هەولێر بەسەرەتای هەنگاوهەڵێنان بۆ چوونە بەغدا دادەنێن و بەکاری هەرە لەپێشی ئەم قۆناغە دادەندرێت، پێویستە ئەو کۆبوونەوەیە کۆتایی بە بەردەوامی دۆخی پێش هەڵبژاردن بهێنێ، تاکە شتێك کە ببێتە هۆی ئەوەی کۆبوونەوەی هەولێر بکاتە خاڵی دەستپێك، پێ لەخۆنان و دان بەخۆداگرتن و لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندی باڵای خەڵکی کوردستانە، ئەم کۆبوونەوەیە کارێکی گران نییە، چونکە خاڵی هاوبەش و ڕەگەزی گرنگ هەیە، لەپێشەوەیان سەرۆکی هەڵبژێردراوی هەرێمی کوردستان چەترێکە بۆهەمووومان، کەواتە چۆن لەسایەی ئەو چەترەدا بەرەو

بەجیاوازیەکانمان دەدەین، بەهەمان شێوە هەمووممان، بۆ یەك هەڵوێستی بەرامبەر تەحەدیاتەکان کۆدەکاتەوە، خەڵکی کوردستان کە بەجۆش و خرۆشەوە بەشداری هەڵبژاردنیان کرد، چاویان بڕیوەتە ئەو هەنگاوە، کەدەبێتە مایەی یەك دەنگی و بەهێزیی کورد، ئاماژەکانی ئەوەش دەرکەوتن کە کورد لایەنێکی گرنگی ئەم قۆناغە دەبێت، هاتنی عادل عەبدولمەهدی و عەلاوی بۆکوردستان بەڵگەی ئەو راستیەن و ڕۆژانی دادێ ئەو جموجۆڵە زیاتر دەبێت.

٢٠١٠/٣/١٥

# ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئادار...نەخشەی ڕێگای پێکەوەژیان

لـە ١٩٧٠/٣/١١ ڕێککـەوتنێك لـە نێـوان سـەرکردایەتی شۆڕشـی مـەزنی ئـەیلوول، بەڕابەرایەتی بارزانیی نەمر و حکوومەتی عێراق مۆرکرا، کە بەڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ناسراوە.

ئەم ڕێککەوتننامەیە لەکاتێکدا بوو، کە ٩ ساڵ بەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول و، ١٢ ساڵیش بەسەر کۆتایی هـاتنی ڕژێمـی پاشـایەتیدا تێپـەڕی بـوو. سـاڵی ١٩٥٨ بارزانی نەمرو هەڤاڵەکانی لە یەکێتی سۆڤیەت گەڕانەوەو، بۆ یەکەم جـار بەشـێوەیەکی روون و ئاشکرا، ناوی کورد لە دەستووری عێراقدا هات و، لە ماددەی سـێی دەسـتووردا هاتبوو کوردو عەرەب لەو نیشتمانەدا هاوبەشن، ئیدی ئەم گۆڕانکارییە، زەمینەی کاری سیاسیی خۆش کرد، جموجـۆڵی سیاسـیی پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتانیش، تـەوژمێکی دیکەی لە سایەی ئامادەبوونی بارزانیی نەمر لە بەغدا بـەخۆوەبینی، پـارتی دیمـوکراتی کوردستان حزبێکی سەرەکی بوو لە عێراقدا، ڕۆڵی سەرەکیی لە مەیدانی سیاسیدا هەبوو، بەڵام بەرە بەرە، بەغدا بەرامبەر بەکورد هەڵوێستی گۆڕی و دۆخەکەی بەرەو ئاڵۆزی برد، بەناچاری کورد ڕاپەڕی و شۆڕشی ئەیلوول بەرپابوو.

لە ماوەی نێوان ١٩٦١ و ١٩٧٠ کە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار مـۆرکرا، چـەندین گەڕی گفتوگۆ لە نێوان شۆڕشی کوردو بەغدا کران، سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول هـیچ دەرفەتێکی ئاشتیی لەدەست نەداوە، ئەگەرچی حکوومەتـەکانی عێـراق، بـۆ فڕوفێـڵ و تەڵەکەبازی و کات بەسەربردن، تا خۆیان دەگرت، ئامادەیی گفتوگۆیان پێشان داوە، بەڵام بارزانیی نـەمر خوازیـاربوو، لـەڕێی ئاشـتییەوە مافـەڕەواکانی کوردسـتان بێنێتـەدی،

ڕێککەوتنی ١١ی ئادار بەڵگەیەکی زۆر گرینگە، بەپێی ئەو ڕێککەوتنە، بەغدا دان بەمافی خەڵکی کوردستاندا دەنێت، چونکە هەمیشە حکوومەتەکانی بەغدا، تێکۆشەرانی کوردیان بە چەتەو ڕێگر دەناساند، ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئادار دەروازەیەکی فراوانی بەڕووی جیهانی دەرەوەدا کردەوە، ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنی نێوان کوردو بەغدا، هێندەی دی کوردی بەجیهان ناساند، لە نێوخۆی کوردستانیشدا، بووە هۆی بەرزبوونەوەی ئاستی براوبەخۆبوون و لایەنی مەعنەویی کورد، لەلایەکی دیکەشەوە، ئەو ڕێککەوتنە بووە هۆی گرنگیدان بە زمان و کولتووری کورد، بۆ یەکەم جار کتێبی خوێندن بە زمانی کوردی بۆ قۆناغە جیاجیاکان چاپ کران و، واقیعێکی ڕۆشنبیریی لە کوردستان سەری هەڵدا، دوای پەشیمان بوونەوەی بەغدا لەو ڕێککەوتنەو نسکۆی شۆڕشیش، ئەو واقیعە ڕۆشنبیرییە کاریگەریی خۆی هەر مایەوە.

ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئادار، دوای پەیمانی سیڤەر لە ١٩٢٠، بەڵگەنامەیەکی بایەخدارە، تەنانەت کاریگەریی ڕێککەوتنی ١١ ی ئادار لە سیڤەر زۆرترە، چونکە دەوڵەتێکی داگیرکەری کوردستان، دانی بەمافی کورددا نا.

ئەگەرچی ڕژێمی بەعس لەو ڕێککەوتنە پەشیمان بۆوەو، لە ماوەی نێوان سالآنی ١٩٧٥ تا ١٩٩١ بەئاگرو ئاسن کەوتە وێزەی خەڵکی کوردستان و، لەو ماوەیەدا گەلی کوردستان جینۆسایدکرا، بەڵام سەرەنجام کورد بە هێزەوە هاتەوە مەیدان، واقیعی هەرێمی کوردستان دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ ، بۆ دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، واقیعێك بوو، پشتگوێ خستنی ئەو واقیعە کارێکی نەکردە بوو، بۆیە کە لەڕێی پەرلەمانی کوردستانەوە، بەر لە ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام، بڕیاری فیدڕاڵی لە چوارچێوەی عێراق درابوو، پرۆسەی سیاسی درێژەی پێدرا.

لە ڕاستیدا، ئەوەی ئەمڕۆ هەیە، لە دووتوێی ماددەو بڕگەکانی ڕێککەوتنی ١١ ی ئاداردا دەبیندرێ، بۆیە پێویستە ناسیونالیزمی عەرەبی، هێندە پشت لە ئێستاو ڕابردووی عێراق نەکاو واقیع بخوێنێتەوە، ئەوەی ئەمڕۆ کورد دەیەوێ مافێکی زەوت کراوەو لەسەر حیسابی خەڵکی دی نییە، لە ساڵی ١٩٧٠ شەوە هەر ئەوەی دەویست، ئەگەر ناسیونالیستانی عەرەب، ئەو واقیعەی کوردستانیان ڕەچاوکردبا، ئەو هەموو کارەساتانەی بەسەر کوردستان و عێراقدا هاتن ڕوویان نەدەدا، لە عێراقی نوێی دوای ٢٠٠٣ ش، هەندێ ناسیونالیستی عەرەب، زۆر بێباکانە هەڵیدەدەنێ و کورد لە نێو

پرۆسەی سیاسی عێراقدا بە نامۆ دەبینن، دەیانەوێ عێراق بگەڕێننەوە پێش سەردەمی ١٩٩١ ، پەند وەرگرتن لە ڕابردوو، باشترین چارەسەرە بۆ عێراق، هەر ئەو هۆیەش بوو، کە وای کرد بە پشت کردن لە ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئادار، کارەسات ڕووبدات، ئێستاش لە عێراقدا هەن، دەیانەوێ پشت لە دەستوور بکەن، هەقە بۆ سوود وەرگرتن لە ڕابردوو، چاوێك بە ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداردا بخشێننەوەو، بڵێن کاتی خۆی بۆ وامان کرد و چیمان دەسکەوت؟

٢٠١٠/٣/١٦

# کەرکووك لەقۆناغێکی دیکەدا

شۆفێنیەکان لە عێراقی نوێدا خاوەنی میراتێکی دەوڵەمەندی شۆفێنیزمن، بەو پێیەی دەوڵەت هەر لەدامەزراندنیەوە تا ٢٠٠٣ لە خزمەتی پیادەکردنی تێزێکی وا دا بووە، هەمیشە زەمینەی بۆ ناسیونالیزمی عەرەبی لە سەر حسابی پێکهاتەکانی دیکە خۆش کردووە ، بەتایبەتیش دوای کۆدێتای ساڵی ١٩٦٨ کاتێ بەعس دەسەڵاتی وەرگرت و تا ساڵی ٢٠٠٣ بۆ ماوەی ٣٥ ساڵ دەوڵەتی خستە خزمەت عروبە، ئیدی سەرکوتکردن و دەرکردنی کورد لە خاکەکەی و بەعەرەبکردنی کوردستان، بەتایبەتیش کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکە هۆیەك بوون بۆ باڵادەستی ناسیونالیستانی عەرەب، بە جۆریك ڕێگەیان بۆ خۆشکرا کەوتنە پیادەکردنی بەرنامەیەك کەبەهۆیەوە لەناوبردنی کوردو پێکهاتەکانی دیکەی عێراقیان بە میکانیزمێکی گرنگدانا لە خزمەت ناسیونالیزمی عەرەبیدا.

ئەمڕۆ لە عێراقی نوێدا ناسیونالیستانی شۆفێنی خاوەنی میراتێکی زۆری داگیرکاری و شێواندنی واقیعن، بەعس وەك داینەمۆی فراوانخوازیی ناسیونالیزمی عەرەب کەرکووکی بە جۆریك بە عەرەب کردو شێواندی، ئێستا ناسیونالیستانی عەرەب کار لەسەر ئەو میراتە دەکەن، میراتی بەعس و ناسیونالیستانی پێش بەعس، وایان لە میراتگرانیان کردووە لە عێراقی نوێدا ببنەوە بەڵا و ڕێگربن لە بەرەو پێش چوون، ئەو میراتە چەند مانگێك خەڵکی عێراقیان بە یاسای هەڵبژاردن خەریك کردو بەدوای ئەوەدا دەگەڕان لەنێوبڕگەو ماددەکانی ئەو یاسایەدا فێڵ لە کورد بکەن و کەرکووك لە هەڵبژاردنی سەرتاسەری عێراق جیابکەنەوەو بارێکی تایبەتی پێبدەن، کە کورد ئەمەی قبووڵ نەکردو سەرۆك بارزانی هەڵوێستی ئاشکرای خەڵکی کوردستانی لەو بارەیەوە ڕاگەیاند، مەرجی دیکەیان بۆ تێپەڕاندنی یاساکە سەپاند، بەپێی ئەو یاسایە نابێ ئەنجامی هەڵبژاردنی کەرکووك بکرێتە بنەما بۆ هەر تەرتیباتێکی سیاسی وئیداری لەو پارێزگایەدا، ئەمەش

بۆ ئەوەبوو ڕێگە لە کورد بگیرێ و نەتوانێ ئەنجامی هەڵبژاردن بکاتە بنەمایەك بۆ گەڕاندنەوەی کەرکووك بۆ ژێر ئیدارەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان.

ئەنجامی هەڵبژاردنی ٧-٣-٢٠١٠ لە کەرکووك وا کەوتەوە کورد ٦ کورسی و عەرەب و تورکمان ٦ کورسی وەدەستبێنن، لە ڕێگەی ساختەکارییەکی زۆر بەتایبەتیش لە قەزای حەویجەو دەوروبەری لیستی ئەلعێراقیە دەنگی زیاتری هێنا، میراتگرانی شێواندنی واقیع ئەو ئەنجامەیان بە سەرکەوتن لە قەڵەمدا، ڕاستە بە هۆی ساختەکاری لەرووی ژمارەوە لە لیستی هاوپەیمانی کوردستان زیاترن، بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە کورد زۆرینە نییە، چونکە دەنگی کورد هەر ئەوەندە نییە، کە شۆفێنیەکان دێن خۆیانی پێ بەراورد دەکەن، وێڕای ئەوەی کورد نیوەی کورسی پارێزگای کەرکووکی وەدەست هێنا، وەك ڕاگەیاندرا لیستە کوردییەکانی دیکە زیاتر لە ٦٠ هەزار دەنگیان هێناوە، هەروەها باس لەوە دەکرێ ژمارەیەکی یەکجار زۆر دەنگدەری کورد دەنگی نەداوە، کەواتە بە هەموو جۆرێك کورد لە کەرکووك زۆرینەیە، ڕاستییەك هەیە ئەویش ئەوەیە ئەگەر ئەو بڕگەیە نەبووایە (کە ئەنجامی هەڵبژاردنی کەرکووك نەکرێتە بنەمای هیچ تەرتیباتێکی ئیداری) ئەوا شۆفێنیەکان جاڕی ئەوەیان دەدا کە ئەوان زۆرینەن، لێ وەك دەڵێن لە کەرکووك (انقلب السحر علی الساحر) .

بە خوێندنەوەی ئەو ڕووداوە خێرایانەی ڕوودەدەن و ئەنجامی هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق، قۆناغی دوای ٧-٣-٢٠١٠ وەرزێکی دیکە دەبێت بۆ کەرکووك، پێویستە دەرس و پەند لەو ڕووداوانە وەربگیرێ، فەوتانی دەنگێکی زۆری کورد لە کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکە، خاڵێکی دیاری پەرش و بڵاوی دەنگی کورد دەگەیەنێ کە پێویستە لەوەرزی تازەی کەرکووکدا، لە داڕشتنی هەر بڕیارو هەڵوێستێکدا ئەو خاڵە بە هەند وەربگیرێ، سەرەتای ئەو قۆناغەش لە هەولێرەوە دەستی پێکردووە، کۆبوونەوەی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ لیستە براوەکانی کوردستان لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراقدا، هەنگاوێکی گرنگە بۆ چوونە بەغداو داڕشتنی پلانی کارکردنی لەمەودوای کورد دەربارەی ناوچە دابڕاوەکان، بۆ ئەوەی کورد لە قۆناغی دوای هەڵبژاردن بە بەرنامەوە بچێتە وەرزی نوێی کارکردن لە کەرکووك، پێویستە لایەنە سیاسییەکان لەخۆبردووانە کاربکەن و زەمینەی بەشداریەکی بەرفراوان بۆ خەڵك بڕەخسێنن و بەدوای پڕکردنەوەی کون و کەلەبەرەکانی قۆناغی پێش هەڵبژاردندا بچن،

پێویستە خاڵی لاوازو کەموری ٧-٣ مان لەبەرچاوبێت کە بریتین لە: ساختەکارییەکی زۆر لە دژی کورد و فەوتانی دەنگێکی زۆر و بەشداری نەکردنی ژمارەیەکی زۆری کورد، ئیدی کوردو کەرکووك چاویان لەوەیە لایەنە سیاسیەکانی کورد لەو سێ خاڵە لاوازەوە بچنە قۆناغی نوێی خەبات و لە وەرزێکی دیکەدا بە بەرنامەی تۆکمەو میکانیزمی گونجاوەوە هایکاری کەرکووك بکەن.

نیسانی ٢٠١٠

# سەرچاوەیەکی لێڵ

# خوێندنەوە یان هەڵتەکاندنی ڕابردوو

دۆخی ڕۆژنامەوانیی کوردستان بە ئاقارێکدا چووە پرسیاری جۆراوجۆری لێدەکەوێتەوە، سەیر لەوەدایە کە باس لەو بێسەروبەرییەی رۆژنامەگەری بکەی، راستەوخۆ بە هەناسە تەنگ و دژە ئازادی ناوت دەبەن، سەیرە کەسانێك بە ئازادی و بۆ بەدیهێنانی مەرامی خۆیان، چ نەماوە بە ئازادیی نەکەن، کە لە رەوتێکی رۆژنامەگەریی کوردستان ورد دەبیتەوە، بۆت دەردەکەوێت ئەو رەوتە بڕیاری داوە چی لەدەستی بێت بیکات بۆ شێواندنی راستی، ئێستا ئەو جۆرە ڕۆژنامەگەرییە کار بۆ شێواندنی مێژوو و ئەو ڕووداوانە دەکات کە سی چلساڵێکە و هەندێکیان سەدەیەك دەبێت لای خەڵکی کوردستان شوێن و پایەی خۆیان هەیەو لە یادگەی خەڵکدا بەڕاستییەکی نکوڵی لێنەکراو تۆمارکراون، ئەو رەوتەی ڕۆژنامەگەری بەناوی سەربەخۆیی و بێلایەنی، هێندە خۆی پێ پرۆفیشناڵە زۆرجار ڕۆژنامەگەری کوردی بەوە تۆمەتبار دەکات کە لەبەر مێژوو و رابردوو ئاگای لە ئێستا نییە، کەچی خۆی دێت بەناوی رەخنەوە وزەیەکی زۆر لەوە سەرف دەکات، هەڵبەتە من ناڵێم مێژووی کوردو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان قابیلی خوێندنەوەو هەڵسەنگاندن نییە، بەڵام بۆ هەڵتەکاندنی رابردوو( وەك هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامە بە ئەرکی خۆیانی دادەنێن) بە بیانووی گەیاندنی بە نەوەی ئێستا، نابێ راستی بشێوێندرێ، کاتێ ڕۆژنامەو گۆڤار بۆ گواستنەوەی مێژوو (وەك خۆیان دەیانەوێ) پشت بە سەرچاوەی لێڵ دەبەستن سوکایەتی بە نەوەی ئێستاو ئازادی دەکەن، ئاخر زەمانێکە لە کوردەواریدا بە قسەی ناڕاست وهەڵبەستراو گوتراوە خاوەنەکەی لە سەرچاوەیەکی لێڵدا ئاوی خواردۆتەوە.

ئێ کە سەرچاوەی قسەو باس لێڵ بێت ئەوا نابێ چاوەڕێی ئەوە بکەیت ڕاستیت دەستکەوێت، باشە چ حیکمەتێکی تێدایە ڕۆژنامەو گۆڤار تەنیا بۆ ئەوەی خۆیان بە ئازا لەقەڵەم بدەن، بۆ رەخنەگرتن لە رەمزی نەتەوایەتی پەنا بۆ قسەی ئەو پیرە ئەفسەرانەی سوپاکانی داگیرکەر ببەن کە هەموو تەمەنیان لە پیلان داڕشتن دژی کورد و وێرانکردنی کوردستان بەسەر بردووە، کەسێك

هەموو تەمەنی بە پشتیوانی سوپاو توانـای زۆری دەوڵـەت لـە دژی کـورد بەسـەر بردبـێ و ئـەو کارەشی  بە شانازی و خزمەت بە نەتەوەی سەردەستی خۆی زانیبێ و بزانێ  چۆن قسـەی خێـر بـۆ کورد دەکات، ئاخر سوپای دەوڵەتانی داگیرکەری کوردستان بە درێـژایی مێـژوویان، ئـەرکی هـەرە سەرەکی و لەپێشیان ئەوە بووە شکسـت بـە بزووتنـەوەی ڕزگـاریخوازی کـورد بهێـنن و هەمیشـە پیلانیان بۆ رابەرو سەرکردەکانمان داناوە تـا لـەناویان ببـەن، ئـەدی ئەفسـەرو دەرەجـەدارانی ئـەو سوپایانە کە بۆ دژایەتی کورد پەروەردە کراون و ڕاهێنـراون، ئێسـتاش لـە ڕێـی ڕۆژنامەگەرییـەوە بوختان بۆ سەرکردەکانمان هەڵدەبەستن و ئەو دەرفەتە دەقۆزنەوە بۆ ئەوەی لە ڕەمـزی نەتەوایـەتیمان بدەن، ئای سەرچاوەیەکی چەند لێڵە، حەیف و مخابن کـە دەیکرێتـە سەرچـاوەی (زانیـاری پێـدان و ڕۆشنکردنەوەو و وریاکردنەوەی) نەوەی نوێ.

هەندێ گۆڤارو ڕۆژنامە بە شانازییەوە بۆ شێواندنی راستی،  بە مانشـێتی گـەورە قسـەی ئـەو شۆڤێنی و چەواشەکارانە دەکەنە سەرچاوەی پەلاماردانی رەمزی نەتەوە، لـە درێـژەی پـەنابردن بـۆ سەرچاوەی لێڵ، ئەو مانشێتانە بوون کە بۆ ناشرینکردنی هەرێمی کوردستان دەربـارەی مەسـەلەی نەوت بەکارهێندران، ئاخر کەسێکی وەك حوسێن شەهرستانی وەزیری نەوتی ئێراق زیاتر لە هەشـت ملیار دۆلاری تەخشان و پەخشان کردووەو فەشەلی هێناوەو کاریگەری دروشمی (نەوتی عـەرەب بـۆ عـەرەب) ی لەسەر ماوە، چۆن حەز دەکات کورد دەست بۆ نـەوت ببـات، ئـەوێك لەبـەر ڕۆشـنایی ئەوەی نەوت بەکورد ڕەوا نابینێ، خوا خوایەتی فەشەلی خۆی بە قسەکردن لەسەر مەسەلەی نەوتی کوردستان بشارێتەوە، چۆن گۆڤارو ڕۆژنامەی کوردی ناقۆزێتەوە. جا لەوە باشـتر دەسـت دەکـەوێت کابرای شۆڤێنی مینبەرێکی لە کوردستان بەناوی سەربەخۆیی بـۆ بڕەخسـێ و درێـژە بـە پرۆسـەی دژایەتی کردنی کورد بدات؟ هەقم بەسەر ئەوانەوە نییە، بەڵام ڕووی قسە لـە ڕۆژنامەگـەریی بـەناو سەربەخۆیە ئەگەر لێم قبووڵ بکەن، گومـانی تێدانییـە کـە هـەموو ئـەو گۆڤـارو ڕۆژنامـە بـەناو سەربەخۆو ئەهلییە ئامانجێکیان هەیە، خۆ دەبێ پەنابردن بۆ سەرچاوەی لێڵیش بـە مەبەسـت بـێ، باشە ئەگەر مەسەلە گەیاندنی زانیاریە بە خوێنەر ئـەوا زانیارییەکـە هەڵەیەچـونکە سەرچـاوەکەی لێڵە، ئێ ئەگەر مەبەستیش  سیاسییە هیچ خزمەتێك بە سیاسەتی کوردی ناگەیەنێ، هەموو ئـەو بەزمەش لە سایەی ئازادیدا دەکەن و دەشڵێن ئازادی نییە، ئەدی بۆچی دەکرێ، ئەمـە لـە مەتـەڵ دەچێ و بۆ خوێنەری بەڕێزی بەجێدەهێڵم بەڵکو  هەڵیبێنێ !

٢٠١٠-٧-٢١

# کەرکووك و ئاییندەی عێرق

# لە گەشتە دیپلۆماسییەکەی سەرۆکی هەرێمی کوردستاندا

سەردانی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ تورکیاو ئەڵمانیاو فەرەنسا، بە گەشتێکی دیپلۆماسیی سەرکەوتوو دادەندرێت، ئەم گەشتە لە کاتێکدایە کە لەبەغدا چەندین ئەجندە دەبەرێکراچوون، لەو لاشەوە ململانێی پۆست وەرگرتن، شڵەژانی دروست کردووە، ئەمەش ئەو راستییە دووپات دەکاتەوە کە هەرێمی کوردستان لە زۆر رووەوە لە بەشەکانی دیکەی عێراق جیاوازە، هەرسێ وێستگەی سەردانی جەنابی سەرۆك، دەهێنێ قسەی زۆری لەبارەوە بکرێ، لێ ئێمە لێرەدا بەلای مەسەلەی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەدا دەچین، یەکێك لەو بابەتانەی لەم سەردانەی سەرۆکی کوردستاندا دەبووە جێی پرسیارو گەڕان بە دوای وەڵامدا، مەسەلەی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان بوو، سەرۆك بارزانی لەبارەی ئەو پرسەوە هەمیشە هەڵوێستێکی ئاشکراو روونی هەبووە، بەو پێیەی هەرێمی کوردستان پێگەیەکی دیاری هەیە، لە میانەی پەیوەندی لەگەڵ دەوروبەرو وڵاتانی دیکەی جیهان، پێگەی هەرێمی کوردستان لە رووی هەلی وەبەرهێنان و درووست بوونی ژینگەیەکی ئارام، لە روانگەی وڵاتانەوە وێنەیەکی خولقاندووە، کە دەکرێ پەرە بە پەیوەندیان لەگەڵ ئەو هەرێمە جیاوازەی عێراق بدەن، جارێکی دی ئەم راستییە لە سەردانی ئەمجارەی جەنابی سەرۆك دا دووپات بۆوە.

بەو پێیەی لە عێراقدا شۆفێنییەکان هەمیشە کاریان بۆ شێواندنی باری دیمۆگرافی و ئەتنۆگرافیای کەرکووك و ناوچە بەعەرەبکراوەکانی دیکە کردووە، لەدوای رووخاندنی رژێمی بەعسیشەوە، ئەم هەوڵەیان بە جۆرو شێوازی دیکە بەردەوام بووە، بەردەوام کەرکووکیان بە بەرمیلی باررووت کردووە، وایان پێشان داوە هەر دەست بردنێك بە مەبەستی چارەسەری بۆ

کەرکووك  بکەن بە هەوێنی تەقینەوە، هەموو ئامانجیشیان هێشتنەوەی تەعریبە دوور لە گەڕاندنەوەی ماف بۆ کورد، ئیدی هەر قسە لێکردنێکی شۆفێنیی عەرەب دەربارەی کەرکووك، بۆ ئەوە بووە لە جیاتی چارەسەر قەیران دروست بکەن، بۆیە لە هەر سەردانێکی سەرۆکی کوردستان بۆ دەرەوەی وڵات، ناوەندە سیاسی و ڕۆژنامەوانییەکانی جیهان، هەڵوێستی هەرێمی کوردستانیان بەلاوە گرنگە، لەو رووەشەوە وێڕای ئەوەی سەردانی ئەمجارەی سەرۆك بارزانی لە پاریس گەیشتە ئیمزاکردنی یاداشتێکی گرنگی لێکتێگەیشتن کە بەخێر بۆ هەرێمی کوردستان دەگەڕێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا کەرکووك لەو گەشتە دیپلۆماسیەدا ئامادەبوو، ئەوانەی بەدوای وەڵامی ئەو پرسەدا دەگەڕان و بەلایانەوە گرنگ بوو هەڵوێستی سەرۆکی هەرێمی کوردستان  لەو بارەیەوە بزانن، جارێکی دی لە ڕێی سەرۆك بارزانی هەڵوێستی هەرێمی کوردستانیان زانی، کەهەڵوێستێکە دەمێکە تەبەنی کراوەو هەرگیز نابێتە کۆسپ و لەمپەر لە ڕێی عێراقی نوێدا، بە پێچەوانەوە هۆکاری ئاشتەوایی و خێرو بەرەکەتە بۆ ئایندەی عێراق، تا ئێستا سەرۆك بارزانی لەبارەی کەرکووکەوە شتێکی لە دەستوور زیاتر نەگوتووە، دەستوورێك کە لە راپرسیدا زۆرینەی خەڵکی عێراق دەنگی بە بەڵێ بۆ داوە، هەڵوێستی نەگۆڕی سەرۆك بارزانی لەبارەی پرسی کەرکووك و ناوچە دابڕاوەکانی دیکەی کوردستان، لە ڕوانگەی گێڕانەوەی مافی زەوتکراوی کوردو پێشێل نەکردنی مافی پێکهاتەکانی دیکەیە، بۆیە سەرۆك بارزانی پێ لەسەر ئەو هەڵوێستەدا دەگرێت،کە  تاکە چارەسەرە بۆ کەرکووك و ناوچە بەعەرەبکراوەکان، چونکە دەستوور بڕیاری چارەنووسی ئەو ناوچانەی بۆ رای خەڵك گێڕاوەتەوە، سەرۆکی کوردستانیش هەمیشە ڕێز لە ڕای خەڵك دەگرێت، هەر بۆیە کاتێ لە ئەنکارا پرسیاری ئەوەیان لە سەرۆکی کوردستان کرد کە چەند ساڵێك لەمەوبەر گوتویەتی شەڕ لە سەر کەرکووك دەکات ئایا ئێستا هەڵوێستی لەوبارەیەوە چییە، سەرۆك بارزانی لە وەڵامدا وتی ئەوکات و ئێستاش وتومەو دەیڵێمەوە کە   لەڕێی ماددەی ١٤٠ ی دەستووری عێراقەوە چارەسەری بۆ ئەو مەسەلەیە داندراوە،  سەرۆك بارزنی لە میانەی ئەو باس و موحازەرانەی لەم گەشتەدا لە چەند ناوەندێکی سیاسی و ستراتیژی  پێشکەشی کردو  لە کۆنگرە ڕۆژنامەوانییەکاندا جەختی لێ دەکردەوە، بە تورك و ئەوروپاییەکانی راگەیاند دەستوور تاکە ڕێگەی چارەسەری و هەنگاونانە بۆ ئەو ئێراقەی هەموو پێکهاتەکان تیایدا هەست بە بوونی خۆیان بکەن، بە لای ئەوروپاییەکانیشەوە گرنگە کە هیچ گرووپ و پێکهاتەیەك پەراوێز نەخرێت، بۆیە هەڵوێستی سەرۆك بارزانی لەو رووە بە گرنگ دەزانن،

چونکه تێزی سەرۆك بارزانی تێزێکە مافی هەموو پێکهاتەکانی ئێراق دەپارێزێ، مافی گرووپ و پێکهاتەیەك لەسەر حسابی ئەوانی دیکە نابێت، لەنێو هەموو بۆچوون و تێزی گرووپ و لایەنەکانی دیکەی عێراقدا توندوتیژی بەدی دەکرێت، چونکە لە جێبەجێ کردندا پێکهاتەی دیکە پەراوێز دەکەن، ئەمەش لەگەڵ تێڕوانینی ئەوروپاییەکاندا نایەتەوە، بۆیە تێزی سەرۆك بارزانی بە گرنگ دەزانن، دەتوانن لە ڕوانگەی ئەو تێزەوە سەیری عێراقی فرەیی بکەن، کە ناکرێ جارێکی دی لە عێراقدا هیچ پێکهاتەیەك پەراوێز بخرێ بە تایبەتیش کورد، هەر بۆیە نیکۆلای سارکۆزی سەرۆکی فەرەنسا لە کاتی دیداریدا لەگەڵ سەرۆکی هەرێمی کوردستان هەڵوێستی رەسمیی حکوومەتی فەرەنسای لەبارەی عێراقەوە راگەیاندو وتی: ئێمە پشتیوانی لە عێراقێکی دیموکراتی و فرەیی دەکەین کە تیایدا کورد ئازادو ئاسوودەبن.

تەموزی ٢٠١٠

# کورد و بڕیاری دروست
# لە هەڵومەرجی دژوار و ئاڵۆزدا

بە حوکمی ئەوەی هێشتا لە عێراقدا ئیرادەیەك هەیە دەیەوێ پشت لە مافە ڕەواکانی کورد بکات، بۆ دژایەتیکردنی کورد نەك تەنیا خۆ لە جێبەجێ کردنی ماددەکانی دەستوور بەتایبەتی ماددەی ١٤٠ دەدزنەوە، بەڵکو کار بەوە گەیشت لە ٢٠٠٨/٧/٢٢ کودەتاشی بەسەردا بکەن، کە بە کودەتای ٢٢ی تەمووز ناسراوە، لەو رۆژەدا زۆر بێ منەتانە بەبێ ئامادەبوونی نوێنەرانی کورد بە تەجاوزکردن لەسەر دەستوور دەنگیان بە یاسای ٢٤ی هەڵبژاردنی پارێزگاکان دا.

٢٢ی تەمووز پێی راگەیاندین هەوڵی ئەو ئیرادەیەی دەیەوێ دژایەتی کورد بکات گەیشتە ئاستێکی مەترسیدار، لەدوای ئەو رووداوە دۆخێك هاتە پێشەوە، کە کوردی ناچار کرد بە هاوپەیمانیەتەکانیدا بچێتەوەو تێڕوانینێکی دیکەی بۆ پەیوەندی هەولێر- بەغدا هەبێت، لێرەوە رۆڵی بڕیاری کورد لە بارودۆخی دژواردا دەردەکەوێ، بەرەنگاربوونەوەی کودەتای ٢٢ی تەمووز بەشێوازی جیا جیا، وەك نارەزایی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان هەر لەو رۆژەدا و، ڤیتۆی سەرۆکایەتی کۆمارو نارەزایی خەڵکی کوردستان لە رێی خۆپیشاندان و پشتیوانی کردنی جەماوەری هەولێرو سلێمانی و دهۆك لە خەڵکی کەرکوك، سەرەتای قۆناغێکی دیکە بۆ بڕیاری هەرێمی کوردستان لە ئاست هەلومەرجی ئاڵۆزو پیلانی شۆڤێنیەکاندا هاتە پێشەوە.

دۆخی دوای هەڵبژاردنی ٢٠١٠/٣/٧ قۆناغێکی دیکەی بڕیاری هەولێرە بەرامبەر بەو کەشە سیاسییەی زادەی هەڵبژاردنە، ئەوەی روویدا هەولێرو بەغدای وەك دوو ناوەندی سیاسی و ئیداریی بردە قۆناغێك هەریەکەو خەسڵەتی تایبەتی خۆی هەبێت، هەرچەندە لە هەرێمی کوردستان و بەشەکانی دیکەی عێراقدا، ژمارەیەکی زۆری لیست و قەوارەی سیاسی چوونە

مەیدانی ململانێی دەسکەوتنی کورسیی پەرلـەمان، لەگـەڵ ئەوەشـدا زۆری نـەبرد، بەغـداو هەولێر لەبەردەم ئەو ژمارە زۆرەی لیست و قەوارەکان هەریەکەو تایبەتمەندی خـۆی وەرگـرت، ئەمەش بۆ بڕیاری هەر یەکێك لەو ناوەندانە دەگەڕێتـەوە. رووخسـاری کەشـی سیاسـی دوای ۲۰۱۰/۳/۷ ئەوەی پێ نیشاندایین، کە لە بەغدا بەهۆی ململانـێ لەسـەر کورسـی دەسـەڵات ناوەندێك نەما بڕیار لە ئاست دۆخی نوێ بدات، بۆیە تا نووسینی ئەم بابەتە زیـاتر لـە پێـنج مانگ بەسەر هەڵبژاردندا چووە، کەچی ململانێی لیستەکان بەغدای بەرەو نائارامی بـردووەو تا دێت توندوتیژی زیاتر دەبێت.

هەندێ سەرچاوەو ئاژانسی رۆژنامەوانی باس لەوە دەکەن، کە لەدوای هەڵبژاردن زیاتر لـە ۱۰۰۰ کـەس کـوژراون و بەشـی هـەرە زۆریـان خـەڵکی سـڤیلن، ململانێـی لیسـتەکان دەستێوەردانی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی زیاتر کردووە. بڕیار لەئاست دۆخی دوای ۷ی ئـادار لـە هەرێمی کوردستاندا بەئاقارێکی دروسـت و باشـدا چـوو، ئەگەرچـی ئاسـەواری هەڵبـژاردنی ۲۰۰۹/۷/۲۵ ی پەرلەمانی کوردستان و بانگەشەی هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێـراق مـابوون، لەگەڵ ئەوەشدا زەمینە بۆ بڕیاری دروست رەخسا، دەکرێ ئاماژە بە رەگەزەکانی ئەو بڕیارە لە ئاست ئاسەواری دوو هەڵبژاردندا بکەین، کە وای کرد دۆخی هەولێر لە بەغدا جیابێت:

۱-بوونی دامەزراوەی شەرعی پەرلەمان و سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و حکوومەتی نوێ.

۲- رۆڵی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە خۆشـکردنی زەمینـەی یـەکبوون لـە بەرامبـەر نەخشـەی سیاسـی دوای ۷ی ئـاداری ۲۰۱۰ لـە بەغـداو پێـداگرتنی لەسـەر ئـەوەی وێـڕای جیاوازییەکانمان لە کوردستان، بەڵام دەبێت لەئاست دۆخی نوێ و بەغدا یەك هەڵوێست بین.

ئەگەرچی هەندێ ناوەندی رۆژنامەوانی لـە هـەرێمی کوردسـتاندا، بەتایبـەتیش ئەوانـەی بەناوی سەربەخۆیی و بێ لایەنی کاردەکەن، خوێندنەوەیان بۆ دۆخـی دوای ۷ی ئاداربـەجۆرێك بوو، کە ئیدی خەڵکی کوردستان هیوای بە ئایندەی نەبێ و لەلایەکی دی کە رۆڵی کوردیان لە بەرامبەر نەخشەی نوێی سیاسیدا زۆر بەکەم دەبینی، یارمەتیدەر نەبوون بۆ کۆبوونەوەی لایەنە سیاسییەکان و یەك هەڵوێستی نواندن لەبەرامبەر ئەو ڕووداوانەی بەڕێوەبوون، بەڵام سـەرۆکی هەرێمی کوردستان ڕۆڵی سەرەکی و کارای بینی لەتێپەڕاندنی دۆخی پێش هەڵبژاردن و بازدان بەسـەر ئاسـەوارەکانیدا، بەمـەش بڕیـاری دروسـتی ڕۆژانـی دوای هەڵبـژاردن، کـەفوکوڵی

بانگەشەکردنی ڕەواندەوەو مەترسی پەرتەوازەیی نەهێشت، ئەم خۆشکردنی زەمینەی پێکەوە بڕیاردان، بەرەو هەموو ئاستەکان چوو، پەرلەمان کۆبۆوەو هەڵوێستی خۆی ڕاگەیاند، حزب و لایەنە بەشداربووەکانی هەڵبژاردن بەئامادەبوونی سەرۆکی کوردستان کۆبوونەوە، هەموو ئەو جموجۆڵە دەسکەوتێکی گرنگی قۆناغەکەی لێکەوتەوە، ئەویش پێکهێنانی(ئیئتلافی لیستە کوردستانیەکان) بوو، ئەگەر ئەو ئیئیتلافە بەڕۆژانی پێش ٢٠٠٩/٧/٢٥ و دواترو پێش ٢٠١٠/٣/٧ بەراورد بکەین، هەنگاوێکی گرنگە، لێرەشەوە گرنگیی بڕیاری نەهێشتنی ئاسەواری هەردوو هەڵبژاردن لەهەرێمی کوردستان بەدیاردەکەوێت.

گرنگترین بڕیاری دروست، کۆدەنگیی ناو ئیئتیلافی لیستە کوردستانیەکان بوو لەسەر داخوازییەکان و مەرجی کورد بۆ دانوستان لەگەڵ هەر لیستێك، ئەویش بەدەوری خۆی ئامادەکاری بوو، بۆ بڕیارێکی لەوە گرنگتر، ئەویش بڕیاری بەیەك دووری وەستان بوو لەبەرامبەر لیستەکان لەبەغدا، هەرچەندە ئەو بڕیارە کە هێڵی سووری بەرامبەر هیچ کەسێك دانەنا بۆ پۆستی سەرۆك وەزیرانی عێراق، لەناوخۆی کوردستان و ئەودیو حەمرینەوە، کەوتە بەر تیرو توانج، توانجی ناوخۆ بەجۆرێك لەگاڵتەکردنەوە، ڕایدەگەیاند،کە جموجۆڵی لیستەکانی بەغدا گەرمەو هەولێریش بێدەنگی هەڵبژاردووە، سەرکردەی هەندێ لیستی بەغداش توانج و پلار دەگرنە کوردو دەڵێن ئەمجارە وەك هەڵبژاردنی ٢٠٠٥ کورد خۆی نەجولاند لایەنەکان بەبەغدا لێك نزیك بکاتەوە، هەردوو توانج ئامانجی تایبەتیان هەیە، ئەوەی ناوخۆ زیاتر بۆ کەمکردنەوەی قورسایی کوردەو لەبەرامبەر ڕووداوەکاندا بەبچووك پیشانیدەدات، هەرچی توانجی ئەودیو حەمرینە، جگە لەوەی قورسایی کورد بەهەند هەڵدەگرێ، بۆیە داوای لێدەکات بێتە مەیدان و دەوری لەهێورکردنەوەی بەغدا هەبێت، لەهەمانکاتدا دەرك بەوەدەکات هەڵوێستی شۆڤێنیەکان و کودەتای ٢٢ی تەمموز گۆڕانیان بەسەر بڕیاری هەولێردا هێناوە.

ئێستا دەرکەوت، بڕیاری کورد بڕیارێکی دروست بووە، چونکە جموجۆڵەکانی بەغدا زیاتر ململانێ و بەکارهێنانی کارتەکانی دەرەوە بووە، چ پێویست دەکات کورد پشتیوانی لایەنێك لەخوتو خۆڕایی بکات بۆ وەرگرتنی کورسی، ئاخر هەر ئەم بڕیارە دروستەبوو، هەولێری کردە ناوەندێك بۆ قسەکردن لەسەر پرۆسەی سیاسی و پێکهێنانی حکومەتی عێراق، بڕیاری دروستی کورد، وایکرد لەدژوارترین دۆخی بەغداو بەنبەست گەیشتی گفتوگۆی لیستە عێراقیەکان، هەولێر لەجموجۆڵی دیبلۆماسی نەکەوێ، وێڕای پێشوازیکردن، لەشاندنی ولاتان و لایەنە عێراقیەکان، سەرۆك بارزانی گەشتێکی دیپلۆماسی سەرکەوتووی بۆ تورکیاو ئەوروپاو

ئەردەن و میسر کـرد، هـەموو ئـەو سـەردانانەی سـەرۆك بـارزانی، لەلایـەن ئـەو وڵاتانـەوە بەسـیفەتی سـەرۆکی هـەرێمی کوردسـتان بانگێشـت کرابـوو. ئەگەرچـی بڕیـاردان هێنـدە پرۆسـەیەکی ئاسـان نییـە، بەتایبـەت بـۆ کـورد، کەچارەنووسـی بـەوڵاتێکی پـڕ لەقـەیران بەستراوەتەوە، لەگەڵ ئەوشدا هەوڵێـداوە بـەپێی قۆنـاغ بڕیـاری خـۆی بـدات، نـابێ ئـەوەش لەبیربکـەین، کـە سـەقامگیری هـەرێمی کوردسـتان و ئامـادەیی دامودەزگـای ئاسـایش، بۆپاراستنی ئاسایشی هەرێمی کوردستان، مەرجی لەپێشی بڕیاری دروستە، لەسەرووی هەموو ئەمانەشەوە حیکمەتی سەرۆکی هەرێمی کوردستان ڕۆڵی سەرەکیی هەیە بـۆ سـازدانی بڕیـار لەکاتی خۆیدا. ڕەوتی ڕووداوەکانی عێراق و ئەو تەنگژەیەی لێـی کەوتۆتـەوە، لەقۆناغـەکانی دادێدا، چەندین جار هەولێر دەخاتەوە بەردەم کات و ساتی بڕیاردان.

٢٠١٠/٨/١٧

# کەرکووك و پارتی

کە سەیری لاپەڕەکانی مێژووی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کورد دەکەین، ڕۆڵی پارتی دیموکراتی کوردستان ڕووبەرێکی بەرفراوانی لەو مێژووەدا هەیە، لە نێو مێژوو و ئێستای پارتی دیموکراتی کوردستانیشدا کەرکووك ئامادەیی هەبووەو هەیە، وێڕای بەشداریکردنی خەڵکی کەرکووك لە بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی دا لە ڕیزەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان، کەرکووك خۆی وێستگەیەکی گرنگی کاری سیاسی و تێکۆشان و خۆنوێکردنەوەی پارتییە، هێشتا دەیەی یەکەمی تەمەنی پارتی تێنەپەڕیبوو، کەرکووك لە ساڵی ١٩٥٣ دا کۆنگرەی سێیەمی پارتیی لەباوەش گرت، ئەو خەتە سیاسییەی لە کەرکووك دارێژرا، بنەمایەکی پتەوی بۆ کاری سیاسیی پارتی بۆ قۆناغەکانی دواتر تا بە ئەمڕۆش دەگات داڕشت، دیارترینی ئەو گۆڕانانەی لەو کۆنگرەیەدا بەسەر کاری سیاسی و حزبایەتی پارتیدا هات، کە تا ئەمڕۆش کاری پێدەکرێت، بریتین لە:

١-گۆڕینی ناوی حزب لە ( پارتی دیموکراتی کورد ) بۆ ( پارتی دیموکراتی کوردستان ) ، ئەمەش بۆ واقیعبینیی ئەو حزبە دەگەڕێتەوە، سەیری پێکهاتەی ئەتنیی کوردستانی کردووە کە جگە لە کورد نەتەوەی دیکەو جگە لە ئیسلام دینی دیکە هەیە، ئەو تێڕوانینە زۆر لە جێی خۆیدا بووە، هەربۆیە خەباتی جووڵانەوەی کوردایەتی زوو چووە سەر ڕێچکەیەك، ئیدی بووە هەوێنی ڕووناککردنەوەی یەکجارەکیی ڕێگای دوورو درێژی خەبات و تێکۆشانی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان و، جگە لە کورد ژمارەیەکی زۆری تێکۆشەرانی پێکهاتەکانی دیکەی کوردستان لە ریزی پارتی دیموکراتی کوردستاندا درێژەیان بە خەبات دا، پارتی زوو دەرکی بەو مەسەلە گرنگە کرد، بۆیە دوای حەوت ساڵ لە دامەزراندنیدا لە کۆنگرەی سێ (١٩٥٣) لە جیاتی وشەی (کورد) لەدوای پارتی دیموکرات وشەی (کوردستان) ی بەکارهێنا، ئیدی لەوێ ڕۆژێ بەولاوە، وەك نەریتێکی لێهات، هەر حزب و گرووپێکی سیاسی کە دامەزرا، ئەزموونی کاری سیاسی و حزبایەتیی پارتی لەبەرچاو بوو، نەدەکرا نادیدە بگیرێ و وشەی کوردستان لەگەڵ ناوی حزبدا بەکار نەهێنێ، داڕشتنی ئەو بناغە سیاسییەی حزبی کوردی لە کەرکووکەوەو لەلایەن پارتی بڕیاری لێدرا.

٢-لەو کۆنگرەیەدا بڕیار لە پێکهێنانی ڕێکخراوی جەماوەری درا و لە پێشەوەی ئەو ڕێکخراوانەش یەکێتی قوتابیان، لاوان، ئافرەتان بوو، کە تا ئەمڕۆش لـە مەیـدان دان و درێژە بە کاری ڕێکخراوەیی خۆیان دەدەن، لە ڕێی ئەو ڕێکخراوانەوە بە سەدان کەسایەتی سیاسی هەڵکەوتووە.

٣-لەڕووی کاری ڕاگەیاندن و ڕۆژنامەوانیشەوە، لەو کۆنگرەیەدا بڕیار درا ئۆرگانی پـارتی لە (ڕزگاری) یەوە ببێتە ( خەبات ) هەرچەندە لە ساڵی ١٩٥٩ بە ئاشـکرا دەرچـوو کـە تـا ئەمڕۆش لەمەیدانی ڕۆژنامەنووسیی کوردسـتاندا بەردەوامـەو سـەدان ڕۆشـنبیر و نووسـەر و ڕۆژنامەنووس و دەیان سیاسەتمەدار لە قوتابخانەی خەبات پێگەیشتوون.

لـە سـەردەمی شۆڕشـی مـەزنی ئەیلوولیشـدا ( ١٩٦١- ١٩٧٥) کـەرکووك ئامـادەیی هەبووە، لەهەموو ئەو وتووێژو دانوستانانەی شۆڕش لەگەڵ بەغداد، کەرکووك خاڵێکی گرنگی دانوستانەکان بووە، چونکە حکوومەتەکانی بەغداد نەیانویستووە کـەرکووك ببێتـە بابـەت و سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوولیش بەرابەرایەتی بـارزانیی نـەمر پێـی لەسـەر داگرتـووە، کـە کەرکووك لە ڕووی مێژوو و جوگرافیاوە کوردستانە، بۆیە پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان هـیچ کاتێك ئامادە نـەبووە لـەبارەی کەرکووکـەوە هـیچ سازشـێك بکـات، بەڵگـەشمان بـۆ ئەمـە قسەیەکی بەناوبانگی بارزانیی نەمرە لـە سـاڵی ١٩٧٤ ، دوای پەشـیمان بوونـەوەی ڕژێمـی بەعس لە ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ لە ڕێی ئـەو پێشـنیازەی لـە ١٩٧٤ پێشکەشـی سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوولی کرد، کەتیایدا پشت لەتەواوی مافی کورد کراو ئەوەی کـورد و بەغدا لەسەری ریککەوتبوون پێچەوانەکەی بوو، بەتایبەتیش کەرکووك و ناوچەکانی دیکـەی بەعەرەبکراوو و دابڕێندراو لەو پێشنیازەی بەعسدا نەهاتبوو، بەغدا دەیزانی کورد بـەوە ڕازی نابێ، بەڵام وەك بەهانەیەك بوو بۆ پەشیمانبوونەوەو هەڵگیرساندنەوەی شـەڕ، بـارزانیی نـەمر ئامادە نەبوو کورد حوکمی زاتییەکی بێ کەرکووکی هەبێ، بۆیە لەوەڵامی بەعسدا دەڵێ: (( خوا شایەتە من ڕکم لەشەڕ دەبێتەوە، شەڕ نالەبارترین شێوازی چارەسەری هـەر کێشـەیەکە، بەڵام بەعس ڕێگەیەکی تری بۆ نەهێشتینەوە، پێشنیازەکەشیان لەوە بەولاوە کە وازیان بۆ لـە کەرکووك و ناوچەکانی تر بهێنین، هـیچ واتایـەکی تـری نییـە، ئەمەشـیان مەحاڵـە، ئەگـەر لەنێوچەوانمان نووسرابێ هەموو لەناو بچین، با بەرەوپیری ئەم چارەنووسەوە بڕۆین، من ئەوەم لا ناخۆشە کورد بێن تف لە گۆڕەکەم بکەن و بڵێن: بۆچی کەرکووکت فرۆشت )) .

ئێستاش بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان وەك پێشمەرگەیەك لە سەنگەری پێشەوەی بەرگریکردنە لە کەرکووك، کاتێ لە ٢٢ی تەمموزی ٢٠٠٨ شۆفێنیەکان کۆدەتایان بەسەر دەستووردا کردو ویستیان لە ڕێی پیلانێك بەویستی خۆیان بارێکی تایبەت بۆ کەرکووك دابنێن، سەرۆك بارزانی هەڵوێستی ڕاشکاوانەی دەربڕی و لە هەمان ڕۆژدا بەیانێکی نارەزایی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان دەرکراو یاسای ٢٤ی تایبەت بە هەڵبژاردنی پارێزگاکان رەتکرایەوە کە بارێکی تایبەتی دابووە کەرکووك، هەماهەنگی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی کورد لە بەغداد کەشێکی دیکەی خولقاندو وەك چاوەڕێ دەکرا سەرۆك کۆمار ڤیتۆی لە بەرامبەر یاساکە بەکارهێنا، سەرۆك بارزانی لە ٢٥-٧-٢٠٠٨ سەردانی بەغدادی کردو لەماوەی ١٠ ڕۆژ مانەوە لەوێ، کۆبوونەوەی زۆر کراو ڕۆژی ٢٦-٧-٢٠٠٨ پێشوازیی کرد لە ڕایان کرۆکەری باڵیۆزی ئەمەریکا لە ئێراق و سەرۆك بارزانی نیگەرانی خەڵکی کوردستانی بە باڵیۆزی ئەمەریکا ڕاگەیاندو ڕاشکاوانە وتی ئەگەر گەلی کوردستان شەریکە دەبێ دیاربێ ئەگەرنا جارێکی دیکە ژێردەستەیی قبووڵ ناکات، باڵیۆزی ئەمەریکا لەو کۆبوونەوەیە هیوای خواست ئەو هەڵەیە چاکبکرێتەوە، هەڵوێستی خەڵکی کەرکووك لە ٢٨ ی تەمموزی ٢٠٠٨ کە لە ڕێی خۆپیشاندانێکی هێمنانە نارەزاییان دژی یاسای ٢٤ دەربڕی، هێندەی دیکە سەرکردایەتی سیاسی کوردستان بەرپرسیاریەتی ئەو قۆناغەی وەئەستۆ گرت، سەرۆك بارزانی لەبەغدادەوە وێڕای دەستخۆشانە لەو خەڵکە تێکۆشەرەی کەرکووك نیگەرانیی بەرامبەر شەهیدبوون و برینداربوونی ژمارەیەك هاوڵاتی دەربڕی، ڕۆژی ٨-٨-٢٠٠٨ سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەردانی کەرکووکی کردو لەگەڵ چین و توێژەکانی ئەو شارەو خانەوادەی شەهیدان و بریندارانی ڕۆژی ٢٨ی تەمموز کۆبۆوە، لەوێ بۆ پشتیوانی کردن لە خەڵکی کەرکووك و وەك پەیامێك بۆ ئەوانەی دەیانەوێ لە ڕێی پیلانگێڕی و کۆدەتاکردن بەسەر دەستورەوە خوێنی کەرکووکیان دەڕێژن ڕایگەیاند:" ئێمە غەدر لە کەس ناکەین بەلام لە کەسیش قبووڵ ناکەین غەدرمان لێبکات". کەواتە ڕێبازی بارزانی و پارتی هەمیشە داکۆکی لە کەرکووك و کەرکووکییەکان دەکات، بە خوێندنەوەی مێژووی یەکانگیریی کەرکووك و پارتی، ئەو ڕاستییە خۆی دەسەپێنێ کە هەرگیز ڕێبازی بارزانی و پارتی دەستبەرداری کەرکووك نابن.

ئابی ٢٠١٠

## شۆڕشی ئەیلوول ..
## وێستگەیەکی گرنگ لە ژیانی کورد دا

ئەگەرچی دەمێکە کورد لە چەندین شۆڕش و ڕاپەڕیندا، لێرەو لەوێ ڕووبەڕووی داگیرکەران بۆتەوە، هەموو شۆڕشەکانیش دەربڕی دەردی داگیرکردنی خاك و کوشتن و ئازاردانی خەڵك و وەرگرتنەوەی مافی زەوتکراو بوون، بۆیە وێڕای جیاوازی قۆناغەکان، هەموویان تەواوکەری یەکتربوون و کاریگەریشیان لەسەر یەکتری داناوە، لێ شۆڕشی مەزنی ئەیلوول لە نێو هەموو شۆڕشەکاندا، بە وێستگەیەکی هەرە گرنگ لە ژیانی کورد دادەنرێت، چونکە شۆڕشێك بوو:

١-خاوەن بەرنامەیەکی سیاسی و دروشمی روون و ئاشکرابوو.

٢- حزبێکی سیاسی هەڵقووڵاوی خەڵکی کوردستان سەرکردایەتی دەکرد.

٣- لە هەمووشی گرنگتر رابەرێکی مەزن و خاوەن ئەزموون و پایەو مەقام و ناوداری وەك بارزانیی نەمر ڕابەرایەتی دەکرد.

٤- تەواوی چین و توێژەکانی خەڵکی کوردستان لە ژێر ئالاَکەیدا خەباتیان دەکرد.

٥- هیچ جیاوازییەکی لە نێوان پێکهاتە نەتەوەیی و ئاتیییەکانی کوردستاندا نەدەکرد، نەك ئەمە بەڵکو تێکەڵاوی ڕۆڵەی ئەو پێکهاتانە لەگەڵ شۆڕش دا بە جۆرێك بوو هەندێکیان گەیشتنە ئاستی سەرکردایەتی.

٦- جگە لە بواری سەربازی و خۆسازدان بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی دوژمن، لە ناوچە ئازادکراوەکاندا دامودەزگای بەڕێوەبردنی دانا و گرنگی بە خوێندن و هۆشیارکردنەوەی خەڵکی کوردستان دا لە ڕێی کردنەوەی قوتابخانەو خولی پێگەیاندنی مامۆستایان و کارمەندی تەندروستی و ڕۆژنامەوانییەوە.

٧- کاری لەسەر نەهێشتنی هەندێ پەیوەندی کۆمەڵایەتی نەشیاو کرد.

٨- پەرەی بە هەستی نەتەوایەتی دا و بووە سەرچاوەیەکی لەبن نەهاتووی خۆڕاگری و تێکۆشان.

٩- خەڵکی کوردستانی بە پشت و پەنای خۆی دەزانی.

١٠-گرنگیی بە پەیوەندیەکان دەداو ڕووداوەکانی کوردستانی بە دنیای دەرەوە دەناساندو دامودەزگای نێودەوڵتیی لێ ئاگادار دەکردەوە، بە نموونە یاداشتی بارزانیی نەمر بۆ نەتەوە یەکگرتووەکان un لە ساڵی ١٩٦٩ دەربارەی بارودۆخی کوردستان لە سایەی بۆردومانی فڕۆکەکانی ئێراق و وێرانکردنی گوند و ئاوایییەکانی کوردستان.

١١- هەمیشە گرنگیی بە ئاشتی داوە، کەناڵی دانوستاندن و گفتوگۆی بە گرنگ زانیوە بۆ وتوێژ لەگەڵ بەغدا، تەنانەت لەسەرکەوتنیشدا ئەو کەناڵەی بە گرنگ داناوە، زۆر جار بەغدا لە لاوازی و دوای شکستی لە بەرامبەر پێشمەرگەدا پەنای بۆ گفتوگۆ هێناوەو ئەو دەستپێشخەرییەش ڕەت نەکراوەتەوە، بۆ نموونە دوای داستانی هەندرێن لە ١٩٦٦ بەغدا پەیوەندیی بە شۆڕشەوە کردەوەو گەڕێکی دیکەی وتووێژی کورد و بەغدا دەستی پێکردەوە.

١٢-پرۆسەی بڕیار زۆر بەگرنگ سەیرکراوە، بۆنموونە دەست پێکردنی وتووێژو خۆئامادەکردن بۆ دانوستاندن بە ڕاوێژو دەستەجەمعی دەکران.

١٣- هەڵوێستی خاکەڕایی و ئەزموونی تێکۆشانی بارزانیی نەمر شۆڕدەبووەوە نێو تێکۆشەران و خەڵکی کوردستان، کە ڕۆڵێکی گەورەی لە بنیاتنانی کەسایەتیەکی پشت بەخۆبەستوو و خۆڕاگرو خزمەتکاری خەڵکی کوردستان بینی.

١٤- بیروباوەڕی کوردایەتی و پاراستنی بەرژەوەندی باڵای گەل لەسەرەوەی بەرژەوەندی تایبەتی وەك پرەنسیپێکی گرنگ لە ژیانی ڕۆژانەدا چەسپاند.

١٥- تێکەڵاویی لە نێو ناوچەکانی کوردستاندا دروست کردو بڕیاری شۆڕش بڕیاری سەرتاسەری بوو، بەمەش تواندرا گیانی یەکگرتوویی بڵاوبکرێتەوەو بڕیارە گرنگەکانی شۆڕش، بەتایبەتیش لە ڕووی کۆمەڵایەتی و پرۆسەی خوێندن و مەسەلەی گۆڕانی کۆمەڵایەتی لە سەرتاسەری کوردستان جێبەجێ بکرێن.

شۆڕشی مەزنی ئەیلوول کولتوورێکی دەوڵەمەندی هەیە، لە چۆنیەتی چوونە نێو مەیدانی دیپلۆماسی و وتووێژ بەتایبەتیش لەگەڵ بەغدا، کە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا زۆر بەسوودن، چونکە بەدرێژایی شۆڕش، قۆناغی دانوستاندن و دیالۆگ هەبووە، کوردیش بۆ دروستکردنی پەیوەندی سوودی لەو دەرفەتانە بینیوە، ئەمەش بۆ گەورەیی ناوناوبانگی بارزانیی نەمر دەگەڕێتەوە، کە توانیی ناوی کورد بە جیهاندا بڵاوبکاتەوە، پرەنسیپە مەزنەکانی بارزانیی نەمر دەرگایان بەڕووی کورددا کردەوەو چەندین ڕۆژنامەنووسی بەناوبانگ ڕێی کوردستانیان

گرتەبەرو سەرسامی خۆیان بە کەسایەتی بارزانیی نـەمر دەربـڕی و لـەڕێی کتێـب و راپۆرتـە ڕۆژنامەوانییەکانیاندا خەبات و تێکۆشانی گـەلی کوردیـان بـە جیهـان ناسـاند، بـۆ نموونـە نووسـەرو ڕۆژنامەنووسـی بـەناوبانگی سـویدی ( تـورد والّسـترۆم) سـالّی ١٩٧٤ سـەردانی کوردستان دەکات و سالّی ١٩٧٥ کتێبێك بە ناوی ( تەنیا چیاکان دۆستمانن...ڕیپۆرتاژێك لە کوردستانەوە ) بلاّو دەکاتەوە [١] ، ئەو ڕۆژنامـەنووسە کەسایەتی بارزانیی نەمر بەم شێوەیە بۆ کۆمەلّگەی سویدی دەخاتەڕوو: (( کاتێ لە دیـداری سـەرکردەی ئەفسـانەیی کـورد مسـتەفا بارزانی دا بووم، لەبەرخۆمەوە بیرم لە کەسایەتی ئەو سەرکردەیە دەکردەوە و ئـەم پرسـیارانەم لەخودی خۆم دەکرد و دەمگوت: کێن ئەو گەورەپیاوانەی جیهـان تـا بـەراوردیان لەگـەلّ ئـەو پیاوەدا بکەم ؟ شای ئێران کێیـە... کیسـنجەرو پـالّمێ و ویلسـۆن کـێن...؟ لەگـەلّ مـەلا مستەفا بارزانی دا بەراوردیان بکەم )) . سەنگی رابەری گەورە بارزانیی نەمر هێندەی دیکە بووە هۆی بەرزبوونەوەی ناوی کوردو ناوبانگی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول، بۆیە شۆڕشی ئـەیلوول بە قۆناغێکی گرنگی کورد دادەندرێت، کە بناغەی شۆڕش و بەرنامەی خۆڕاگری و تێکۆشانی بۆ قۆناغی دوای شۆڕشی ئەیلول دانا. هێشتا بەشێکی دیار لەوانەی لە گفتوگۆودانوستاندنی کورد لەگەلّ بەغدا، یان ئەزموونی وتوێژی سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولیان هەیە، یان سـوودیان لە قوتابخانەی ئەزموونی شۆڕشی ئەیلوول وەرگرتووە، بناغـەی ئەمڕۆی کوردستان لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولەوە داڕێژراوە، شۆڕشی ئەیلوول سەرچاوەیەکی بەهادارە، ئەمڕۆ زۆر پێویستمان بەوەیە کار بە پرەنسیپەکانی ئەو شۆڕشەوە بکەین، تا چاومان لەو سەرچاوە دەولّەمەندە بێت و لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا لەسەر زەوی جێبەجێیان بکەین، ئەوا کەنـدو کۆسـپەکانی ڕێگـەمان کەمتر دەبن و بەرەو نەمان دەچن، جا کە شۆڕشی مەزنی ئـەیلوول وێسـتگەیەکی بایەخـداری مێژوومان بێت، هەقە بۆ خۆڕاگری و شێوازەکانی دیکەی خەبات و خزمەتکردنی خـەلّك، بـۆ کولتوورو ئەزموونی کەلّەکەبووی ئـەو قۆناغـە بگەڕێینـەوە، لـەم سـەردەمەدا جـارێکی دی تەوزیفیان بکەینەوە.

**(١)بڕوانە ڕۆژنامەی خەبات ڕۆژی ٢٥-٨-٢٠١٠ بابەتی کتیب دەربارەی کورد ...( تەنیا چیاکان دۆستمانن ) ، لە نووسینی تورد والّسترۆم و ڕانانی فەخرەدین تاهیر.**

ئەیلوولی ٢٠١٠

# گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەیلوول

دوای تێپەڕبوونی ١٩ ساڵ بەسەر ڕاپەڕین و ١٨ ساڵ بەسەر دامەزراندنی دەسەڵاتی خۆماڵی و ٧ ساڵ بەسەر ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس و زیاتر لە ٦ مانگ بەسەر هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق و لە گەرمەی قەیرانی پێکهێنانی حکوومەتی ئێراق، لە ١١ی ئەم مانگەدا یادی ٤٩ ساڵەی هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول کرایەوە.

لەنێو ئەو هەموو ڕووداوانەی دوای شۆڕشی ئەیلوول بەدوای یەکداهاتن، تا بەوە گەیشت بۆ یەکەم جار لە مێژوودا کورد بەشدارێکی کارای دارشتنی دەستووری ئێراق بێ، کەچی ئەوپەڕی پێویستیمان بە گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول هەیە، بەو پێیەی شۆڕشی ئەیلوول بناغەیەکی پتەوی بۆخەباتی نەتەوایەتی و نیشتیمانیی خەڵکی کوردستان دانا، ماوەی ١٤ ساڵی شۆڕش ئەزموونێکی دەوڵەمەندی لە ڕووی تێکۆشانی جەماوەری و خەباتی دیپلۆماسی و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ هێزە سیاسیەکانی ئێراق بۆ بەجێهێشتووین، بۆیە دەکرێ لە چەند ئاستێکدا مەسەلەی گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەیلوول تاوتوێ بکەین.

یەکەم: لە ئاستی ناوخۆو چۆنیەتی ئاراستەکردنی خەباتی جەماوەری و خڕبوونەوەی حزب و لایەنە سیاسیەکانی کوردستان و یەکدەنگی و یەکهەڵوێستی و نەهێشتنی درز و کەلێن لەو گردبوونەوەیەدا، ئەمەش بە گەڕانەوە بۆ ڕۆحیەتی کارکردن و هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی گەورە بەرامبەر بە خەڵکی کوردستان دەبێت، بۆ ئەمەش ئەزموونی شۆڕشی ئەیلوول پڕە لە وانەو دەرس و پەند، کە لە ڕاستیدا دەوڵەمەندیی ئەو ئەزموونە بۆ ئەزموونی دەوڵەمەندی بارزانیی نەمر دەگەڕێتەوە، هەر ئەو هۆیەشە وایکردووە شۆڕشی ئەیلوول لە یادگەی خەڵکی کوردستان و تەنانەت جیهانیش ( لە ڕێی ئەو ڕۆژنامەنووسانەی لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا چاویان بە بارزانیی نەمر کەوتووە) بمێنێتەوە. خاکەڕایی(تەوازوع) ڕابەری گەل بنەمای ئەو یەکانگیریەی نێوان بارزانیی نەمرو خەڵکی کوردستان بوو، ئەمەش لە فەلسەفەی

خەبات و تێکۆشان و کاری سیاسیی ئەو ڕابەرەوە هەڵقولاّ بوو کە بریتی بوو لە خزمەتکردنی خەڵك، بەم شێوەیە خزمەتکردن و بەرگریکردن لە خەڵکی کوردستان بووە کولتوورێك و لەژیانی ڕۆژانەی تێکۆشەراندا بەدی دەکرا، هەر بۆیە بارزانیی نەمر ڕێزێکی زۆری لەو کەسانە دەگرت کە خزمەتی خەڵکیان دەکرد، ئێمە لەزۆر بۆنەدا لەسەر زاری پێشمەرگەو هەڤاڵانی بارزنیی نەمر ئەو سیفەتە بەرزو گرانبەهایەی ڕابەری گەورەی کوردمان بیستووە کەچۆن خۆی لە پێشمەرگە جیانەکردۆتەوەو لە سادەیی جلوبەرگ و خواردن و ماندووبووندا وەك هەر پێشمەرگەیەك بووە.

هەمیشە ئامادەبووە زەحمەتی بکێشێ بۆ ئەوەی خەڵك ئەزیەت نەخواو زیانیان پێ نەکەوێ. حکوومەتی بەغدا بە فڕۆکە ئەو شوێنانەی بۆردومان دەکرد کە جموجۆڵی بارزانیی نەمری لێ بەدی کردبا، بۆنموونە لە ناوەڕاستی شەستەکانی سەدەی بیستەم و لە گەرمەی شۆڕشی ئەیلوولدا، فڕۆکە چەندین جار گوندی وەسان ی ناوچەی باڵەکایەتی و تەواوی گوندەکانی دیکەی نزیك گوندی وەسانی بۆردومان کرد، بارزانیی نەمر بڕیاری دا ئەو گوندە چۆڵ بکات و بچێتە چیا و دۆڵی دەوروبەری گوندەکە، هەرچەندە خەڵکی گوند بەوە نیگەران بوون کە بارزانی دەیەوێ لەپێناوی ئەواندا زەحمەتی بکێشێ بۆیە داوایان لێکردبوو ئەو بڕیارە نەدات، بەڵام جەنابی بارزانی وتبووی بۆ ئەوەی خەڵك بەهۆی بوونی ئێمە نەبێتە قوربانی چۆڵی دەکەین، ئیدی هەموو بنەماڵەی بەڕێزی بارزانی(ئەوانەی لەوێ بوون) ئامادەبوون چەند ڕۆژێك لەبەر لێزمەی باران لە پەنا شاخ و دوور لە ئاوەدانی بمێننەوە بۆ ئەوەی گوند بۆردومان نەکرێت، بەڕاستی ئەمە لووتکەی خاکەڕایی و خزمەتکردنی خەڵکە، هەرچەندە ناتواندرێ لە وتارێکی کورتدا زۆر لە دەرس و وانەکانی خاکەڕایی بارزانیی نەمر باس بکرێ، بەڵام ئەمە نموونەیەکی ژیانی ڕۆژانەی ڕابەری کوردە لە شۆڕشی ئەیلوولدا و یەکەم جاریشە بڵاو دەکرێتەوە چونکە بە پێویست زاندرا لێرەدا باس بکرێ. بۆیە زۆر پێویستە لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا هەریەکەو بە پێی ئەرك و کار و پلەو پۆستی خۆی ئاوڕێك لە مێژووی شۆڕشی مەزنی ئەیلول بداتەوەو بپرسێ ئەرێ ئەوە چی بوو وای کردبوو بەرژەوەندی باڵای میللەت لەسەروەی بەرژەوەندی تایبەت دابندرێ؟

دووەم: لە ڕووی دیپلۆماسی و پەیوەندی لەگەڵ بەغدا، شۆڕشی ئەیلوول بناغەیەکی گرنگی بۆ داناوە، لە قۆناغەکانی دواتر تا بە ئەمڕۆش دەگات، زۆر سوود لە ئەزموونی شۆڕشی ئەیلوول وەرگیراوە، بۆیە هێشتا پێویستیمان بە خوێندنەوەی ئەو ئەزموونە هەیە.

سێیەم: دوای ئەو هەموو ڕووداوانە، ئەگەر سەیری مێژووی ئەو شۆڕشە بکەین، بۆمان دەردەکەوێت کە بارزانیی نەمر چەند واقیعبینانە هەنگاوی هەڵێناوە، ئەو دووربینیەی ڕابەری کورد بۆ بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان ڕێگە خۆشکەربوو، هەربۆیە دروشمی ئەوێ ڕۆژێی شۆڕشی کوردستان (دیموکراسی بۆ ئێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) بوو، ئێستا ئێراق گیرۆدەی قەیرانێکی گەورە بووە، چونکە هێزە سیاسیەکانی ئێراق هەوڵیان نەداوە زەمینە بۆ دیموکراسی خۆش بکەن، ئەمەش وای کردووە تابلۆیەکی شێواوی ئێراقمان پیشان بدات، ئەگەر لە سەردەمی شۆڕشی ئەیلوولدا بەغدا گوێی لە بارزانیی نەمر گرتبا و پشتی لە دروشمی (دیموکراسی بۆ ئێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان)نەکردبا، ئێستا ئێراق لە قۆناغێکی زۆر پێشکەوتوودا دەبوو و ئەو هەموو کارەساتانە بەسەر گەلانی ئێراقدا نەدەهاتن، ئەگەر گەڕانەوە بۆ پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەیلوول بۆ کورد گرنگ بێت، ئەوا بۆ بەغدای ئێستا گرنگترە، چونکە دەبێتە هۆی سەقامگیری سیاسی لە ئێراقداو ڕێگە لە دووبارەبوونەوەی کارەسات دەگرێت.

چوارەم: لەبەر ئەوەی بارزانیی نەمر هەمیشە بەدوای ئاشتیدا گەڕاوە، هیچ دەرفەتێکی گفتوگۆو دانوستاندنی لەگەڵ بەغدا ڕەت نەکردۆتەوە، تەنانەت لە ڕۆژگارێکدا کە پێشمەرگە لەوپەڕی سەرکەوتندا بووە دەستپێشخەری گفتوگۆی ڕەت نەکردۆتەوە، هەرچەندە دەیزانی بەغدا گەمەی بە کات دەکرد، کەواتە شۆڕش بەدوای هەلی ئاشتیدا دەگەڕاو بەغداش بە دوای هەل و دەرفەتی تەڵەکەبازی و فڕوفێڵ و پەلاماردانەوەی کوردستان، بەڵام ئەو تێڕوانینە شۆفێنیە زیانی گەورەی بە گەلانی ئێراق گەیاند، شۆڕش دەستی درێژبوو دەیتوانی لە ناوچەکانی ژێر دەسەڵاتی ڕژێمی بەعس لە ڕێی تەقینەوەوپشێوی بنێتەوە، بەڵام دەرس و وانەی بارزانیی نەمر شێوازی خەباتی کوردی بە ئاراستەیەکی تردا برد و شۆڕش و خەباتی کورد لەوبارەیەوە تۆمارێکی خاوێنی هەیە، ئەمە لە کاتێکدا بووە کە بەغدا لە پەنای ئاشتیەوە پیلانی تیرۆرکردنی بارزانیی نەمری داوە، شۆڕش لەماوەی ئاشتیی ١٩٧٠-١٩٧٤ بەرنامەی ئاوەدانکردنەوەی کوردستانی دادەڕشت، بەغداش بەرنامەی کاولکردنی کوردستان، ئەمڕۆش لە کوردستاندا ئیرادەیەك هەیە بەپشت بەستن بە ڕێبازی بارزانی کە ڕێبازی خزمەتکردنی خەڵك و ئاوەدانی و برەودانە بە لێبووردەیی، کوردستانی لە بەشەکانی دیکەی ئێراق جیاکردۆتەوە.

کەواتە بۆ ئەوەی خزمەتی خەڵك بکەین، هەرکەسەو لە هەر پلەو پایەو پۆستێکدابێت، پێویستە بۆ پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەیلوول بگەڕێتەوە، چونکە بە پێی پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەیلوول بەرپرسیاریەتی ئەرکێکی گەورەیەو بەرپرس ئەو کەسەیە کە خزمەتی خەڵك دەکات، تا بەرپرسیاریش گەورەبێت ئەرك و خزمەتکردنیش زیاد دەبێت، جا بۆ ئەوەی ئەم هاوکێشەیە بە بەراوەژوو نەخوێنینەوە، پێویستە ئەو پرەنسیپانە لەبیر نەکەین. بۆ ئەوەی بە ئەزموونەوە بچینە بەغدا بۆ دانوستاندن پێویستە ئەزموونی دەوڵەمەندی گفتوگۆی کورد و بەغدا لە سەردەمی ئەیلوول لە یاد نەکەین. ئەگەر دەست بە پرەنسیپەکانی شۆڕشی ئەیلوولەوە بگرین، قەت کەلێن لە نێوان خەڵك و دەسەڵاتی خۆماڵی دروست نابێ، مەرجی سەرەکیی هەنگاوەکانی دانوستاندن و یەکهەڵوێستی لە بەغدا بە نێوخۆی کوردستاندا رەت دەبێت، کەواتە بۆ ئەوەی سڵ لە خزمەتکردنی خەڵك نەکەینەوەو خۆڕاگربین و تێهەڵچینەوەو سەرکەوتووبین دەبێ بۆ پرەنسیپەکانی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول بگەڕێنەوە.

٢٠١٠-٩-٢٠

# تێزی هەولێر بۆ چارەسەری قەیرانی بەغدا

کۆتایی هێنان بـە ڕژێمـی بـەعس و دەسـەڵاتی تاکڕەوانـەی سـەدام لـە ٩-٤-٢٠٠٣ ، دەرفەتێکی لەباری هێنایەپێشەوە، بۆ دووبارە پێداچوونەوە بە شێوازی حوکمڕانی لە ئێراقـدا، چونکە دەسەڵات لە دەستێکدا کۆببۆوە، ناسیونالیستانی عەرەب لە ئێراقدا، هەمیشە خـەون بە مەرکەزییەتەوە دەبینن، بۆ ئەوەی لـەو ڕێگەیـەوە تێـزی خۆیـان جێبـەجێ بکـەن، هـەر هەولێکیش بە ئاراستەی وەدیهێنانی ئەو خەونە بێت، ئەوا دەیەوێ بەردەوام خوێن لـە ئێـراق بچۆڕێ و نەپەڕژێتە سەر دۆزینەوەی ڕێگەچارەی دەربازبوون لەو هەموو قەیرانانەی بە درێژایی مێژوو و لە سایەی دەسەڵاتی مەرکەزی و تاکڕەویدا کەڵەکە بوون. لە حەوت ساڵی ڕابردوودا، وێڕای نووسینەوەی دەسـتوورو ڕێککـەوتنی لایەنـەکان لـە سـەر بـەڕێوەبردنی وڵات، کەچـی کێبەرکێی گرووپ و هێزە سیاسییەکان بۆ گرتنەدەستی زۆرتـرین دەسـەڵات، کێشـەو گـرفتی گەورەی لێکەوتەوە، ئەمەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئێراق وڵاتێکی فرە ئیتنیکییە، هەر گرووپ و پێکهاتەیەك دەیەوێ زۆرترین دەسەڵاتی هەبێت، لەنێو پێکهاتەکانی ئێراق دا، تەنیا کورد بەلای ئەوەدا نەچووە کە بە غدا کۆنترۆڵ بکات، ئەوەی کـورد دەیـەوێ بەشـداربوونێکی ڕاستەقینەیە لە حوکمڕانیداو هاتنەدیی مافەکانیەتی، کەچی ئامانجی زۆر لەو گرووپ و هێـزو تاقمانەی دیکە کۆنترۆلکردنی بەغدایە، کۆنترۆڵکردنێـك کـە مایـەی مەترسـی و گەڕانـەوەی تارمایی مەرکەزییەت و کۆکردنەوەی هـەموو دەسـەڵاتێك بێـت لـە دەسـتێکدا، لەڕاسـتیدا ئەزموونی چەند ساڵی ڕابردوو دەریخست، کە لە بەغدا مەیلێك هەیە بۆ کۆکردنەوەی دەسەڵات لە دەستێکدا، هەر بۆ ئەم مەبەسـتەش چـەندین هێـزو گـرووپ و تـاقم داوای ڕەتکردنـەوەی فیدراڵیان کردووەو لە دژی دەوەستن، حکوومەتی ئێراق زۆر بڕیاری تاکلایەنەی دەرکـرد کـە بوونە هۆی زیادکردنی کێشە، ئەمەش سەری بۆ ئەوە کێشا لایەنە براوەکـانی هەڵبـژاردنی پەرلەمانی ئێراق لـە ٧-٣-٢٠١٠ بکەونـە ململانێیـەکی توونـدو، کورسـیی سـەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی ئێراق بۆتە مایەی رکابەرییەکی سەختی نێوان لیستەکانی عەرەب.

هەرێمی کوردستان لە ئاست قەیرانی بەغدا خاوەنی بەرنامەی خۆیەتی، کە بە کارنامەی ئیئتیلافی لیستە کوردستانییەکان ناسراوە، ئەم کارنامەیە کارنامەیەکی هەمەلایەنە، نەك تەنیا بۆ چۆنیەتی پەیوەندیی هەولێرو بەغدا، بەڵکو کارنامەیەکی گرنگیشە بۆ چارەسەری قەیرانەکانی بەغدا، چونکە ئەو کارنامەیە زادەی بارودۆخی هێوربووەوەی دوای هەڵبژاردنە، ئەو کارنامەیەی ئیئتیلافی لیستە کوردستانییەکان، دوای چەندین کۆبونەوەی لایەنە بەشداربووەکانی کوردستان بە ئامادەبوونی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی کوردستان هاتووەتەدی، دەمەوێ بڵێم کارنامەیەکە کاری زۆری بۆ کراوە، سەرۆك بارزانی هەر لە ڕۆژانی دوای هەڵبژاردنی ٧-٣ ، زوو هاتە مەیدان و کاری بۆ ئەوەکرد کۆتایی بەئاسەواری ڕۆژانی بانگەشە بهێنێ و کار بۆ قۆناغی دوای هەڵبژاردن بکرێ، ئیدی چەندین کۆبوونەوەی یەك لە دوای یەکی لایەنە سیاسییەکان، زەمینەی لەباری ڕەخساند تا بەوە گەیشت کۆدەنگی لەسەر ئەو کارنامەیە بکرێ، چونکە کارنامەیەکە سەرباری ئەوەی مەرجی بۆ هەر لیستێك داناوە بۆ دانوستان دەربارەی هەندێ پرسی هەڵواسراوی وەکو جێبەجێکردنی دەستوور و مەسەلەی پێشمەرگەو نەوت وغازو سەرژمێری و بەشداری هەموو لایەك لە حکوومەتدا، لەگەڵ ئەوەشدا باشترین چارەسەری پێیە بۆ ئێراق، کە بریتییە لە هاوسەنگی لە دابەشکردنی دەسەڵات و پابەندبوون بە دەستوور.

ڕۆژی ١٥-٨-٢٠١٠ سەرۆك بارزانی پێشوازیی کرد لە بەڕێز جیفری ڤیلتمان یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا، بارودۆخی سیاسی و بەربەستەکانی دیموکراتی و مەسەلەی پێکهێنانی حکوومەتی نوێی ئێراقیان تاوتوو کرد، سەرۆك بارزانی ئەو هەنگاوە دەستووری و یاساییانەی بۆ یاریدەدەری وەزیری دەرەوەی ئەمەریکا روونکردەوە کە پێویستە جێبەجێ بکرێن، لەبارەی چۆنیەتی چارەسەرکردنی کێشەی پۆستی سەرۆك وەزیران و ئەنجامدانی چاکسازی لە دامودەزگاکانی حکوومەتی فیدراڵ و پۆستە باڵاکانی وڵات بە دابەشکردنی دەسەڵاتەکان، ئەم دابەشکردنەشی بە زامنێکی گەورە دانا بۆ بەردەوامی پرۆسەی سیاسی و دیموکراتی لە ئێراقدا. گرنگە بەغدا گوێ لە هەولێر بگرێ، چونکە کارنامەی هەرێمی کوردستان، دەستی لەسەر برینەکانی ئەو وڵاتە داناوەو چارەسەرێکی گونجاوە بۆ ئەو قەیرانەی رووبەرووی ئێراق بۆتەوە، چونکە هەر هەنگاونانێك بۆ ئەوەی بەغدا بکرێتەوە ناوەندی دەسەڵاتی مەرکەزی، ئەوا وڵات بەرەو دواوە دەگەڕێتەوە، بۆیە تێزی هەولێر بۆ دابەشکردنەوەی دەسەڵاتەکان، دەبێتە یارمەتیدەر و دەربازبوون لە قەیرانی

پێکهێنانی حکوومەت، ئەم تێـزەی هـەولێر لـە یادگـەی خـەڵکی کوردسـتان و تەنانـەت خەڵکی ناوچەکانی دیکەی ئێراقیشدا نامۆ نییە، لە ئێراقـدا بـە درێـژایی مێـژووی خـۆی بەتایبەتیش لە سەردەمی یەکـەم کۆمـارەوە تـا ئـەمڕۆش، پـارتی دیمـوکراتی کوردسـتان هەمیشە نوێنەرایەتی ڕوانگەی دابەشکردنی دەسـەڵاتەکانی کـردووە کـە خـۆی لـە تێـزی لامەرکەزییەتدا دیوەتەوە، ئەمڕۆش جارێکی دی، هەولێر بەپشت بەستن بـەو کولتـوورەی تێکشـکاندنی مەرکەزییـەت و دابەشـکردنی دەسـەڵات بەشـێوەیەکی عادیلانـە بەسـەر پێکهاتەکانی ئێـراق، تێهەڵدەچـێتەوەو بـە بەرنامەیـەکی سـەردەمیانە بەشـداری دەکـات بەوپێیەی کە بەرنامەی چارەسەری پێیە، بۆیە ئەگەر بەغدا گوێ لە سەرۆك بارزانی و تێزی هەولێر بگرێ، ئەوا پێکهاتەکانی ئێراق ئاهێکیان دێتەوەبەرو تروسکایی ژیـانێکی نوێیـان لێ وەدەردەکەوێ، ئەگەر خوانەخواستە پشتیش لەو تێـزە هەمەلایەنیـە مەعقولـە بکـرێ، ئەوا زەمینـە بۆ شۆفێنیزم بەتەواوی دەڕەخسێ و عروبەی تەسکبین و پـەڕگیر بـە بـەربلاوی سەردێنێتەوەدەر، بۆیە تا زووە، بۆ هەموو پێکهاتەکانی ئێراقێ باشە، گرووپ و دەسـتەو لایەنە سیاسیەکان هانبدەن، کە چیدی لە ئاست تێزی مەعقولدا گوێیان نەئاخنن.

٢٠١٠-٨-٢٢

# ماڵی کورد و ماڵی عەرەب

ئەم ناونیشانە، لەوەوە سەرچاوەی نەگرتووە، کە خوانەخواستە هیچ حیسابێك بۆ پێکهاتەکانی دیکەی ئێراق نەکرێ، بەڵکو لەوەوە هاتووە کە قەبارەی هەردوو نەتەوەی عەرەب و کورد لە ئێراقدا، بەجۆرێکە بە درێژایی مێژوو، وا سەیری ئەو وڵاتە کراوە کە لە دوو نەتەوەی سەرەکی ( کورد و عەرەب) و پێکهاتەی دیکە پێکهاتووە، ئیدی وای لێهات زاراوەی کوردو عەرەب کەوتە سەر زاری خەڵك، هەرچەندە شۆڤێنییەکانی ئێراق لە سایەی دروشمی بەناو برایەتی کورد و عەرەب هەوڵی لەناوبردنی کوردیان داو ئافاتێکی گەورەیان بەسەر ئێراقدا هێنا، ئەمڕۆش ئەم وڵاتە بەدەستییەوە دەناڵێنێ.

ئەو شکڵ و شێوە کارە سیاسییەی لە ئێراقدا ئامادەیی هەبووە، تا ئێستاش کۆسپی هەرە گەورەی ڕێی دیموکراسییە. هێشتا لەم وڵاتەدا کولتووری لێبوردەیی نەچەسپیووە، ئەم کولتوورە سەری بۆ یەکتر قبووڵ نەکردن کێشا، کە دەردی هەرە گەورەی ئەمڕۆی ئێراقە، یەکتر قبووڵ نەکردن زیانی بە پرۆسەی سیاسی گەیاندووە، لەو نێوەدا ئەوانەی چاویان لەوەیە ئێراقی ئەمڕۆ ئێراقی هەمووان بێ، ترس دایگرتوون و لەسایەی یەکتر قبووڵ نەکردن لە ئایندەیان نیگەرانن. ئەگەر بە واقیعی سەیری ئێراق بکرێ، نابێ هیچ گرووپێکی سیاسی بە چاوی کۆنترۆڵکردن بڕوانێتە بەغداو خەون بەوەوە ببینێ پشت لە کورد بکرێ، ئەگەر هەموو لایەك ئەو قەناعەتەیان لادروست بووبێ کە کورد نەتەوەی دووەمی ئێراقە، چ پێویست بەوە دەکات کورد دوای هەر هەڵبژاردن و بەر لە هەر خولێکی نوێی پەرلەمان و پێکهێنانی حکوومەتی تازە، جارێکی دی بکەوێتەوە خۆو تێهەڵچێتەوە.

لێرەوەیە قسەکردن لە زاراوەی ماڵی کوردو ماڵی عەرەب دێتە پێشەوە، بۆ عەرەب دوای هەڵبژاردنی ٧-٣-٢٠١٠ سەرەتایەکی نوێ بوو، چونکە واقیعی دوای رووخاندنی ڕژێمی سەدام، هەڵپەی گرتنە دەستی دەسەڵات و زەقبوونەوەی گرووپی مەزهەبی و دەستەو تاقمی جیاجیا و ململانێی توند لەپێناوی گەیشتن بەکورسی، جۆرێك لە پەرش و بڵاوی خستە نێو

ماڵی عەرەب، ئەو لێکبلاوییە لە ئەنجامی مشتومڕی وەرگرتنی پۆستی سەرۆك وەزیران وەك ئاماژەیەك لە نێو لیستەکانیاندا سەری هەڵدا، لێ ئەمە ئەوە ناگەیەنێ، کورد وا سەیری بکات کە پێویست بە تەگبیر نەکات، هەر سەبارەت بەو مەسەلەیە، دەبێ ئەوەش بڵێین کە ئەوەی لە ئێراق روویداو ئەگەری روودانەوەی هەیە، کۆبوونەوەو خۆ یەکخستنەوەی عەرەبە لەبەرامبەر کورد، نموونە گرووپی ٢٢ی تەمموز بوولە ٢٢-٧-٢٠٠٨ دا، کە لە پەرلەمانداو لەسایەی دیموکراسی و بە بەرچاوی خەڵك و جیهانەوە کۆدەتایان بەسەر دەستووردا کردو ویستیان بە یاسا شەرعیەت بە دژایەتی کردن وپەراوێزکردنی کورد بدەن، ئەمە نموونەیەکی ئەم سەردەمەیە، کە تیایدا زۆربەی دەستەو تاقم و لایەنی سیاسیی نەتەوەی سەردەست هەر بەڕەی جاران دەپێون، ئاخۆ ئەوە چییە پاڵ بە نەتەوەی سەردەستەوە دەنێ لە پەنای زۆریی ژمارەی دانیشتوان، هێشتا پەنا بۆ ئەوە ببات پیلان لە نەتەوەی دووەم بکات؟ کۆدەتای ٢٢ ی تەمووز و هەوڵ و شالاوەکانی دیکەی قۆناغەکانی رابردوو بۆ سەر کورد، پێمان دەڵێ لەبەر ئەوە بووە بە درێژایی قۆناغە جیاجیاکان، کورد چاوی لە یەك ماڵی بووە، هەر جارێکیش لێکترازان روویدابێ، هاواری یەکخستنەوەی ماڵی کورد لە هەموو لایەك هەستاوە، کە لە جێی خۆی بووە، هەندێ جاریش بەتایبەتی لە دوو سێ ساڵی ڕابردودا، چەند دەنگێك لە کوردستان بە جۆرێك قسەی لەسەر ئەو یەك ماڵییەی کورد کردووە، کە بە کەم سەیر کراوەو وایان پێشانی خەڵك داوە، ئەو یەك ماڵییە تەنیا لە بەرژەوەندی پارتی و یەکێتی دایە، کەچی ڕۆژگار گرنگیی ئەو یەك ماڵییەی سەلماند.

دوای هەڵبژاردنی ٧-٣ دۆخی کوردستان بە جۆرێك هاتە پێشەوە کە زەرورەتی کۆکردنەوەی هێزو لایەنە سیاسییەکانی هێنایەپێش، هەرچەندە قۆناغی دوای هەڵبژاردنی ٢٥-٧-٢٠٠٩ کەشێکی وای خوڵقاندبوو، کە هەندێ کەس یەکخستنەوەی ماڵی کوردی بە ئەستەم دەزانی، لەولاشەوە چەند دەنگێك کاریان لەسەر ئەوە دەکرد یەکخستنەوەی ماڵی کورد و هەر هەنگاوێك بەو ئاقارەدا بە کەم لەقەڵەم بدەن، ڕۆڵی سەرەکیی کۆکردنەوەی تەواوی ئەو لایەنە سیاسیانەی بەشداری هەڵبژاردنیان کردبوو، بۆ بەڕێز سەرۆك بارزانی دەگەڕێتەوە، سەرۆکی کوردستان بووە چەترێك بۆ کۆکردنەوەی لایەنە سیاسییەکان، بەمەش هەولێر چەندین کۆبوونەوەی بەخۆوەبینی کە لەدایکبوونی ئیئتیلافی لیستە کوردستانییەکانی لێکەوتەوە.

زۆر جار لێکترازانی ماڵی کورد، زەبری کوشندەی لێداوین، زۆرجاریش لە ساتەوەختی ناسکدا ماڵ یەکخراوەتەوەو دەسکەوتی گەورە وەدیهاتوون، بۆیە پێویستە هەموو کاتێ هەست بە گرنگیی ماڵی کورد بکەین، ئاخر گەورەیی ڕاپەڕین لەوەدا بوو بەهۆی یەککگرتوویی هێزە سیاسیەکان، ڕیزەکانی خەڵکی کوردستانیش یەکخراو هەموولایەك پێکەوە دەست لەناو دەست ڕاپەڕین و کوردستان ئازاد کرا، بەکورتی هەرجارەی یەکماڵە بووبین دەسکەوتی گەورەمان وەدەستهێناوە.

کۆبوونەوەی لیستە کوردستانییەکان لە ئیئتیلافێکدا، ئاماژەیەکی گرنگە بۆ قۆناغی دادێ کە نابێت نادیدە بگیرێ، پێویستە ئەو پرسیارە لەخۆمان بکەین، ئەگەر عەرەب کە زۆرینەی ئێراقەو دنیای عەرەب و وڵاتانی ئیقلیمیش پشتیوانیان دەکەن و لەبەرامبەر کورد خۆیان یەکخەن و گردبوونەوەی وەك ٢٢ی تەمموزمان لێ بکەن، بۆچی یەکماڵی بۆ ئێمە گرنگ نییە؟ چونکە ئەوپیلانە هەرەشە نییە بۆ سەر چەند لایەنێك، بەڵکو بۆ هەموومانە، بۆیە ئەو ناسیونالیستە عەرەبانەی فرمێسك بۆ ئەوە دەرێژن، کە لە کوردستان حزبە گەورەکان ڕێگە بە دەنگی جیاواز نادەن، بۆ ئەوەیە هەمیشە لایەنە سیاسیەکانی کوردستان لێك دوور بن، ڕێی تێناچێ کەسانێك هانی توندوتیژی بدەن و بە تەقاندنەوە دژی جیاوازییەکان بوەستن و بێن ئامۆژگاری ئێمە بکەن. لە سۆنگەی ئەمەشەوە، دەبێ ئەو راستییەمان لەبەرچاوبێ، کە یەکماڵی مانای کوشتنی جیاوازییەکان ناگەیەنێ، وەك هەندێ کەس وای بۆ دەچن، مێژوو گرنگیی یەکماڵیی کورد دەزانێ، دەی کەواتە با جیاوازی بۆچوونەکانمان بپارێزین و لە ماڵێکدا کۆببینەوە.

٢٠١٠-٨-٢٩

# ئێراق ... خاکێکی ڕەقەڵان بۆ دیموکراسی

دوای ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٣ وە بە زەبری هێز کۆتایی بە دکتاتۆرییەت هێندرا، زەمینەیەك بۆ قسەکردن دەربارەی دیموکراسی پەیدابوو، هەندێ بۆچوونیش زۆر بە پەلە ڕووداوەکانی ئێراقیان دەخوێندەوە، بەوەی زۆر نابات دیموکراسی بەرقەرار دەبێت و چیدی لە ئێراقدا جیاوازی لە نێوان پێکهاتەکاندا ناکرێت، لە بنیاتنانی ئەو بۆچوونە خێرایەدا، ئەوە لەبیرکرا کە وڵاتێك پڕکرابێت لە گۆڕی بەکۆمەڵ و ناوە ناوە جاڕی دۆزینەوەی کەللەسەر و ئێسك و پروسکی مرۆڤ بدرێ، چۆن چۆنی بەو خێراییە، ئەو خاکە تۆوی دیموکراسی وەخۆ هەڵدەگرێ؟ بەداخەوە هێشتا کەندو کۆسپی زۆر لە ڕێگادا ماون، سەیرکەن لە بەغدا ململانێ لەسەر ئەوە نییە کامە هێزولایەنی سیاسی لەویدی دیموکراسیترە، بەڵکو ململانێ لەسەر وەرگرتنی دەسەڵاتە، ئەمەش لەوەوە هاتووە کە ئەو هێزو لایەنانە متمانەیان بە یەکتری نییە، هەر لایەك لە دەسەڵات نەبێ بە مەترسیی دەزانێ و خۆ بە پەراوێزکراو دەبینێ، بە درێژایی ماوەی دوای ڕووخاندنی رژێمی بەعس، هێشتا گرووپ و دەستەو تاقمی زۆر هەن ژەهر دەرێژن، هێشتا ناسیونالیزمی عەرەبی لە ئێراقدا جورئەتی ئەوەی نییە بڕیاری بەخۆداچوونەوەیەکی جدی بدات و واقیعی تازەی قبووڵ بێت، نەك ئەو بڕیارە نادرێت، بەڵکو ڕەواج بۆ ئەوە پەیدا دەکرێت کە لە کاری ئێستادا پشت لە دەستوورو واقیعی نوێ بکرێت، لە دۆخێکی وەهاشدا زەمینە بۆ ئەو گرووپانە خۆش دەبێت کە تەنیا خۆیان دەبینن و تەواوی پێکهاتەکانی دی پشت گوێ دەخەن، تەنانەت هەندێکیان بێ هیچ دوو دڵی و شەرمکردنێك بە ئاشکرا دژایەتی کورد دەکەن و ئەو دژایەتی کردنەیان بۆ بانگەشەی هەڵبژاردنیش بەکارهێناوە، ئاخر دیموکراسی چۆن لە خاکێکدا چەکەرە بکات هێزە کاراکانی پشت لەدەستوور بکەن، لە ئێراقدا تەنیا کورد بڕوای بە دەستوورەو هەر ئەو هێزەش بە جدی پشتیوانی لەو دەستوورە دەکات، پشت کردنە دەستوورو پرەنسیپی کاری پێکەوەیی و تەوافوق لە کاری سیاسیدا لەبەر ئەوەیە تەنیا کورد کە زۆرینە نیە لە ئێراقدا پشتیوانی دەستوورە، کاتێکیش کەمینە خۆی بەپارێزەری دەستوور بزانێ لەبەرامبەر زۆرینەیەك کە خۆی لە هەنگاوەکانی

بەرقەراركردنی دیموكراسیدا دەدزێتەوە، ئـەوا هێنـدەی دی بێمتمانـەیی و تـرس لەیـەكتری و هەوڵدان بۆ پەراوێزخستنی بەرامبەر جێگەی كاری پێكـەوەیی دەگرێتـەوە. بەوپێیـەی هێـزو گرووپ و لایەنە سیاسییەكان هەڵقووڵاوی كۆمەڵگای ئێراقن، نـابێ خۆمـان هەڵخەڵـەتێنین و پێمانوابێ ئەو هێزو گرووپانە نامۆن بە خەڵكی ئێراق و مەترسی نین لەسـەر دیموكراسـی، لـە راستیدا ئەو تروسكە دیموكراسیەی لەڕێی ملدان بـۆ هەڵبـژاردن دەبینـدرێ زادەی زاڵبـوونی هێزی دەرەكی و لاوازی بەغدایە وەك ناوەندێكی بەهێز كە ناسیونالیزمی عەرەبی هـەوڵی بـۆ دەدات، نەك لە ناخەوە بڕوابوون بە دیموكراسـی، ئـەوەتا ناسیونالیسـتانی عـەرەب نایانـەوێ هەڵبژاردن بكرێ، بۆئەوەی نەتەوەی كورد لە پەنای ساختەكاریی سـەرژمێردا بـە قەبارەیـەكی بچووك پیشان بدرێت، دەیانەوێ لە دژایەتی كردنی کورددا پەنا بۆ میكانیزمێكی دیكە ببـەن كە بەهیچ جۆرێك لەگەڵ ئێراقێكی نوێدا تێكناكاتەوە، ئەو میكانیزمەش سەپاندنی ئـیرادەی ناسیونالیزمی عەرەبییە كە بریتییە لە هەنجن هەنجن كردنی كورد لەڕێی دابڕ دابڕكردنی بەسەر چەند پێكهاتەیەك و ناوهێنانی ئێزدی و شەبەك و فـەیلی لـە ئیسـتیمارەی سـەرژمێری وەك نەتەوەی جیا لە نەتـەوەی كـورد، ئەمـەش سیاسـەتێكی لەمێـژی ناسـیونالیزمی عەرەبییـە بەرامبەر بە كورد، ئەم ئاراستەیەی ناسیونالیزمی عەرەبی مایەی گومان و ترسـە لەئاینـدەی ئێراق كە وڵاتێكی فرە نەتەوەو ئاین و مەزهەب و كولتوورە، ناسیونالیزمی عەرەبی قـەبارەی بە مەترسی دەزانێ بۆیە هەوڵ لە بەرامبەر عەرەبـدا هـەموو نەتـەوەو پێكهاتەیـەكی دی بـە بچووك پیشان بدات، بۆیە كە ناسیۆنالیستە شۆڤێنییەكانی عـەرەب خۆیـان بـە بـەرگریكاری نەتەوەكانی دیكەی غەیرە كورد پیشان دەدەن، جۆریكە لـە تاكتیـك و شـتێكی كاتییـەو لـە قۆناغی بەهێزبوونەوە لە ڕێی كۆنترۆڵكردنی دامودەزگا گرنگەكانی دەوڵەت بەچاوی سەردەمی پێش ٢٠٠٣ سەیری هەموو پێكهاتەیەكی غەیرە عەرەب دەكرێت. خاكی ئێراق وێڕای ئـەوەی پڕكراوە لە دڕكوداڵ، بۆ دیموكراسی هەر ڕەقەڵانەو ناكێڵدرێ چونكە هێشـتا نەخوسـاوە، بـۆ ئەوەی بۆ كێڵان ئامادەبێ و تۆوی دیموكراسیی پێوەربكرێ، پێویستە بـاش روسـە بكرێـت تـا بەچاكی دەخوسێ.

٢٠١٠-١٠-١٧

# راگەیاندن و پرسە ستراتیژییەکان

### هۆکارە مێژووییەکانی دابڕاندنی ناوچەکانی کوردستان لە لایەن حکوومەتی بەغدا

جاریٚ لەپێشەوە، لە وەڵامی ئەم پرسیارەدا پێویستە ئاوڕێك لە مێـژووی دروسـت بـوونی عێراقی نویٚ بدەینەوە، چونکە بەر لە پەیدابوونی دەوڵەتی عێراق کـە زادەی شـەڕی یەکـەمی جیهانە، عێراق بریتی بوو لە ٣ ویلایەتی دەوڵەتی عوسمانی، کە ساڵی ١٩٢١ دەوڵەتی عێراق دامەزرا هێشتا کوردستان نەخرابۆوە سەر دەوڵەتی تازە دامەزراوی عێراق، دوای ٥ ساڵ بڕیار درا بەو دەوڵەتە تازەیەوە بلکێندریٚ، کەواتە لە سەرەتادا بەغدا ئیرادەیـەکی وای نـەبووە ئـەو کارە بکات، بـە مانایـەکی دی، ئیرادەیـەکی نێودەوڵـەتی لەپشـت لکانـدنی کوردسـتان بـە عێراقەوە بووە، بەرژەوەندی نێودەوڵەتی لەوەدا بووە عێراقێکی مەرکەزیی توونـد بـە درێـژایی زیاتر لە ٨٠ ساڵ هەبێت، ئەمە لەڕووی فاکتەری دەرەکی، هەرچی فاکتـەری ناوخۆشـە ئـەوا لەسـایەی دەوڵـەتێکی مەرکـەزی دا ناسـیونالیزمی عـەرەبی هەمیشـە کـاری بـۆ تێـژە تەسکبینەکانی کردووەو دۆخی نێودەوڵەتی و پرەنسیپی "دەستێوەرنەدان لەکاروباری نـاوخۆ" ی لە خزمەت تێزە ناسیونالیستیە تەسکبینەکانیدا خستەگەڕ، بۆیە بەغدا کـە هەمیشـە لـە لایەن ناسیونالیستانی عەرەبەوە، وەك پایتەختێکی ناسیونالیزمی عـەرەبی خراوەتـەڕوو، بـەم پێیەش بڕیارەکانی ئەوپایتەختە زیاتر برەویان بەتێزی ناسیونالیزمی عەرەبی داوە. کوردستان کە جوگرافیاو مێژوو لە عێراقـی عـەرەبیی جیادەکاتـەوە، بۆتـە جێـی چـاوتێبڕینی بەغـدا، کاتێکیش بۆ یەکەم جار نەوت لە کوردستان دەرهێندرا ئەوەندەی تـر عـەرەب خـۆی لێخـۆش کرد. لە لایەکی دیکەشەوە ئاووهەوا جۆرە تایبەتمەندییەکی دیکەی بە کوردسـتان بەخشـیوە، کە بە عێراقی عەرەبی نەبەخشیوە، کوردستان لەسایەی ئەو دۆخەی ئاووهـەوا، عـەمبارێکی گەورەی گەنمە ئەگەر پلانی تۆکمەو جدی لە بواری کشتوکاڵ هەبیٚ ئـەوا چـاوگی دابینکردنـی خۆراکە لە عێراق، لەولاشەوە باشترین لەوەڕگای هەیە و توانای بەخێوکردنی ژمارەیەکی زۆری

مەڕو ماڵاتی هەیە، بۆیە بە درێژایی مێژوو خێڵە عەرەبیەکان چاویان تێبڕیوەو باڵادەستیی ناسیونالیزمی عەرەبی لە عێراقدا زەمینەی بۆ شاڵاوی خێڵە عەرەبیەکان خۆش کردووە کە بێمنەت روو لە کوردستان بکەن، خێڵی عەرەب لەگەڵ باراندا دەجولێ، بەو پێیەی ڕادەی بارانی ناوچەی عەرەبی کەمەو یارمەتیدەر نییە بۆ لەوەڕگا، بۆیە لەگەڵ تێپەڕبوونی کات و کورت بوونەوەی وەرزی باران لە ناوچەکەیاندا خێڵی عەرەب بەرەو کوردستان هەڵدەکشێن، کەواتە بەغدای ناسیونالیزمی عەرەبی، کوردستانی بە سەرچاوەیەکی گرنگ و بەردەوامی ژیان لە عێراقدا داناوە ( کە هەر وایشە) بۆیە ئەو سەچاوەیەی لەڕووی دەرامەتی سروشتییەوە بە هەموو سامانەوە ( ئاو و نەوت و کانزاکانی دیکە و زەویی بەپیت و بەرەکەت و لەوەڕگای دەولەمەند...تد) بە حەڵاڵ بۆ عەرەب زانیوە، ئەو بەمولکی خۆزانینەی کوردستان لە لایەن عەرەبەوە، چۆتە بەرنامەی حکوومەتە یەك لەدوای یەکەکانی عێراق، بۆیە هەر لە دامەزراندنی دەولەتی عێراقەوە، ساڵ لەدوای ساڵ و حکوومەت لەدوای حکوومەت، بەرنامەی داگیرکردنی کوردستان و شێواندنی سیمای نەتەوەیی خێراتر بووە، لەمەوە پرۆسەی بەعەرەب کردنی کوردستان ئەولەویەتی کاری حکوومەتەکانی بەغدا بووە، کە ئامانج لێی داگیرکردنی خاکی کوردستان و لەناوبردنی خەڵکەکەی بووە، ئەم شێوە کاکردنەی بەغدا لە خزمەت تێزی ناسیونالیزمی عەرەبیدا، چەندین نەوەی عەرەبی بە جۆرێك پێگەیاند کە هەمیشە بە چاوێکی کەم و پلەیەکی نزم سەیری کورد بکەن، ئەوەتا ئەمڕۆ ئەو نەوەیە، کوردی ئاوارەو دەربەدەر کە دوای رووخاندنی رژێمی بەعس گەڕاونەتەوە سەر زێدی باووباپیرانیان لە کەرکوك بە داگیرکەری خاك لەقەڵەم دەدات و ماڵ لە ماخۆ حەرام دەکات.

**بەرنامەی سەرکردایەتی سیاسی کورد بۆ گەڕانەوەی ناوچە دابڕێندراوەکان چەندە قابیلی جێبەجێکردنە؟**

بەرنامەی سەرکردایەتی سیاسی کورد تا ئێستا ئەوەیە کە لە چوارچێوەی دەستووری عێراقدا هاتووە، ئەوەی لە دەستوورو رێکەوتنەکاندا هاتووە، مەسەلەیەکی وایە کە لە چوارچێوەی دەستوورێکدایە کە ئێستا زۆربەی عەرەب بەتایبەتیش سوننە لێی پەشیمانن، لە لایەکی دیکە بەغدای حکوومەتەکانی رابردوو و بەغدای ئێستاش کەکورد شەریکی حکوومەتە، هەمیشە قسەو کرداری وەکو یەك نەبووە، قسە و بەڵێن هەمیشە لەنێو فایل و لەسەر رەفەدا داندراون، بەغدا لەوادەی جێبەجێکردن لەسەر زەویدا خۆی دەدزێتەوە، بۆیە بەرنامەی کورد کۆسپی گەورەی دێتە ڕێ، کەواتە بەغدا بە درێژایی مێژووی گفتوگۆ لەگەڵ

کورد، فاکتەری کاتی بە گرنگ زانیوە لە چاوەڕوانی رووداوی نوێ کە بەخێر بۆکورد نەگەڕێتەوە، هەر بۆیە قۆناغەکانی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ ی لەوادەی دیاریکراوی خۆی جێبەجێ نەکرد، بەمەش سەرکردایەتی سیاسیی خستە بەردەم تەنگژەیەکەوە، کەواتە ئەگەر بەرنامەی سەرکردایەتی کورد قابیلی جێبەجێکردنیش بێت، بەغدا رێگەی لێگرتووە.

## میکانیزمەکانی گەڕاندنەوەی ناوچە دابڕێندراوەکان

پێویستە بەخۆماندا بچینەوە، بۆ ئەوەی چیدی گیرۆدەی ( بریاو خۆزگەو دەبوو وامان کردبایە) نەبین، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە تا نەقەومێ قسەی لێ ناکەین، بۆ نموونە ئێستا لە کێ بپرسی دەڵێ نەدەبوو کورد دوای رووخاندنی بەعس بێ گەڕاندنەوەی ناوچە داگیرکراوەکان، بەو خێراییە چووبا بەغدا بۆ دامەزراندنەوەی دەوڵەتی عێراق، بۆیە ئەو میکانیزمەی بە گونجاوی دەزانم ئەوەیە کە کورد دەربارەی ئەو ناوچانە حەقێکی دەستووریی بەدەستەوەیە، ئەگەرچی بە پێی دەستووری عێراق ئەو ناوچە بەعەرەب کراوانە بە ناوچەی ناکۆکی لەسەر ناو دەبرێت، کەئەمەش غەدرێکی دیکەیەو بە پێی دەستوور حەق بە عەرەب دراوە لەسەر ئەو ناوچانە ببێتە لایەنێکی ناکۆکی، ئێستا ئەوە چوو، بەلاّم بە پێی دەستوور ئەو ناوچانە کە جێی ناکۆکی دوو لایەنن، دەبێ لە پەنای بەغدا کە لایەنێکی ناکۆکییەکەیە بەتەنیا لەو ناوچانەیەو سوپای عێراق ئامرازێکە بە دەست شۆفێنییەکانەوە، پێویستە هێزەکانی هەرێمی کوردستانیش وەك لایەنێکی ناکۆکی لەو ناوچانە بێت، بە داخەوە یەك دوو ساڵ لەمەوبەر پێشمەرگە لەو ناوچانە پاشەکشەی کرد و سوپای عێراق بەتەنیا مایەوەو کەوتەوە خزمەت عروبە، کورد وتەنی ( بەز- مان بە پشیلە سپارد) ، ئێستا دەرفەتێکی دیکەی لەبار هاتۆتە پێش، پێویستە ئەمجارە هێزی کورد بچێتەوە ئەو شوێنانەو ئەمجارە چۆڵی نەکات، لەو لاشەوە هەوڵی دیپلۆماسی لە ئاستی عێراق و ئیقلیم و جیهاندا لەوبارەیەوە چڕتر بکات، لە لایەکی دیکەشەوە، بە چاوخشاندنەوە بە ئەدای حکوومەت و دانانی بەرنامەیەکی تۆکمە بۆ نەهێشتنی گەندەڵی و، پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری زیاترو گوێگرتن لە یەکتری و گرتنەبەر زمانی دیالۆگ، باری ناوخۆی وڵات بە ئاقاری خۆشکردنی زەمینەی تێهەڵچوونەوە رێکبخرێتەوە.

## ڕۆڵ و ئەرکی راگەیاندنی کوردی لەهەمبەر کێشە ستراتیژییەکان

ڕاگەیاندنی کوردی سەرەتا بە گەرمی لەو مەسەلەیە چووەپێش، بەلاّم کە قۆناغەکانی ماددەی ١٤٠ لە وادەی دیاریکراوی خۆی جێبەجێ نەکران، راگەیاندنی کوردیش وردە وردە

خۆی لێ دزیەوە، لە لایەکی دیکەشەوە، بەهۆی دابەشبوونی راگەیاندنی کوردی بەسەر دوو بەرەدا، ئاراستەی جیاجیا لە نێو راگەیاندندا لە هەمبەر پرسە ستراتیژییەکاندا و بەتایبەت مەسەلەی گەڕاندنەوەی ناوچە دابڕێندراوەکان سەریان هەڵدا، ئەمەش بۆ کەشی ناوخۆی کوردستان دەگەڕێتەوە، بەتایبەتیش دوای گەرمبوونی کێبەرکێی وەرگرتنی دەسەڵات لەرێی هەڵبژاردنەوە، ئیدی خەمی پەیداکردنی دەنگ تەنگی بە پرسە ستراتیژییەکان لە راگەیاندن هەڵچنی، تا وای لێهات ماوەیەکی زۆر بەلای راگەیاندنەوە گرنگ نەبن و نەبوون بە شایان بۆ قسە لەسەرکردن، ئەمە سەری کێشا بۆ ئەوەی کە هەندێجار راگەیاندن بۆتە سەبەبکاری ساردبوونەوە لەهەمبەر پرسە ستراتیژییەکاندا، لەو سۆنگەیەوە، زۆرجار ئەو راگەیاندنەی زۆر بەلای پرسە ستراتیژییەکاندا دەچێت سەرزەنشت دەکرێت و بە خۆدزینەوە لە ویستی ئەم سەردەمە لەقەڵەم دەدرێت، بەتایبەتیش راگەیاندنی حزبەکان، لە راستیشدا، گەندەڵی و رۆتینی زۆری دامودەزگاو لێنەپرسینەوە لەوانەی کەمتەرخەم وبێ باکن، زۆرترین رووبەری راگەیاندنی داگیرکردووە، بەو پێیەی دانیشتوانی ناوچە دابڕێندراوەکان بەشداری لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی هەرێمی کوردستاندا ناکەن، راگەیاندنی کوردی پشتی تێکردوون، ئەگەر بەرەیەکی راگەیاندن بەگرنگی بزانێ، ئەوا بەرەی دیکە بە پێچەوانەوە کاری کردووە، تەنانەت هەندێ جار راگەیاندن ئەو پرسە گرنگانە لەبیر خەڵك دەباتەوە، سەیر لەوەدایە ئەو بێنرخ کردنەی پرسە ستراتیژییەکان لە پەنای پرۆفیشناڵیی راگەیاندنەوە دەکرێ، بۆیە هەقە راگەیاندنی کوردی لەوە ئاگاداربێ کە مەسەلە ستراتیژییەکان هێشتا ستراتیژن و پەراوێز نەخراوون، جێی خۆیەتی بەرگری لە مافی خەڵك بکات و دیاردەی دزێوی گەندەڵی ریسوا بکات، بەڵام دەبێ ئاگایەکیشی لە مەسەلە ستراتیژییەکان بێت و هێشتا پرسی نەتەوەیی دەهێنێ کاری بۆ بکرێ، ئەگەر ئەگەر گەندەڵی و گرفتی کەڵەکەبووی ئەم وڵاتە بە هۆکاری کاڵبوونەوەی هەستی نەتەوایەتی لە قەڵەم بدرێ، ئەوا راگەیاندنی کوردی پشکی شێری لە پرۆسەی کاڵبوونەوەکەدا پێ دەبڕێ.

* ئەم بابەتە وەڵامی پرسیارەکانی ئەو دیدارەیە کە رۆژنامەی بارزان نیوز لەگەڵ نووسەری ئەم کتێبەی کردبوو و کە لە لایەن رۆژنامەنووس جەمال ئیسماعیلەوە ئامادەکرابوو و لە ژمارە (٢٠٣) ی رۆژنامەی بارزان نیوز ، رۆژی ٦-٣-٢٠١١ بڵاوبۆتەوە.

# هەمیشە پێویستیمان
# بەڕێنمایی سەرۆك بارزانی هەیە

ئـەم ناونیشـانە قسـەی مـن نییـە، بـەڵکو قسـەی جـیمس جێفـری بـاڵیۆزی ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمەریکایـە لـە ئێـراق، کـە ڕۆژی ٣-٥-٢٠١١ لەگـەڵ ژەنـەڕاڵ ئۆسـتن فەرماندەی هێزەکانی ئەمەریکا لە ئێراق و شاندێکی یاوەریان سەردانی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیان لە سەلاحەددین کرد، لە دیدارەکەدا گفتوگۆ لـەبارەی چـەندین مەسەلە کرا، باڵیۆزی ئەمەریکا ستایشی ڕۆڵی سەرۆك بارزانی کرد لە ڕەخساندنی زەمینـەی دیموکراسی و ئازادی بـیروڕاو هـەروەها لـە بەرەوپێشـبردنی هـەرێمی کوردسـتان لـە هـەموو بوارەکانداو ڕایگەیاند: ئێمـە هەمیشـە پێویسـتیمان بـەڕێنمایی سـەرۆك بـارزانی هەیـە لـە چارەسەرکردنی ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی پرۆسەی سیاسی ئێراق دەبنەوە.

ئەم دیدارەو چەندین دیدارو چاوپێکەوتنی دیکە، بەتایبـەتیش لـە دوای ٢/١٧ ، کـە لـە ئاستی جیاجیای وڵاتان و بە سەردانی رەجەب تەیب ئەردۆگانی سـەرۆك وەزیرانـی تورکیـاوە، ئاماژەیەکن بۆ پایەی هەرێمی کوردستان لە ناوچەکەو جیهاندا. لەولاشەوە میدیای ئۆپۆزسیۆن هەمیشە هەرێمی کوردستان وەك هـەرێمێکی دوورەپـەرێزو دابـڕاو لـەجیهان پیشـان دەدات، بەوەش ڕاناوەستن زۆرجار بەجۆرێك مامەڵە لەگەڵ هەواڵ و ڕاپۆرت دەکەن، کە وا مانـا بـدات ئەوە ئەمەریکا هێندە لە دامەزراوە شەرعییەکانی هەرێمی کوردستان توڕەیـە وێنـەی نییـە، هەواڵی ترشوخوێکراوی لەوجۆرە لە هەڵخەڵەتاندن بەولاوە هیچی دیکە نییە، لـە مانشـێت و ژێرنووسی تەلەفزیۆنی ئۆپۆزسیۆن هاتووە کە ئەمەریکا لە بەکارهێنانی توندوتیژی بەرامبـەر خۆپیشاندەرانی ئێراق و کوردستان ناڕازییە، ئـەی باشـە چـی بڵـێ خـۆ نـاڵێ ڕازیـم، پاشـان دەسەڵاتیش لەگەڵ ئەوە نییە توندوتیژی بەرامبەر خۆپیشاندەران بەکاربێت، ئەم جۆرە هەواڵـە زیاتر لە هەواڵی سەردەمی بەسەرچوو دەچن، کە بـۆ بەرزکردنـەوەی مەعنـەویاتی سـەربازان

بەکاردەهات و لە پەنای شاردنەوەی راستیدا، بە هەزاران کەس ڕەوانەی بەرەکانی شەڕ دەکران، ئەمەش بۆ خزمەتکردنی ئامانجی سیاسی خۆیانە، دەنا کە ئەو ڕستە مەتاتیییە دەرخواردی خەڵك دەدرێت، هەقە دیوەکەی تریش نەشاردرێتەوە، کە بریتییە لەوەی ئەمەریکا دامەزراوەکانی هەرێمی کوردستانی بە ناشەرعی نەزانیوە، ئۆپۆزسۆن کە بۆ بەرژەوەندی خۆی ناشەرعیبوون دەداتە پاڵ دامەزراوەکانی کوردستان، بۆ ئەوەیە تا شەرعییەت بداتە داوای خۆی کە ڕووخاندنی حکوومەتە، پێی وایە دەبێ خەڵك وەها تێبگەن ئەوە ئەمەریکاش بەقسەی ئەوان دەکات. هیچ ڕۆژنامەو گۆڤارێك هێندەی ئەو ڕۆژنامەو گۆڤارانەی سێبەرو هاوپشتی ئۆپۆزسیۆنن بەر لە ٢/١٧ جەختییان لە مەسەلەی شەفافییەتی ڕۆژئاواییەکان نەکردۆتەوە، هەمیشە ئەوەیان پێڕاگەیاندووین کە ڕۆژئاواییەکان موجامەلەی کەس ناکەن، ئەی باشە کە باڵیۆزی ئەمەریکا ستایشی ڕۆڵی سەرۆك بارزانی دەکات لە ڕەخساندنی زەمینەی دیموکراسی و ئازادی بیروڕاو بەرەو پێشەوەبردنی هەرێمی کوردستان لە هەموو بوارەکاندا، یان کە دەڵێ لە چارەسەرکردنی ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی پرۆسەی سیاسی ئێراق دەبنەوە ئێمە هەمیشە پێویستیمان بەڕێنمایی سەرۆك بارزانی هەیە چی دەگەیەنێ؟ ئەگەر ڕۆڵ و پێگەی هەرێمی کوردستان و قورسایی سەرۆك بارزانی لە ناوچەکەدا لەبەرچاو نەگیرێ، ئەو ڕێنماییانەییان بۆچییە. ئاشکرایە زۆرجار میدیای بەرەی ئۆپۆزسیۆن و هاوپشتەکانیان، ئەو جۆرە هەواڵانە بەشێوەیەکی دیکە هەڵدەگێڕنەوەو بەپێچەوانەوە بەناوی سەرچاوەیەکی نزیك لە کۆبوونەوەکە کە نەیویست ناوی ئاشکرا بکرێت بڵاودەکەنەوە، مەبەست لێرەدا ئەوە نییە وەك میدیای ئۆپۆزسیۆن ڕاییگەیەنین و بڵێین ئەمەریکا دژی ئۆپۆزسیۆنە، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە هەقە ڕووداوەکان وەك خۆیان بگەن، بۆ ئەوەی دەرفەت بدرێتە هاوڵاتی لە ڕێی زانیاریی دروستەوە ڕاوبۆچوونی خۆی بنیات بنێ. لایەنەکانی ئۆپۆزسۆن بۆ ختوکەدانی سۆزی هەوادارانیان، ناوە ناوە بەڵێنیان پێ دەدان ئەم هەفتەیە حکوومەت و هەمووشتێ دەڕوخێت، کوردستانیان بەرەو دۆخێك دەبرد کە بە ئارەزووی خۆیان لە جیهانی دابڕن، بەڵام لە ماوەی دوو مانگی خۆپیشاندانەکاندا کەناڵی دیپلۆماسی زۆر گەرموگوڕ بوو، کە گرنگترینیان هاتنی سەرۆك وەزیرانی تورکیا بوو کە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی هەولێری کردەوە، واتە ئەو سەردانە ڕووداوێکی سیاسی و ئابووریی گرنگ بوو لە ناوچەکەدا. هەرێمێك هێشتا ماوەی دیاریکراوی هەرسێ سەرۆکایەتییەکەی تەواو نەبووبێت و ئەمەریکییەکان پێویستییان بە ڕێنمایی سەرۆکەکەی بێت بۆ لابردنی ئاستەنگەکانی پرۆسەی سیاسی ئێراق، ئۆپۆزسیۆن لە

پای چی بیانوو بە پێشنیارە گونجاوەکانی ئەو سەرۆکە دەگرێت و یەك هەنگاو لێی نایەتە پێشەوە، باشە بەشداری کردن لە چاکسازی و پێکهێنانی حکوومەتی بنکە فراوان و هەڵبژاردنی پێشوەختە، وەك سێ پێشنیار بۆ ئۆپۆزسیۆن، بۆچی بیانوویان پێ بگیرێ و بە داخستنی دەرگای دیالۆگ تەماشا بکرێت، ئایا ئەمە داخستنی دەرگای دیالۆگە یان ئەو هەموو ڕەتکردنەوەو پێداگرتنە لەسەر هەڵوەشاندنەوەی حکوومەت؟ هەق نییە ئۆپۆزسیۆن دانیشتن بە عەیبەو ملکەچ بوون دابنێ، ئێمە لە کوردستاندا خاوەنی سەرۆکێکی هەڵبژێردراوین و ٧٠٪ ی خەڵکی کوردستان متمانەیان پێ بەخشیوە، ئەمە دەسکەوتێکی گرنگە لە پەنای دامەزراوە شەرعییەکانی دیکەی وڵات، سەرۆك بارزانی چەترێکە بۆ هەموو پێکهاتەکانی کوردستان و بیروبۆچوونی سیاسیی جیاواز، هەقە لەژێر ئەو چەترەدا بڕیاری دانیشتن و گفتوگۆی جدی بدەین و وەك ئەمەریکییەکان سوود لە ڕێنماییەکانی سەرۆك بارزانی وەربگرین و هەمیشە بە پێویستیان بزانین.

٢٠١١-٥-٨

# ڕۆحیەتێکی بەرەیی "بەرەی کوردستانی" بۆ ئەمڕۆ

پێویست ناکات هێندە ڕۆبچینە قووڵایی مێژوو، هەر چەند ساڵی ڕابردووو قۆناغی دوای ڕاپەڕین بەسە بۆ ئەوەی لەوە حاڵی بین، کە یەکدەنگی بۆ کورد چەند گرنگە، با لە سەرەتای ڕاپەڕینەوە دەست پێبکەین و بزانین ئەگەر کورد یەکڕیزو تەبا نەبوایە ڕاپەڕین بەو خێراییە دەبوو؟ ئایا لەتەك هاتنەپێشەوەی بارودۆخێکی نوێی نێودەوڵەتی و ناوچەکە، کورد بە ناتەبایی و پارچەپارچەیی ریزی هێزە سیاسییەکانی چی دەکرد؟ ئەمەو زۆری دیکەش ئەو پرسیارە جدیانەن، کە ئەمڕۆ لە شەقامی کوردیدا سەرهەڵدەدەنەوە.

کە یادی ڕاگەیاندنی بەرەی کوردستانی دەکەینەوە، هەرێمی کوردستان بە دۆخێکدا تێدەپەڕێت، جارێکی دی هێزو لایەنە سیاسییەکان دابەش بوون و خەڵکی کوردستانیش بەو دۆخە تازەیە نیگەرانن. بەرەی کوردستانی کە لە ١٢-٥-١٩٨٨ لە دۆخێکدا ڕاگەیەندرا، شالاوی جینۆسایدکردنی کورد گەیشتبووە ئەوپەڕی، بەرەیەك بوو هێزو لایەنە سیاسییەکانی پێکەوە کۆکردبۆوە، ڕاستە نەوەی دوای ڕاپەڕین ئاگاداری زەرورەتی پێکهێنانی ئەو بەرەیە نین، بەڵام بەشێکی زۆری تێکۆشەرو سەرکردەکانی ئەمڕۆ ئاگاداری سەرەتاکانی کارکردن و ڕاگەیاندنی بەرەی کوردستانین، هەشیانە بۆ بەرژەوەندی حزبایەتی باسکردنی بابەتی بەرەی کوردستانی بە پێویست نازانن، ئەگەرچی ئەوانەی لە واقیعی ڕۆژانی بەرەی کوردستانیدا ژیاون، دەسکەوتی یەکڕیزی کوردیان بەهۆی ئەو بەرەیەوە بینی و لە سێبەریدا حەسانەوە، لێ سەرکردەی لێهاتوو ئیدریس بارزانی، کە جێپەنجەی بەسەر کارەکانی بەرەی کوردستانییەوە دیارەو بەو هۆیەشەوە بە ئەندازیاری ئاشتی ناسرا، بەرهەمی خۆسازدانی بەرەی کوردستانیی لە ڕاپەڕین و دامەزراندنی دامەزراوە شەرعییەکاندا نەبینی.

بەختی خەڵکی کوردستان بوو کە بەر لە ڕاپەڕین لایەنە سیاسییەکان لە بەرەیەکدا کۆببوونەوە، چونکە ڕاپەڕین وەك ڕووداوێك وەرچەرخانێکی گەورەبوو، گەورەیی ئەو ڕووداوە

لەوەدا بوو بەهۆی یەکڕیزی هێزو لایەنەسیاسییەکان، ماڵی کورد یەکخراو بە یەکدەنگ و یەك پارچە خەڵکی کوردستان ڕاپەڕی، بەرەی کوردستانی داینەمۆی هەستانەوەی کورد بوو هەستانەوەیەك کە بناغەی بۆ ئەمڕۆو سبەی دانا، هەر لەوان ڕۆژاندا کە هێشتا ڕاپەڕین لە گەرمەیدا بوو، سەرۆك بارزانی لە ٢٠-٣-١٩٩١دا لەبەردەم جەماوەری ڕاپەڕیوی شاری کۆیە باسی دامەزراندنی دەوڵەتی قانونی کردو ڕایگەیاند کە پێویستە هەڵبژاردن بکرێت بۆ ئەوەی دەسەڵات لە لایەن خەڵکەوە هەڵبژێردرێت، دواتر ئەو پێشنیارە بەجێیەی سەرۆك بارزانی کەوتە واری جێبەجێکردنەوەو بەرەی کوردستانی بڕیاری خۆی داو لە ڕۆژی ١٩-٥-١٩٩٢ یەکەم هەڵبژاردنی گشتی کراو سەردەمی بەرەی کوردستانی کۆتایی هات. بەداخەوە هەندێ جار بۆ مەرامی سیاسی لە گرنگی و بەهای یەکڕیزی کەم دەکرێتەوە، بەو بیانووەی سوودی بۆ پارتی و یەکێتی هەیە،هەر بۆیە بەهۆی ملنەدان بۆ ویستی ئەو خەڵکەی خوازیاری ئەوەبوون کە هەر نەبێ لە ناوچە دابڕێندراوەکاندا بە یەکلیست لە هەڵبژاردنی پەرلەمانی ئێراق لە ٧-٣-٢٠١٠ دابەزن، کورد ژمارەیەك کورسیی لەدەست دا، ئەمە لە کاتێکدا بوو شۆفێنییەکان بەردەوام بەدوای دەرفەتدا گەڕاون بۆ گورز وەشاندن لە کورد، نموونەی گرووپی ٢٢ی تەمموزی ٢٠٠٨ هەیە لە پەرلەمانی ئێراقدا کە هەمووی ساڵێك بوو بەر لە هەڵبژاردنی کوردستان ٢٥-٧-٢٠٠٩ ، کاتێ ویستیان لەڕێی گردبوونەوەی شۆفێنییەکانەوە بەیاسا دژی کورد بووەستنەوە، بەڵام وەڵام دانەوەی بەپەلەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و رەتکردنەوەی لە لایەن سەرۆك کۆمارەوەو دەوری کوتلەی کورد لە بەغدا خۆپیشاندانی خەڵکی کەرکوك لە ٢٨-٧ و پشتیوانی خەڵکی هەولێرو سلێمانی و دهۆك پیلانەکە پووچەڵ کرایەوە، کەواتە ئەوە یەکدەنگی خەڵکی کوردستان و لایەنە سیاسییەکان بوو لێنەگەڕا پیلانی شۆفێنییەکان سەربگرێت. دیارە جەختکردنەوە لە میکانیزمێکی وەك بەرەی کوردستانی بۆ ئەوە نییە هیچ کەسێك گوزارشت لە بۆچوونی خۆی نەکات، وەك زۆرجار دەڵێن ئەو یەکدەنگییە بۆ کوشتنی جیاوازییەکانە، بەداخەوە بەر لە هەڵبژاردنی گشتیی ئێراق لە ٧-٣-٢٠١٠ بەردەوام جەخت لەوە دەکرایەوە کە گرنگە لە بەغدا یەکدەنگ و یەك هەڵوێست و لە کوردستانیش جیاواز بین و هەرکەس گوزارشت لە بیرو بۆچوونی خۆی بکات، لەبەرچاو نەگرتنی (یەکدەنگی و یەك هەڵوێستی لە بەغداو فرە ڕەنگی و پارێزگاریکردنی جیاوازییەکان لە کوردستان) سەری کێشا بۆ ئەوەی حزبەکانی ئۆپۆزسیۆن لە ماوەی دوو مانگی خۆپیشاندانی بەردەرکی سەرادا ویستی سیاسیی خۆیان بەسەر داوای خەڵکدا فەرز بکەن، ئیدی ئەو ویستەی هەرسێ لایەنی

ئۆپۆزسیۆن بەهیچ شێوەیەك بەرامبەری قبولّ نەبووو رەتی دەكردەوە، زۆر بە پەلە هەولّی كۆپی كردنی ڕووداوەكانی تونس و میسریان داو داوای ڕووخاندنیان كرد، لەو ماوەیەشدا دیسان شۆفێنییەكان ویستیان پەلاماری كەركووك بدەن و كورد دەربكەن، ئەگەر ئامادەباشیی پێشمەرگە نەبوایە شۆفێنییەكان دەستی خۆیان دەوەشاند، لێ ئەمەش لە لایەن ئۆپۆزسیۆنەوە بە سیناریۆ لێكدرایەوە.

ئەگەرچی دامەزراوەی شەرعیی وەك سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان و پەرلەمان و حكوومەتی هەرێمی كوردستانمان هەیە، بەلاّم بۆ كۆكردنەوەی هەموو هێزە سیاسییەكان بەتایبەتیش ئەوانەی كورسیی پەرلەمانیان نییە، لە ئەنجوومەنی بالاّی حزب و لایەنەسیاسییەكاندا بەسەرپەرشتیی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستاندا باس لە پرسە سیاسییەكان دەكرا، لێ پێداگرتن لەسەر هەندێ مەسەلەی حزبی و بەستنەوەی یەكدەنگی لە بەغدا بە دەسكەوت لەكوردستان، كاری ئەو ئەنجوومەنەشی ڕاگرت، بۆیە ئەمڕۆ لە بەرامبەر ئەو ڕووداوو گۆڕانكارییانەی بەرێوەن، بەتایبەتیش خۆ ئامادەكردن بۆ قۆناغی دوای كشانەوەی هێزەكانی ئەمەریكا لە ئێراق، زۆر پێویستیمان بە زیندووكرنەوەی ڕۆحی بەرەی كوردستانی هەیە، بۆ ئەوەی ببێتە پشتیوانێكی بەهێزی دامەزراوە شەرعییەكانی هەرێمی كوردستان، گرنگە گوتاری كورد لەبەرامبەر ئەو ڕووداوانەی بەڕێوەن ببێتەوە یەك گوتارو چیدی جیاوازییەكانی كوردستان و هەندێ ڕووداو كە دەكرێ بەسەریاندا زالّ بین نەكرێنە كراسی عوسمان و هەقە بۆ بەرژەوەندی تەسكی حزبایەتی پێش چاومان بۆ دیتنی سبەی لێلّ نەكەین.

٢٠١١-٥-١١

# له یادی ڕێککەوتنی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦دا

یەکێك لە خەسڵەت و سیماکانی جوڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان، گرتنەبەری رێگەچارەی ئاشتییانەیە، کە بەداخەوە لایەنی بەرامبەر هەمیشە بەجۆرێکی دیکە سەیری کردووە، شۆڕشی مەزنی ئەیلوول زادەی ئەو زوڵم و ستەمە نەتەوایەتییە بوو، کە دەرهەق بەکورد دەکرا، پارتی دیموکراتی کوردستان وەك حزبێکی سیاسی جەماوەری گوزارشتی لە ئیرادەی گەلەکەمان کردووە بەدرێژایی قۆناغەکانی مێژوو، خاوەنی تێزی تایبەت بەخۆی بووە دەربارەی چۆنیەتی کاری نیشتمانی لە ئێراقدا، کەچی بەغدا هەمیشە ناواقیعیانە لە کوردو جوڵانەوە سیاسییەکەی ڕووانیوە، بەڵام شۆڕشی مەزنی ئەیلوول بەرابەرایەتی بارزانیی نەمر، رێگای دیالۆگ و گفتوگۆی وەك ئەلتەرناتیڤێك زانیووە بۆ چارەسەری کێشەکان و دوانەدنی بەرامبەرو چەندین هەنگاوی لەو شێوەشی هاویشتووە، یەکێك لەو رێککەوتنانەی نێوان شۆڕش و حکوومەتی ناوەندی ڕێککەوتنی ٢٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٦٦ـە.

هەرچەندە چەند ساڵێك بەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشی مەزنی ئەیلوولدا تێپەڕی بوو، کەچی (عەبدولسەلام عارف)ی سەرۆکی ئەوسای ئێراق دەیوست پەردە بەسەر بارودۆخەکەدا بداو، ناواقیعیانە کێشەکەی دەخوێندەوە، لەجیاتی ئەوەی رێز لە ئیرادەی گەلێك بگرێ کە بەهەموو چین و توێژەکانیەوە لەدەوری شۆڕش و سەرکردایەتی بارزانیی نەمردا کۆببوونەوەو ئاشتیخوازانە داوای مافە ڕەواکانیان دەکردو هەمیشە بۆچوونی گونجاویان بۆ شێوەی پێکەوەژیان لە چوارچێوەی ئێراقدا هەبووە، کە ئەگەر لەلایەن دەسەڵاتی ناوەندی بەغداوە وەرگیراباو تەبەنی کرابا زۆر لەو ڕووداوانەی ساڵانی دوایی یەخەی ئێراقیان گرت و کارەساتیان لێکەوتەوە هەرگیز ڕوویان نەدەدا. ئەو تێڕوانینەی سەرکردایەتی ئێراق بۆ کوردو جوڵانەوە هەقخوازییەکەی، بارودۆخی بەرەو گرژی و توندوتیژی دەبرد، هەر ئەمەش بووە. هۆکاری پێکدادان و دووبارە هەڵگیرسانەوەی شەڕ لەنیسانی ١٩٦٥دا، لەگەرمەی نێوان

شـــۆڕش و ســـوپای ئێراقـــدا لەنیســـانی ١٩٦٦ عەبدولســـەلام عـــارف بـــەهۆی ڕووداوی کەوتنەخوارەوەی هەلیکۆپتەر گیانی لەدەستداو (عەبدولڕەحمان عارف)ی برای شوێنی گرتەوە.

مردنی عەبدولسەلام و هاتنی عەبدولڕەحمان بۆ سەر کورسی حوکمڕانی ئێراق، هیچیان لەو مەسەلەیە نەگۆڕی و نـەبووە هـۆی خاوبوونـەوەی لەسـەر هێـرش کردنـە سـەر کوردسـتان، بەتایبەتیش بۆناوچەی باڵەکایەتی کە ئەوسا بڕبڕەی پشت و سەنتەری جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان بوو بە ڕابەرایەتی بارزانیی نەمر، ئەوەبوو هێرشێکی (ئاسمانی و زەمـینی)یـان بـۆ ناوچەکە دەستپێکرد، لە حەوزی ڕوواندزەوە بەرەو چیای هەندرێن زۆزك و دواییش (بە قەولی خۆیان) حاجی ئۆمەران بگرن، هێرشەکە لەسەرەتای مانگی ئایاری ١٩٦٦ دەسـتی پێکـرد، بەڵام پێشمەرگە لەداستانی بەناوبانگی هەندرێن ١٢/٥/١٩٦٦ هێـزی حکوومـەتی ئێراقیـان تێکشکاند و زیـانێکی زۆریـان پێگەیانـدن و دەسـتکەوتێکی زۆری کەلوپـەلی سـەربازییان هەبوو، لەشکری پێشمەرگەی کوردستان لێنەگەڕا خەونی سەید حەمۆی فەرماندەی لیوای ٥ی سوپای ئێراق بێتەدی، کەبڕیاری دابوو تا گەڵاڵە نەگرێت ڕیشی نەتاشێ، دوژمـن تێگەیشـت گرتنی بنکەو بارەگاکانی سەرکردایەتی شۆڕشی مـەزنی ئـەیلوول هێنـدە ئاسـان نییـە، ئـەو نەبەردییەی پێشمەرگە هاوکێشەکانی پێچەوانە کردەوەو ئەو قەناعەتەی سەرکردایەتی ئێـراق پەیداکرد، کە مەحاڵە لەڕووی سەربازییەوە بەسەر جووڵانەوەی ڕزگاریخوازیدا زاڵ بێـت، بۆیـە دوای شەڕەکە هەڵوێستی ئێراق گۆڕاو کەوتنە ناردنی وەفـد بـۆ لای سـەرکردایەتی شـۆڕش و داوای گفتوگۆیان کرد، بەمەش ئەوە ئیسپات بوو کە توندوتیژی و توانای حکوومەتی ناوەندی بەغدا نەبووە هۆی ساردبوونەوە لەسەر داوا ڕەواکان، هەر بۆیە دوای شەڕ حکوومەتی ناوەندی وەفـدێکی ڕەوانـەی لای سـەرکردایەتی شۆڕشـی کوردسـتان کـردو داوای گفتوگـۆی کـرد، سەرکردایەتی شۆڕش وەك نیەت پاکی، وەڵامـی داخوازییەکـەی بەغـدای دایـەوەو دەسـەڵات شاندێکی لە بەغداوە نارد کە پێکهاتبوو لە: عەمیـدی خانەنشـین مەجیـد عـەلی و ئەحمـەد کەمال و ئەکرەم جاف و زەید ئەحمەد عوسمان لە ١٥/٦/١٩٦٦ گەیشتە گەڵاڵە ئەمە دەسپێك بوو ڕێی بۆ شاندێکی میللی خـۆش دەکـرد کـە لـە عـەرەب و کـوردو تورکمـان پێکهـاتبوو ئەوانیش: لیوای خانەنشین ئیبراهیم ڕاوی لەسەردەمی پاشایەتی و دکتۆر کازم شوبەر و باڵیۆز و وەزیری پێشوو عەلی حەیدەر سولەیمان و ئەندازیار و وەزیر. دواتر ـــ ئیحسـان شـێرزاد و ڕەئوف ئەحمەد و دکتۆر محەمەد ساڵح مەحموود وەزیر ـــ لەسـەردەمی عەبدولکـەریم قاسـم و نورەددین واعیزی زانای ئایینی و حەسەن عەبدولڕەحمانی وەزیری پێشوو بوون، سـەرکردایەتی

شۆڕش بە هاتنی ئەو شاندە قایل بوو و لە ١٨/٦/١٩٦٦ کەیشتە کەلالە، ئەو شاندە پێشنیازی ئەوەیانکرد کە شاندێکی کوردی بچێت بۆ بەغدا، سەرکردایەتی شۆڕش ڕەزامەندی پیشانداو لە ٢٢ی ئەو مانگە شاندەکە ڕووی کردە بەغداو سێ ڕۆژ لەوێ مایەوە پێکهاتبوون لە: نافیز جەلال و ساڵ یوسفی و حەبیب محەمەد کەریم و عەلی عەبدوڵلا. شاندەکە مەرجی دانا لەوانەش: مەرجی بنەڕەتی کە دەبێ چەکی جاشەکان دابماڵرێت و شاندەکە گوتی: حکوومەت ئەو مەرجەی قەبولکردووە.

پاش گۆڕینەوەی بیروڕا لەنێوان وەفدی شۆڕش و سەرۆك وەزیران عەبدولڕەحمان بەزاز، لە ٢٩ی حوزەیرانی ئەوساڵەدا ١٩٦٦ ڕێککەوتنێك لەنێوان هەردوولادا مۆرکراو بەزاز خۆی بەیاننامەکەی خوێندەوە، ڕێککەوتنەکە ژمارەیەك داخوازی شۆڕشی کوردی لەخۆگرتبوو، دوای ئیمزاکردنی ڕێککەوتننامەکە کە بە (ڕێککەوتننامەی ٢٩ی حوزەیران) ناسراوە، بارودۆخ خاوبۆوەو بەرەو هێمنی و ئارامی دەچوو، (عەبدولڕەحمان عارف)ی سەرۆك کۆمار سەردانی ناوچەی ڕەواندزی کردو لەبەرزێوە کە ناوچەیەکی ئازادکراوبوو لەگەڵ بارزانیی نەمردا کۆبۆوە، هەندێ لەبەرپرسانی شۆڕشیش سەردانی بەغدایان کرد. دەکرێ لە خوێندنەوەی ئیمزاکردنی ئەو ڕێککەوتننامەیەدا ئەمانە ڕەچاو بکەین:

❊ بە هەڵە خوێندنەوەی بزاڤی رزگاریخوازی کوردستان و خۆلادان لەرێوشوێنی گونجاو، سەرکردایەتی ئێراقیان بە ئاقارێکدا برد، کە دەبێ دان بەوە دابنێن زەبرو توندوتیژی هیچ وەختێك چارەسەری کێشە ناکات و ئەو ڕێگە چەوتەش کارەساتیان بۆ ئێراق و کوردستان هێنا.

❊ ڕەوایی و شەرعیەتی شۆڕش و سەرکردایەتیەکەی بە ڕابەرایەتی بارزانیی نەمر.

❊ بە عەمەلی بوونی تێزی شۆڕش لەمەڕ ڕێگەچارەی ئاشتیانە بۆ دۆزی کوردو چۆنیەتی کردنەوەی گرێ و ڕەتکردنەوەی ئەو تۆمەتانەی بەناڕەوا دەخرانە پاڵ شۆڕش.

❊ بارودۆخی دوای ڕێککەوتننامەکە بۆ کوردستان و بەتایبەتیش ناوچە ئازادکراوەکان سوودی هەبوو، چونکە هەلومەرجێکی دیکەی هێنایە پێشەوەو پارتیش لەو سەروبەندەدا توانی کۆنگرە ببەستێ، ئەوەبوو دوای زیاتر لەچوار مانگ لە ١٥/١١/١٩٦٦ کۆنگرەی حەوتەم لە گەلالە گرێدرا.

ئەو خەتە سیاسییەی بارزانیی نەمر لە شۆڕشی مەزنی ئەیلولدا تەبەنی کردبوو، سەبارەت بە هەند هەڵگرتنی مەسەلەی ئاشتی و گرتنەبەری ڕێوشوێنی گونجاو و ئاشتیانە بۆ چارەسەری گرفتەکان، بناغەیەکی پتەوی بۆ داهاتووی جووڵانەوەی رزگاریخوازی کوردستان بەگشتی دانا، هەر ئـەو ڕوانینـە ئاشـتیخوازانەیە بایەخـدارترین بەڵگەنامـەی مێـژوویی لێکەوتـەوە، کـە ڕێککەوتننامەی ١١ی ئاداری ١٩٧٠یە، ئەو ڕێبازو بەرنامەیە چەندین دەستکەوتی مـەزنی سیاسـی کردۆتـە دیـاری بـۆ کـوردو جووڵانـەوە هەقخوازییەکـەی، ئەمـەش لـە مەیـدانی پراکتیزەکردندا دیارە، خۆ هەمووی پێنج ساڵ بەسەر هەڵگیرسانی شۆڕشی مـەزنی ئەیلولـدا تێپەڕی بوو، لە ١٢/٥/١٩٦٦دا گەورەترین سەرکەوتنی لە هەندرێن بەسـەر سـوپای ئێراقـدا وەدەست هێنابوو، کەچی لەو ئان و ساتەدا وەڵامی داخوازییەکانی حکوومەتی ئێراق دەربارەی گفتوگۆ درایەوە، ئەمڕۆش ئەو خەتە سیاسییەی بارزانیی نەمر لەوێ ڕۆژێوە تەبەنای کردبوو، بۆتە تاکە ڕێگەی چۆنیەتی پێکەوە ژیان و فۆرمۆڵەیەك بۆ پاراستنی ئـەزموونی کوردسـتان. مۆرکردنی ڕێککەوتننامـەی ٢٩ی حـوزەیرانی ١٩٦٦ بـۆ وەدیهێنـانی مافـە نەتەوەییـەکان بنەمایەکی پتەوبوو بۆ داهاتووی نێوان کوردو حکوومـەتی ناوەنـدی بەغـداو سـەرەتایەکی گرنگ بوو بۆ خەباتی سیاسی.

ئەمڕۆ ٤٥ ساڵ بەسەر ئەو ڕێککەوتننامەیەدا تێدەپەڕێت، کەچی هێشتا هەندێ کـەس و بیرکردنەوە لە ئێراقی نوێدا هەیە، نایانەوێ ڕووداوەکانی دوێنێ بکەنە پەندو وانە بـۆ ئـەمڕۆو سبەی. هەر ئەمەشە دەبێتەهۆی تەڵخ بـوونی دۆخـی سیاسـی و ئەمـەش بـەهیچ شـێوەیەك لەقازانجی خەڵکی ئێراقدا نییە. ئەمڕۆ بەداخەوە ڕەوتێك لە ئێراقی نوێدا هەیە، پێی وایە کـە بەغدا خۆی گرتەوە دەبێ پشت لە کورد بکرێ، ئەمـەش درێژەپێـدەری هـەمان بیرکردنـەوەی شەڕانگێزانی دوێنێی ئێراقە کەتا ئێستاش خەڵکی ئێراق باجی هەڵەو خراپ بیرکردنەوەی ئـەو ڕەوتـە دەدات. بـارزانیی نـەمر لەکاتێکـدا گـەورەترین سـەرکەوتنی لەمەیـدانی سـەربازیدا لەداستانی هەندرێن وەدیهێنا کەچی زوو وەڵامی بەغـدای بـۆ گفتوگـۆ دایـەوە. ئـەم ڕێبـازە هەوێنی پێکەوە ژیان و بیرکردنەوەیەکی ڕاست و دروستە، بەغدای دوێنێ پشتی لە بەرنامەی سیاسی و ڕێبازی ئاشتیخوازانەی بارزانیی نەمرکرد، بۆیە ئێـراق وای بەسـەر هـات. ئـەمڕۆ بەرنامەی ئاشتەوایی بارزانیی نەمر لـە هـەرێمی کوردسـتاندا دەروازەی بـۆ ژیـانێکی نـوێ کردۆتەوە، گرتنەبەری ئەم ڕێگایە پێگەی هەرێمی کوردستانی گرنگ وێنـا کـردووە، هـەولێر بۆتە لایەنێکی گرنگ لە قسەکردن دەربارەی قۆناغی دادێی ئێراقدا.

## دەقی بەیاننامەی

## ڕێککەوتنی ٢٩ی حوزەیرانی ١٩٦٦

ئەم حکوومەتە لەبەر حەزکردنی بە کۆتایی پێهێنانی ئەو بارودۆخە ناسرووشتییە لە هەندێك ناوچەی باکوور هەروەك لە بڕگە چواری نووسراوی ڕوولێنانی پێکهێنانی وەزارەتدا هاتووە، ئەو بڕگەیەی بانگەشە بۆ پارێزگاریکردن لە یەکێتی خاکی ئێراق و وەدیهێنانی یەکێتی ئێراق و جەختکردن لەو یەکگرییەی لە نێوان عەرەب و کورددا هەیە ـــ ئەو یەکگرییەی بەسەریاندا دەسەپێنێ کە بەڕاستگۆیی و خۆگری کار بۆ بەرژەوەندی نیشتمانەکەیان بکەن ـــ ئەم حکوومەتە ئەم بەرنامەیەی خوارەوە ڕادەگەیەنێت و لەهەمان کاتیشدا بڕیاری بنەڕەتی خۆی جاڕ دەدات بۆ پابەندبوون بەو بەرنامەیە و پیادەکردنی بەدەق و ناوەڕۆکەوە بە نێزیکترین کات کە لە توانادا بێت:

١- حکوومەت بە دڵنیایی بێ سێ و دوو دان بە نەتەوایەتی کورددا دەنێت لە دەستووری کاتیی هەموارکراودا و ئامادەشە بۆ جەختکردن لەسەر ئەو دانپیانانەو ڕوونکردنەوەی لە دەستووری هەمیشەییدا، بە جۆرێك ببێتە نەتەوەی کورد و مافە نەتەوەییەکانی کورد لەیەك نیشتمانی ئێراقییدا کە دوو نەتەوەی سەرەکی دەگرێتە خۆ، عەرەب و کورد. عەرەب و کوردیش لە ماف و ئەرکدا یەکسان دەبن.

٢- حکوومەت ئامادەیە لە یاسای پارێزگاکان کە لەسەر بنچینەی (لامرکزی) جاڕ دەدرێت بوونی ڕاستەقینە بەم ڕاستییە حاشا هەڵنەگرە ببەخشێت و هەموو پارێزگاو قەزاو ناحییەیەك کەسیەتی بەشداریی خۆیان هەیە کە دانیان پیادەنرێت، هەروەها هەر یەکەیەکی کارگێڕی، لەوەش زیاتر، ئەنجوومەنی هەڵبژێردراوی خۆی دەبێت کە دەسەڵاتی بەرفراوانی لە بواری فێرکردن و تەندروستی و گەلێکی دیکە لە کاروباری ناوخۆیی و شارەوانیدا دەبێت، هەروەك یاسای ئاماژە بۆ کراو بەدوورو درێژی لێی دەدوێ و یاساکەش دەسەڵاتی هێنانەکایەی هەموارکردن دەدات بەخۆی لە نێو چوارچێوەی یەکە کارگێڕییەکاندا، هەروەها دەسەڵاتی پێکهێنانی یەکەی کارگێڕی تازەی پێدەدرێت، ئەوە ئەگەر بەرژەوەندیی گشتی پێویستی بەوەکرد.

٣- پێویست بەوە ناکات بڵێین حکوومەت دان بە زمانی کوردیدا دەنێت وەك زمانێکی ڕەسمی شانبەشانی زمانی عەرەبی لەو ناوچانەی زۆرینەی کوردیان تێدا دادەنیشێ و خوێندنیش بەهەردوو زمان دەبێت بەپێی ئەوەی یاسای ئەنجوومەنە شارەوانییەکان دیاری دەکەن.

٤- ئەم حکوومەتە نیازی وایە هەڵبژاردنی پەرلەمانی لەو ماوەیەدا بکات کە دەستووری کاتی و بەیاننامەی وەزاری دیارییان کردووەو کوردیش بەرێژەی ژمارەی دانیشتوانی لەئەنجوومەنی نیشتمانیدا نوێنەری دەبێت بەپێی ئەو ڕێبازەی لەیاسای هەڵبژاردندا باسی لێوەگراوە.

٥-پێویست بەوە ناکات بڵێین کوردیش لەهەموو پلەو پایە گشتییەکاندا بەپێی ژمارەی دانیشتوانیان بەشداریی برا عەرەبەکانیان دەکەن، لەوانەش وەزارەتەکان وفەرمانگە گشتییەکان و پایەی قەزایی (دادوەری) ودیپلۆماسی و سەربازی لەگەڵ ڕەچاوکردنی بنەمای لێهاتوویی و لێوەشاوەیی.

٦-ژمارەیەك (منحە)ی خوێندن و قوتابی ناردنە دەرەوە بۆ وەرگرتنی تایبەتمەندایەتی لەبواری لێهاتوویی کەسایەتیی پێویست بۆ وڵات دەدرێ بە کورد و زانکۆی بەغداش بایەخێکی تایبەتی بەخوێندنی زمان و ئەدەب و نەریت و باوەڕ و مێژووی کورد دەدات، لەهەمان کاتیشدا زانکۆی بەغدا پڕۆژەیەکی خۆی لەباکوور دەکاتەوە ، ئەگەر پارەی پێویست بۆ ئەو مەبەستە هەبوو.

٧-پێویست بەوەناکات بڵێین کە فەرمانبەرەکانی حکوومەت لە پارێزگاو قەزاو ناحیە کوردییەکان کورد دەبن هەر کاتێك ژمارەی پێویست بۆ ئەمە هەبوو و، ئەو جۆرە فەرمانانە بەکەسی تر نادرێن، تەنیا مەگەر لەبەرژەوەندیی ناوچەکەدا بێت.

٨-ژیانی پەرلەمانی وا پێویست دەکات ڕێکخراوی سیاسی دیاریکراو هەبێت و ڕۆژنامەوانییش مافی ئەوەی هەیە خواست وئارەزووی گەل دەربڕێت و کوردیش بەشداری لەو مافەدا دەکەن لەچوارچێوەی سنووری یاسادا ڕۆژنامەی سیاسی و ئەدەبی لەناوچە کوردییەکاندا بەزمانی کوردی، یان زمانی عەرەبی دەبێت بەپێی داواکاریی کەسانی پەیوەندیدار.

٩-أ. هەر کاتێك کاری توندوتیژی بوەستێت، ئەوا لێوردنێکی گشتی بۆ هەموو ئەوانە دەردەچێت کەلەباکوردا بەشدارییان لەو کارانەدا کردووەو پەیوەندییان پێیانەوە هەبووە، هەروەها بۆ هەموو ئەوانەش کە حوکم دراون لەبەر بەشداربوونیان لەکاری توندوتیژییدا یان پەیوەندییان پێیانەوە هەبووە و، لەهەمان کاتیشدا هەموو ئەوانەی کە ئازادییان کۆت کراوە.

ب. هەموو بەرپرس و فەرمانبەرە کوردەکان دەگەڕێنەوە بۆ فەرمانەکانی پێشوویان و دامەزراندنیش بەشێوەیەکی دادپەروەرانە دەچێت بەڕێوە.

ج-حکوومەت هەرچییەکی لەتوانایدا هەبێ بۆ گەڕاندنەوەی گشت کرێکارە کوردەکان بۆ سەر کارەکانیان، دەیکات.

١٠-هەموو هەڵاتووەکانی هێزە چەکدارەکان لەچوارچێوەی ئەو مەرجانەی لەخوارەوە نووسراون، دەسبەجێ بەدەرچوونی ئەم بەیاننامەیە دەگەڕێنەوە بۆ یەکەکانی خۆیان، بەمەرجێك ئەم کارە لەماوەی دوو مانگدا جێبەجێ بکرێت و ئەو گەڕاوانەش بەسۆزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا دەکرێ و لێبوردنێکی تایبەتیان بۆ دەردەچێت. مەرجەکانیش ئەوانەن:

ا- هەموو ئەوانەی لە سوپادابوون دەبێت بەخۆیان و بە چەکەکانیانەوە بگەڕێنەوە.

ب- هەموو ئەوانەیش کە پۆلیس بوون، دەبێ بەخۆیان و بە چەکەکانیانەوە بگەڕێنەوە بۆ هێزی پۆلیس.

ج- گشت ئەو مەدەنیانەی لە ماوەی توندوتیژیدا چەکیان هەڵگرتووە بە ڕێکخراوێکی سەر بە دەوڵەت دادەنرێن و حکوومەت یارمەتیان دەدات بۆ دەست پێکردنەوەی کارە ئاساییەکانیان و تا ئەوەش جێبەجێ دەبێت، ئەوا حکوومەت لێیان بەرپرس دەبێت و پێویستە لەسەر هەموو ئەوانەی دەست بەکارە ئاساییەکانی خۆیان دەکەنەوە گشت چەك و فیشەك و شتی دیکە لەم بابەتەیان بدەنەوە حکوومەت بەپێی پلانێك کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادە دەکرێت.

د- هێزی سوارە ( _الفرسان) لەکاتی دابینبوونی ئاشتیدا دەگەڕێنەوە مەڵبەندەکانی خۆیان و چەکەکانیشیان بەپێی پلانێك کە بۆ ئەو مەبەستە ئامادە دەکرێت لێ دەستێندرێتەوە.

١١- پێویست بە گوتن ناکات کە ئەو پارەو پوولەی بۆ لەناوبردنی کاری توندوتیژی، بێ ئەوەی پێویست بەوە بکات، خەرج دەکرێت، بۆ ئاوەدانکردنەوەی باکوور تەرخان دەکرێت و

دەستەیەکی تایبەتیش بۆ ئاوەدانکردنـەوەی ناوچـە کوردییـەکان پێـك دەهێنرێـت و پـارەی پێویستیش بۆ ئەو دەستەیە تەرخان دەکرێت بۆ وەدیهێنانی کـار تـەواوکردن لـەو پـارەی کـە دانراوە بۆ جێبەجێکردنی پلانـی گەشـەکاری بـۆ وڵات. وەزیرێکـی تایبـەتیش دادەنرێـت بـۆ چاودێری کردنی ناوچەگەلی هاوینە هەوارەکان و لێڕەوار و تووتن چاندن و لەهـەمان کاتیشـدا سەرپەرشتیی کاروباری ئەو یەکە کارگێڕییانە دەکات کە کـورد زۆرینـەی دانیشـتوانیان تێـدا پێکدەهێنن و ئەو کاروبارانەش لە ناخی گیروگرفتی کوردەوەن وەك ڕۆشنبیری و زمانی کوردی، حکوومەت ئەوەی لە توانایدا بێت دەیکات بۆ قەرەبووکردنەوەی ئەو کەسانەی بەهۆی کـاری توندوتیژییەوە زیانیان لێ کەوتووە تا بتوانن کارە ئاساییەکانی خۆیـان لـە سـایەی ئاشـتی و ئاسایشدا بکەن و لە پێناو وەدیهێنـانی خۆشـگوزەرانی و گەشـەکردن. هـەروەها حکوومـەت لەڕووی نیشتیمانی و مرۆڤایەتییەوە ژیانی هەتیو و بێوەژنەکان و هەموو ئەوانەی لە ئەنجامی ئەو توندوتیژکارییانەوە لەبەشی باکووری نیشتیمان تووشی پەککەوتـەیی و کەمئەنـدامیبوون دەگرێتە ئەستۆو، لەهەمان کاتیشدا بە زووترین کات پەناگەو پەیمانگای پیشەیی دەکاتەوە.

١٢- حکوومەت هەوڵ دەدات بۆ نیشتەجێکردنەوەی هەموو ئەو کەس و کۆمەڵانـەی کـە ناوچەکانی خۆیان جێ هێشتووە، یان لێیان هەترە کراون و دوور خراونەتەوە، بـۆ ڕەخسـاندنی بارودۆخێکی ئاسایی. خۆ ئەگەر حکوومەت بینی لە دوارۆژدا وا پێویسـت دەکـات بـە کـڕین دەست بەسەر هەندێك کەلوپەلدا بگرێت، دەبـێ ئـەو کـارە بـە قەرەبووکردنەوەیـەکی خێـراو دادوەرانە بێت.

تیبینی: بۆ دەقی ڕێککەوتننامەکەو هەندێ زانیاری تر سوود لە ( مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی رزگاریخوازی کورد، بـەرگی سـێیەم، شۆڕشـی ئـەیلوول ١٩٦١-١٩٧٠ ) وەرگیراوە.

٢٠١١-٦-٢٩

# سوپا پێویستی بە (حەسەن عەبود) ـەکان هەیە

گرفتی گـەورەی ئێـراق ئەوەیـە، تـا ئێسـتا سـوپایەکی نیشـتمانیی نـەبووە، ئەگەرچـی حکوومەتەکان وایان پیشـان داوە کـە سـوپای ئێـراق نیشـتمانی بـووە، بـەڵام لـە راسـتیدا، بەدرێژایی مێژوو، ئەو سوپایە هەمیشە داردەستی سەرۆك و حکوومەتەکانی ئێراق بـووەو لـە خزمەت بەرنامەی نادروستدا بەکارهێندراوە، تا بەوە گەیشت ناسیونالیزمی عەرەبی شانازیی بەو سوپایەوە کردو بووە ئـامێری جێبـەجی کردنـی شـۆفێنیەکان. بەدرێـژایی مێـژووی ئـەو سوپایە، کوردستان مەیدانی تەراتێن و جەنگ و وێرانکـردن بـووە، بـەجۆرێ کـە بـە بڕیـاری بەغداو لەسەر دەستی ئەم سوپایە، ژێرخانی کوردستان لەبـەین بـراوەو چـەکی قەدەغـەکراوی لەدژی دانیشتوانەکەیدا بەکارهێناوەو بەهەزارانیشی خستە گۆڕی بە کۆمەڵەوە کەتا ئێستاش ناوە ناوە ئەو گۆڕە بەکۆمەڵانە دەدۆزرێنەوە.

سوپا لە ئێراقدا، لەسەر ئەوە راهێندراوە، کە کوردستان و خەڵکەکـەی مەترسـین لەسـەر ئێراق و نەتەوەی عەرەب، بۆیە ئۆپەراسیۆنەکانی بەجۆرێك بووە، هەمیشە دەسـتکراوە بـووە، هەر بەهۆی ئۆپەراسـیۆنەکانی سـوپای ئێـراق لەکوردسـتان، ئەفسـەرو فەرمانـدەی تونـدڕەو دەرکەوتن و لەسەردەمی بـەعس ژمارەیـان زیـادی کـرد، کـە کوێرانـە بڕیـاری کاولکـاری و کوشتوبڕیان دەدا، کەسانێکی دەگمەنیش هەبوون پێچەوانەی ئەوان کە جێگەیان نـەدەبووەوە، عەمید حەسەن عەبود بە نموونە دەهێنینەوە کە لە کوردستان و لە سەرەتای شۆڕشی ئەیلوولدا چۆن بڕیاری داوەو دواتر لەسەر ئەو هەڵوێستانەی بە چ دەردێکیان بردووە. دوای ٥ پێـنج ڕۆژ لە هەڵگیرسانی شۆڕشی ئەیلوول، واتە لە ١٦ی ئەیلوولی ١٩٦١ دا عەبدولکەریم قاسم ٤چوار باڵەفڕی بۆمبهاوێژی ناردۆتە سەر گوندی بارزان و گوندەکانی دەوروبەری بارزان، بۆ مـاوەی ٧ حەوت ڕۆژ تەواوی ناوچەی بارزانیان بۆمبابارن کردووە، دواتـر رژێمـی قاسـم هێزێکـی زۆری

سوپاو جاشی کۆکردۆتەوەو لە دوو قۆڵەوە هێرشی کردۆتە سەر ناوچەکە، بەڵام هێـزی دوژمـن نەیتوانیوە لە هێڵی بەرگری نزیك بکەوێتەوە، دواتر شێخ ئەحمەدی بارزان بڕیاری شەڕوەستاندن لەگەڵ هێزەکانی حکوومەتی ئێراق دا، عەبدولکەریم قـاسمیش داوای لێکـرد بچـێتە بەغـدا، ئینجا هێزەکانی حکوومەت روویان کردە بارزان و مێرگەسۆر،سـەرۆك بـارزانی لـەبارەی ئـەو هێزانەو دۆخی ئەوێ ڕۆژێی خێزانەکانی شێخانی بـارزان لـە کتـێبی (بـارزانی و بزووتنـەوەی رزگاریخوازی کورد) دەڵێ: "هێزەکانی لیوای پێنجەم بەسەرکردایەتی زەعیم (عەمید) حەسـەن عەبود چوونە ناو گوندی بارزانەوەو فەوجێکی هێزی سـێی پیـادەش بەسـەرکردایەتی عەقیـد وەهبی چووە مێرگەسۆرو، خێزانەکانی شێخانی بارزان بە خێزانی بارزانی خۆشیەوە لە گونـدی مێرگەسۆردا یەکیان گرتەوە. عەبدولکەریم قاسم لەسەرەتادا بڕیاری دابوو هەموو خێزانـەکانی شێخانی بارزان  بۆ ناوچەی فوراتی ناوەڕاست دوورخاتـەوە، بـەڵام پـاش چـاوپێکەوتنی شـێخ ئەحمەد لەم نیازەی پاشگەزبووەوە ".

ئەوەی لێرەدا باسی دەکـەین و بەنموونـە دەیهێنینـەوە ڕووداوگـەلی سـەرەتای شۆڕشـی ئەیلولن، لە وەختێکدا هەمووی نێزیکەی ٣ سێ ساڵ بوو کۆتایی بـە حـوکمی پاشـایەتی هێندرابوو، لەلایەکی دیکەشەوە عەبدولکەریم قاسم لەخۆبایی ببوو و هەنـدێ سـەرکەوتنی سەربازی و ئازاردانی خەڵکی کوردستانی لێخۆش هاتبوو، لەو کاتەدا هەڵوێسـتی حەسـەن عەبوود وەك فەرماندەیەکی سوپا گرنگ بوو، چـونکە پێچـەوانەی ئـەو ئاراسـتەیەبوو کـە دەیویست خوێنێکی زۆر لە ناوچەکە بڕژێت و ئاژاوەو فیتنە بنرێتەوە، هەر لەوکاتدا عەقید وەهبی کە لە مێرگەسۆر بوو بە پێچەوانەی عەمید حەسەن عەبود زۆر بەتوندی لەگەڵ خەڵك جولاوەتەوە، سەرۆك بارزانی لە کتێبەکەیدا دەربـارەی ڕەفتـاری عەقیـد وەهـبی دەڵـێ: " هەرگیز ئەو کارە دوور لەهەموو بنەمایەکی شەرەف و ڕەوشت بەرزییانەم لەبیر ناچنەوە کـە عەقید وەهبی لە مێرگەسۆردا کردنی و، ئەو ئازارو ناڕەحەتیانە لەیاد ناکەم کە ئەو کابرایە پێی گەیاندین، یەکێکیان ئەوەبوو لوقمانی برامی گرت و بە زنجیرو کەلەپچەکراوی ناردی بۆ بەغداو فڕێی دایە زیندانی سوپایی ژمارە (١) ی مۆڵگەی ڕەشیدەوە". لەلایـەکی دیکـەوە ئەو هێزەی سوپاو جاشەی کە لەناوچـەکە مۆڵـدرابووو گـەمارۆی خێزانـەکانی گونـدەکانی دەوروبەرو دراوسێی بارزان دەدەن کە لە گوندی بارزان و مێرگەسۆر خڕکرابوونەوە، بەدرەدین عەلی کە کرابووە پارێزگاری هـەولێر ویسـتویەتی بـەهاوکاری جاشـەکان، تۆڵـە بکاتـەوەو هانیـان بـدات لـە دژی بارزانییـەکان و چاوپۆشـی دەکـردن لـە دەسـتدرێژییان بـۆ سـەر

بارزانییەکان، بەڵام ئەوەی لێنەگەڕا ئەوە ڕوویـدات عـەمیـد حەسـەن عـەبودی فەرمانـدەی لیوای پێنج بوو، سەرۆك بارزانی لەبارەی هەڵوێستی حەسەن عەبود لەو بارودۆخەدا دەڵێ: " عەمید حەسەن عەبود هەڵوێستێکی توندی وەرگرت و نەیهێشت ئەوەی دەیانەویست بیکەن جێبەجێ ببێ و، فەرمانی دەرکردنیانی لەناوچـەکە دا، بنـەمای دوژمنایـەتیی نێـوان ئـەم سەرکردەیەی سوپاو بەدرەدین عەلی لێرەوەبوو".

ئەم هەڵوێستەی عەبود لەسایەی غروری قاسـم و فەرمانـدەکانی دیکـەی سـوپا، مایـەی بەهەند هەڵگرتن و پێزانین بـوو، چـونکە نەچـووە ژێـر بڕیـاری بـەدرەدین عـەلی و ئەوانـەی دەیانەویست سوپاو جاش بکەنە ئامرازێك بـۆ قـەتلوعام و ئـاژاوە نانـەوە، سـەرۆك بـارزانی لەبارەی لەبیرنەکردنی ئەم هەڵوێستەو هەڵوێستی دواتری بـارزانیی نـەمر بەرامبـەر حەسـەن عەبود دەڵێ: " بارزانی ئەم پیاوەتیەی حەسەن عەبودی هەرگیز لەیاد نەکردو کە بەعسییەکان لە ٨ ی شوباتی ١٩٦٣ هاتنە سەر حوکم و حەسەن عەبودیان گرت و بڕیـاری کوشـتنیان دا، بارزانی ئەو پیاوەتییەی حەسەن عەبودی لە یادبوو و نەیهێشت ئەو چارەنووسەی بۆیـان بڕیـار دابوو جێبەجێی بکەن و لە مردن ڕزگـاری کـرد. بارزانییـەکانیش هـەروەها ئـەم هەڵوێسـتە مەردانەیەی ئەم سەرکردەیەیان لەبیر نەچووەتەو هەمیشە یادی دەکەنەوە". ئـەم هەڵوێسـتەی حەسەن عەبود لەنێو سوپا قبووڵ نەبوو، دیارە عەبدولکەریم قاسمیش بۆی لەناو پارووە نانێـك هەڵگرتبوو و لە دەرفەت دەگەڕا، ئـەوەبوو دوای شـەڕی گـەورەی زاویتـە لـە ١٢ی کـانوونی یەکەمی ١٩٦١ داو تێکشکانی هێزی هێرشبەری سوپا لە گەلی زاویتە، قاسـم نامەیـەك بـۆ شێخ ئەحمەد دەنێرێ و دوای ناردنی دەقی ئەو نامەیە لەلایەن شـێخ ئەحمـەدەوە بـۆ بـارزانی، داوایەکیش لە قاسمەوە دەگاتە بارزانیی نەمر کە لەگەڵ حەسەن عەبودی نێردەی قاسم دابنیشێ و بـارزانیش بـەو داوایـە رازی دەبێـت. حکوومـەت ڕۆژی ١٧ی کـانوونی یەکـەمی ١٩٦١ شوێنێکی لە نێزیك سەرسەنگ بۆ گفتوگۆکە دیاری کرد، بەڵام بارزانی ناچێتە ئەو شوێنەو لە شوێنێکی نێزیك بامەڕنی دەمێنێتەوەو چەند کەسێك دەنێرێتە شـوێنی کۆبوونـەوەو چـاوەڕێی حەسەن عـەبود دەکـەن و دوای گەیشـتنی لەگـەڵ خۆیـان دەیبەنـە لای بـارزانی، دواتـر زۆر ناخایەنێ ٤ چوار باڵـەفڕ شـوێنی کۆبوونەوەکـە بۆردومـان دەکـەن، دووربـینی و حیکمـەتی بـارزانیی نـەمر پیلانـی قـاسمی پووچـەڵ کـردەوەو، بۆچـوونی بـارزانی راسـت دەرچـوو کـە عەبدولکەریم قاسم مەبەستی بوو بارزانی و حەسەن عەبود لەنابەرێت، سەرۆك بارزانی لەبارەی هەڵوێستی حەسەن عەبود لەو کاتوساتەدا دەڵـێ: "حەسـەن عـەبود ئـەو بۆمبارانـە تونـدەی

لەدوورەوە بە چاوی خۆی دی و شـەرمەزارییەکی سـەخت دای گـرت و ئـەو هەڵوێسـتەی تـا ڕادەیەکی زۆر بەلاوە گران بوو. هیچ شتێکی لەبارەی ئـەو تاوانـەوە کـە سـەرۆکەکەی سـازی کردبوو لەزەیندا نەبوو، حەسەن عەبود یەکێك بوو لە ئەفسەرە بەشەرەفەکان، دڵی پاك بوو لە هەموو دڵیەوە حەزی دەکرد ئاشتی لە نێواندا بەرقەراربێ، ئێمەش لـەو هەڵوێسـتە بـەرزەی دڵنیابووین کە پیاوێکی نیازپاکە، ئەویش ئەوکاتـە بـوو کـە بـووە کۆسـپ لـەڕێی جاشـان و نەیهێشت ئازاری بارزانییەکان بدەن. بارزانی لەو شوێنەدا کە خۆی هەڵی بـژاردبوو چـاوی بـە حەسەن عەبود کەوت، پێی وت: (من داوای هیچ لە قاسم ناکەم بمداتێ، ئـەو بـا مافـەکانی گەلی کورد بداو من ئێراق بەجێ دەهێڵم و دەڕۆم) دەرکەوت ئەم ئەفسـەرە چ پلـەو پایەیـەکی لای بارزانی هەبوو، بەڵام ژیانی لای قاسم وەك دەرکەوت هیچی نەدەهێنا".

دوای گەڕانەوەی حەسەن عەبود بۆ موسڵ، عەبدولکەریم قاسم بۆ بەغدا بانگی دەکـات و هەڕەشەو گوڕەشەی زۆری لـێ دەکـات، لێـرەدا دەقـی ئـەو دەمەقاڵێیـەی نێوانیـان وەك لـە کتێبەکەی سـەرۆك بـارزانی دا هـاتووە دەخەینـەڕوو، بـۆ ئـەوەی ئاسـتی لـەخۆبایی بـوونی عەبدولکەریم قاسمی سەرۆك کۆمار و هەڵوێست و واقیعبینیی حەسـەن عـەبود، بـۆ خوێنـەر دەرکەوێ، ئاخۆ بۆچوونی کامەیان لە بەرژەوەندی وڵاتدا بووە؟

" یەکێ لەو قسانەی قاسم پێی وتبوو ئەوەبوو: تۆ چۆن دەڵێی من دڵسۆزی تۆم لەکاتێکدا لەکاتی کۆبوونەوە هەوڵی ئەوەت نەدا بارزانی بکوژی؟ حەسەن عـەبودیش لـە وەڵامـدا پێـی دەڵێ: چۆن دەمتوانی بیکوژم؟ دەڵێ: دەمانچـەکەت لـێ هەڵکێشـایەو بتکوشـتایە، حەسـەن عەبود دەڵێ: من بۆ ئەوە لەگەڵی کۆبووبوومەوە لەگەڵی ڕێك کەوم و ئاشتیی لەگەڵدا بکـەم، ئەویش هێشتی من چەکەکەم بەقەدەوە بێ و قەدریان گرتم و چـەکەکەیان لـێ وەرنـەگرتم کـە دەشیتوانی لێم بستێنێ، ئەگەر وام بکردایە کە تـۆ دەیڵێیـت هـیچ سـەرکەوتنێکم دەسـتگیر نەدەبوو چونکە چواردەورمان بـە پاسـەوانە وریـاو زیتـەکانی ئـەوان گیرابـوو". ئیـدی زۆری پێنەچوو حەسەن عەبود لەلایەن قاسمەوە لە سـەرکردایەتی لیـوای پێـنج لادراو مامەڵەیـەکی خراپی دەرهەق کراو خرایە ژێردەستی بەڕێوەبەرێتییەوە.

دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، سوپای ئێراق بە بڕیارێکی پۆل بریمـەری حـاکمی ئەوسـای ئێراق هەڵوەشایەوە، دیارە شۆڤێنییەکان ئێستاشی لەگەڵدابێ فرمێسك بۆ هەڵوەشانەوەی سوپا هەڵدەڕێـژن، چـونکە ئـامێرێکی جێبـەجێکاری بەرنامـەکانیان بـوو. بەداخـەوە ئـەمڕۆش مشتومڕێکی زۆر لەسەر بەدەستەوەگرتنی سوپاو هێزەکانی ناوخۆ لە نێـوان سـوننەو شـیعەو

هێزە سیاسیە عەرەبییەکانی ئێراقدا هەیەو هێشتا وەزارەتە ئەمنییەکان بێ وەزیرن، کورد هەقی خۆیەتی بەترسەوە بڕوانێتە ئەو مەیلەی دەیەوێ سوپا بکاتەوە ئامرازەکەی جاران، بەداخەوە ئێستا لە نێو سوپای نوێی ئێراقدا ئەو مەیلە لەبەرگێکی دیکەدا خۆی دەنوێنێ، بە ئاشکرا هەوڵی ئەوە دەدرێت کە ڕێژەی کورد لەو سوپایەدا کەم بێت، ئەو فیرقە سەربازییانەی زۆرینەیان کوردن لە چەکی گرنگ بێ بەشیان کردوون، ئایا ئەم سوپایە دەربڕی قۆناغی تازەی ئێراقە؟ هەقە ئەمڕۆ لە هەمووکاتێك زیاتر واقیعیانە پێکهاتەکانی ئێراق بخوێندرێتەوە، لەبەر ڕۆشنایی ئەم خوێندنەوە واقیعبینانەیە سوپایەك پێکەوەبندرێ، گوزارشت لە هەموو پێکهاتەکانی ئێراق بکات، نابێ جارێکی دی سوپا بکرێتەوە داردەستی تاکرەوی و تاکە لایەن، ئەگەر هەوڵێکی دڵسۆزانە هەبێت بۆ پێکهێنانی سوپایەکی نیشتمانی، پێویستە بەدوای خەڵکی وەك حەسەن عەبوددا بگەڕێن، کە بووە قوربانیی پیشەیی بوونەکەی لە سوپادا، ئاخر لە سوپای ئێراقدا بەهۆی هاتنەپێشەوەی قەومییەکان کە لەسەردەمی بەعسدا گەیشتە لووتکە، سوپا جێگەی حەسەن عەبودەکانی تێدا نەبۆوە، بۆیە هەرگیز نەبوو بە سوپایەکی نیشتمانی، ئاماژەکان پێمان دەڵێن، هەڵپەی کۆنترۆڵ کردنی سوپا پێناچێت بەو ئاراستەیە بڕوات جێگەی حەسەن عەبودەکان ببێتەوە، کەواتە ئەستەمە لە سایەی ئەو جۆرە بیرکردنەوەیەی ئەمڕۆ لە ئێراقێ لە ئارادایە بتوانین بڵێین سوپایەکی نیشتمانی بەرێوەیە.

تێبینی: بۆ زانیارییەکانی ئەم بابەتە سوود لە کتێبی: مسعود بارزنی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد،بەرگی سێیەم، شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥ ، بەشی یەکەم، چاپی یەکەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤ وەرگیراوە.

٢٠١١-٧-١٨

# ڕایەڵی پتەوی پێکەوەژیان ڕەگوڕیشەی مێژوویی هەیە

کە دێین قسە لەسەر پێکەوەژیان دەکەین، نابێ لەم ئـان و سـاتەوە لێـی بـدوێین، چـونکە پێکەوەژیان مێژوویەکی دوورودرێژی هەیەو ڕەگوڕیشەی داکوتاوە، ئەوەی گرنگـە لەبەرچـاوی بگرین ئەوەیە کە پێکەوەژیان لە کوردستاندا زادەی یەك دوو کۆبوونەوەو کۆنفرانس و کـۆنگرە نییە، تا بتواندرێ بە ئاسانی بە بڕیارێك هەڵبوەشێندرێتەوە، ڕایەڵی پێکەوەژیان لە واقیعێـك سەری هەڵداوە، کە بناغەیەکی تۆکمەی بۆ ئەمڕۆو سبەی داناوە، بۆیە ئەوەی کە لێرەو لـەوێ سەرهەڵدەدات و کاری بۆ دەکرێ بۆ ئەوەیە کە بخرێتە خانەی دژایەتی نێوان پێکهاتەکان و ئەو وێنەیەی کە هەیەو زادەی مێژوویەك لێبووردەیی و پێکەوەژیانی ئاین و ئاینزاکانە بشێوێندرێ و، وێنەی توندوتیژی شوێنی بگرێتەوە.

لەو ڕووەوە بە پێویستی دەزانم بۆ قسەی (هاملتۆن)ی ئەندازیاری ڕێگای سەرەکی هەولێر-حاجی ئۆمەران لە سییەکانی سەدەی ڕابردوو، هاملتۆن بەدرێژایی ئەو ماوەیەی خەریکی ئـەو ڕێگەیە بوو کە دواتر بەڕێگەی هاملتۆن ناسرا، هەمیشە کرێکـاری موسـڵمان و مەسـیحی و جولەکەی هەبوو، هاملتۆن لە کتێبەکەیدا دەڵێ کرێکارەکـان پێکـەوە کاریـان دەکـردو هـەر یەکەشیان بە پێی ئاینی خۆی پشووی هەبوو، ڕۆژانی هـەینی کرێکـاری موسـڵمان و ڕۆژانـی شەممە کرێکاری جولەکەو ڕۆژانی یەك شەممە پشوویان هەبوو، ئـەم نموونەیـەم بۆیـە هێنایـەوە چونکە ئەوە قسەی کەسێك نییە بـۆ موزایـەدەکردن بیکـات، بـەڵکو قسـەی ئەنـدازیارێکی ئەوروپییە و خۆی چەند ساڵێك لـە کوردسـتان ژیـاوە، ئـەم نموونـەم کـە لـە زاری کەسـێکی ئەوروپایی هێنایەوە، بۆ ئـەوەی وێنـەی ڕاسـتەقینەی پێکـەوەژیان لـە ڕابـردووی کوردسـتان بێنینەوە بەرچاو، کەواتە ڕایەڵی پێکەوەژیان ڕایەڵێکی پتەوەو زادەی لێبووردەیی ئاینەکانە لە کوردستان، بەڵام ئەوەی ئەو بابەتەی بەرەو ئەوە بردووە کە پێکەوژیان بکرێتە ئامـانج، ئـەوە

خودی ئاینەکان و پەیڕەوانیانیان نییە، بەڵکو سیاسەتە دەست لەو مەسەلەیە دەدات و دەیەوێ بیشێوێنێ.

جیاوازیی هەرێمی کوردستان و خواروو ناوەڕاستی عێراق لەوەدایە، کە لەوێ ناکۆکیی مەزهەبی ڕەگوڕیشەی هەیە، بۆیە پرۆسەی سیاسیی دوای ٢٠٠٣ بەتەواوی لەژێر ئەو کاریگەرییەدایە، ئێستا حکوومەتی عێراق ئەو کاریگەرییەی پێوەدیارە، بۆیە بەغدا نەیتوانیوە ببێتە پایتەختی وڵاتێکی پڕ لە مەزهەب و ئاین و نەتەوە. بۆیە کە ئاین و لایەنی ڕۆحیی خەڵکی کوردستان بەسیاسی کرا، ئیدی ڕێگە بۆ ئەوە خۆش بوو دەست بۆ ڕایەڵی پێکەوەژیان ببرێت، دەسکاری کردنی ئەو مەسەلەیەو هەڵگێڕانەوەی بۆتە هۆکاری دروست بوونی ئەو دۆخە نەخوازراوەی ناوە ناوە لە کوردستان سەر هەڵدەدات، کە دەسکاری ئەندازەی پێکەوەژیان و لێبووردەیی دەکرێت، بۆیە هەقە ئەو هێزو لایەنانەی بۆ بەرژەوەندی تەسکی حزبایەتی و گرتنە دەستی دەسەڵات، بە هیچ شێوەیەك تخوونی ئەو ڕایەڵە مێژووییەی پێکەوەژیان لە کوردستان هەیە نەکەونەوە، چونکە بەرژەوەندی نیشتمان لەسەرەوەوی بەرژەوەندی هەر هێزو لایەنێکی سیاسییە، هەقە لێرە بەولاوە دەست بردن بۆ ڕایەڵی پێکەوەژیان حەرام بکرێت و بکرێتە هێڵی سوور، چونکە ئەوانەی بێباکانە هەوڵی تێکدانی پێکەوەژیان دەدەن بۆ ئەوەیانە ئاگر لە نیشتمان بەربدەن و ناحەزانیش پێمان پێبکەنن.

٢٠١١-١٢-٥

# ڕێككەوتننامەی جەزائیر ١٩٧٥ ڕێككەوتن لەسەر دژایەتیكردنی كورد و ئاگر تێبەردانی ناوچەكە

ڕۆژی ٦ ی ئاداری ١٩٧٥ لە یادگەی گەلی كوردستاندا، لە ڕۆژە هەرە تاڵ و ناخۆشەكانە، چونكە بەهۆی ئەو ڕێككەوتنەوە، كە كورد بە(پیلانی جەزائیر) ناوی دەبات، گەلەكۆمەكییەكی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی لە شۆڕشی مەزنی ئەیلوول كرا، شۆڕشێك كە هەموو چین و توێژەكانی كوردستانی لێ كۆببۆوە، ئەو شۆڕشە لە مێژووی كوردا شوێنێكی بایەخداری هەیە، چونكە بەهۆی ئەو شۆڕشە بە ڕابەرایەتی بارزانیی نەمر، ناوو دەنگی كورد لە جیهاندا بڵاوبۆوە، كورد ئەو پیلانە بە خەنجەرێك دادەنێ كە لە پشترا وێی كەوتووەو بەهۆیەوە گەورەترین شۆڕش توشی نسكۆ بووە، جێی خۆیەتی هەمیشە بزاڤی سیاسیی كورد بە هەموو بیروڕای جیاجیاوە، خوێندنەوەی قووڵیان بۆ ئەو ڕووداوە گەورەیە هەبێت.

شۆڕشی ئەیلوول ئەوەندە بەهێز ببوو تەنگی بە ڕژێمی بەعس هەڵچنی بوو، خەڵكی كوردستان بە ئیرادەیەكی بەهێزەوە خۆیان لە بەرامبەر شاڵاوی ڕۆژانەی باڵەفڕەكانی ڕژێمی بەعس ڕادەگرت و پشتیوانی شۆڕشیان دەكرد، جەماوەری كوردستان پاڵپشتی گەورەی شۆڕش بوو، نهێنی سەركەوتنی شۆڕش لێرەوەبوو، كە بارزانیی نەمر ئەو پشتیوانییەی خەڵكی كوردستانی بە هێزو توانای لەبن نەهاتوو بۆ شۆڕش دەزانی، ئەو یەكانگیرییەی خەڵك و پێشمەرگە بەڕابەرایەتی بارزانیی نەمر، سەنگەرێكی قایمی بەرامبەر بە شاڵاوەكانی ڕژێمی بەعس بۆ سەر كوردستان دروست كردبوو، بەغدا هەموو شێوازێكی گرتەبەر بۆ كپكردنەوەی دەنگی كورد، تەنانەت لە كاتی ئاشتیشدا بەدوای فڕوفێڵ و تەڵەكەبازیدا دەگەڕا، لە ماوەی ئاشتیدا(١٩٧٠-١٩٧٤) هەوڵی دا دەست لە سەردەكان بوەشێنێ، ئەوەبوو لە بەغدا هەوڵی

تیرۆرکردنــی ئیــدریس بــارزانی دا و لــە کوردســتانیش لــە ڕێــی چــەند مەلایەکــەوە هــەوڵی تیرۆرکردنی بارزانیی نەمری دا

شۆڕشی کورد هەوڵی دەدا تا بکرێت بە ئاشتی چارەسەری کێشە بکریٚ، بۆیــە لەکاتێکـدا بەغدا بەدوای بیانوودا دەگەڕاو خەریکی فڕوفێـڵ بــوو و زەمینــەی بــۆ شــەڕ خــۆش دەکـرد، سەرکردایەتی بڕیاریدا وەفدێك بەسەرۆکایەتی ئیدریس بارزانی ڕەوانــەی بەغــدا بکــات، ڕۆژی ٨ی ئاداری ١٩٧٤ سەدام حسێن پەردەی لەسەر نیەت خراپی خۆی بەرامبەر بە کوردو شۆڕشە ڕەواکەی هەڵماڵی و بە ئیــدریس بــارزانی وت: " ئەگــەر ناچــاربین دەســت لــە شــەتلعەرەب هەڵبگرین بۆ ئێران تاوەکو عێراقمان لەدەست نەچیٚ، هیچ دوودڵی ناکەین"(١) ئەم قســەیەی سەدام دۆخێکی نوێی هێنایەکایە، سەرکردایەتی شۆڕش هەستی بەوەکردبوو بەغــدا چــۆن بــیر دەکاتەوە، هەربۆیە ئەو وەفدەی بەسەرۆکایەتی ئیدریس بارزانی ڕەوانەی بەغداکردو سەدامیش غرور گرتبووی و پەیمانی دۆستایەتی ١٩٧٢ لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت بە ئاراستەیەکی دیکــەدا برد، ئەوەبوو تاکلایەنە بەیانێکی ئۆتۆنۆمیی بڵاوکردەوەو دواتریش بڕیاری هەڵگیرســاندنەوەی شــەڕی بەســەر کوردســتاندا ســەپاند. بــەم شــێوەیە لــە ئــەنجامی ئــەو شــەڕەدا لــە مــاوەی ١٩٧٤/٣/١١ تا ١٩٧٥/٣/١١ زیانی پێشمەرگەو خەڵکی سڤیل(مەدەنی) بــەم جــۆرە بــوو، زیانی پێشمەرگە ١٥٣٥ شەهیدو ٢٣٦٠ بریندار، زیــانی خــەڵکی مــەدەنی ١٤٩٣ شــەهیدو ١٩٥٢ بریندارو ٧٤١ گوند کەوتنە بەر بۆمبابــاران و ٤٣٩٩ هێرشــی ئاســمانی کرایــە ســەر کوردستان، زیانی گیانی و ماڵیی هێزەکانی حکوومەتی بەغدا لــە مــاوەی ١٩٧٤/٣/١١ تــا ١٩٧٥/٣/١١ بــەم شــێوەیە بــوو: ١١٦٨٠ کــوژراوو ١٨٢٧٠ برینــدارو ٢٣٠دیــل و ٢٣٤٦ کەسیش تەسلیم بوون و پەیوەندیانکرد و، زیانی ماڵی حکوومەتی بەعس ئەمەبوو:٢٩٦ تانك و سەربازگوێزەرەوەو ٩٦ تۆپی قورس و ٥٧٧ ئۆتــۆمبێلی ســەربازی تێکشــکان و ٣٩ باڵــەفڕ خرانە خوارەوە(٢) ، هەڵگیرساندنەوەی شەڕ بڕیاری ســەدام بــوو، لــەو بڕوایــەدابوو بــە شــەڕو سوپای دەوڵەت دەتوانیٚ کۆتایی بە دۆزی کورد بهێنیٚ، دواتر بۆی دەرکەوت کە نــاتوانیٚ ئــەو خەونەی لەڕێگەی سەپاندنی شەڕ بەسەر کوردستاندا بۆ بێتەدی، پــەنای بــۆ ئــەوەبرد (واز لــە خاك و ئاوی عێراق بێنیٚ بۆ ئێران، بۆ ئەوەی کۆتــایی بــە شۆڕشــی کــورد بــێنیٚ) (٣)، ئــەو ئاواتەشی لەڕێی ڕێککەوتننامەی جەزائیرەوە لە ١٩٧٥ هاتەدی.

ڕێککەوتننامــەی جــەزائیر کــە بــە میــانگیری هــەواری بومــدیانی ســەرۆکی جــەزائیرو بەسەرپەرشتی ڕاستەوخۆی ئەمەریکا لە نێوان سەدام حسێن (کــە ئــەوکات جێگــری ســەرۆك

کۆماری عێراق بوو) و محەمەد ڕەزا پەهلەویی شای ئێران ئیمزاکرا، لەبەر ئەوەی ئەو ڕێککەوتنە هیچ سوودێکی بۆ گەلانی ئێراق نەبوو، بەڵکو بڕیاری تاکڕەوانەی بەغداو مەیلی شۆڤێنییانەی ناسیونالیزمی عەرەب بوو لە عێراق، چونکە ڕژێمی بەعسیان بە بەرهەمی ناسیونالیستانی عەرەب دادەنا، هەر بۆیە سەدام چەند جارێك بەم شێوەیە پاساوی بۆ ئەو ڕێککەوتنە هێناوەتەوە: "ئەگەر پەنا بۆ ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی جەزائیر نەبردرابا، ئەوا دەسەڵات کۆتایی پێدەهات، ئەو ئاستەنگانەی ڕووبەڕووی هەوڵی سوپا بوونەوە بۆ کوژاندنەوەی شۆڕشی کورد، وای کرد لەپێناوی زاڵبوون بەسەر شۆڕشی کورددا تەنازول لە دووبارە دانانەوەی سنوور بۆ ئێران بکرێت" (٤)

لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانەوە دەوڵەتی عێراق، میراتی ناکۆکیی لەسەر سنوور بەتایبەتیش سنووری ئاوی لەگەڵ ئێران، لە دەوڵەتی عوسمانییەوە بۆ بەجێماوە، بۆیە چەندین جار هەردوولا لەیەکتر پەشیمان بوونەتەوە، بۆ نموونە ڕێککەوتنی **١٩١٣** ئێران لە بەرژەوەندی خۆی زانیوە، کەچی عێراق لەسایەی ئینگلیز ئەمەی وەلا ناوەو ڕێککەوتنی **١٩٣٧**ی پەسند کردووە، ساڵی **١٩٦٩** عێراق ئێرانی ئاگادار کردۆتەوە کە شەتی عەرەب بەتەواوی ئاوی عێراقە، ساڵی **١٩٧٥** لەپێناوی دامرکاندنەوەی شۆڕشی کورد، عێراق تەنازولی لە ئاوی شەتلعەرب بۆ ئێران کرد لەبری ئەوەی ئێران واز لە یارمەتیدانی شۆڕشی کورد بێنێ (٥). حکوومەتێك کە لەڕێی کودەتای سەربازییەوە دەسەڵاتی وەرگرتبوو، لە پێناو توندکردنی کورسیی دەسەڵاتی تاکڕەوی و ملنەدان بۆ داوای ڕەوای گەلی کورد، تەنازولی لە ئاوی عێراق کرد. ئایا حکوومەتی بەعس کە بەناوی ناسیونالیزمی عەرەبییەوە قسەی دەکردو بڕیاری دەدا، پاش ئەوەی لە دوای ڕێککەوتنی جەزائیر **١٩٧٥** بەرنامەی کاولکاری لە کوردستان جێبەجێ کردو کورد ئاوارەو دەربەدەربوو، چی بەسەر عێراقدا هێنا، ئەگەرچی ناسیونالیستانی عەرەب لەو کردەوەیە بێدەنگ بوون، بەڵام لای هەندێ لە نووسەرو ڕووناکبیرانی عەرەب، ئەو تەنازولە قبولێ نییەو بەدەست درێژی بۆ سەر سەروەری و ئایندەی عێراقی دادەنێن و بە زیانێکی زۆرو خیانەتێکی گەورەی نیشتمانیی دادەنێن و پێیان وایە نابێ لەژێر هەر بیانوویەکدابێ پاساو بۆ ئەو ڕێککەوتنە عەیبدارە بهێندرێتەوە، لێ سەدام مەبەستی ئەوە بوو بۆ کۆتایی هێنان بە شۆڕشی کورد هەڵوێستی شای ئێران بەلای خۆیدا بشکێنێتەوە، دواتر دەرفەتی بۆ ڕەخسا بۆ ئەوەی گەلی کورد لەناو ببات (٦) ، ئەگەرچی ئەم ڕێککەوتنە زیانی لە

کورد داو شۆڕشی توشی نسکۆ کرد، بەڵام زیانی گەورەی بەگەلانی عێراق گەیاند. ئەوەتا ڕێکەوتنی جەزائیر کە بەرهەمی ناسیونالیزمی عەرەبییە ئەمڕۆ چۆن یەخەی عێراقی گرتووە، هەموو ئەو ڕووبارو لق و زێیانەی بەدرێژایی سنوور کە دەڕژێنە رووباری دیجلە لە لایەن ئێرانەوە دەگیرێنەوەو هەندێ سەرچاوە ژمارەی ئەو ڕووبارانە بە ٤٢ ڕووبار دادەنێن(٧) ، کە ئاماژە بە رووداوەکانی ئێستا دەکەین نابێ شەڕی ٨ساڵەی عێراق لەبیر بکەین، کە ئەنجامەکەی لەوەوە هات سەدام ڕێککەوتنی جەزائیری هەڵوەشاندەوەو لە ١٩٨٠ تا١٩٨٨ شەڕی عێراق – ئێران هەڵگیرسا و بەسەدان هەزارکەس لە هەردوولا بوونە قوربانی و زیانی زۆری بە ژێرخانی ئابووری گەیاند، شای ئێران تەنازولی عێراقی بە دەسکەوتێکی گەورە بۆخۆی دەزانی، لە ڕاستیشدا هەروابوو، چونکە ئەوەی تاران لەسەردەمی قەومییەکانی عەرەب دەستی کەوت، بەدرێژایی سەردەمی پاشایەتی عێراق ئێران خەونی پێوە دەدیت و بۆی ڕێك نەدەکەوت، ئێراق لە سەردەمس پاشایەتیدا لەساڵی ١٩٣٧ بەپێی بەرژەوەندی خۆی ڕێککەوت و ڕێککەوتنی ١٩١٣ ی بەلاوەنا، کەچی سەدام کە هەمیشە وەك پاڵەوانی قەومییەکانی عەرەب خۆی ناساندووە، بەئاسانی لە ١٩٧٥ بۆ دژایەتی کردنی کورد، تەنازولی بۆ شای ئێران کرد.

لایەنەکەی دیکەی ڕێکەوتنی جەزائیر کە شای ئێران بوو، ئەویش پشتکردنی لە کورد بە بەرژەوەندی بۆ گەلانی ئێران لەقەڵەمدا، کەچی ئەو ئیمزایەی ١٩٧٥، ئێرانی لە سەرەڕۆیی و تاکڕەویی سەدام ڕزگار نەکردو بەهۆی شەڕی هەشت ساڵە لە١٩٨٠ تا ١٩٨٨ زیانی زۆری بەرکەوت، کەچی شای ئێران کە ڕۆژی ١١ی ئاداری ١٩٧٥ پێشوازیی لە بارزانیی نەمر کرد پێی وت: " من ناچاربووم ئەم ڕێککەوتنە لەگەڵ بەعسییەکاندا بکەم، نەمکردایە دەکەوتمە گێروگرفتی شەڕێکی بەربڵاو لەگەڵ بەعسییە عێراقییەکان کە سۆڤیەتییەکان هەموو قورسایی خۆیان دەخستە شەڕەکەوە، ئەنجا ڕێککەوتنەکە لە سەرێکی تریشەوە، بەتەواوی لەبەرژەوەندی گەلی ئێرانە وەك چۆن ئێوە لە بەرژەوەندیی خۆتاندا ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ تان کرد، تا ئاخری مانگی ئادار مۆڵەتتانە، لەم ماوەیەدا سنوور کراوەتەوە بۆ هەرکەس بیەوێ بمێنێتەوە، کە ماوەی مۆڵەتەکە تەواو بوو ئیتر سنوور دادەخەین" (٨) ئەم قسانەی شای ئێران وەك سەرچاوەی ئاگادار لە بارودۆخی ئەوکات باسی لێوە دەکات، لە لایەك ڕاگەیاندنی ڕێککەوتنەکە بووە بە بارزانی و لە لایەکی دیکەشەوە، ئەوەی وەبیر بارزانی هێناوەتەوە کە

بۆچی شۆڕشی کورد لە ساڵی ١٩٧٠ ڕێککەوتنی لەگەڵ بەغدا کـردووە(٩) ، بـە وردبوونـەوە لەو ڕێککەوتنە ئەو دەردەکەوێ کە قورسایی ڕێککەوتنی هێـزە ئیقلیمـی و نێودەوڵەتییـەکان چەند بووە، ئەوەش دەردەکەوێ کە ئەگەرچی ئێران دەروازەی شۆڕش بووە، بەڵام بۆ گەیشتن بە مافی کـورد، بـارزانی پشـتی لـە دەرفـەتی ئاشـتی و زمـانی گفتوگـۆ نـەکردووە، هەربۆیـە ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ی لەگەڵ حکوومەتی بەغدا ئیمزا کردووە، بەمەش شۆڕشـی ئەیلوول بەسەرۆکایەتی مسـتەفا بـارزانی، ڕێگـەی بـە شـای ئێـران نـەداوە دەسـتوەرداتە بڕیارەکانی شۆڕش، هەربۆیە شا مەسەلەی ئیمزاکردنی ڕێککەوتنی ١١ی ئـاداری ١٩٧٠ی وەبیر بارزانیی نەمر هێناوەتەوە.

ڕۆژگار دەریخست بارزانیی نەمر چەند بە حەکیمی مامەڵەی لەگەڵ ئەو دۆخـە نالـەبارو هەستیارەی ئەوێ ڕۆژێی کورد کردووە، ئەگەر خوێندنەوەی ورد بۆ هەلومەرجەکە نەبوایـە، ئەوا بۆی هەبوو کارەساتی جینۆسایدکردنی کورد کە زیاتر لەهەشتاکان گەیشتە ئەوپـەڕی، ئـەوا وەپێشـتر دەکـەوت، هەرچـەندە ڕژێمـی بـەعس دوای ١٩٧٥ دەسـتی بـە پرۆسـەی لەناوبردنی کورد کردو سەرەتا دەستی بـە ڕاگواسـتنی ناوچـە سـنوورییەکان کـرد، ئینجـا بەرنامەکانی دیکەی پرۆسەی لەناوبردنی کورد دەستی پێکرد، بەڵام هەر زوو بـە ڕێنمـایی بارزانیی نەمر، ئەگەرچی ئەوکات تەمەنی گەیشـتبووە سـەرووی ٧٠ سـاڵی و نەخۆشـیش سەربار، کەچی زوو ئیدریس بارزانی هەمیشە لەیادو سەرۆك مسعود بارزانی بە ڕێنمایی و تەوجیهاتـەکانی بـارزانیی نـەمر بەرنامـەی هەڵسـانەوەو خۆڕێکخسـتنەوەیان داڕشـتەوەو جـارێکی دی ئومێـد بـۆ خـەڵکی کوردسـتان گەڕایـەوەو سـەنگەرەکانی کوردایـەتی ئاوەدانکرانەوەو فوو بە ژیلەمۆی شۆڕشی مەزنی ئەیلوولدا کرایەوەو پشکۆکان گەشـانەوەو شۆڕشی گوڵان بانگی تێهەڵچوونەوەی دا.

سەیرە لەم سەردەمەدا مـالیکی سـەرۆك وەزیـری عێـراق بڵـێ هـەرێم بـە چـەند دەوڵەتێك دەورەدراوەو نابێ کورد چاو لە باشووری سودان بکات، ئـەم قسـەیە ئەگـەر لەڕووی جوگرافییەوە ڕاستیی تێدابێت، بەڵام لەلایەکی دیکەوە، لەسـەروبەندی یـادی ڕێکەوتنی جەزائیری ١٩٧٥ ئەو قسەیە مانای ئەوە دەگەیـەنێ کـە بەغـدای ئێسـتای ئامادەیی ئەوەی تێدابێ سەودایەکی لە تەرزی جەزائیر دووبارە بکاتـەوە، لـە کاتێـدا پێویست بوو بەغدای ئێستا بە هیچ شێوەیەك بەلای ئـەو جـۆرە بەرنامانـەدا نەچـێ، چونکە دوای ئەوەی گەلەکۆمەکییەکی گەورە لە کورد کرا لەناو نەچـوو و ئـەوەتا لـەم

سەردەمەدا لە قۆناغێکی گرنگ دایەو یاریکەرێکی گرنگ و سەرەکییەلە پرۆسەی سیاسی عێراقدا، کەچی ئێستاشی لەگەڵدا بێت عێراق بە ئاگری ئەو ڕێککەوتنەوە دەسوتێت و هەمیشە مایەی ناکۆکی وئاڵۆزییە لە ناوچەکەداو گەلانی ناوچەکە لێی دەترسن، چونکە ڕێککەوتنێك بووە لەنێوان دوو دیکتاتۆری ناوچەکە(سەدام و شای ئێران) و بەڵام مۆتەکەیەك بووە بۆ گەلانی ناوچەکە، دەی کێ دەیەوێ بەڵایە بەڵایە بەسەر ناوچەکەدا بێنێ پێویستە ئاوڕێك لە دوێنێ بداتەوە.

**پەراوێزو سەرچاوە:**

١-مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کورد، شۆڕشی ئەیلوول ١٩٦١-١٩٧٥ ، بەرگی سێیەم، بەشی دووەم، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە- هەولێر،٢٠٠٤، ل ١٦٧ .

٢-بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی وردەکاری بەرەکانی شەڕو زیانی گیانی وماڵی شۆڕش و حکوومەتی بەعس لە ماوەی ساڵێکدا، بڕوانە هەمان سەرچاوە، ل٤١٨-٤٢٨.

٣-عدنان فارس،اتفاقیه الجزائر ١٩٧٥ خیانه وگنیه، الحوار المتمدن،٢٠/٧/.٢٠٠٥

٤-اتفاقیه الجزائر.. خسائر عراقیه معلنه و اخرى خفیه، تقریر رامی الجنابی، بڕوانە:
http://www.al-raeed.net/news/preview.php?id=٢٤٥٤

٥-اتفاقیه الجزائر بین العراق وایران سنه ١٩٧٥ بڕوانە:
http://lalipost.almountadaalarabi.com/t٦٦٧-topic

٦-زهیر کاظم عبود، هل تنسجم اتفاقیه الجزائر مع القانون الدولی؟، مجله الصوت الاخر العدد١٩٢.

٧-مصگفی محمد غریب، اتفاقیه الجزائر ١٩٧٥ اجاعت حقوق العراق، بڕوانە:
http://www.shafaaq.com/sh٢/articles/general-essays/٦٤٨٥---١٩٧٥---.html

٨-مسعود بارزانی، هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٧١ .

٩-هەمان سەرچاوەو لاپەڕە

٢٠١٢/٣/٦

# ٦٨٨ .. بڕیارێکی نێودەوڵەتی
# بۆ پاراستنی کورد و پەیامێك بۆ بەغدا

٥ ی نیسانی ١٩٩١ ڕۆژێکی گرینگە لە مێژووی کوردستان بە تایبەتی و جیهان بەگشتی، چونکە لەو ڕۆژەدا، هێشتا کورد بە شاخ و کێوەکانی کوردستانەوە بوو، پێنجەمین ڕۆژبوو لە کۆڕەوێکی ملیۆنیدا، وەك ریفراندۆمێك، ژیانی لە سایەی دەسەلاتی حکوومەتی بەعس ڕەت کردبۆوە، ئا لەو ڕۆژەدا (٥/٤/١٩٩١) ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ٦٨٨ ی دەرکرد.

## هێزە گەورەکانی جیهان وەدەنگ هاتن

گرینگی ئەو بڕیارە بۆ کورد لەوەدابوو کە دەرگایەکی تازەی لێکرایەوە، لەسایەی ئەو بڕیارە نێودەوڵەتییە، ئاهێکی وەبەر هاتەوە، هەم بۆ دەربازبوون لەو مەینەتی و مەرگەساتییەی دووچاری هاتبوو، هەم ڕێگەیەکی دیکەی لەبەردەمدا کرایەوە، کە بکەوێتەخۆو لەسایەی دۆخی نوێدا تێهەڵچێتەوەو برەو بەخەباتی سیاسی و دیپلۆماسی و سەربازی بداتەوە، چونکە بڕیاری ٦٨٨ لە دوای پەیمانی سیڤری ساڵی ١٩٢٠ ، دووەم دەرەتانی نێودەوڵەتی بوو بۆ کورد، دەکرێ گرینگیی ئەو بڕیارە بۆ جیهان لەوەدا ببینین کە هاتنەدەنگی جیهان بوو بۆ بەهاناوەچوونی گەلێکی لێقەوماو، کۆڕەوی ملیۆنیی کورد، دوای زەمەنێکی دوورودرێژی چەوساندنەوە بووو ڕەتکردنەوەی واقیعێکی داسەپاوبوو بەسەر کورددا، کە لە ڕاستیدا ئەو واقیعە زادەی دارشتنی نەخشەی سیاسیی جیهان بوو لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانیداو، بێ دەنگی هێزە بڕیاربەدەستەکانی جیهان بوو لە ئاست ئەو کارەساتانەی بەسەر کورددا دەهاتن، ئیدی بڕیاری ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، پێی

ڕاگەیاندین دیارە جیهان لە ئاست ئەو کارەساتەی بەسەر کورددا هاتووە، تــەریق دەبێتــەوە، ئەگەرچــی هەمیشە بەرژەوەندی ئاراستەی سیاسی دەجولێنێ، لێ بێ دەنگ بوون لە بەرامبەر ئەوەی لــە ١٩٩١ بەسەر کورددا هات شەرمەزاری بوو.

## قۆناغەکانی بڕیاری ٦٨٨

کۆڕەو دوا بڕیاری کورد بوو، لەوە زیاتر هیچ ڕێگەیەکی دیکەی شك نەبرد، چۆڵ کردنی شــارەکانی کوردستان و ڕووکردنە سنوورەکان، کارەساتێکی مرۆیی گەورەی بەدوای خۆیدا هێنا، تەنانەت ئێــران و تورکیاش ترسیان لەو کارەساتە هەبوو، بۆیە لەدوای فەرەنسا ئەوانیش وەدەنــگ هــاتن، دەنگدانــەوەی کۆڕەوی ملیۆنیی کورد لە جیهاندا، لە پەنای یەکەم دەستپێشــخەری بــۆ دەرکردنــی ئــەو بڕیــارە کــە فەرەنسابوو و لە ١٩٩١/٤/٢ دا نامەیەکی ئاراستەی نەتەوە یەکگرتووەکان کــرد، هــەروەها کۆمــاری ئیســلامی ئێــران لــە ١٩٩١/٤/٣ و تورکیــاش لــە لــە ١٩٩١/٤/٤ نامــەیان ئاراســتەی نەتــەوە یەکگرتووەکان کرد، ئەم دەستپێشخەری و داواکارییەی هەرسێ دەوڵــەت، بەتایبــەتیش فەرەنســا کــە یەکێکە لە پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، زەمینەیەکی باشــی بــۆ دەرکردنی بڕیاری ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی خــۆش کــرد، ئــەوەبوو لــە ١٩٩١/٤/٥ بڕیاری ژمارە ٦٨٨ ی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی دەرچوو.

## ناوچەیەکی ئارام لە سەرووی هێڵی ٣٦

دیاری کردنی سەرووی هێڵی ٣٦ وەك ناوچەیەکی ئارام، بۆ ڕۆژانی کۆڕەوی ملیۆنیی کــورد بــەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا دەگەڕێتەوە، گرینگترین پشتیوانیش بۆ دانانی ناوچەی ئارام بڕیــاری ٦٨٨ بوو، کە تێیدا داوای ڕاگرتنی چەوساندنەوەی کورد دەکات، ئــەم بڕیــارەش لــە کاتێکــدا دەرچــوو کــە ژمارەیەکی یەکجار زۆری ئــاوارە، مــاڵ و حاڵیــان بــەجێ هێشــتبوو و ڕوویــان لــە ناوچــە ســنوورییە سەختەکان کردبوو.

دوای دەرچوونی ئەم بڕیارەو خۆڕاگریی پێشمەرگەی کوردســتان و وەســتاندنی هێرشــی ســوپای ئێراق بۆ سەر کوردستان، ئاوارەکانی دهۆك پێیان لەسەر ئەوە داگرت، کــە تــا ســوپای ئێــراق لــە ناوچەکەیاندا بێ، ئامادە نین بە هیچ شێوەیەك بگەڕێنەوە، ئەمەش بــووە هــۆی ئــەوەی هێزەکــانی

ئەمەریکاو چەند وڵاتێکی ئەورووپا بێنە ناو خاکی کوردستانەوە، هـاتنی ئـەو هێـزە بـەناوی دابـین کردنی  پرۆسەی ئارامەوە بوو، کە خۆی لە دەوروبەری ٢٥ هەزار سەرباز دەدا، هێزەکە بـەرە بـەرە گەیشتە قوڵایی ناوچەکە، سەرەتا ٣٠ کیلۆمەتر هاتـە نـاو خـاکی کوردسـتانی ئێراقـەوە، هێـزە نێودەوڵەتییەکە داوای لە سوپای ئێراق کرد بەتەواوی لە ناوچەکە بکشـێتەوە، بەغـدا بـەبێ هـیچ سەرپێچییەك هێزەکانی خۆی کشاندەوە، بەمەش هێزە نێودەوڵەتییەکـە، سـەرەتا ناوچـەیەکی بـە ١١٥ کیلۆمەتری و بەدرێژایی سنووری کوردستانی ئێراق و تورکیا بە قووڵایی ٥٠ کیلۆمـەتر وەك ناوچەیەکی ئارام بۆ ئەو خەڵکە پێکهێنا کە ماڵ و حاڵی خۆیان بەجێ هێشتبوو، بەم پێیە سـەرەتا دانانی ناوچەی ئارام لە دهۆکەوە دەستی پێکـرد، پاشـان ناوچـەکانی دیکەشـی لـە پارێزگاکـانی هەولێرو سلێمانی و کەرکووك گرتەوە، بەمەش ئاوارەکـان گەڕانـەوە شـوێنی خۆیـان و هێزەکـانی هاوپەیمانانیش دوای دڵنیابوون لە گەڕانەوەی ئاوارەکان گەڕانەوە تورکیا.

پاش ڕوودانی گرژی و پێکدادان لە نێوان کورد و هێزەکانی ئێراق، مەترسـیی دووبارەبوونـەوەی کارەسات، ئەمەریکاو چەند دەوڵەتێکی ئەورووپای هێنایە سەر ئەو باوەڕە، کە لە سـەر داوای جـۆن مێجەری سەرۆك وەزیرانـی پێشـووتری بـەریتانیا ڕازی بـن، هێـزی ئاسمـانی لـە تورکیـا بـەناوی (چەکوشی ئامادە)  بۆ پاراستنی کورد پێکەوە بنێن و (ئینجەرلیك) بکەنـە بنکـەی ئـەو هێـزەو، سەرووی هێڵی ٣٦ بکەنە ناوچەیەکی دژەفـڕینی هێـزە ئاسمانییـەکانی ئێـراق. لێـرەوە مەسـەلەی هێڵی ٣٦ و ناوچەی ئارام زیاتر کەوتـە سـەر زاران و، بـواریش بـۆ کـورد ڕەخسـا ئـەو بۆشـاییە ئیدارییەی بەغدا دروستی کردبوو، هەوڵی پڕکردنەوەی بدات و دامـەزراوەی شـەرعی دابمـەزرێنێ، مەسەلەی دامەزراوەی دەوڵەت لەکوردستان هێندە نامۆ نەبوو، چونکە سەرۆك بارزانی لـە ئـاداری ١٩٩١ لە کۆیە، بە جەماوەری ڕاپەڕیوی ڕاگەیاند کە پێویستە هەڵبژاردن بکرێ و دەوڵـەتی قـانون و دامەزراوە بێتەکایە.

## پەیامێك بۆ بەغدا

کـاتێ بڕیـاری ٦٨٨ ی ئەنجوومــەنی ئاسایشــی نێودەوڵــەتی دەرچـوو، پــەیامێکی کۆمەڵگــەی نێودەوڵەتی ئاراستەی بەغدا کرا، کـە نـابێ چـیدیکە کـورد بچەوسـێنێتەوە، میکـانیزمی ڕاگـرتنی هەڕەشەی بەغدا، دانانی ناوچەیەکی ئارام بوو لە سەرووی هێڵی پانیی ٣٦ بۆ ئەوەی ببێتــە نەوایــەکی ئارام. کەچی سەدام لەو ناوچە کوردستانییانەی کەوتنە دەرەوەی هێڵی ٣٦ بەردەوام بوو لــە ئــازاردانی کوردو بە عەرەبکردنی ئەو ناوچە کوردنشینانە، چونکە ناوچەکانی ســەرووی ٣٦ی لەدەســت چــووبوو، شالاوی بەعەرەب کردنی خێراتر کرد.

دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بــەعس و هاتنەکایــەی ئێراقــی نــوێ، دەســتوورێك بــە بەشـداری کــورد نووسراو، هەرێمی کوردستان وەك ئەمری واقیــع مایــەوە، ئــەو ناوچــە کوردیانــەی دەرەوەی ئیــدارەی هەرێمی کوردستان، لە دەستوور بە (ناوچەی ناکۆکی لەسەر) ناویـان هـات، مـاددەی ١٤٠ دەســتوور سێ قۆناغی چارەسەرکردنی ئەو ناوچەدابڕێندراوانەی دیاری کرد، کە بەردەوام حکومەتی بەغدا خـۆی لە جێبەجێ کردنی ئەو ماددە دەسـتوورییەدا دزیوەتــەوە، بەمــەش دەردەکــەوێ بەغــدای ســەردەمی بەعس و بەغدای ئێراقی نوێ، هەریەکەو بەجۆرێك دژایەتی هەرێمی کوردستانیان کردووە، هەریەکــەو بە چاوی سەردەمێك بەڵام بە یەك میکانیزم کە تەعریبە، کاریان بۆ هێشتنەوەی ناوچە دابڕێنـدراوەکان بە تەعریب کراوی و لە دەرەوەی ئیدارەی هەرێمی کوردستان کردووە، بەغدای هەردوو قۆنـاغ سـوپایان دژی ئەو ناوچانە بەکارهێناوە، هێشتا هەن لە بەغدا، ئەگـەر بۆیـان بلـوێ ئــەمڕۆ بــەر لــە ســبەینێ پەلاماری هەرێمی کوردستان دەدەن، ئەمەش ئەوەمان پێ دەڵێ کە هێشتا بەغـدا نەبۆتــە پایتــەختی ئێراقێکی نوێ، هەقە بەغدای ئێستا سەیری مێژوو بکات و بزانێ بەغدای دوێنێ چۆن چـۆنی ســەیری کوردی کردووەو لەو شێوە سەیرکردنەدا ئێراقی بــەرەو چ هەڵــدێرێکی هــەزار بەهــەزار بــردووە، دەبــێ بەغدای ئێستا بزانێ کوردو کۆمەڵگای نێودەوڵەتی بــە بەغــدای دوێنێیــان گــوت ئیــدی بەســە، لــەم قۆناغەشدا بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، ڕایگەیاند کە ئیـدی بەســەو جـارێکی دی دیکتاتۆریەت قبوڵ ناکەین، چونکە بەغدای ئەمڕۆ پشتی لە دەســتوورێك کـردووە، کــە زۆرینــەی خەڵکی ئێراق دەنگیـان پێـداوە، ئــەم پشــت کردنــە دەســتوورو مامەڵــەی چــەوت لەگــەڵ هــەرێمی کوردستان، وا لە ئینسان دەکات بپرسێ ئەرێ ئەوە بەغدای ئێستا دەیەوێ بە هــەوای بەغــدای جـاران لێبخوڕێ؟ سەیرە توبڵێی سەردەم ئەمە قبوڵ بکات؟!

٢٠١٢/٤/٥

# بەغدای حاجی محەمەدئەمین و

# بەغدای محەمەداوی

لەم چەند ڕۆژەی ڕابردوودا، شێخ عەباس محەمەداوی ئەمینداری گشتی ئیئتیلافی ڕۆڵە بەجەرگەکانی عێراق (ائتلاف ابناو العراق الغیاری)، زۆر بە توندی بەیاننامەیەکی دژی کورد دەرکردو، داوای کرد هەرچی کوردە لە ناوەڕاست و باشووری عێراقدا دەربکرێن.

ئەم داوایەی محەمەداوی نیگەرانییەکی زۆری لە لایەن کوردەوە لێکەوتەوە، بۆ بەهەند هەڵنەگرتنیشی، هەندێ کەس و لایەن(لە بەغدا) دەڵێن ئەمە ڕای تایبەتەو هیچ کاریگەرییەکی نییە، بەڵام بەشێکی ئەو بەهەند هەڵنەگرتنە بۆ(بەدەستی من نییە بەڵام بەدڵی منە) دەگەڕێتەوە، چونکە نەدەبوو هەر کورد لەو بۆچوونە ڕەگەزپەرستییە وەدەنگ بێ، بەڵکو دەبوو هەموو ئەو هێزو لایەن و کەسایەتیانەی، دەخوازن بەڕاستی عێراق عێراقێکی دیکەبێت، لە ئاست ئەو داوایەی محەمەداوی وەدەنگ هاتبان. ئەم ڕووداوە دەمانگێڕێتەوە ساڵی ١٩٤١ کاتێ لە بەغدا هێرش کرایە سەر جولەکەو ژمارەیەکی زۆریان لێ کوشتن و دەیان کۆگاو دوکان و ماڵ تالان کرا، هەر بەهۆی ئەو ڕووداوەشەوە، لەو ساڵەش ڕا وشەی فەرهود لە عێراقدا زیاتر بڵاوبۆوە، ئەوانەی بەو کارانە هەڵدەستان بە شەقامەکانی بەغداد دا دەسوڕانەوەو هاواریان دەکرد(فەرهود خۆشەو هەموو ڕۆژێك هەر فەرهود بێ)، ئەگەرچی لەو سەروبەندەدا قەومییەکانی عەرەب زەمینەیان بۆ ئەو جۆرە ڕووداوانە خۆش دەکرد، بەڵام نابێ دەوری حاجی محەمەدئەمین حوسێنی فەلەستین کە ئەوکات لەبەغدابوو لەبیر بکرێت، ئەو پیاوە لەو سەردەم کە گەرمەی جەنگی دووەمی جیهان بوو لەبەرەی ئەڵمان دابوو، بۆ برەودان بە ئاراستەی سیاسیی خۆی، لە خۆشکردنی ڕووداوی حوزەیرانی ١٩٤١دا دەوری کەم نەبوو، ئەوانەی بەشداری ئەو کوشتارو تالان و

بڕۆیەی ئەو ساڵەیان کرد سەربازو پۆلیسیشیان لەگەڵ دابوو، تەنانەت هەندێ سیاسەتمەداری ئەوکاتیش بەشداربوون و هەشیان بوو خۆی لێ لەگێلی دا.

ئەمڕۆش، لە سەدەی ٢١ دا، کە جیهان لەچاو چلەکانی سەدەی بیستدا زۆر گۆڕاوە، کەچی محەمەداوییەك، بە بەرچاوی هێزو لایەنی سیاسیی عێراقی نوێ، جاڕی دەرکردنی کورد لە بەغداو باشووری عێراق دەدات، ئەو کابرایە گلەیی لە کورد دەکات و پێی وایە هەستی عێراقی بوونیان لاوازەو، دەیەوێ لە هاوشێوەکانی محەمەداوی عێراقیتربن، ئەوانە چ جۆرە عێراقی بوونێکیان لە کورد دەوێ، مەگەر بەشداری کردنی کورد لە بنیاتنانی عێراقی نوێ دا بە عێراقی بوون دانانێن؟ نەخێر عێراقی بوونی کورد بەتێڕوانینی ئەوان دەبێ بە جۆرێك بێت کورد لەوان ماندووتر بێ و پلە دوو بێت. لە عێراقی نوێدا، قەومییەکانی عەرەب بەدوای دەرفەتی پاك کردنەوەی عێراق دا دەگەڕێن، پاککردنەوە لە غەیرە عەرەب، لە سەرەتای قۆناغی دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، لە شالاوێکی خێرادا مەسیحیەکان وەدەرنران، ئەمڕۆش لە ڕێی محەمەداویەوە جاڕی دەرکردنی کورد لە بەغداو شارەکانی دیکەی عێراق دەدرێ. هەق نییە ئەم مەسەلەیە هێندە بە سادەو ساکاری مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ و گوزەر بکات، لەبەر ئەوەی هێشتا بۆ مانۆڕو کات بەسەربردن سەیری گفتوگۆ دەکرێت، بۆیە هەر دەبێ چاوەڕێی محەمەداوییەکان بین، وەك چۆن لە بەغدای ١٩٤١ دا چاو لە کوشتوبڕ و تالان و فەرهود پۆشرا، ئەمڕۆش لە ژینگەی عێراقدا کار کردن بۆ دووبارەبوونەوەی ئەو ڕووداوانە ڕمێنی هەیە، ئەگەر وانەبێ خێرە محەمەداوی (لەم ئێراقە نوێیەدا) شیری لێ هەڵکێشاوە، بەغدا عەلی وەردی هەیەو محەمەداوییەکانیشی هەیە، بەڵام جێی داخە هەمیشە محەمەداوییەکان دەوریان هەبووەو گوێیان لێ گیراوە نەك عەلی وەردی، بۆیە هەمیشە بڕیاری بەغدا بەدرێژایی حکوومەتە یەك لەدوای یەکەکان، ئازاری بە کوردو پێکهاتەکانی دیکە گەیاندووەو عێراقیشی بردۆتەوە دواوەو لە کاروانی پێشکەوتن بەجێی هێشتووە، هەقە کورد ئەوە لەبیرنەکات، کە لە بەغدا قوتابخانەی هاوشێوەکانی محەمەداوی زۆرترن نەك قوتابخانەی وەردی، بۆیە بەغدا کەمتر ڕووی لە گفتوگۆیە، پێویستە ئاقڵمەندانی بەغدا بێزیان لەو بۆچوونە شۆفێنییە ببێتەوە، دەبێ بزانن، ئەو بانگەوازەی محەمەداوی وەك ئەوە وایە ئاگر دەپوشێ بەربێ.

٢٠١٢/٤/١١

# داستانی هەندرێن...

# تێکشکاندنی غروری عەسکەرو سەپاندنی گرتنەبەری ڕێگای ئاشتی و زمانی گفتوگۆ بەسەر بەغدا

لە ١٩٦٦/٥/١٢ دا لە داستانێکی کەم وێنەدا بە دروشمی کوردستان یان نەمان هێزی پێشمەرگەی شۆڕشی مەزنی ئەیلوول کە بە داستانی هەندرێن بەناوبانگە گورزێکی ئەوتۆیان لە سوپای ئەوکاتەی ڕژێمی بەغدا وەشاند، نەك هەر ئاستێکی بۆ غروری عەسکەر دانا، بەڵکو حکوومەتیشی ناچارکرد بۆ دەربازبوون لەو زۆنگاوەی تێیکەوتبوو بیر لە ڕێگەچارەی دیکە بکاتەوە، ئەوەبوو لە ئاکامدا گفتوگۆ لە نێوان حکوومەت و سەرکردایەتی شۆڕشی ئەیلوول دەستیپێکردو بە بەیانی٢٩ ی حوزەیران کۆتایی هات، بە ئاڕاستەی ئاساییکردنەوەی بارودۆخ و دوورخستنەوەی تارمایی شەڕ لە کوردستاندا. ئەوەی ئەو داستانە کەم وێنەیەی دروست کرد، کە تا کورد مابێت، هەر دەشمێنێ لەبیرناچێتەوەو هەقە وەك بابەتێك لە ئەکادیمیای سەربازی بخوێندرێ و ئەوانەشی لەو بوارە بڕوانامەی باڵا وەردەگرن بیکەنە تێزی نامەکانیان. ئەوەی ئەو داستانەی تۆمارکرد پێشمەرگەکانی کوردستان بوو بە هاوکاری ئەو هێزانەی ئەوکات لەگەڵ شۆڕشی ئەیلوول بوون. بۆیە هەقی خۆیەتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی کوردستان هەمیشە خۆی بەپێشمەرگە بزانێ و هەمیشە داکۆکی لە مانەوەی پێشمەرگە دەکات و بە سمبولی بەرخودانیان دادەنێ، چونکە پێشمەرگە ئەو هێزە ڕزگاریخوازە نیشتمانپەروەریە کە لە پێناوی ئازادیدا هەمیشە لە بەرخۆدان و ڕووبەڕوو بوونەوە دابووە، هەر لەسەر ئەو بنەمایەشە سەرۆك بارزانی هەمیشە دەڵێ: پێشمەرگە سمبولی بەرخودانە و پێشمەرگە بە بڕیاری هیچ دەوڵەت و حزب و کەسێك هەڵناوەشێتەوە، بەڵکو دووپات لەوە دەکاتەوە، ئەگەر پێشتر ئەرکی پێشمەرگە بەرگریکردن لە خاك و وڵات و بەدیهێنانی ئازادی بووە، ئەمڕۆ ئەرکی پێشمەرگە گۆڕاوە، واتە ئەمڕۆ پێشمەرگە بەرگری لەو دەسکەوتانە دەکات کە بە خوێنی شەهیدان و خەبات و بەرخودانی پێشمەرگە هاتوونەتەدی.

## نەخشەی خەونێك بۆ داگیركردنی

## بارەگای سەركردایەتی شۆڕش

غروری ڕژێمی بەغدا بەوە گەیشت نەخشەیەكی بەربلاو بۆ داگیركردنی كوردستان دابنێن، ئیدی ڕژێم لە ژێرناوی (توكلت علی الله) ئامادەكارییان بۆ جێبەجێكردنی ئەو نەخشەیە دارشت. وەزیری نوێی بەرگری لیوا ڕوكن عەبدولعەزیز عوقەیلی ئەم نەخشەیەی دانا. ئەم كابرایە پڕی دەروونی كینەبوو بەرامبەر بەگەلی كورد. بڕیار وابوو لە ١٥ ی نیسانی ١٩٦٦دا دەست بدرێتە جێبەجێكردنی ئەم نەخشەیە، بەلام بەهۆی بەربوونەوەی هەلیكۆپتەرێكەوە كە عەبدولسەلام عارفی سەرۆك كۆماری ئێراقی تێدابوو و مرد، ئەو وادەیە دواخرا بۆ ٢ی ئایاری ١٩٦٦ . عەبدولسەلام عارف بە باڵەفڕ كەوتبووە ڕێ بۆ باشووری ئێراق، بەلام باڵەفڕەكەی لە١٣ ی نیساندا كەوتەخوار، ئەویش و ژمارەیەك لە گەورە بەرپرسان لەو ڕووداوەدا سووتان.

## سووربوونی سوپا لەسەر جێبەجێكردنی نەخشەكە

مەرگی عەبدولسەلام بووە هۆی دەست لەكاركێشانەوەی وەزارەتی تاهیر یەحیاو هاتنەسەركاری وەزارەتێكی دیكە بەسەرۆكایەتی عەبدولڕەحمان بەزاز. ناكۆكی كەوتە نێوان وەزیرو بەرپرسەكان. لەسەرپلەی سەرۆك كۆمار بوو بە ناكۆكی لە نێوان بەزازو عەبدولعەزیز عوقەیلیدا. عەسكەرییەكان لە سەركردە فیرقەكان و ئەفسەرە گەورەكانی ئەنجوومەنی بەرگری دەیانویست عوقەیلی ببێ بە سەرۆك كۆمار، لە كاتێكدا مەدەنییەكان دەیانویست بەزاز بێت بەسەرۆك كۆمار. پاش ئەوەی عەبدولڕەحمان عارفی برای عەبدولسەلام بووە سەرۆك كۆمار، عوقەیلی دەست كێشانەوەی خۆی پێشكەش كردو لە وەزارەت دەرچوو. سەرلەنوێ داوا لە بەزاز كرایەوە كە وەزارەت پێكەوە بنێ و ئەویش لیوا ڕوكن شاكر مەحموود شوكری بۆ وەزارەتی بەرگری لەجیاتی عوقەیلی هەڵبژارد.

سەرۆك كۆماری نوێ دەیویست خۆی لە بەرەوڕوو بوونەوە بەشەڕ دووربگرێ، پیاوێكی بێ دەسەلات بوو، ڕایەكی جێگرتووی نەبوو و خاوەنی بڕیاری یەكجاری نەبوو. لە١٨ ی

نیسانی١٩٦٦ دا کۆنگرەیەکی ڕۆژنامەنووسی بەست و داوای لە کورد کرد کە یەکێتی وڵات بپارێزن، ڕۆژی٢٨ ی نیسان سەرۆك کۆمار بەڕێز زەید ئەحمەد عوسمانی ناردە لای بارزانیی نەمر بۆ گەڵاڵەو داوایلێکرد لەگەڵیدا بکەوێتە گفتوگۆ، بارزانیی نەمریش خۆشحاڵی خۆی بۆ ئەو داوایە دەردەبڕی، بەڵام ئەفسەرە گەورەکانی سوپا نارەزاییان لەم دەست پێشخەرییەی سەرۆك کۆمار دەربڕی و گوشاریان خستەسەری و داوای جێبەجێکردنی نەخشەی (توکلت علی الله) یان لێکرد کە کاتی خۆی پاشیان خستبوو.

## ئامادەکاری دوژمن بۆ داگیرکردنی

## بارەگاکانی سەرکردایەتی شۆڕش لە ناوچەی باڵەك

نەخشەی دوژمن لە چەندین کردەوەی سەربازیی بەربلاو و پڕ مەترسی گەورە بۆ سەر پاشەڕۆژی پێکهاتبوو ئامانجی ئەم نەخشەیە داگیرکردنی بارەگاکانی سەرکردایەتی شۆڕش بوو لە ناوچەی سەختی باڵەك و پاشان کەرتکردنی کوردستانی ئازادکراو بۆ دووکەرت و بڕینی پەیوەندی هەردوو کەرتەکە بەیەکەوە، لەبەرئەوەی کە هەردوو چیای هەندرێن و زۆزك بەسەر دەروازەی ڕێگەی هاملتۆندا دەڕوانن کە ناوچەی باڵەك دەبڕێ، هێزەکانی حکوومەتی بەغدا قورسایی هێرشەکانی خۆیانیان خستەسەر ئەم دووچیایە.

## ئەو هێزو توانایەی

## دوژمن بۆ پەلاماردان تەرخانی کردبوو

١- لیوای١ و لیوای٢ و٣و٤و٥و١٤و١٥ کە نزیکەی ١٥ هەزار چەکداری خێڵەکیش یارمەتیان بدەن.

٢- هەردوو بنکەی ئاسمانیی کەرکوك و مووسڵ کە خاوەنی دوو پۆل باڵەفڕی مێك و دوو پۆل باڵەفڕی هۆکەر هەنتەر و هەشت بۆمبا هاوێژی ئیلیووشن و شەش بۆمبا هاوێژی باجەر

تۆپۆلیف ١٦ بوون.

٣-پێنج کەتیبەی تۆپخانە : کەتیبەیەکی تۆپخانەی ئەندازە ١٢٢ ملمی کەوان و، کەتیبەیەکی تۆپخانەی مەیدانی ١٢٠ ملم و کەتیبەیەکی تۆپخانەی چیایی ئەندازە ٢٥ ڕەتڵ، کەتیبەیەکی تۆپخانەی ئەندازە ٧٥ملم و کەتیبەیەکی تۆپخانەی٤,٢٠ ملم و، شەش تۆپی ئەندازە پێنج پێنج گرێ.

سەرکردایەتی شۆڕش زانیاریی وردی لاهەبوو کەوا حکوومەتی بەغدا نیازی وایە لە یەککاتدا هێرش بکاتە سەر هەردوو ناوچەی بارزان و باڵەك، لەگەڵ ئەمەشدا گومان وابوو بەهۆی مردنی عەبدولسەلام عارف و نیازی گفتوگۆ کردنەوە وازی لە جێبەجێ کردنی نەخشەکە هێناوە.

## دەستپێکردنی هێرشی دوژمن

شەوی ٢لەسەر ٣ی ئایاری ١٩٦٦ هێرش بەم جۆرەی خوارەوە دەستیپێکرد :

١- لیوای ٤ پێشکەوت بۆ دەست گرتن بەسەر چیای هەندرێن و لیوای١ بەکشان بۆ سەر بنە کاول و دۆڵی ئاکۆیان یارمەتیی دەدا.

٢-لیوای ٣ بە یارمەتی لیوای١٤ بەرەو زۆزك پێشکەوت.

٣- بەشی زۆری جاش لە هێرش بۆ سەر زۆزك بەشدار بوون.

لیواکانی دیکەش دانرابوون بۆ تەنگانە، چونکە وا چاوەڕوان دەکرا شەڕ بەردەوام دەبێ و گەرمیش دەبێ. تۆپخانەو باڵەفڕ کوورەی ئاگریان بەسەر پێشمەرگە دادەڕشت لەبەرەی دۆڵی ئاکۆیان و زۆزکدا شوێنی خۆیان بۆ داکۆکی و بەرگری گرتبوو، هێرشی دوژمن شکستێکی پیسی تووش هات. بەڵام لە چیای هەندرێن دوژمن هیچ بەرگرییەکی ئەوتۆی لە کاتی بەسەرکەوتنیدا لە ڕێی خۆیدا نەدی و چەند شوێنێکی گرنگی لە نزیکی لووتکەی چیاکەوە داگیر کرد. ورەی بەوە گڕی گرت و گۆڕانێکی گەورە بە سوودی حکوومەت بەسەر بارودۆخەکەدا هات کە توانیویانە نیوەی نەخشەکەیان جێبەجێ بکەن کە یەکەم هەنگاویان بریتی بوو لە دەستگرتن بەسەر هەردوو چیای هەندرێن و زۆزکدا تا داگیرکردنی دەرگەڵەو بەر سیرینیشی بەناچاری لە دوادا بێت، لە هەنگاوی دووەمیشدا گەلاڵە دەگیرێت و لە سێیەمیشدا

هێزەکان هەموو بەجارێ بەرەو حاجی ئۆمەران دەکشێن بەنیازی داگیرکردنی. سەعید حەمۆ فەرماندەی لیوای ٥ کە هەوای سەرکەوتن لە کەللەی دابوو، بە پەراوێزی ئەم بەرەو پێشچوونەی هێزەکانییەوە گوتی : ریشم بەردەدەمەوە و نایتاشم تا دەگەمە گەلاڵە، فەرمانده‌کانی حکوومەت بەو شێوەیە دڵنیابوون لەوەی کە سەردەکەون.

## برووسکەیەك لە هێزی باڵەکەوە

رۆژی ٢ی ئایار برووسکەیەك لە هێزی باڵەکەوە بۆ بارزانیی نەمر هات، وای دەگەیاند کەوا پێشکەوتنە بەربڵاوە گەورەکەی دوژمن لە بەرەی شەڕدا دەستیپێکردووە و سوپا چیای هەندرێنی گرتووە. بارزانی هەر کە لەم بروسکەیە ئاگادار بوو فەرمانی بۆ ئیدریس بارزانی دەرکرد بە پەلە بەرەو بەرەی شەڕ بکەوێتە ڕێ و دۆخەکە بەسەر بکاتەوەو پاشان لە دۆخەکە ئاگاداری بکاتەوە، فەرمانێکی تەواویشی بۆ سەرکردەکانی بەرەی شەڕ دایێ، کە دەبێ بەهەر نرخێ بێ نەهێڵن دوژمن هیچ پێششکەوتنێکی دیکە بەدەست بهێنێ.

## ئیدریس بارزانی لە بەرەی شەڕدا..
## پەیمان درا دوژمن ببەزێنن

بە گەیشتنی ئیدریس بارزانی بۆ بەرەی شەڕ، کۆبوونەوەیەك بۆ هەموو سەرکردەکان سازکراو بڕیارێك درا کە هەر چەندی قوربانیدانی بوێ دەبێ پێشکەوتنی دوژمن راوەستێنرێ. ئەوانەی لەو کۆبوونەوەیەدا بوون برووسکەیەکیان بۆ بارزانی لێدا پەیمانیان دایێ کە خۆیان رادەگرن و سوورن دوژمن ببەزێنن لە برووسکەکەدا ئامادەبووانی کۆبوونەوە بە بارزانیان راگەیاندبوو : ئێمە ئەرکی ئەوەت نادەینەبەر بۆ خۆت تەشریف بهێنی و بۆخۆمان کارەکە رادەپەڕێنین.
ئەرکی گەورە لە داکۆکیردن لە هەندرێن لە ئەستۆی هێزی حزبی شیوعیدا بوو.

## ٧٩هێرشی ئاسمانی له ڕۆژێك دا..

## شەڕی گەوره له زۆزك و گەرووی عومەر ئاغا

له بەردەوامی ئەو قارەمانیەتیەی پێشمەرگەدا، شەڕی گەوره له سبەینێی رۆژی ٣ی ئایاردا له زۆزك و گەرووی عومەر ئاغادا روویدا، لەو رۆژەدا ژمارەی هێرش و هەڵفڕینی ئاسمانی بەسەر بەرەی شەڕدا گەیشته ٧٩ جار هێرشی ئاسمانی، بەپێی نەخشەی دوژمن دەبوو ئەم دوو شوێنه داگیر بکرێن بۆ ئەوەی هەنگاوی یەکەمی نەخشەکه جێبەجێ بکرێ.

رۆژی شەشەم شەڕێکی گەوره بەنیازی داگیرکردنی زۆزك گەرووی عومەر ئاغا روویدا. دوو لیوا به پشتیوانی بۆمباران و تۆپباران پێشڕەیان کرد. لەم شەڕەدا ژمارەیەك سەرکردەی قارەمان شەهیدبوون که بریتیبوون له یونس بیرێژی و ناجی بیرۆخی و ئەحمەد حاجی محەمەد و میخائیل، ئیدریس بارزانی برووسکەیەکی بۆ بارزانی ناردو له بارودۆخی بەرەی شەڕ ئاگاداری کردەوه، بارزانی بۆخۆی به پەله بەرەو بەرەی شەڕ چوو.

### بارزانیی نەمر

### رۆژێك پێش تۆمارکردنی داستانی هەندرێن

### لەگەڵ سەرکردەکان کۆبووەوه

رۆژی١١ ی ئایار بارزانی لەگەڵ سەرکردەکانی بەرەدا کۆبووەوه بۆ لێکۆڵینەوه له بارودۆخەکەدا. هەموو دڵنیابوون له سەرکەوتن سەعات چواری پاش نیوەڕۆی رۆژی پاشتر سەعاتی سفر بوو. به گولله تۆپی هاوەنی ٨١ ملم و ١٢٠ ملم و تۆپی چیایی ٢٥ رەتڵ، رێگه بۆ هێرشەکه خۆشکرا، پاشان هەڵمەتێکی بەربڵاویان برده سەر دوژمن، له نیو سەعاتی یەکەمدا سەرکەوتنی پێشمەرگه ئاشکرا بوو. دوای سەعاتێك بارەگای دوو فەوجی لیوای٤ و بارەگای پێشینی گیرا و دوژمن هەڵات و ٢ باتریی تۆپخانەی ئەندازه ٧٥ ملم و ٤,٢٠ ملمی له دوای خۆیەوه بەجێ هێشت و کەوتنه دەستی پێشمەرگه، سەربازەکان به تەواوی ورەیان رووخا.

## داستانێکی مێژوویی

رۆژی١٢ ی ئایار پێشمەرگە داستانێکیان لە گرنگترین داستانەکانی گەلی کورد لە مێـژوودا تۆمارکرد، کە داستانێکی کەم و وێنەی هاوکاریی تەواوی نێوان هێزەکـانی پـارتی دیمـوکراتی کوردستان و حزبی شیوعی ئێراق بوو، داستانی هەندرێن بارودۆخی سیاسی و سوپای سـەروبن کردەوە، ئیدی دوای ئەم سـەرکەوتنە مەزنـەی پێشـمەرگە، دوژمـن هـیچ هۆیـەکی دیکـەی بەدەستەوە نەما جگـە لـە بۆردومـانی ئاسمـانی بـۆ گونـدەکان، بـەلاّم زیانـەکان کـەمبوون، لەبەرئەوەی خەڵك ڕاهاتبوون بەیانیان گوندەکانیان بەجێبهێڵن و لە دۆڵ و چیاکاندا بلاّوەبکـەن و ئێوارە بگەڕێنەوە. هەر ئەو ماوەیە توانرا بۆمبهاوێژێکی جـۆری ئەبیوشـن ٢٨ بخرێتـە خوارەوە کە لە نزیك گوندی دەربەند نێـوان گەلاّلـەو حـاجی ئۆمـەرانی کەوتـەوەو کـەس لـە تاخمەکەی دەرنەچوو

## ئاواتی (سەعید حەمۆ)

## بۆ داگیرکردنی گەلاّلە نەهاتەدی

دیارە لە نەخشەی دوژمن داگیرکردنی ناوچەی باڵەکایەتی بوو، سـەعید حـەمۆی فەرمانـدەی لیوای ٥ کە بڕیاریدابوو تا گەلاّلە نەگرێ ڕیشـی نەتاشـێ، ئەمـە غـرووری عەسـکەربوو، ئەنجامیش بەهۆی خۆڕاگری قارەمانانەی پێشمەرگە، دوژمن خەونی نەهاتەدی و تێگەیشت کە گرتنی گەلاّلە هێندە ئاسان نییە، بەمەش جۆرە نائومێدییەك باڵی بەسەر دوژمندا کێشـا وای لێهات بەوەندە بوەستێ، چونکە دەترسـان هێرشـی پێشـمەرگە بـەردەوام بـێ، ئـەم داسـتانە هۆکارێکی سەرەکی بوو بۆ ئەوەی بەغدا داوای گفتوگۆ لە سەرکردایەتی شۆڕش بکات، ئیـدی بارزانیی نەمریش هەموو کاتێ پێی باشبوو تا بە ئاشـتی و بـەبێ خـوێن ئامـانج بـەدی بـێ باشترە، بۆیە هەمیشە لە شۆڕشی ئەیلوولدا گفتوگـۆ حسـابی بـۆ کـراوە، ئەمـە ڕێگـەی بـۆ ڕێککەوتنی٢٩ ی حوزەیران خۆشکرد.

## دوێنێ بۆ ئەمڕۆ

داستانی هەندرێن نموونەیەکی هەموو ئەو بەرگری و بەرخۆدانەی دوێنێی پێشمەرگەیە لە خاکی کوردستان، خەباتی بزووتنەوەی رزگـاریخوازی کوردسـتان، لاپەڕەیـەکی دوێنێـی مقاوەمـەتی شۆڕشی مەزنی ئەیلوولە بەڕابەرایەتی بـارزانیی نـەمر، داسـتانی هەنـدرێن و تـەواوی شـەڕە خوێناویەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی، ئەمڕۆیان بەرهەم هێنا، بۆیە جێی خۆیـەتی ئەوانـەی دوێنێ لە سەنگەری شەڕەف و مەردایەتیدا بـوون و ئـەمڕۆش پـارێزەری دەسـتکەوتەکانمانن، رێزیان لێبگیرێ، دەبێ بزانین ئەمڕۆ بەرهەمی دوێنێی شەڕ و خوێن بەخشـین بـووە بـۆ خـاك، ئەمڕۆ بەو ئاسانیە دروست نەبووە وەك هەندێ کەس پێیان وایە، دوێنێ ئەو دۆخـەی ئـەورۆی دروست کردووە کە هەموو چین و توێژ و پێکهاتەکانی کوردستان گوزارشت لە خۆیان بکەن.

تێبینی: بۆ ئامادەکردنی ئەم بابەتە سوود لە کتێبی، مسعود بارزانی، بارزانی و بزووتنـەوەی رزگاریخوازی کورد، بەرگی سێیەم، بەشی یەکەم شۆڕشی ئەیلوول١٩٦١ ــ١٩٧٥، چاپخانەی وەزارەتی پەروەردە، هەولێر، ٢٠٠٤ وەرگیراوە.

٢٠١٢-٥-١١

# تایەفەگەری لەژێر عەبای ناسیونالیزم دا

عێراق وەك وڵاتێکی زادەی شەڕی یەکەمی جیهان، لە بەرژەوەندی زلهێزەکان، بەتایبەتیش بەریتانیا کە ئەندازیاری دارشتنەوەی ناوچەکە بوو دوای شەڕی یەکەمی جیهان و ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی، چەندین پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینی بە زۆر لەو دەوڵەتە داتاشراوە (عێراق)دا کۆکرانەوەو سوننەکانیان لەو دەوڵەتەدا کردە برا گەورە، لە وێستگەکانی دواتریشدا، لە سایەی ئەو شوناسەی بەسەر عێراقدا درا، کە شوناسێکی عەرەبی سوننی بوو، قەومییەکانی عەرەب خۆیان لە دەسەڵات خۆشکردو خۆیان بەسەر عێراقدا سەپاند، ئەوانە زۆر کاریان لەسەر ئەوە کرد، بەناوی قەومییەتەوە، سوننە زاڵ بن و هەرچی پێکهاتەی دیکەشە بتوێننەوە، ئیدی بەم شێوەیە چوارچێوەیەك بۆ ناسیونالیزمی عەرەبی لە عێراق دارێژرا، ئەو دۆخەی ناسیونالیزمی عەرەبی خولقاندی، دۆخێك بوو شۆفێنیەتی بەرهەمهێنا، ئەمەش ڕێی بۆ ئەوە خۆشکرد، توندڕەوی تاکە میکانیزمی کاری ناسیونالیستانی عەرەب بێت و، هەڵپەی گەیشتن بە دەسەڵات وای لێکردن، بۆ پاساوی کودەتاکردن بەسەر یەکتریدا، کودەتاچییەکان خۆیان لەوانی پێش خۆیان بە قەومیتر بزانن، هەموو کودەتاکانیش هەر سوننەی گەیاندۆتە دەسەڵات، لە سایەی ناسیونالیزمی عەرەبیدا درێژە بە چەوساندنەوەی کوردو خەڵکی دیکە دراوە.

عروبە بەدرێژایی مێژووی دەوڵەت تا ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣، کلتوری قەتلوعام و سڕینەوەی بەرامبەرو بڕوانەبوون بە پێکەوەژیان لەگەڵ پێکهاتەکان بەتایبەتیش کورد بەرهەمهێنا، ئەو کلتورە چەندین کەند و کۆسپ و لەمپەری بۆ عێراقی نوێ دروست کردووە، ئێستا کە ململانێی شیعەو سوننە لەوپەڕیدایە، عەبای ناسیونالیزم لە کاری سیاسیدا ڕەواجی هەیە، ئەو عەبایە بۆ هەڵبژاردن و برەودان بە دەسەڵات بەکاردەهێندرێت، بە جۆرێك دژایەتی کردنی کورد، باشترین ڕێکلامی بانگەشەی هەڵبژاردن و دەنگ پەیداکردنە، خۆدزینەوە لە جێبەجێ کردنی دەستوور بەتایبەتیش ماددەی ١٤٠ ، هەوڵێکە بۆ بەهێزکردنەوەی بەغداو خۆسەپاندنە بەسەر تەواوی جومگەکانی دەسەڵات، نوری مالیکی سەرۆك وەزیران کە دەیەوێ عێراق بەرەو دکتاتۆریەت بباتەوە، عەبای ناسیونالیزمی

بەخۆداداوەو بۆ سەرنجڕاکێشانی عەرەبی سوننەو پێشاندانی عێراق وەك عێراقی عەرەبی، دژایەتی کورد دەکات، هەر لە درێژەی خۆپێشاندان وەك کەسێك کە لە خەمی عێراقێکی مەرکەزی دایە، ڕۆژی ٢٠١٢/٥/٨ بە چەند هێلیکۆپتەرو هێزێکی زۆرەوە، کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیرانی (بە بێ وەزیرەکانی کورد) هێنایە کەرکووك، ئەم ئیستیفزازکردنەی کورد، هەوڵێکی دیکەیە بۆ بەهێزکردنەوەی ناوەند، لەم ڕێگەیەشەوە عەرەبی شۆفێنی لە ناوچە دابڕێندراوەکانی کوردستان، بۆ دژایەتی کردنی کورد دێنێتەوە سەر خەت. عەبای ناسیونالیزم لە عێراقدا، ئەوەندە عەبایەکی سیحراوییە، بەجۆرێك کە هەرکەسێ چەند تایەفەگەری بکات و فیتنە لە نێو پێکهاتنەکانی عێراقدا بنێیتەوە، بەڵام کە ئەو عەبایەی بەخۆدادا، ئەوا دەبێتەوە جێی ئومێدی ناسیونالیستانی عەرەب و کەڵکەڵەی کۆنترۆڵکردنەوەی بەغدایان دەکەوێتەوە سەر، سەیر لەوەدایە بەدرێژایی مێژووی دەوڵەتی عێراق، بالۆرەی قەومییەت و ناسیونالیزم، گەلانی عێراقی توشی مەینەتی کردووەو گرووپێکیشی بردۆتە لووتکەی دەسەڵات، هەر ئەوەشە وای کردووە ئەوەی دەسەڵاتی لە بەغدا وەرگرت، ئەو قەوانە لێبدەداتەوە، هەروەك مالیکی کە بە ڕۆژنامەی عوکازی سعودییەی ڕاگەیاندبوو (کوردی عێراق چییان دەوێ کوا کوردی وڵاتانی دەوروبەر ئەوەیان هەیە)، خۆ سەدامیش بەردەوام ئەو منەتەی بەسەر کورددا دەکرد، بە هەموو شێوەیەك کەتبووە لەناوبردنی کوردو دەشیگوت لە عێراقدا کورد دەسکەوتی لە عەرەب زیاترە، عەرەب یەك جار بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی دەنگ دەدات، بەڵام کورد دوو جار یەکیان وەك عەرەب بۆ ئەنجوومەنی نیشتمانی و ئەویدیکەشیان بۆ ئەنجوومەنی یاسادادانانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی کوردستان(کورد پێی دەگوت ئەنجوومەنی کارتۆنی)،عەرەبی عێراق بە بەیت و بالۆرەی قەومییەت بێ هۆش و سڕ کراوە، بۆیە ڕێژەیەکی زۆریان ئالودەی ئەو دروشم و بالۆرانە بوون، ئەگەر وانەبێ چی وای لە عەرەبێکی داماوی عێراق کردووە، کە لە نێو تەپوتۆزی شەڕی خوێناویی تایەفەگەری و نەبوونی خزمەتگوزاری و بەرزبوونەوی ڕێژەی هەژاری، داوای یەکپارچەیی عێراق بکات و خۆی لەبیر بچێت لە چ حاڵێکدایە، چونکە لە ڕاستیدا، ئەو داوایە داوای ئەوانەیە کە چاویان لە کورسی دەسەڵاتە، لەبەر ئەوەی هێشتنەوەی ئەم بارە نالەبارەی عێراق لەم گێژاوەدا، تەنیا لە قازانجی دەسەڵاتخوازاندایە، ئاخر ئێستا لە ژێر عەبای ناسیونالیزمدا تایەفەگەری لەوپەڕیدایە، پێناچێ وا بەئاسانی کلتوری یەکترسڕینەوە نەك نەهێڵدرێ بەڵکو کەمیش بکرێتەوە، ئەوەی لە عێراق دەگوزەرێ شەڕی کۆنترۆڵکردنی بەغدایە لە نێوان سوننەو شیعە، ئەو تایەفەگەرییە، بە ڕادەیەکە،

گۆڕانکارییەکانی ناوچەکەش و ئەوەی پێی دەگوترێ بەهاری عەرەبی، فاکتەرێکە بۆ زیاتر تۆخکردنەوەی ئەو تایەفەگەرییە، چونکە ئەو وڵاتانەی بەر گۆڕانکاری کەوتوون، ئیسلامی سیاسی چووەتە دەسەڵات، کە سوننەن، بۆیە زۆرجار بە بەهاری عەرەبی دەگوترێ بەهاری سوننە، ترس لەو بەهارە هەڵوێستی حکوومەتی عێراقی بەرامبەر بە سوریا تەواو پێچەوانە کردەوە، بەر لە دەرکەوتنی ئەو بەهارە، حکوومەتی عێراق لەسەر زاری مالیکی، سوریا بە داڵدەدانی تیرۆریست و بەعسییەکانی عێراق لە قەڵەم دراو، ئەو لێدوانە پەیوەندی نێوان دیمەشق و بەغدای ئاڵۆز کرد، بەڵام بۆ هێشتنەوەی هاوکێشەی ئێستا ئیقلیمی بەوشێوەیە، کە لە قازانجی پێکهاتەی شیعەدایە، پەیوەندی بەغداو دیمەشق چۆتە دۆخێکی دیکە، کە زۆر پێویستیان بەیەکتری هەیە.

ئەمڕۆ لە عێراقدا، عەبای ناسیۆنالیزم وەك جلکی وەرشەی کارە، ئەندازیارو کارمەندی تەکنیکی و کرێکاری وەرشە لەکاتی کارکردن جلوبەرگ(بەدلە)ی کار لەبەر دەکەن، لە بەغداش مالیکی لە حکوومەتدا عەبای ناسیۆنالیزم لەبەردەکات، چونکە بەدوو سەرە کار دەکات، لەلایەك فاکتەری قووڵکردنەوەی تایەفەگەرییە، لە لایەکیش بۆ داپۆشینی تایەفەگەری و خۆپیشاندان وەك کەسێکی قەومی لە خزمەتی عێراق، هەوڵ دەدات تایبەتمەندی تایەفەگەری لە ژێر پۆشاکێکی قەومیدا بشارێتەوە، لەو ڕێگەیەشەوە بۆ موجامەلەکردنی عەرەبی سوننەو قەومییەکانی سوننەو تەنانەت بەعس، چەند تاوانبارێکی گەورەی ڕژێمی بەعسی لە زیندان ئازاد کرد کە دەستیان لە جینۆسایدکردنی کورد هەبوو، دوو۲ ملیار دۆلاریشی لە لوتکەی عەرەبی سەرف کرد تەنها بۆ ئەوەی ئەو لوتکەیە لە بەغدا ببەسترێ، تا لای دنیای عەرەب وا بنوێنی دژی تایەفەگەرییە، لەولاشەوە کەوتە پەراوێزخستنی کورد لە پۆستە گەورەکان و، بەوەشەوە نەوەستا، بۆ پشتکردن لە جێبەجێ کردنی ماددەی ١٤٠ و کێشە هەڵواسراوەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و بەغدا، کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیرانی هێنایە کەرکوك، بەڵام بەر لەو کۆبوونەوەیە هەزارن دۆنم زەویی لە کەرکوك لەسەر وەقفی شیعی تاپۆکرد، دوای ئەو هەنگاوە تایەفەگەرییە، عەبای ناسۆنالیزمی کردەوەبەرو لە سایەی هێزێکی زۆرو سوڕانەوەی باڵەفڕ لە ئاسماندا کۆبوونەوەی ئەنجوومەنی وەزیرانی لە کەرکوك کرد، ئەم کۆبوونەوەیە دڵی ئەو عەرەبانەی خۆش کرد، کە هەمیشە لێیان خۆش هاتووە داردەستی جێبەجێ کردنی بەرنامەی توندکردنەوەی مەرکەزییەت و دژایەتی کردنی کورد بن، نابێ خۆمان بەوە هەڵبخەڵەتێنین کە عەقڵیەتی سیاسی لە عێراق گۆڕاوە، چونکە قۆناغی دوای نەمانی سەدام، زەمینەی مانەوەی ئەو دۆخەی جارانی تێدا ماوە، چونکە ئێستاشی لەگەڵدابێ، دەرکەوتنی پاڵەوانی قەومییەت بەندە بە دژایەتی کردنی کوردەوە، بۆیە باشترین دەرفەت بۆ

ئەوانەی کار لەسەر تایەفەگـەری دەکـەن ئەوەیـە کـە وەك دژە کـورد خۆیـان پیشـان بـدەن، ئـەم هەلومەرجە جارێکی دی دەبێتەوە بەربەست لەڕێی ئەوانەی دەیانـەوێ شـەقامی عـەرەبی هۆشـیار بکەنـەوە، ئـەوەتا دەسـتەبژێری ڕۆشـنبیری عـەرەب، دێـن لـە هـەولێر کـۆنگرەی گردبوونـەوەی سەرخستنی دۆزی کورد دەبەستن، چەند گرنگ بوو بۆ حکوومەتی عێراق بـۆ پێشـاندانی نیازپـاکی ئەو کۆنگرەیەی لە بەغدا بەستبا، بەغدای ئێستاش لێناگـەڕێ ئـەو دەسـتەبژێرەی عـەرەب ڕۆڵـی خۆیان لە هۆشیارکردنەوەی شـەقامی عەرەبیـدا بگێـڕن، چـونکە ئـەو ڕۆشـنبیرانەی عـەرەب لـە هەولێرەوە داوای ئەوەیان کرد عەرەب لـە دۆزی ڕەوای کـورد تێبگـەن، جگـە لـەوە هەنـدێك لـەو ڕۆشنبیرانەی عەرەب، هەستیان بەوە کردووە مالیکی عێراق بەرەو دکتاتۆریـەت دەبـات، لـە ڕێـی وتارو نووسینەکانیانەوە، زەنگی ئەو مەترسییەیان لێداوە.

کارکردن لەژێر عەبای ناسیونالیزمدا، بەرچاوروونی ناداتە عـەرەب بـۆ ئـەوەی بـیر لـەوە بکەنەوە، کە نە سەردەم سەردەمی جارانەو نە دۆزی کـوردیش لـە سـەردەمی شـەڕی ساردو جووت جەمسەری دایە، مالیکی ٨ی ئایار بـە ئیسـتیفزازی هاتـە کـەرکووك، ڕۆژی دواتـر وتەبێژی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان ڕایگەیاند ناسنامەی کەرکووك کوردسـتانییە، هـەر ئەو ڕۆژەش وەفدێکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان چووە کەرکووك. ئەمڕۆ کۆشکی سپی لە هاوکێشەکانی عێراق و ناوچەکەدا حیساب بـۆ کـورد دەکـات، هەقـە عـەرەب بـیر لـە تـوڕ تێهەڵدانی ئەو عەبایەی ناسیونالیزم بکەنەوە، کە بە دیزاینی سەردەمی قەومییەتی شـۆفێنی دروومانی بۆ کراوە، ئەمڕۆ عەرەب پێویستی بەوەیە بزانن کـە چـیدی مـافی گـەلان ناخرێتـە پەراوێزەوەو، کاتی هاتووە کە لێنەگەڕێن کەسانێك بـۆ مـەرامی گەیشـتن بـە دەسـەڵات یـان مانەوە لە دەسەڵات بیانکەنـە بەربەسـت لـەڕێی کـورد، عـەبای ناسـیونالیزمیش لـە بـەڵاو مەینەتی زیاتر بۆ گەلانی عێراق چیدیکەی پێ نەبووەو نییە.

٢٠١٢/٥/١٦

# دەستوور لە نێوان هەولێر و بەغدا

بەوپێیەی لە وڵاتانی ناوچەکەو بەتایبەتیش عێراقدا، دەستوور تەنها بۆ ئەوەبووە لە سەر ڕەفە دابندرێ و لەبیر بکرێ، هەر لەبەر ئەوەشە، کە گەلانی عێراق ئاشنایەتییان لەگەڵ دەستووردا نەبووە، نووسینی دەستوور نەبۆتە خەمی خەڵك، چونکە لە عێراقدا هەر وا هاتووە، کە ناوە ناوە چەند کەسێك لە ڕێی کۆدەتاوە هاتوون و دەستوورێکیان بۆخۆ نووسیوەتەوەو، لەو ڕێگەیەوە شەرعییەتیان بە دەسەڵات داوە، بەم شێوەیە دەتوانین بڵێین دەستوور هی خەڵك نەبووە، بەڵکو هی گرووپی دەسەڵاتداران بووە، جا دەستوورێك لە لایەن چەند کەسێکەوە دابندرێ و، وەك ئامرازێك بۆ درێژەدان بە دەسەڵات بەکاری بێنن، خەڵك ناچارنییە بە موڵکی خۆی بزانن. ئەگەر ئەو جۆرە دەستوورە بۆ وڵاتی یەك نەتەوە گرفت بێت، دەبێ لە وڵاتێکی فرە نەتەوەو ئاین و مەزهەبی وەك عێراق چ بەڵایەك بێ.

## قۆناغێکی نوێ

دوای ساڵی ٢٠٠٣ قۆناغێکی نوێیە لە ژیانی گەلانی عێراقدا، چونکە دوای دوو ساڵ لە ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام، ساڵی ٢٠٠٥بۆ یەکەم جار دەستوورێك لە مێژووی ئەوڵاتەدا ڕاپرسیی بۆکراو لە سەدا هەشتای پێکهاتەکانی عێراق دەنگیان پێدا، کوردیش وەك پێکهاتەیەکی سەرەکیی ئەو وڵاتە لەو ڕاپرسییەدا دەنگی بە دەستووری عێراق دا. بە درێژایی مێژووی دەوڵەتی عێراق، ئەگەر تەنیا کۆدەتاچی و دەسەڵاتداران دەستووریان داڕشتبێ، ئەوا لەنێو هەموو پێکهاتەکانی عێراقدا، زیاتر کورد بۆتە قوربانیی بەغدا، ڕاستە گرووپێکی کۆدەتاچی حوکمی بەغدایان کردووەو خەڵکییان ئازار داوە، بەڵام لە هەمان کاتدا بەغدایان کردبووە ناوەندێکی بەهێز بۆ عروبە، کەواتە لە بەغدا دەستوورێك هەبووە لە پێناو عەرەب، بەڵام دژی کوردو خەڵکی دی. لە دوای ڕووخاندی ڕژێمی سەدام(٢٠٠٣)، وێڕای

هاتنەپێشەوەی قۆناغێکی نوێ، کە تیایدا دەستوور لەسەر دەستی پێکهاتەکان بە ئاگاداری ئەمەریکاییەکان نووسراوەتەوە، لێ ئەو وڵاتە گیرۆدەی قەیرانی جێبەجێ نەکردنی دەستوور بووە، لە بەغدا مەیلی کۆنترۆڵکردنەوەی دەسەڵات لە لایەن گرووپ و تاکەکەسدا هەیەو دەستوور دەکەنە وێردی سەر زمانیان، ئێستا مالیکی بەو ئاراستەیەدا کاردەکات ، ئەو کەس و گرووپانە دەیانەوێ دەسەڵات پاوان بکەن و، ئیدیعای ئەوەش دەکەن کە تەنیا ئەوانن بە پێی دەستوور کاردەکەن و، ڕایدەگەیەنن کە ئەوە کوردە پشتی کردووەتە دەستوور، لە کاتێکدا تاکە شتێك کە بەدەست کوردەوەبێت دەستوورە، کە بتوانێ بە هۆیەوە پێ لەسەر مافەکانی دابگرێت، کورد لە دەرەوەی ئەو دەستوورە زیاتری داوا نەکردووە، کەچی دەنگە بەرزبووەکانی بەغدا هاوار دەکەن و دەڵێن کورد دەیەوێ عێراق دابەش بکات.

## کوردو دەستوور

ئەگەر بەدیوێکی دیکەدا، سەیری هاوکێشەی دەستوور لە نێوان کوردو بەغدا بکەین، دەبینین بە درێژایی مێژوو، ئەوە دووەم جارە کورد خۆی لەنێو ماددەکانی دەستوردا ببینێتەوە، یەکەم جار لە ساڵی ١٩٥٨ و جاری دووەمیش ساڵی ٢٠٠٥ ، لە هەردوو جاریشدا، کە ناوی کورد هاتووە، لەوەڕا نەهاتووە بەغدا دەرکی بەوە کردبێ کە ناکرێ کورد وەك پێکهاتەیەکی گرنگ و سەرەکی فەرامۆش بکرێت، بەڵکوو لە هەردوو جارەکەدا، جۆرێك لە ئامادەبوونی کورد هەبووە، ساڵی ١٩٥٨ کە کۆتایی بە سەردەمی پاشایەتی هات، عەبدولکەریم قاسم بۆ دامەزراندنی کۆماری یەکەم، پێویستی بەوەبوو تا پێی بکرێت دۆخی سیاسی بباتە قۆناغێکی دی، بۆ ئەمەش نەدەکرا کورد پەراوێز بکات، چونکە کورد لە گۆڕەپانی سیاسیدا ئامادەبوو، پارتی دیموکراتی کوردستان ١٢ ساڵ بوو دامەزرابوو، مستەفا بارزانیی نەمر-یش وەك ڕابەری کورد ناووناوبانگی بە هەموو جیهاندا بڵاوبۆوەو ١١ ساڵ بوو لە سۆڤییەت بوو، بارزانیی نەمر لە نێوان وازهێنان لە خەبات و تێکۆشان و ڕازی بوون بە فەرمانەکانی بەغدا و ئاوارەیی و دەربەدەری لە پێناوی سەربەرزی گەلەکەیدا، ئاوارەیی هەڵبژاردبوو، ئیدی بە گەڕانەوەی بارزانیی نەمر لە یەکێتی سۆڤییەتەوە بۆ بەغدا، جارێکی دی کورد بە گەرموگوڕییەوە هاتەوە گۆڕەپانی سیاسی، دەرفەتێك بۆ کاری سیاسی ڕەخساو، پارتی دیموکراتی کوردستان لەو دۆخە تازەیەی دوای ساڵی ١٩٥٨ و لەسایەی بارزانیی نەمردا، کەوتەوە جموجۆڵ و لە بەغدا بووە

هێزێکی کاریگەرو لە ڕیزی پێشەوەی داکۆکی کردن بوو لە ئازادی و بەرجەستەکردنی دیموکراسی، بۆیە کورد کە هێزێکی دیاربوو، نەدەکرا لە دەستوور پشتگوێ بخرێ، ئەوەبوو لەماددەی سێی دەستووردا، بە ئاشکرا ناوی کورد لە پاڵ ناوی عەرەب هات کە هەردووکیان لە نیشتماندا هاوبەشن، وێڕای ئەوەی لە عێراقدا کورد بە هاوبەش لەگەڵ عەرەب ناوی هات، بەڵام لە ماددەیەکی دیکەی دەستوورەکەدا، ئەوە هاتبوو، کە عێراق بەشێکە لە نیشتمانی عەرەب، ئیدی ڕۆژنامەی خەباتی زمانحاڵی پارتی دیموکراتی کوردستان، لەو ماددەیەی عێراقی بە بەشێك لە نیشتمانی عەرەب لە قەڵەمدا هاتە دەنگ.

بۆ قۆناغی دوای ٢٠٠٣ ش هەروایە، ئامادەبوونی کورد لە بەرامبەر دۆخی تازەدا، وای کرد ئەمجارە خۆی بەشداری نووسینەوەی دەستوور بێت، ئەو واقیعەی لە دوای ڕاپەڕینی ١٩٩١ لە کوردستان دروست ببوو، لە دەستووری ٢٠٠٥ دا وەك خۆی ناسرا، نەك هەر ئەوە بەڵکو کورد وەك چۆن لەدوای ساڵی ١٩٥٨ پارێزەری ئازادی و مافە دیموکراتییەکانی خەڵك بوو، لە ٢٠٠٥ یشدا ڕۆڵی سەرەکیی بینی لەوەدا کە دەستوورێك بێت لەگەڵ سەردەمدا بگونجێ، زێدەڕۆیی نییە بگوترێ، ئەگەر کورد نەبووایە عێراق یان نەدەبووە خاوەنی دەستوور، یان دەبووە خاوەن دەستوورێك کە لەگەڵ سەردەم نەگونجێ و ڕەچاوی مافی تاکەکەس و پێکهاتەکان نەکرێ، کورد فاکتەری خێر بووە بۆ عێراق، چەند لە داڕشتنەوەی دەستووری نوێدا شەڕی لەسەر مافە نەتەوەییەکانی خۆی کردووە، هێندەو بگرە زیاتریش شەڕی لە سەر بەرجەستەکردنی دیموکراسی کردووە. گرفتەکە لێرەدایە، کەسانێك بیانەوێ دەسەڵات لە بەغدا پاوان بکەن، ئەو دەستوورە ناخوازن کە ڕێگەی لە پاوانکردنی دەسەڵات گرتووە.

## کێ دژی دەستوورە؟

لە عێراقدا بە تایبەتیش لە نێو سیاسەتمەداران، کێشە لەوەدایە کە بە دەگمەن قەناعەتیان بە دەستوور هەیە، ئەوەتا سەرۆك وەزیرانی عێراق مالیکی، کە خۆی یەکێك بووە لەوانەی لە داڕشتن و نووسینەوەی ماددە ماددەی دەستووردا دەستی هەبووە، کەچی لەبەر ئەوەی حەزی لە پاوان کردنی دەسەڵاتەو، زۆرترین پێشێلکاری دەستووری لە پێناوی بەهێزکردنی پێگەی خۆی و گرووپەکەیدا کردووە، دەڵێ ئەو دەستوورە بۆمبی تەوقیتکراوی تێدایە، لە لایەکی دیکەشەوە بۆ زیاتر کۆکردنەوەی هەموو دەسەڵاتەکان لە دەستی خۆیدا،

خۆی بە پارێزەری دەستوور دادەنێ و هەموو ئەو دەنگانەی نایانەوێ دکتاتۆری بگەڕێتەوە بەتایبەتیش هەرێمی کوردستان، بە دژە دەستوور دادەنێ، ئەو ڕێچکەیەی بەغدا گرتوویەتیەبەر جاڕدانی پاشەکشەکردنی پرۆسەی سیاسیی عێراقە بەرەو دواوە، ئەو مەترسییەشە وای کردووە هەولێر بێتە دەنگ، بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان ئەوەی ڕاگەیاندووە کە مەحاڵە جارێکی دی قبوڵ بکەین حوکمی تاکە کەسی و دکتاتۆری بگەڕێتەوە، کەواتە ئەو دەنگەی لە هەرێمی کوردستان دژی گەڕانەوەی حوکمی تاکەکەسی بەرزبۆتەوە، چەند لە پێناوی کوردستانە هێندەش لەبەرژەوەندی گەلانی عێراقدایە، ئەگەر بە دیقەتیشەوە سەیری دیمەنی گۆڕەپانی سیاسیی عێراق بکەین، دەبینین ژمارەیەکی زۆری هێزو گرووپ و دەستەی سیاسی گوێ لەو زەنگەی وەئاگاهێنانەوە دەگرن کە لە هەولێر لێدرا. بەڵایەکی گەورەیە کە تائێستاش لە بەغدا دەستوور وەك تاکتیك بەکاردێنن، نەك وەك مەرجەع و سەرچاوەی کاری سیاسی و بەڕێوەبردنی وڵات، لە دەستووری ساڵی ١٩٥٨ دا کورد دڵی خۆش بوو کە لە نیشتماندا(عێراق) بەهاوبەش داندرا، بەڵام زۆری نەخایاند، دەرکەوت بەغدا دەستووری بۆ تاکتیك بەکارهێنا، ئیدی لە بەغداڕاگەیاندرا کە کورد نەك هاوبەش نییە، بەڵکو لەو نیشتمانەشدا جێی نابێتەوە، شۆفێنییەکانی بەغدا لە ڕێی ڕۆژنامەکانەوە، زوو لە کورد کەوتنە تەقەو ڕێگەیان بۆ دژایەتی کردنی کورد خۆش کرد، لێ لەوێ ڕۆژێوە کە لە بەغدا بڕیار درا پشت لە دەستوور بکرێ و لێ نەگەڕێن کورد بە مافە ڕەواکانی خۆی بگات تا بەوە گەیشت جینۆساید بکرێ، دۆخی عێراق بە گشتی تا ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام بەکوێ گەیشت؟ ئەوەی ئێستا لە بەغدا دەگوزەرێ پشت کردنە لە دەستوور، ئەگەر لەبەرامبەردا دەنگ بەرز نەبێتەوە، ئەوا کارەساتی گەورە بەسەر هەموو عێراقدا دێت، لە جێی خۆیدایە کورد وەدەنگ بێت، چونکە لە هاوکێشەی کورد و بەغدا، ئەوە کوردە پارێزگاری لە دەستوور دەکات و داوای ئەو مافانە دەکات کە لە دەستووردا هەن، لە بەرامبەریشدا ئەو بەغدایە خۆی لە ئەرکی جێبەجێ کردنی دەستوور دەدزێتەوە.

٢٠١٢/٥/٢٨

# كە گیرفانی بەغدا گەرم دەبێت

کێشەی گەورەی عێراق لەوەدایە، کە هەمیشە مەیلی چوونە سەر کورسی و پاوانخوازی، زەبری کوشندەی سرەواندۆتە گەلانی ئەو وڵاتە، چونکە خێروبێری وڵات خراوەتە خزمەت ئەو مەیلە پاوانخوازییەوە، هەر وڵاتێك بەم دەردە بچێت، ئەوا بەڵاو مەینەتی بەشی خەڵکەکەی دەبێت، چونکە ئەو کەمینەیەی لە سەرەوەڕا کۆمەڵگە کۆنترۆڵ دەکات، دروشم بە خەڵك دەفرۆشێ و سامانی وڵاتیش لە پێناوی مانەوەی خۆیدا دەخاتەگەڕ، ئەوە لاپەڕەکانی مێژووە پێمان دەڵێ، بەغدا بەردەوام بەو ئاراستەیەدا کاری کردووە، جا ئەگەر تا ٢٠٠٣ کۆدەتاچییەکان حوکمیان کردبێ، خۆ دوای ئەو مێژووە، حکومەتی بەغدا بە هەڵبژاردن هاتووە، کەچی لەو عێراقە نوێیەشدا، سامانی وڵات بۆ مانەوە لە دەسەڵات بەکاردێت.

## بۆ وڵاتان شایی و بۆ عێراقیش شین

زۆربوونی داهات و دەوڵەمەند بوونی وڵات، ئاماژەیەکی گرنگە، بۆ بەرەوپێشەوەچوون و خۆشگوزەرانی خەڵك، بەڵام ئەوەی لە عێراق تێبینی دەکرێت ئەوەیە، کە بەهۆی ئەوەی مەیلی پاوانخوازی لێنەگەڕاوە خەڵك بە دەوڵەمەندبوونی وڵات دڵخۆش بێت، ئیدی وەك دابونەریتی لێهاتووە، کە بیرکردنەوە لە مەسەلەی سامانی وڵات بە ئیشی خەڵك دانەندرێت، بەڵکو ئەوە مافی ئەوانەیە کە لە بەغدا فەرمانڕەوان، ئەزموونی گەلانی عێراق لەگەڵ دەسەڵاتدارانی بەغدای پێش ٢٠٠٣ ئەوەی هێناوەتەکایە کە لە دەوڵەمەندبوونی وڵات بترسن، چونکە لەگەڵ دەوڵەمەندبوون، دەسەڵاتدارانیش بەرنامەی فراوانخوازی و شەڕانگێزییان فراوانتر کردووە، ئەگەر لە وڵاتان دەوڵەمەندی خۆشی و شایی بووبێت بۆ عێراق نیگەرانی و شین، دوای نەمانی دەسەڵاتی پاشایەتی لە ١٩٥٨ و دواتر کۆدەتا دوای کۆدەتاو، گەیشتنی قەومییە شۆفێنیەکان بە دەسەڵات، عێراق بە جۆرێك وێنا کراوە کە تەنیا عەرەبەو، واقیعی فرە پێکهاتەی نەتەوەیی

و ئایینی پشت گوێ خراوەو شاردراوەتەوە، ئەم بەرنامەیەی شۆفێنییەکان لە دەسەڵاتدا سامانێکی زۆری تیادا خەرج کرا، ئاخر بەغدا لە جیاتی ئەوەی خێروبێری وڵات لە خزمەتکردنی پێکەوژیانی کورد و عەرەب و پێکهاتەکانی دیکەی عێراقدا بەکاربێنێ، وەك لە مادده سێی دەستووری ١٩٥٨ عەرەب و کوردی بە هاوبەش لە نیشتمان دانا، کەچی هاتن سامانی زۆریان لە شەڕو لەناوبردنی کورد خستەگەڕ، بەمەش عێراق هەمیشە لە گێژاوێکی گەورە دابووە.

## پارەو پشتکردن لە ئاشتی

بەغدا پێی وابووە، دەرفەتێکی باشی بۆ هەڵکەوتووە کە بەو سامانەی لەبەردەستی دایە، دەتوانێ کورد لەناو ببات و بەرنامەی شۆفێنییانەیان بە ئامانج بگات، بەغدا لە ناو گێژاوی گەورەی سەپاندنی شەڕ بەسەر کورد، دەرفەتی دەوڵەمەندبوونی بۆ ئەوە قۆستۆتەوە، کە پارەیەکی زۆر لە ماکینەی شەڕو خۆ بەهێزکردن لە بەرامبەر کوردا بخاتەگەڕ، هەمیشە گەرم بوونی گیرفان بەغدای بەلای خۆسەپاندن و گوێنەدان بە مافی کورد و خۆشگوزەرانی خەڵکی عێراقدا بردووە، پارە بۆتە مایەی پشت کردن لە ئاشتی و هەڵبژاردنی ئاڵۆزی وپشێوی و، بردنی پێکهاتەکانی عێراق بۆ ناو گێژاوێك، کە بەردەوام بە دەست قەیرانی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیەوە بناڵێنن، لە کاتێکدا لە ساڵی ١٩٧٠ ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار لە نێوان شۆڕشی کورد و بەغدا، دەرفەتێکی لەباری بۆ ئاشتی هێناکایەو ماوەی ١٩٧٠ تا ١٩٧٤ بە ماوەی ئاشتی ناسرا، کەچی دوای خۆماڵی کردنی نەوت و گەرم بوونی گیرفان، بەغدا پشتی لە ئاشتی کردو شەڕی هەڵبژارد، بۆ ئەمەش پێی باش بوو تەنازول بۆ شای ئێران بکات لە پێناو لەناوبردنی شۆڕشی کورد، لە ١٩٧٥ نسکۆی بەسەر شۆڕشی کورددا هێنا، ساڵی ١٩٨٠ پێی وابوو عێراق دەوڵەمەندە و توانای ئەوەی هەیە شەڕی ئێران بکات، چونکە ساڵێك بوو شۆڕشی گەلانی ئێران بەرپا ببوو، دواتریش مەیلی شەڕانگێزانەی سەدام لە ١٩٩٠پەلاماری کوێتی دا، تا ٢٠٠٣ دەوڵەمەندی، عێراقی زۆر بەجێ هێشت، ئەنجامەکەی وڵاتێکی وێران و زیاتر لە ملیۆنێك بێوەژن و دواکەوتوویی، ساڵی ٢٠٠٣ دوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام، ڕۆژنامەنووسێکی ئەمەریکی لە باڵەفڕێکدا کە بەسەر شارەکانی خوارووی عێراقدا دەسووڕایەوە، دیمەنی پێشنەکەوتووی ئەو شارانە سەرنجی ڕادەکێشێ و، لە وتارێکدا ئەو

گەشتەی خستبووەڕوو و، گوتی چاوەڕێم نەدەکرد عێراق وابێت، ئەوەی دیتم شتێك بوو وامزانی هەر لە سەردەمی بابلییەکاندایە.

## لە عێراقی نوێدا

دوای ۲۰۰۳ قۆناغێکی دیکەی زۆربوونی داهاتی نەوتی عێراقە، بەمەش، بەهۆی هەڵوەشاندنەوەی سوپای عێراق، ئومێدێك لای خەڵك پەیدابوو، کە چیدی پارە لە کڕینی چەك و گەورەکردنی سوپا خەرج ناکرێت، چونکە پێشتر لە ژێر دروشمی گەورە گەورەی قەومی و بەناوی پاراستنی (دەرگای ڕۆژهەڵاتی نیشتمانی عەرەب) سامانی وڵات بەولاو ئەملادا درا، ئەمجارە بەغدا بەو پارە زۆرەی ڕژایە گیرفانییەوە، نەیتوانی برینەکانی پێشوو سارێژ بکات، ئەگەرچی لەڕێی دەنگدانەوە حکومەت دروست بوو، لێ هێشتا مەیلی پاوان کردنی دەسەڵات لە بەغدا لەبرەو دایە، ئەو پارەیەی دوای ۲۰۰۳ لە بەغدا کەڵەکەبوو، ناکۆکی و شەڕەکانی بەغدای بە چەند ئاراستەیەکدا برد، ئەگەر جاران بەشێوەیەکی سەرەکی گەورەکردنی سوپاو خستنەگەڕی پارە بۆ ماشێنی جەنگ، بە ئاراستەی کوردستان بوو، ئێستا وێڕای ئەم ئاراستەیە، ئاراستەیەکی دیکەشی شەڕی تایەفەگەری و توندکردنی دەسەڵاتە، ئەگەر بەغدای جاران بەناوی قەومییەت پارەی بەهەدەر دابێت، بەغدای ئێستا لەژێر عەبای ناسیۆنالیزمدا، بەناوی دیموکراسی و خزمەتگوزاری و پێکەوەژیان و بە قەولی خۆیان پێشخستنی عێراق، دەست بەسەر سامانی وڵاتدا دەگرێت، بەغدای ئێستا لەبیرخۆی دەباتەوە، کە کورد قورسایی خۆی هەیە، بۆیە لەسایەی هەڵڕژانی پارەیەکی زۆرەوە، مەیلی پاوانخوازی سەری هەڵدایەوەو، مالیکی بە پێچەوانەی دەستوور هەڵسوکەوت دەکات، ئەوەی ترسی دروست کرد، تاکڕەویی سەرۆك وەزیران بوو، کە بۆ خۆقایمکردنی لە پۆستی سەرۆك وەزیران، پارەی دەوڵەتی بەکارهێنا، لە ماوەی ۹ساڵی قۆناغی دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، بۆ کۆنترۆڵکردنی دەسەڵات لە بەغدا زیاتر لە ۱۰۰ هەزار کەس بۆتە قوربانیی تیرۆرو شەڕی تایەفی، لە سایەی دۆخی نائارامدا بە دەیان و سەدان ملیار دیناری عێراقی بە شێوەی پڕۆژەی وەهمی دەچێتە گیرفانی گرووپ و کەسانەوە، ئێستا باس لە ۵۰۰ ملیار دۆلاری ئەم چەند ساڵە دەکرێت، کە بەبێ هیچ لێپرسینەوەیەك لە لایەن پەرلەمانی عێراق، کەس نازانێ چۆن چۆنی خەرج کراوەو چی لێهاتووە، لیژنەی نەزاهە ڕایگەیاندووە، کە لەو مەبلەغە، نزیکەی نیوەی گەندەڵیی تێدا

کراوە، هەر لەم ڕۆژانەدا بلاّوکرایەوە، کە لەماوە ئەم ٩ ساڵەدا نزیکەی ٣٥ قوتابخانە لـە ١٥ پارێزگاکەی عێراق(بێجگە لە هەرێم) دروست کراوە، پارەیەکی زۆر لە کارەبا خەرج کراوە بەلاّم وزەی پێویست بەرهەم نەهاتووە.

## ترس لە پارە

ئەوە دووەمین جارە، دەرفەتی کەڵەکەبوونی پارەیەکی زۆر لە عێراق دێتە پێشـەوە، بـەلاّم مەیلی پاوانخوازی دەستی بەسەردا دەگرێت و، خەڵك لێـی بـێ بـەش دەبێـت، یەکـەمیان لـە حەفتاکانی سەدەی ڕابردوو بوو، لەبەر ئـەوەی خرایـە خزمـەت بەرنامـەی شـۆفێنییەکانەوە، عێراق ڕووبەڕووی چەندین شەڕ کرایەوە، بێجگە لە شەڕە بەردەوامەکانی کوردستان و هـەوڵی جینۆسایدکردنی کورد، شـەڕی هەشـت سـاڵەی ئێـران و کوێتیشـی بەسـەرداهات. ئێسـتاش دەرفەتێك هاتۆتەپێش بۆ پێشکەش کردنی خزمەتگوزاری، بـەلاّم گەنـدەڵی عێراقـی گەیانـدە ڕیزی پێشەوەی ولاّتانی گەندەڵ و فاشیل لـە سـەر ئاسـتی جیهانـدا، سـەرەڕای ئـەو هـەموو نەهامەتییەی بەسەر عێراقدا هاتووە، کە لە هەندێ پارێزگای خوارووی عێراقدا ڕێژەی بێکاری و هەژاری  زۆر بەرز بۆتەوە،  جارێکی دی بەغدا کڕینی فڕۆکەی جەنگی و جبەخانەی بـەلاوە گرنگترە لە ئاوڕدانەوە لە خەڵك وپێشکەش کردنی خزمەتگوزاری، هێشتا برینی وێرانکـردن و شەڕو کوشـتارەکانی سـاڕێژ نـەبووەو بـرینی ئـەم قۆناغەشـی هاتۆتەسـەر، کەچـی حوسـێن شەهرستانی جێگری سەرۆك وەزیران بۆ کاروباری وزە هەڕەشەی بڕینی ئەو بڕە بەنزینە دەکـات کە لە بێجییەوە بۆ کوردستان دێت، خەڵکی عێراق بـەهۆی مـەیلی پـاوانخوازی و تـاکڕەوی و بەهەدەردانی سامان بۆ بەرنامەی درێژەدان بە دەسەلاّت، ناهەق نین لە خوا بپاڕێنـەوەو بڵـێن: خوایە ئەگەر سامان و پارە لە ولاّتان بۆ خۆشگوزەرانی خەڵك بێت و، لە عێراقیش بۆ درێژەدان بە تاکڕەوی و شەڕو نەهامەتی و پاوانخوازی و تایەفەگەری بێت، خوایە چـی دی بـە نسـیبمان نەکەیت، چونکە لە جیاتی ئەوەی لە ئاوەدانکردنەوەو ڕێزگرتنی مرۆڤ بەکاربێت، لە تیکدان و بێ ڕێزی کردن بە مرۆڤ بەکاردێت.

٢٠١٢/٦/٤

# بەغداو کولتووری ئیمزاکردن و ڕێزنەگرتن لە ئیمزا دژی کورد

وەك ئاشکرایە، ئیمزاکردن دواقۆناغی وتوویـژو ڕێککـەوتنی دوو لایـەن یـان زیـاترە لەسـەر مەسەلەیەك، کە باس لە ئیمزاکردن دەکرێت، دیـارە چـوونە سـەر مێـزی گفتوگـۆ بـۆ ڕێککـەوتن هەڵبژێردراوە، مەرجیش نییە هەموو چوونە سەرمێزێك بۆ گفتوگۆ، لە ڕوانگـەی ویسـت و مـەیلی پشت کردن لە توندو تیژی و شەڕەوەبێت، زۆر جار شکست هێنان لە شەڕ، لایەنێك بەزۆر پەلکێشی سەرمێزو ئیمزاکردن دەکات. بە درێژایی مێـژووی دەوڵـەتی عێـراق، لەبـەر ئـەوەی دەسـەڵات لـە خەڵکـەوە نـەبووە، گفتوگـۆو هاوپـەیمانی و دۆسـتایەتی لەگـەڵ وڵات و هێـزە نێودەوڵـەتی و ئیقلیمییـەکان لـە بەرژەوەنـدی خـەڵك نـەبووە، بـەڵکو لـە بەرژەوەنـدی دەسـەڵات بـووە، بۆیـە پاشگەزبوونەوەش هەر لە پێناوی مانەوە لە دەسەڵات بووە، نەك لە پێناوی میللەت، واتە زۆر جـار ئیمزاکردن وەك تاکتیك بەکارهێندراوە، ئەمەش هۆیەك بووە بۆ درێژەدان بە پاشـاگەردانی و زیـاتر ئاڵۆزبوون و ونکردنی ڕێگەی دەربازبوون لە قەیران.

## دوای لکاندن بە عێراق

بەو پێیـەی عێـراق زادەی شـەڕی یەکـەمی جیهانـەو، لەبەرژەوەنـدی براوەکـانی ئـەو شـەڕە بەتایبەتیش بەریتانیا دروست بووە، بەزۆر پێکهاتەکانی تێـدا کۆکراونەتـەوەو، ئـەو کۆمەڵگەیـەی پێی گوترا عێراق، هەمیشە لە سەرەوەڕا کۆنترۆڵ کراوە، بۆیـە بەغـدا وەك ناوەنـدێکی دەسـەڵات، حیسابی بۆ کۆمەڵگە نەکردووە، ئیدی لەبەر ئەوەی مەبەستی هەموو دەسەڵاتداران مانـەوە بـووە، خاڵێکی هاوبەشیان هەبووە، ئەویش ئیمزاو بڕیاردان لە پێناوی مانەوە لە دەسـەڵاتداو پشـت کـردن لە پێکهاتەکان، بەتایبەتیش کورد. بەغدا وەك سەنتەری ئەو عێراقەی کوردستانی پێـوە لکێنـدرا،

نەیتوانی وەك عەرەب بەچاوی یەكسان سەیری كورد بكات، بـەڵكو وەك هەڕەشـە لەسـەر دەوڵـەت سەیری كردووە، بەغدا تەنیا لەو كاتەی بزووتنەوەی ڕزگـاریخوازی كوردسـتان بـەهێز بـووە، لەگـەڵ كورد دانیشتووەو باسی ڕێككەوتنی كردووە، بەڵام هەوڵی داوە ئیمزای ئەو ڕێككەوتنە لەگەڵ كورد بە كاتی و وەك تاكتیك بهێڵێتەوە، تا هەلێكی پاشگەزبوونەوەی لـەو ئیمزایـە دەسـتكەوتووە، بـە درێژایی مێژوو بەغدا لە پێناوی تێكشكاندنی كورد ئیمزای كردووەو لێـی پەشـیمان بۆتـەوە، خـۆ ئەگەر بە مێژووی ڕێككەوتنەكانی عێراقدا بچینەوە، ئەگەر دژایەتی كوردیان تیا نـەبووبێت، ئـەوا بە هیچ شێوەیەك ئەو ڕێككەوتنانە لە قازانجیدا نەبووە. ڕێككەوتنی عێـراق-بـەریتانیا لـە سـاڵی ١٩٣٠ دا، یەكەم ئیمزای بەغدایە دوای لكاندنی كوردستان بە عێراقەوە، لە سەر ڕێككەوتنێك كـە هیچ حیسابێك بۆ كورد ناكات، ئاخر كە لە ساڵی ١٩٢٥ كوردستان بە عێراق لكێندرا، كورد ناوی لە ڕاسپاردەكانی كۆمەڵەی گەلاندا هاتبوو، لەبەر ڕۆشنایی ئـەو لێژنەیـەی نـاردرابووە كوردسـتان، كۆمەڵەی گەلان بەو مەرجە كوردستانی بە عێراقەوە لكاند، كە دەوڵەتی عێراق زمـانی كـوردی و خەڵكی كورد وەك فەرمانبەر لە دامودەزگاكانی بەڕێوەبردندا لەبەرچاو بگیرێـن، پـاش ئـەوەی لـە ڕاسپاردەی كۆمەڵەی گەلاندا بەو شێوەیە ناوی كورد هات، لە ڕێككەوتنی سـاڵی ١٩٣٠ی نێـوان عێراق و بەریتانیادا بە هیچ شێوەیەك ناوی نەهات، ئەمەش بووە مایەی نـاڕەزایی كـوردو ڕۆژی ٦ ی ئەیلوولی ١٩٣٠ خۆپێشاندانێكی گەورە لەبەردەركی سەرای سلێمانی كراو خوێن ڕژا، دواتر ئـەو ڕۆژە لە مێژووی كورد بە ڕۆژی شەشی ئەیلوولی ڕەش ناسرا، كورد لـە یەكـەم ڕێككـەوتن كـە بـە ئیمزای بەغدا كرا وەدەنگ هات، بەغدا چەند ڕێككەوتنێكی دیكەشی كرد كـە بەهۆیانـەوە زیـاتر گەمارۆی كوردی دەدا، وەك پەیمانی سەعد ئابادی ١٩٣٧ و پەیمانی بەغدای ١٩٥٥. ئـەو پەیمانانـە بەغدای گەیاندە لووتكەی غرورو لەخۆبایی بوون و، بەو هۆیەوە زیاتر پەنای بۆ توندوتیژی و ڕێگەی شەڕ بەرامبەر كورد برد، بۆیە دوای ڕووخانی كۆمـاری كوردسـتان لـە مهابـاد، دەوڵـەتی ئێـران و توركیاو عێراق بۆ لێدانی كورد لەسەر خەت بوون، بـارزانیی نـەمرو هەڤاڵـەكانی تـا لـە ڕووبـاری ئاراس پەڕینەوەو گەیشتنە خاكی یەكێتی سۆڤیەت، شەڕی هەر سێ دەوڵەتیان كرد، شێخ ئەحمەدی بارزان و هەموو ئەو تێكۆشەرانەی دیكەش كە لەگەڵیدا گەڕانەوە عێراق، بۆ ماوەی ١٢ ساڵ خرانە بەندیخانەوە، هەروەها ئەو چوار ئەفسەرە كوردەی بەهۆی ئـەوەی بەشـداری كۆمـاری كوردسـتانیان كردبوو لەسێدارە دا.

## سەردەمی دەسەڵاتی

## ناسیونالیستانی عەرەب

دوای ١٩٥٨ وەرزێکی دیکەی ئیمزاکردن و پاشگەزبوونەوە لە ئیمزا دژی کورد دەستی پێکرد، دەستووری نوێ لە ماددەی سێیەمدا کوردو عەرەبی بە هاوبەش لە نیشتمان لە قەڵەمدا، بەڵام زۆری نەبرد بەغدا لێی پەشیمان بۆوە، دوای زاڵبوونی قەومییەکانی عەرەب بەسەر دەسەڵاتدا، زۆرترین ئیمزا دژی کورد کراو، بەغدا ڕێزی لە ئیمزاکانی خۆی لە ڕێککەوتن لەگەڵ کورد نەگرت، چونکە بە درێژایی شۆڕشی ئەیلوول، کورد هەمیشە ئامادەبووە بە ئاشتی و زمانی گفتوگۆ مافەکانی دەستکەوێت، بۆیە چەندین ڕێککەوتنی لەگەڵ بەغدا کرد، بەڵام بەغدا دوای ئەوەی هەلی بەهێزبوونەوەی دەست دەکەوت پەشیمان دەبۆوەو ڕێزی لە ئیمزای خۆی نەدەگرت، بۆ نموونە ڕێککەوتنی ٢٩ ی حوزەیرانی ١٩٦٦ و ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ ، بەغدا لە ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئادار پەشیمان بۆوەو ڕێککەوتنی ٦ ی ئاداری ١٩٧٥ ی لەگەڵ شای ئێران دژی شۆڕشی کورد ئیمزا کرد، بەغدا بەوپێیەی لەگەڵ گەورەترین شۆڕشی کورد لە گەورەترین ڕێککەوتن (کە ڕێککەوتنی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠بوو) پەشیمان بۆوە، دوای ١٩٧٥ هەوڵی دا شێوازێکی دیکەی وتووێژ بگرێتەبەر، کە لە هەمان کاتدا درزی گەورە بخاتە ناو ڕیزەکانی بزووتنەوەی رزگاریخوازی کوردستان، ئەمجارە بۆ گفتوگۆ هەر جارە ڕووی لە حزبێك دەکرد.

## لە عێراقی نوێشدا

## کولتوورێك هێشتا ئامادەیە

دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس لە ٢٠٠٣ دا، عێراق چووە قۆناغێکی نوێوە، بۆیە دەکرێ بەو عێراقەی دوای ڕووخانی ڕژێمی سەدام حسێن بگوترێ عێراقی نوێ، چونکە نەمانی دکتاتۆرییەت دەرفەتێکی بۆ تەواوی هێزە سیاسییەکان هێنایە پێشەوە، کە بەشداری لە پرۆسەی سیاسیدا بکەن، کورد وەك هێزە هەرە کاراکە بەشداری ئەو قۆناغە تازەیەی کرد، چونکە ئەزموونێکی حوکمڕانیی بە هەموو کەموکوڕییەوە هەبوو، بۆیە وەك یاریکەرێکی کارا لە گۆڕەپانی سیاسی عێراق دەرکەوت.

کورد لە داڕشتنەوەی دەوڵەت لە فۆڕمێکی نوێدا ڕۆڵی بینی، بەجۆرێك کە ئەم قۆناغەی دەوڵەتی عێراق لەسەر پرەنسیپی ڕێککەوتن بنیاتنرا، دەستووریش ڕەنگدانەوەی فرە پێکهاتەیی و ڕێککەوتن

بوو، مافی لە نێو ئـەو دەسـتوورەدا کۆکرایـەوە، بـەڵام بەدرێـژایی حـەوت سـاڵی دوای نووسـینەوەی دەستوور(٢٠٠٥) جارێکی دی جێبەجێ نەکردنی دەستوور لای بەغدا سـەری هەڵدایـەوە، ئـەم پشـت کردنە لە دەستوور بەغدای بەلای ئەوەدا بردەوە، جارێکی دی مەیلی خۆ سەپاندن و حـوکمی تـاکڕەوی چەکەرە بکاتەوە، ئەمەش لە هەڵسوکەوتی نوری مالیکی سەرۆك وەزیران بەدی دەکرێت، ئەوەی جێـی پرسیارە ئەوەیە، کـە مـالیکی بـە پێـی ڕێککـەوتنی هـەولێر ئـەو پۆسـتەی وەرگرتـووە، واتـە بـە ڕێککەوتنی لایەنەکانی بەشدار لە ڕێککەوتنی هەولێر، کەواتە دەبوو ئـەویش داخـوازیی لایەنـەکانی دیکە جێبەجێ بکات، کورد بەو ڕێککەوتنە کارنامەیەکی ١٩ خاڵی داوەتـە حکومـەتی مـالیکی و لەسەری بوو جێبەجێیان بکات بەڵام خۆی لێ دزییەوە، نەك هـەر ئـەوە، بـەڵکو کـار بـەوە گەیشـت جارێکی دی مەترسی دروست بوونەوەی دکتـاتۆرو حـوکمی تاکەکەسـی سـەرهەڵداتەوە، کـە بـەلای هەموو پێکهاتەکان، بەتایبەتیش کورد بەهیچ شێوەیەك قبوڵ ناکرێت.

جێگەی نیگەرانییە کە لە قۆناغی دوای نەمانی دکتاتۆرییەت، جارێکی دی بەغدا ڕێز لـە ئیمـزا ناگرێت و، لە ڕێککەوتن لەگەڵ کـورد خـۆی دەدزێتـەوە، ئەمـەش ئاماژەیـەکی دیـارە کـە هێشـتا کولتووری خۆدزینەوە لە ڕێککەوتن لەگەڵ کورد، لە بەغدای بە حیساب پایتەختی وڵاتی فرە پێکهاتە ئامادەیە، ئەم ئاراستەیەی بەغدا بە هیچ شێوەیەك لەگەڵ خواستی ئێستای عێراق تێکناکاتەوە.

ئەگـەر بڕیاربێـت عێـراق وڵاتێکـی دیمـوکراتی و هـی هـەموو پێکهاتـەکان بێـت، پێویسـتە ڕێککەوتنی بەغدا لەگەڵ کورد، ڕێککەوتنی ڕاستەقینەبێت، نەك بۆ کات بەڕێکردن ئیمزا بکرێـت و دواتر ڕێزی ئەو ئیمزایە نـەگیرێت، ئـەم شـێوە مامەڵەکردنـە، مامەڵـەی وڵاتـی پـەراوێزکردنی پێکهاتەکان و دکتاتۆرییەتە، بۆیە ئەگەر کورد لە ١٩٣٠ لەو ئیمزایەی بەغـدا لەسـەر ڕێککـەوتن لەگەڵ بەریتانیا کردی وەدەنگ هاتبێ، هەرگیز ڕێی تێناچێت لەم قۆناغەدا، کە کورد وێڕای ئـەوەی لە عێراقدا کاریگەریی هەیە لە ئاستی نێودەوڵەتی و ناوچەکەشدا پێگەی خۆی هەیە، لەو هەوڵـەی بەغدا بۆ ئیمزاکردن و ڕێز نەگرتن لە ئیمزا و پاشگەزبوونەوە لە ڕێککەوتن لەگەڵ کورد بێ دەنگـی لێبکات، ئەگەر لە سەدەی ڕابـردوودا کـورد بـێ دەنگـی هەڵنەبـژاردبێ، چـۆن لـەم سـەدەیە کـە سەردەمی گەلانە، بێ دەنگی لەبەرامبەر ئەو گرووپ و ناوەندانە هەڵدەبژێرێ، کە دەیانەوێ کۆسـپ و تەگەرە بخەنە ڕێگەی گەیشتن بە مافە ڕەواکانی.

٢٠١٢/٦/٢٥

# هەوڵی کورد لە نەهێشتنی مەرکەزیەتدا

عێراق بە پێی دەستوور وڵاتێکی فیدراڵییە، کەچی لە بەغدا چاو لـە دەسـتوور ناکرێـت، تەنانەت لە ڕاگەیاندندا هەر دەگوترێت عێراق، لە کاتێکدا پێویستە بە پێی دەستوور بگوترێ عێراقی فیدراڵ، ئەمەش بـە ئاشـکرا نییـەتی بەغـدا بەرامبـەر دەسـتوورو، خۆدزینـەوە لـە جێبەجێ کردنی ئەو دەستوورەو، پشتکردن لە فیدراڵی و بادانەوە بەلای مەرکەزیەتـدا پیشـان دەدات، ئەمـەش سەرچـاوەی پشـێوی و ئاڵۆزییـە، کـارکردن بـۆ مەرکەزیـەت لـە سـایەی دەستوورێکدا کە پێکهاتەکانی وڵات لەبەرچاو دەگرێت، ئاماژەیـەکی ترسـناکە بـۆ ئاینـدەی عێراق و، ئەگەری پێکەوەژیانی پێکهاتەکان لاواز دەکات.

هەر لە سەرەتای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، مەرکەزییەت لە حوکمڕانیدا چـەکەرەی کردووە، لە بناغەی دامەزراندنی دەوڵەتـدا پـرس بـە دانیشـتوانی عێـراق نـەکراوە، چـونکە دەوڵەتەکە زادەی شەڕی یەکەمی جیهانەو هێزە گەورەکانی جیهـان، بەتایبـەتیش بـەریتانیاو فەرەنسا، بە پێی بەرژەوەندیی خۆیان نەخشەی وڵاتێکی نوێیان بە ناوی عێراق داڕشت، مەلیك فەیسەڵ لـە دەرەوەڕا هێنـدرا، جگـە لـە مـەلیك، دەسـتەبژێری حـوکمڕانی عێـراق بـەزۆری لەوانەبوون کـە لـە دەوڵـەتی عوسمانیـدا ئەفسـەرو کاربەدەسـت بـوون، ئەوانـەش بـە هـۆی مەرکەزیـەتی دەوڵـەتی عوسمـانی، بـوون بـە بناغەداڕێـژەری تونـدکردنی مەرکەزییـەت و کۆکردنەوەی دەسەڵات لە بەغدا، بەو مانایە هێشتا کوردستان بە عێراقەوە نەلکێندرابوو، کە بناغەی دەوڵەتێکی مەرکەزی داڕێژرا، لێرەوەیە تێدەگەین کە کورد چ دەردەسەرییەکی لـەڕێی نەهێشتنی مەرکەزییەتـدا دیتـووە، چـونکە هەمیشـە هەوڵیـداوە خـۆی لـەو مەرکەزییەتـە ڕاپسکێنێ، مەرکەزیش هەوڵی داوە بەزۆر بیخاتە ژێر دەسەڵاتی خۆیەوەو خێروبێری بخوات و،

لە بۆتەی کولتووری خۆیدا بیتوێنێتەوە، بەم پێیەش هەر کوردێك لە مەرکەز هەڵگەڕابێتەوە بە یاخی لە قەڵەمدراوە، سزای یاخی بوونیش لە دەوڵەت توندترین سزابووە.

ئەگەر بناغەی دەوڵەت لە عێراقدا لەسەر مەرکەزییەت دامەزرابێت، ئەوا بناغەی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستانیش هەمیشە لەسەر بنەمای خۆڕاپسکاندن لە مەرکەزییەت دامەزراوە، چونکە لە سایەی مەرکەزییەتدا، کوردستان خراوەتە دەرەوەی خزمەتگوزاری و، هەر بە دواکەوتوویی هێڵدراوەتەوە، بۆیە سەرکردەکانی کورد بە هۆی داواکاری بۆ باش کردنی ژیانی خەڵکی کوردستان، هەڕەشەی لەداردانییان لێکراوە، لە سەرەتای سەدەی بیستەم شێخ عەبدولسەلام بارزانی هەوڵی خۆڕاپسکاندنی لە مەرکەزییەت داوەو، بناغەی لامەرکەزییەتی ئیداریی داناوەو هەوڵی داوە پەیوەندی دیپلۆماسیی لەگەڵ هێزە گەورەکان گرێبدات، ئاستی وەدیهێنانی مافەکانی کورد بەرزبکاتەوە، ئەگەر سەیری داخوازییەکانی ساڵی ١٩١١ ی شێخ عەبدولسەلام بارزانی لە دەوڵەتی عوسمانی بکەین، دەبینین ویستویەتی تایبەتمەندی بە کوردستان بدات و لە دەوروبەر جیای بکاتەوەو لە مەرکەزییەتی دەوڵەتە داگیرکەرەکان دووری بخاتەوە، کاتێ داوای کرد گەورە بەرپرس و فەرمانبەرانی کوردستان کورد بن و، ئەو پارەو پولەی لە خەڵکی کوردستان کۆدەکرایەوە بۆ دەوڵەت، وەك ئەو پارەیەی لە جیاتی چوونە عەسکەری دەیانداو شتی دی، لە ئاوادانکردنەوەی کوردستان خەرج بکرێت و، خوێندن و نووسراوی ڕەسمی بە زمانی کوردی بن، نەك هەر ئەوە، بەڵکو هەوڵیداوە لە ڕووی مەزهەبیشەوە تایبەتمەندی بە کوردستان بدات و لە دەوروبەر جیای بکاتەوە، کە باشترین هۆکاری یەکانگیری کوردو خۆپاراستنە لە کاریگەریی دەوروبەرو سەرەنجام دوورکەوتنەوە لە مەرکەزییەتی داگیرکەران، دەوڵەت لە بزاڤی شێخ عەبدولسەلام بارزانی ترسا، بۆیە هەوڵی زۆریدا تا بە هەر شێوەیەك بێت ئەو ڕابەرەی کورد لەناوببات، ئەوەبوو بە پیلانی خیانەتکارانە دەستگیر کراو ساڵی ١٩١٤ لە موسڵ لەسێدارەدرا.

خۆڕاپسکاندن لە مەرکەزییەتی داگیرکەران و هەوڵی خۆبەڕێوەبەری لە زۆر ناوچەی کوردستان پەرەی سەند، کاتێ لە دوای کۆتایی هاتنی شەڕی یەکەمی جیهان و هاتنی ئینگلیز بۆ کوردستان، شۆڕشی شێخ مەحمود لە ناوچەی سلێمانی هەڵگیرسا، پەیوەندی لە نێوان هەردوو مەکۆی شۆڕش بارزان و سلێمانی پەیدابوو، شێخ ئەحمەدی بارزانی لە ١٩١٩ مەلا مستەفا بارزانیی نەمری بە سەرکردایەتی هێزێکی ٣٠٠ جەنگاوەر بۆ پشتیوانی شۆڕش ناردە سلێمانی، هەوڵی شێخ عەبدولسەلام بارزانی و ئەم پردی پەیوەندییەی نێوان دوو ناوچە کە

بوونە سەنتەری شۆڕش و ڕاپەڕینەکانی کوردستان، هێندەی دی پەرەی بە هێزی لامەرکـەزی و سەرەتایەکی دیکەی هەڵچنینی هێنانەدیی خەونی گـەورە دا، کـە بناغەیـەکی تۆکمـەی بـۆ ڕەتکردنەوەی مەرکەزییەت لە حوکمڕانی دا دارشت. لە لایەکی دیکەوە، لە بەغـدا پـەرە بـە حوکمی مەرکەزی دەدرا، بەمەش لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق، بارودۆخ بەم شـێوەیە بوو: بەغدایەکی پێداگر لە سەر مەرکەزییەت، کوردستانیش لە ڕێی شۆڕشـەوە ڕەتکردنـەوەی مەرکەزییەتی ڕاگەیاندبوو، ویلایەتی موسڵیش لە نێـوان عێـراق و تورکیـا بـە هەڵواسـراوی مابۆوە، کەواتە کورد مەرکەزییەتی بەغدای پایتـەختی دەوڵـەتی تـازە دامـەزراوی عێراقـی ڕەتکردەوە، بەڵام ئیرادەیەکی نێودەوڵەتی، لە ڕێی بڕیاری کۆمەڵـەی گـەلان، کوردسـتانی بـە عێراقەوە لکاند.

لە سەردەمی پاشایەتیدا، دۆخـی ئیقلیمـی و نێودەوڵـەتی و خولیـای مـەلیك و گرووپـی حوکمڕانان، برەویان بە دەسەڵاتی مەرکـەزی دا، لـە کۆتـایی سـییەکان و کۆتـایی چـلەکانی سەدەی بیست، ناسیونالیزمی عەرەبیش لە مەیدانەکەدا دەرکەوت و خـۆی نمـایش کـرد، بـە تایبەتیش لە سەرەتای چلەکاندا، دوای ئـەوەی ناسـیونالیزمی عـەرەبی لـە ڕێـی کۆدەتـاوە دەسەڵاتیان لە سەرەتای شەستەکانەوە وەرگرت، بیری مەرکەزییەت لە حوکمڕانیدا زیاتر برەوی سەند، تا بەوە گەیشت ناسیونالیستە عەرەبەکان لە ڕێـی حزبـی بەعسـەوە، مەرکەزییـەتیان ئەوەندە توند کرد، گەورەترین کارەساتیان بەسەر کوردستان و عێراقدا هێنا، کە تـا ئـەمڕۆش کاریگەرییەکانی ماوە. ناسیونالیستانی عـەرەب لـە تونـدکردنی مەرکەزییەتـدا، فشـارێکی زۆریان خستە سەر کورد، ئەمەش سەری بۆ ئەوە کێشا، کە لە ١٩٦١ تا ١٩٩١ شـۆڕش لـە کوردستان بەردەوام بێت، بە درێژایی ئەو ماوەیەی شـۆڕش، نـاوە نـاوە کـورد لەگـەڵ بەغـدا کەوتۆتە گفتوگۆوە، گەورەترین گرێی بەغدا وازنەهێنان بووە لە مەرکەزییەت و لەو ڕێیەشەوە دەست بەرنەدان لە هەندێ ناوچەی بە عەرەبکراو، کە تا ئەمڕۆش بوونەتە یـەکێك لـە گرفتـە هەڵواسراوەکان و، بەغدا خۆ لە چارەسەرکردنیان دەدزێتەوە.

بەر لە ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس، هەرێمی کوردستان بۆ ماوەی ١٢ ساڵ(١٩٩١-٢٠٠٣) لە دەسەڵاتی مەرکەزیی بەغدا خۆی دابڕاند،ساڵی ١٩٩٢ لەڕێی پەرلەمانەوە فیـدراڵیی وەك شێوازی پێکەوە ژیان لەگەڵ بەغدا دیار کرد. واقیعی هـەرێمی کوردسـتان لـە یاسـای کـاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت ناسێندراو، گرفتە سەرەکییەکانی وەك ناوچە دابڕێندراوەکان لە مـاددەی ٥٨ ی ئەو یاسایەدا خۆی دیتەوە، دواتر لە دەسـتووری سـاڵی ٢٠٠٥ لـە مـاددەی ١٤٠ دا.

دوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام، پێکهاتەکانی عێراق لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە بەڕێوەبردنی وڵات بەجۆرێك بێت، هیچ پێکهاتەیەکی نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبی پشت گوێ نەخرێت، بەڵام داڕشتنی دەستوورێکی نوێ مشتومڕی زۆری لێکەوتەوە، لەبەر دوو هۆ، یەکیان ئەوەبوو کە هەر پێکهاتەیەك هەوڵی دەدا پەراوێز نەخرێت و زۆرترین تایبەتمەندی خۆی بخاتە نێو دەستوورەوە، ئەوی دیکەشیان ئەوەبوو دیاربوو مەیلێکی خۆسەپێن هەیەو دەیەویست دەستوور بە جۆرێك بێت، بوارێك بۆ خۆسەپاندن و قۆرخ کردنی دەسەڵات هەبێت، تا لە پەنای دەستووردا، ئەوەی دەیەوێ جێبەجێی بکات، کورد لەم عێراقە نوێیەدا هێزێکی کارابوو بۆ چەسپاندنی بنەماکانی دیموکراسی و فرەیی لە دەستووردا، زێدەڕۆیی نییە ئەگەر بڵێین کورد نەبوایە دەستوور بە جۆرێکی دی دادەڕێژرا، بڕیار بوو عێراقی دوای سەدام عێراقێکی دی بێت، بەڵام وەك لە پێشەوە باسمان کرد، تەلاری ئەو دەوڵەتە دوای شەڕی یەکەمی جیهان لەسەر بناغەی مەرکەزییەت هەڵنرا، بۆیە هەموو ئەو هێزو گرووپانەی لە ڕێی کۆدەتاوە دەسەڵاتیان وەرگرتووە، مەرکەزییەتیان بە باشترین میکانیزم بۆ درێژەدان بە دەسەڵات داناوە، ناسیونالیستانی عەرەب لەمەدا زۆرترین ڕۆڵیان هەبوو، ئەوان هاتن کاریان لەسەر ئەوە کرد، کە دوورکەوتنەوە لە مەرکەزییەت بە مانای ڕێگەدان بە هێزو ئاراستەی دیکەی سیاسی، ئەمەش لە فەرهەنگی ناسیونالیزمی عەرەبیدا نییە، تێزی ناسیونالیزمی عەرەبی کاری لەسەر ئەوە کرد، کە بێجگە لە عەرەب هیچ پێکهاتەیەکی دی حیسابی بۆ نەکرێ، ئەمەش سەری بۆ ئەوە کێشا کە هەر داواکارییەك بۆ نەهێشتنی مەرکەزییەت بە دژایەتی کردنی عەرەب و پارچە پارچە کردنی عێراق لە قەڵەم بدرێت، ئەمڕۆ لە عێراقدا جارێکی دی ئەم تێزە لە برەودایە، چونکە ڕێگە بە قۆرخکردنی دەسەڵات دەدات، بۆیە هەر هێزێك بیەوێت تەواوی دەسەڵات لە عێراق بە دەستەوە بگرێت، کار لەسەر ئەوە دەکات کە دژایەتی کردنی مەرکەزییەت، بە پارچە پارچە کردنی عێراق دابنێ، شیعەکانیش کە دەیانەوێ عێراق کۆنترۆڵ بکەن، کار بە مەرکەزییەت دەکەن، هەندێ هێزی شیعەکان ناوە ناوە باس لە فیدراڵی دەکەن، بەڵام پێ دەچێ ئەمەش هەر بۆ جۆرە فشارێك بووبێت، بۆ ئەو کاتانەیە کە تیایدا هەست بەوە دەکەن عێراقیان پێ کۆنترۆڵ ناکرێت. سوننە ئێستاشی لەگەڵ دابێت هەر بەهەوای ڕابردوو دەژیت، کە هەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە تا ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام(١٩٢١-٢٠٠٣) دەسەڵات بەدەست ئەوانەوە بووە.

مەرکەزییەت لە حوکمڕانیدا، زەمینەیەکی لەبار بۆ تاکڕەوی فەراهەم دەکات، بۆیە ئەوانەی شەیدای قۆرخکردنی دەسەڵاتن پەنای بۆ دەبەن، نوری کامل مالیکی سەرۆك وەزیرانی عێراق، دەیەوێ عێراق بە ئاراستەی مەرکەزییەت بباتەوە، ئەمەش لە هەڵسوکەت و چۆنیەتی مامەڵەکردنی لەگەڵ دەستووردا بەدی دەکرێت، بڕیار بە پێچەوانەی دەستوور دەدات، بەو پێیەی بە پێی دەستوور سەرۆك وەزیران فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانە، بە ئارەزووی خۆی فەرماندەی فیرقە دادەنێ و ژمارەی سەرباز و فیرقەی عەسکەری بە پێی ویستی خۆی دادەنێ نەك بەپێی دەستوور، ئێستا مالیکی و ئەوانەی دەیانەوێت مەرکەزییەت لە حوکمڕانیدا هەبێ، هەرێمی کوردستان بە گەورەترین کۆسپ دادەنێن، چونکە بەهۆی زاڵبوونی تیۆری مەرکەزییەت و تاکڕەوی، هێزە دیموکراتەکانی عێراق هەمیشە ڕووبەری کارکردنیان بەرتەسك بۆتەوە، بۆیە ئەوانەی دەیانەوێ دەسەڵات قۆرخ بکەن، هیچ حیسابێك بۆ هێزە دیموکراتەکان ناکەن، تا ئێستاش زۆربەی کەسایەتییە ڕووناکبیرو ئەکادیمییە دیارەکانی عێراق لە دەرەوەی وڵات دەژین، ژمارەیەکییان بۆ پشتیوانی کردنی عەرەب لە دۆزی کورد کۆمەڵەیەکیان دامەزراندووەو(گردبوونەوەی عەرەبی بۆ پشتیوانی کردن لە دۆزی کورد) لە ٢٠١٢ کۆنگرەیەکیان لە هەولێر گرێدا، بەڵام ڕاگەیاندنی عەرەبی گرنگی پێنەدا، زەمینەیان بۆ نارەخسێ ئەو جۆرە کۆنگرانە لە بەغدا بەڕێوەببەن، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو ڕووناکبیرە عەرەبانەی واقیعیانە بیر لە پێکەوەژیانی پێکهاتەکان دەکەنەوە، دوور لە زاڵبوونی یەکێکیان و پەراوێزخستنی ئەوی دی، هێشتا ئەو هێزە نین قورساییان لە سەر گۆڕەپانی سیاسیی عەرەبیدا هەبێت، مەبەست کەم کردنەوە نییە لە پێگەی ئەو ڕووناکبیرو دیموکراسیخوازانەی عەرەب، بەڵام ڕاستییەك هەیە نابێ لەبیر بکرێ، ئەویش ئەوەیە کە هەمیشە کورد لە عێراقدا تاکە پشتیوانی ڕاستەقینەیان بووە، کوردستان پەناگەیەکی ئارام بووە، بۆ هەناسەدان و قسەکردنی جدی لەبارەی مەسەلە چارەنووسسازەکانی عێراق، بە ئێستاشەوە.

ئەگەرچی کورد خەباتی بۆ سەندنەوەی مافە زەوتکراوەکانی کردووە، بەڵام لەو کاروانەدا کاری بۆ ئەوەش کردووە، دیموکراسی لە عێراقدا بەرقەرار بێت، ئەمەشی نەشاردۆتەوە، بەڵکو ساڵانێکی دوورو درێژ، دروشمی ناوەندی بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان (دیموکراسی بۆ عێراق و ئۆتۆنۆمی بۆ کوردستان) بووە، چالاکی سیاسیی کورد لەبەغدا، وێڕای خەبات لە پێناوی وەدیهێنانی مافی کورد، ڕۆڵی لە بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی دژە مەرکەزییەت هەبووە،

دەکرێ دامەزراندنی پارتی دیموکراتی کوردستان لە بەغدا ساڵی ١٩٤٦ بە سەرەتایەکی گرنگ لە گردبوونەوەی توانای سیاسی و ڕووناکبیری و ڕاگەیاندنی کورد دابندرێ، کە دواتر لە پەنجاکان و بە تایبەتیش لە سەرەتای شەستەکانی سەدەی بیست، لە ڕێی ڕۆژنامەی (خەبات) ی زمانحاڵی پارتییەوە، لایەنی خراپی مەرکەزییەت خراوەتەڕوو و دژی ئەو ماددەیەی دەستوور وەستاوە کە عێراقی بە بەشێك لە نیشتمانی عەرەب لە قەڵەم داوە، لە سەر ئەم هەڵوێستە ڕۆژنامەکە داخراوەو سەرنووسەرەکەیشی مامۆستا ئیبراهیم ئەحمەد زیندانی کراوە.

دەرکەوت کە مەرکەزییەت لە حوکمڕانیدا، بەهۆی تاکڕەوی و نەخوێندنەوەی بۆچوون و تێزەکانی دی، چ کارەساتی بەسەر عێراقدا هێناوە، هەموو ئەو شەڕوماڵوێرانییانەی بەسەر ئەم وڵاتەدا هاتوون، لە ئەنجامی تاکڕەوی حکوومەتی بەغدا بووە لە بڕیاردا. ئەمڕۆ عێراق پێویستی بەوەیە خۆی لە ئاسەواری حوکمی تاکڕەوی و مەرکەزییەت ڕزگار بکات، هەقە لەمەشدا هەوڵی کورد بە ئیجابی وەربگرن، بەڵام بەداخەوە، لە جیاتی ئەوەی حکوومەتی بەغدا مل بداتە بەر ئاوەدانکردنەوەی عێراق و، کەمێك لە خەمی خەڵکی عێراق کەم بکاتەوە، کە تائێستاش بەدەم ئازاری شەڕو کاولکارییەوە دەتلێنەوە، کەچی خەمی هەرە گەورەی سەرۆك وەزیران نوری مالیکی، کڕینی باڵەفڕی جەنگ f١٦ و چەکی قورس و پڕچەك کردنی سوپایە، بۆ بەهێزکردنەوەی دەسەڵات و توندکردنەوەی مەرکەزییەت، تەنانەت بە بێ هیچ شەرم کردنێك، لە بەغدا قسە لەبارەی هێرش کردنە سەر هەرێمی کوردستان دەکرێت، ئەو گرووپەی بەم شێوەیە لە بەغدا حوکمڕانی دەکات، دەیەوێ عێراق بباتەوە دۆخی شەڕو، عێراقییەکان بخاتەوە بەردەم چارەنووسێکی نادیار، لە لایەکی دیکەشەوە، ئەگەر بەغدا چاوی لەوە بێت، کە جارێکی دی کوردستان بخاتەوە ژێر مەرکەزییەتێکی توند، کە لە ڕاستیشدا هەر بەو ئاراستەیەدا کاردەکات، چونکە ڕایدەگەیەنێ کە بودجەی ببڕێ و لێناگەڕێ خەڵکی کوردستان سوود لە سامانەکەیان وەربگرن، بەغدا دەیەوێ سویچی کارەبای کوردستانی لەبەر دەستدا بێت، چۆن سەدام دوای ڕاپەڕین تاوەرەکانی کارەبای نێوان کوردستان و بەشەکانی دیکەی عێراقی تێکداو کارەبای لەسەر کوردستان بڕی، جارێکی دی هەمان شت بکرێتەوە، بەغدا دەیەوێ کورد بەهیچ شێوەیەك دەست بۆ نەوت نەبات و، پێویستییەکانی کوردستان لە بەغداوە بێت، لە لایەکی دیکە ئامادە نییە ئەو بەشەی بۆ کوردستان داندراوە بەتەواوی بیدات، هەرێمی کوردستان قبوڵی نییە جارێکی دی بخرێتەوە ژێر حکوومەتێکی مەرکەزی، ئەگەر لە سەرەتای سەدەی بیستەمەوە، کورد داوای ئەوەی کردبێت، خۆی بەڕێوە ببات و

ولاَتی ئاوەدان بکرێتەوە، هیچ ڕێی تێناچێت دوای ١٠٠ ساڵ جارێکی دی بچێتەوە ژێر مەرکەزییەتێکی توونددەوە، ئاخر لە سەرەتای سەدەی بیستەم، کورد ٤٠٠ ساڵ زیاتر بوو ببووە بەرداشی نێوان دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتی ئێران و، بەو حاڵەشەوە کەوتە نێو شەڕی یەکەمی جیهانەوەو، دوای شەڕ کوردستانی بەشی عوسمانی بە سەر هەرسێ دەوڵەتی عێراق و تورکیاو سوریا دابەش کرا. ئێستا دنیا گۆڕاوەو سەردەمی گەلانە، نابێ بەغدا پێی وابێ بەزۆر هەرێمی کوردستان ڕاکێشێتەوە ژێر حوکمی مەرکەزی، ناکرێ واوەتریش بچێت و بڵێ کۆڵەگەکانی دەوڵەت لە عێراقدا لەسەر مەرکەزییەت دامەزراوە، هەقە بەغدا ئەوەی لەبەرچاو بێت، کە سەردەمی مەرکەزییەت لە حوکمڕانیدا بەسەرچوو، ئەو ڕەشەبایەی ئەمجارە هەڵی کردووە، ئەو کۆڵەگانەش تێك دەشکێنێ کە بەغدا پێیانەوە دەنازێت و بە پیرۆزیان دەزانێت، ئەگەر بەغدا مەرکەزییەت توڕ هەڵبدات و مل بۆ دەستوور و جێبەجێ کردنی یاسا بدات، ئەوا تێکدانی کۆڵەگەکانی مەرکەزییەت ئازاریان نابێت، بەڵام ئەگەر پشت لە دەستوور بکات و هەر لەسەر ئەوە سوور بێت ، کە مەرکەزییەتی حوکمڕانی بە تاکە جێگرەوەی فەرمانڕەوایەتی بزانێ، ئەوا لەو حاڵەتە، هەڵتەکاندن و لە ڕەگوڕیشە دەرهێنانی کۆڵەگەکانی مەرکەزییەت بێ ئازار نابێت.

٢٠١٢/٧/٢٣

## ئەنجوومەنی دانوستاندن لەگەڵ بەغدا

## وانەیەك لە ڕابردوو.. پەندێك بۆ ئەمڕۆو سبەی

هێشتا کاروانی دانوستاندنی نێوان کوردو بەغدا بەردەوامە، ئەگەر لە شۆڕشی ئەیلوولەوە دەست پێبکەین، ئەوا زیاتر لە ٥٠ ساڵە، وێڕای شەڕو کاولکاری و جینۆسایدکردنی کوردو خەباتی چەکداریی خەڵکی کوردستان، هەمیشە جوڵانەوەی ڕزگاریخوازی کوردستان، کەناڵی گفتوگۆو دانوستاندنی بە گرنگ زانیوە، ئەوەشی لەلا ڕوون بووە، کە لە بەغدا مەیلی کات بەسەر بردن و خۆدزینەوە لە گفتوگۆ هەبووەو هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا، تا ڕێگای ئاشتی و گفتوگۆ هەبووبێ، پەنای بۆ خەباتی چەکداری نەبردووە، بۆیە کۆبوونەوەی ڕاوێژکاریی پەرلەمان لەسەر داوای حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ڕۆژی ٢٠١٢ /٧/٦ بۆ پێکهێنانی ئەنجوومەنی باڵای دانوستاندن لەگەڵ حکوومەتی عێراقی فیدراڵ، بناغەی قۆناغێکی نوێیە لە درێژەدان بە دانوستاندن لەگەڵ بەغدا، کە خوێندنەوە هەڵدەگرێت.

گفتوگۆ، دانوستاندن، یان (مفاوەزات) ئەوەی زیاتر لەسەر زمانی خەڵك بووە بە ئێستاشەوە، دەمێکە شوێنی لە یادگەی خەڵکی کوردستاندا کردۆتەوە، ئەمەش لەوەوە هاتووە، کە شێوازێکی دیکەی خەباتە، بۆ وەدەستهێنانی ماف، لە لایەکی دیکەشەوە، دانوستاندن ڕێگایەکی ئاشتیخوازانەیەو خوێنی تێدا نارژێ، ئەگەرچی ئەمە بۆ کورد شتێکی دیکەیە، چونکە لەمەشیاندا ئازاردراوە، نموونەش زۆرە، بەدرێژایی مێژووی تێکۆشان و مفاوەزات، هەوڵدراوە لە پەنای ئاشتیدا زەبری لێ بوەشێندرێ، وەك هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزانی هەمیشە لەیاد لە مانگی کانوونی یەکەمی ١٩٧٠ لە بەغدا کە بۆ بەدواداچوونی هەندێ بابەتی ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئادار چووبوو، هەروەها هەوڵی تیرۆرکردنی بارزانیی نەمر لە ١٩٧١/٩/٢٩ لە حاجی ئۆمەران، ئەمەو لە ١٩٧٢ هەوڵێکی دیکەی تیرۆرکردنی بارزانی پوچەڵ کرایەوە، لە کاتێکدا ١٩٧٠-١٩٧٤ ماوەی ئاشتی بوو لە نێوان شۆڕشی کوردستان و بەغدا، بەپێی ڕێککەوتننامەی ١١ ی ئاداری ١٩٧٠ ، یان بەغدا پەنای بۆ بەرێکردنی کات بردووە، چونکە تا ئێستا، بڕیاری بەغدا بۆ گرتنەبەری ڕێگەی

گفتوگۆ و دانوستاندن، له ڕوانگەی بڕوابوونی به ڕێگەی ئاشتییەوه نەبووه، بەڵکو له کاتی لاوازی و ناچاریدا، لەگەڵ کورد کەوتۆتە دانوستاندن، که دەرفەتی هاتۆتەوه پێش لێی پەشیمان بۆتەوه، بەداخەوه ئەم تێڕوانینه ئێستاش له بەغدا زاڵه.

لەبەرئەوەی دانوستاندن له پێناوی مەسەله چارەنووسسازەکانه، بڕیاردانیش له چوونه نێو پرۆسەی دانوستاندنەوه، ئەرکێکی قورسەو، وەئەستۆگرتنی ئەو بەرپرسیارێتییه مێژووییە، هێنده ئاسان نییه، بەتایبەتیش بۆ دۆخی کوردستان، که بەغدا به قەناعەتەوه نەچۆته نێو پرۆسەی دانوستاندنەوه، بۆیه هەمیشه له نێو بزووتنەوەی ڕزگاریخوازی کوردستاندا، دانوستاندن لەگەڵ بەغدا، پێویستی به بڕیاری دەستەجەمعی بووه، ئەو بڕیاره دەستەجەمعییه له کوێ دراوەو دەدرێ؟ بەو پێیەی پەیوەندیی به چارەنووسی میللەتەوه هەیه، پێویستیی به کۆدەنگی هەیه، له کوردستاندا حزبه سیاسییەکان ئەو ئەرکەیان وەئەستۆ گرتووەو، پرۆسەی دانوستاندن به چەندین قۆناغدا تێپەڕیووه، له سەردەمی شۆڕشی ئەیلوول به ڕابەرایەتی پارتی دیموکراتی کوردستان، چەندین گەڕی دانوستانی نێوان شۆڕشی کوردستان و بەغدا بەڕێوەچووه، که له لایەن شۆڕشەوه به گرنگ سەیر کراوەو، بڕیاری گونجاوی له کات و ساتی گونجاودا داوه، هەر کاتێك دەرفەتی دانوستاندن هاتبا پێشەوه، به کۆبوونەوەی بەردەوام و کۆدەنگی بڕیاری قبوڵکردن یان ڕەتکردنەوه دراوه، دیاره له ماوەی ١٩٦١-١٩٧٥ واته به درێژایی شۆڕشی ئەیلول، زۆر جار دانوستان لەگەڵ بەغدا کراوەو، لەو سەردەمەوه وشەی مفاوەزات زیاتر داکەوت، ساڵی ١٩٦٣ به فەرمانی بارزانیی نەمر کۆنفرانسی کۆیه بەڕێوەچوو، له سەر داوای بارزانی نوێنەری هەموو ناوچەکانی کوردستان لەو کۆنفرانسه کۆکرانەوەو، بارزانی خۆیشی ئامادە بوو، که زۆر به بایەخەوه دانوستاندن لەگەڵ بەغدا هەڵسەنگێندراو به کۆدەنگی پرۆژەیەك بۆ دانوستاندن گەڵاڵه کراو وەفدێك بۆ چوونه بەغدا پێکهێندرا، ئەمە لەکاتێکدا بوو که شۆڕشی کوردستان له لایەن تەنیا حزبێك که پارتی دیموکراتی کوردستان بوو ڕابەرایەتی دەکرا، دواتر ناوه ناوه بەغدا داوای گفتوگۆی کردووه، تا بەوه گەیشت که له ١١ی ئاداری ١٩٧٠ ڕێککەوتن له نێوان شۆڕشی کوردستان و حکوومەتی بەغدا کرا، هەرچەنده بارزانیی نەمر قەناعەتی لادروست ببوو، که بەغدا مل بۆ ئاشتی نادات، بەڵام لەبەر کۆدەنگی سەرکردایەتی، بەوه ڕازی بووه که دانوستان دەست پێبکرێتەوه، بۆچوونی بارزانیی نەمر ڕاست دەرچوو، ئەگەرچی بەغدا له ناچاری ملی بۆ دانوستان داو، هەرچەنده ڕێککەوتنی ١١ی ئاداری ١٩٧٠ به بەڵگەنامەیەکی گرنگی دانپێدانانی بەغدا به مافی گەلی کورد دادەندرێ،

لەگەڵ ئەوەشدا بەغدا بەدوای دەرفەتدا دەگەڕاو ویستی لە پەنای ئاشتیدا، لە بەغدا هەوڵی تیرۆرکردنی ئیدریس بارزانی دا، هەروەها هەوڵیدا بارزانیی نەمر تیرۆر بکات، دوای ئەوەی دەستی خۆیشی گرتەوە، لە ١١ ی ئاداری ١٩٧٤ بەیاننامەیەکی یەکلایەنەی ڕاگەیاندو شەڕی بەسەر کوردستاندا سەپاندەوە، لە ١٩٧٥ یش لە ڕێی ڕێککەوتننامەی جەزائیرەوە، تەنازولی بۆ شای ئێران کردو شۆڕش تووشی نسکۆ بوو.

ماوەی ١٩٧٥- ١٩٩١ قۆناغێکە، کە تیایدا بەغدا بەتەواوی، دانوستان وەك تاکتیك بۆ تێکشکاندنی کوردو پەرتکردنی زیاتری هێزە سیاسییەکان بەکاردێنێت، لەم قۆناغەدا چەندین حزب لە گۆڕەپانی سیاسیدا بوون، بەغدا هەوڵی دەدا هەرجارەو لەگەڵ لایەنێکی سیاسیدا مفاوەزات بکات، کەواتە لەم قۆناغەدا کۆدەنگی تەواوی هێزە سیاسییەکان بۆ دانوستان لەگەڵ بەغدا نەبووە، لەم ماوەیەدا ڕژێمی بەعس، نەك هەر بڕوای بە دانوستان نەبوو، بەڵکو شاڵاوی لەناوبردنی خەڵکی کوردستانی فراوانتر کرد، گەیشتە ئاستی بەکارهێنانی چەکی کیمیاوی و ئەنفالکردنی ژمارەیەکی زۆری خەڵکی کوردستان و وێرانکردنی ژێرخانی کوردستان.

دوای ڕاپەڕین و کۆڕەوی ملیۆنیی خەڵکی کوردستان، دەرفەتێکی دیکەی دانوستاندن هاتەوە پێش، ئەمجارە هێزە سیاسییەکان لە ژێر بەرەیەکدا بوون (بەرەی کوردستانی)، بۆیە ئەم دانوستانە، بە دانوستانی نێوان بەرەی کوردستانی و حکوومەتی عێراق ناسراوە، کە ماوەیەکی زۆری خایاند، بەڵام هیچی لێ شین نەبۆوە. لە ١٩٩٢/٥/١٩ هەڵبژاردن کراو پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان لەدایك بوون، بەڕێوەبردنی کوردستان لە لایەن دەسەڵاتی بەرەی کوردستانییەوە بۆ حکوومەتی هەرێمی کوردستان گوازرایەوە.

ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام لە ٢٠٠٣ سەرەتای عێراقێکی تازەی هێنایە ئارا، هەرێمی کوردستان لە هاوکێشەکانی ئەم قۆناغەدا حیسابی بۆ کرا، سەرەتا بەهۆی قورسایی هەرێمی کوردستان، وا دەهاتە بەرچاو، کە مادام تواناکانی هەرێم لە بنیاتنانەوەی عێراقی نوێدا دەخرێنەگەڕ، ئیدی پێویست بە دانوستان لەگەڵ بەغدا نامێنێ، بەڵام بە سوود وەرگرتن لە ژینگەی عێراق، ئەوەش خرایەڕوو کە لایەنە سیاسیەکانی عەرەب، دوای کەوتنەسەرپێی حکوومەتی بەغدا، کۆسپ بۆ مافەکانی کوردستان دروست دەکەنەوە، زۆری نەبرد، بۆ جارێکی دی مافی خەڵکی کوردستان، بۆوە بابەتی دانوستانی نێوان هەولێرو بەغدا، تا بەوە گەیشت واقیعی هەرێمی کوردستان، وەك خۆی بناسرێ و، مافی کوردستان لە ماددەی ٥٨ ی

یاسای کاتی بەڕێوەبەردنی دەوڵەت و، دواتر لە ماددەی ١٤٠ ی دەستووری عێراقدا چەسپێندرا، لەگەڵ ئەوەی مافەکانی هەرێمی کوردستان لە دەستووردا دانی پێدانرا، بەڵام حکوومەتی بەغدا خۆی لە جێبەجێ کردنی دەستوور دزیەوە، بەمەش پرۆسەی سیاسی عێراق و دیموکراسی لە عێراق کەوتەژێر پرسیارەوە.

بەغدا لەدوای ٢٠٠٣ وە لە دوو دەروازەوە کوردی دەدواندو، کاربەدەستان دەهاتنە پیرمام و دوکان، بەڵام دوای ٢٠٠٥ کە بۆ یەکەم جار لە پەرلەمانی کوردستان سەرۆکی هەرێمی کوردستان هەڵبژێردرا، کوردستان بووە خاوەنی یەك مەرجەع، بەمەش بەغدا ناچاربوو ئەو مەرجەعە ببینێ، هەرچەندە بەغدا هەمیشە چاوی لەوەبووە کورد پەرتەوازە بێ و لە بڕیارداندا بەهێز نەبێت. گەشەسەندنی سیاسی لە کوردستان و سەرهەڵدانی ئۆپۆزسیۆن لە ٢٠٠٩ و، هەڵبژاردنی بەڕێز مسعود بارزانی لەلایەن خەڵکی کوردستان وەك سەرۆکی هەرێمی کوردستان، گەرموگوڕی خستەوە گۆڕەپانی سیاسی و، تا دێت کونسوڵگەری وڵاتان لە پایتەختی هەرێمی کوردستان زیاد دەبن، بەغداش لای خۆیەوە کەوتە دژایەتی کردنی هەرێمی کوردستان، بەمەش پەیوەندی هەولێرو بەغدا ئاڵۆزیی تێکەوت، سەرۆك بارزانی هەوڵیدا جیاوازییەکانی ناوخۆی هەرێمی کوردستان، نەبێتە ڕێگر لەبەردەم یەك ڕیزی و یەك گوتاری سیاسی بەرامبەر بەغدا، ئەم پێویستییەی یەك ڕیزی و یەك گوتارییە، بووە یەکێك لە کارنامەکانی کابینەی حەوتەم، کە ڕۆژی ٢٠١٢/٤/٥ لە لایەن بەڕێز نێچیرڤان بارزانی لە پەرلەمانی کوردستان خوێندرایەوە، بۆ ئەوەی هەوڵ بدرێ ئەنجوومەنێك بۆ دانوستاندن لەگەڵ بەغدا پێك بێت، دوای ئەوەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان داوای لە پەرلەمانی کوردستان کرد، بۆ ئەوەی لە پەرلەماندا قسە لەو بابەتە بکرێت، ڕۆژی ٢٠١٢/٧/٦ کۆبوونەوەیەکی ڕاوێژکاری بەڕێوەچوو، کە جگە لە فراکسیۆنەکانی پەرلەمان نوێنەری تەواوی لایەنە سیاسییەکان ئامادەبوون، دەکرێ چەند سەرنج و بۆچوونێك دەربارەی ئەم ئامادەکارییە بۆ دانوستاندن لەگەڵ بەغدا، لەم خاڵانەدا بخەینەڕوو:

١-وێڕای فراکسیۆنەکانی پەرلەمان کە نوێنەرایەتی خەڵکی کوردستان دەکەن، لەبەرچاوگرتنی زۆرترین بیروڕای هێزو لایەن و گرووپی سیاسییە، کە کۆدەنگی بەرامبەر ئەم پرۆژەیەی دامەزراندنی ئەنجوومەنی دانوستاندن بەهێزدەکات.

٢- گرتنی هەموو ئەو کون و کەلەبەر و درزانەی، کە بەغدا دەیەوێت لێیانەوە بێتە کوردستان بۆ درێژەدان بە دانوستاندن وەك خۆی دەیەوێت، ڕێگرتن لە فرە سەنتەری بڕیاردان،

چونکە بەغدا گەرەکیەتی بۆ پەرش و بڵاوکردنی هێزەکـان و لاوازکردنـی ناوەنـدی بڕیـار، لـە درزەکاندا بێتە ژوورەوە.

٣-ئەم گردبوونەوەیە بۆ خەمخواردن لە چۆنیەتی دانوستاندن، ئەوەمان پێشان دەدات، کە لە بەغدا ڕانابیندرێت مل بداتە بەر جێبەجێ کردنی دەستوور، بۆیە هەمووان لەسەر ئەم تەگبیرە یەك دەنگن، تا بە میکانزمێکی نوێوە بچنەوە مەیدان.

٤-هەموو ئەو هێزو لایەنانەی نوێنەریان لەو ئەنجوومەنە دەبێت، هـەوڵ بـدەن لـە دانـانی نوێنەرەکانیاندا، خۆیان لـە خزمخزمێنـەو مەحسـوبییەت بپـارێزن، هەقـە توانـاو لێهـاتوویی کەسەکان بکرێتە پێوەر.

٥-هێزو لایەنە سیاسـییەکان دان بـەخۆدا بگـرن و، لەسـەر بچـووکترین کێشـە نەکەونـە هەڕەشەی بایکۆت کردن لەو ئەنجوومەنە، چونکە دەبێتە هۆی دروستکردنی زەمینەی ئەو کون و کەلەبەرانەی بەغدا گەرەکییەتی.

٦-ئەنجوومەنی دانوسـتاندن، ئـەوەمان پێـدەڵێت، کـە یـەکگرتوویی گوتـاری سیاسـی و بەگەڕخستنی هەموو توانایەك بۆ دانوستاندن، پێویستییەکی حەیاتییە، پێشمان دەڵێ سەیری دوێنێ بکـەن، کـە پەرتـەوازەو فـرە مەرجـەع بـوون، بەغـدا چـۆن سـەیری دەکـردن و چـی بەسەرهێنان.

٢٠١٢/٨/١٣

# تەلاری عێراق.. پێویستیی بە هەڵوەشاندنەوەو دیزاینێکی نوێ هەیە

سەد ساڵ لەمەوبەر، هێشتا شەڕی یەکەمی جیهان هەڵنەگیرسابوو، بەڵام لە هەڵایسان نزیك ببۆوە، دانیشتوانی هەرسێ ویلایەتی بەسرەو بەغداو موسڵ، کە هێشتا بەزۆر لە دەوڵەتێکدا کۆنەکرابوونەوە، لە دۆخێکی ناهەمواری ڕۆژانی دوایی پیاوە نەخۆشەکە (دەوڵەتی عوسمانی) دا دەژیان، سەرەڕای ئەو ژیانە ناخۆش و دەردەسەرییە، تارمایی شەڕێکی گەورەش بەڕێوەبوو، بۆ سەر ئاسمانی ئەو ناوچەیە، لەولاشەوە هێزە گەورەکانی جیهان، خەونیان بە موڵك و ماڵی ئەو (پیاوە نەخۆشەوە) دەدیت، دوای شەڕیش شیروتیریان لێکتر دەسوی، بەتایبەتیش پاش دۆزینەوەی نەوت، بۆیە چەندین ڕێککەوتن و پەیماننامەیان، بۆ دابەشکردنی ئەو جوگرافیایەی لە چوارچێوەی دەوڵەتی عوسمانیدا بوو، بەست.

عێراق ناوی ئەو وڵاتە بوو، کە دوای شەڕی یەکەمی جیهان کەوتە سەر زاران، واتە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراق زادەی شەڕی یەکەمی جیهانە، ئەو تەلارەی ناوی لێندرا (عێراق) چەندین پێکهاتەی نەتەوەیی و ئاینی و مەزهەبیی تێدا کۆکرایەوە، بێ ئەوەی هیچ پرس و ڕایەکیان پێبکرێ، بەتایبەتیش کورد، کە بەزۆری زۆرداری، هەڵدرایە ناو تەلارەکەوە. دیارە ئەندازیارو داڕێژەری تەلارەکەش بەریتانییەکان بوون، ئەوان و فەرەنسییەکانیش، هێشتا گەرمەی شەڕی یەکەمی جیهان بوو، ڕێککەوتنیان (ڕێککەوتننامەی سایکس —بیکۆ ١٩١٦) بۆ دابەشکردنی خاك و ناوچە گرنگەکان دەکرد، ئەوکات بەریتانیا هێزی ژمارە یەکی جیهان بوو، دەستی گەیشتبووە زۆربەی ناوچەکانی جیهان، بۆیە پێیان دەگوت ئەو ئیپراتۆرییەی خۆری لێ ئاوانابێت، سەرەتا بەریتانییەکان بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی خۆیان، کوردستانیان دابووە فەرەنسییەکان، بەڵام کە بۆنی نەوتیان کرد، خێرا لەو بڕیارەیان پەشیمان بوونەوەو،

دوای دروستکردنی تەلاری عێراق، کاریان بۆ ئەوە کرد، کورد دەو تەلارە بپەستن و، کوردستان بە عێراقەوە بلکێنن، ئینگلیزەکان لە ١٩٢١ جارِی تەواوبوونی تەلاری عێراقیان داو، دوای ٤ ساڵ، پاش کێشمەکێشێکی زۆر کوردستانیان بەو دەوڵەتە تازە دروستکراوە لکاند.

کورد نەیویست لەو تەلارەدا لە سایەی مەلیك فەیسەڵ دابنیشێ، ئەم ڕایەشیان بە لیژنەکەی کۆمەڵەی گەلان ڕاگەیاندبوو، بەڵام دوا قسە هەر بۆ بەریتانییەکان مایەوەو، بڕیار هەر بڕیاری ئەوان بوو، چونکە بەرژەوەندییان لەوەدا بوو، کە کورد هەڵدەنە ناو ئەو نەخشە تازەیەی دروستکراوی خۆیان. شێوەی دارِشتنی ئەو دەوڵەتە وا دارِێژرا، کە ئاهونالەی میللەتانی ناویی بەتایبەتیش کورد گرنگ نەبێت، بەمەش ئاگرێکی بێ ئامان دەو وڵاتە بەردرا، کە هێشتا نێڵەی دێت، چونکە نەخشەی دیزاینی وڵاتەکە بۆ پێکهاتەکان سەقەت بوو، بەڵام لە بەرژەوەندی بەریتانیا دابوو، دارِێژەری نەخشەی عێراق، بەرپرسیارێتی هەموو ئەو بەڵاو نەهامەتیانەی دەکەوێتە ئەستۆ، کە بەدرێژایی سەدەی بیستەم، بەرۆکی کوردو پێکهاتەکانی دیکەی گرت، لەو دیزاینە تەنیا دەسەڵاتداران حسابیان بۆکراوەو، هەمیشە پشت لە نەهامەتی گەلان کراوە، بۆیە بەردەوام لە ئاڵۆزی و تەقینەوەدا بووە، ئەمەش بووە ڕێچکەیەك بۆ فەرمانڕەواکانی بەغدا، کە تا ئێستاشی لەگەڵدابێت، خۆدزینەوە لە مافەڕەواکانی کورد، وەك نەریتێکی دەسەڵاتدارانی ئەو وڵاتەی لێهاتووە، ئەوەتا لە سەردەمی دوای سەدام، جارێکی دی پشت لە سیاسەتی تەوافوق و پێکەوەیی دەکرێت و بەبێ کورد بودجەی لە پەرلەمان پەسەند دەکرێ و هیچ حیسابێك بۆ کورد، وەك پێکهاتەیەکی سەرەکی ناکرێت.

لە عێراقی دوای ٢٠٠٣ دا، دابەشبوونێکی بە ئاشکرای پێکهاتە سەرەکییەکان دەرکەوت، بەجۆرێك کە لەو قۆناغەدا شیعەو سوننەو کورد، وەك سێ پێکهاتەی سەرەکی دەرکەوتن و بڕیاری هەمووان ئەوەبوو، کە وڵات لەسەر بنەمای تەوافوقی بەڕێوە بچێت، کەچی مەیلی تاکڕەوی دەرکەوتەوە، ئەو مەیلە هەمیشە لە دەرفەت دەگەڕێ بۆ ئەوەی مەرکەزیەتی جاران بگێڕێتەوە، سەرۆك وەزیران مالیکی بەو ئاراستەیەدا کاردەکات و، پشت لە هەموو ڕێککەوتن و هاوپەیمانییەك لەگەڵ کورد دەکات.

دیمەنی ئێستای عێراق، بەجۆرێکە کە گرفتەکان ئاڵۆزتر دەبینرێن، بەناوی زۆرینەی سیاسی، ئەو ئاگرە خۆشتر دەکرێت، کە بەردەوام هەڵایساوە، ئەوەی لەم دیمەنە سیاسییەی دوای ڕووخاندنی ڕژێمی بەعس دەبیندرێت، ونکردنی ڕێگاکانی دەرچوونە لەو قەیرانانەی

بەرۆکی عێراقیان گرتووە، یان لە ڕاستیدا دەکرێ بڵێین، خوڵقاندنی قەیرانە بۆ ونکردنی ڕێگاکانی دەربازبوون لەو کێشە ئاڵۆزانەی بەرۆکی ئەو وڵاتەیان گرتووە، بۆیە سەردەم چیدی ئەو تەلارە کۆنە نەگونجاوەی ناوێ، لەبەرئەوەی هۆکاری سەرەکیی ئەو هەموو بەڵاو مەینەتیانەیە، کە بەرۆکی گەلانی عێراقیان گرتووە، ئەگەر داڕێژەری دەوڵەت، بۆ پاراستی بەرژەوەندییەکانی خۆی، پێیوابوبێ، کە دیزاینێکی ڕۆژهەڵاتیانەی داناوەو، لەسەر بنەمای خێزانی گەورەی ڕۆژهەڵاتی، ئەو پێکهاتانەی لە نێو سنوورێکدا کۆکردۆتەوە، ئەوە ئەو هەڵەیە، کە ئێستا پێکهاتەکان باجی دەدەن، با پێکهاتەکان هەڵگری یەك ئاینیش بن، بەڵام نەتەوەی جیاجیان، ناکرێ هەموویان بە یەك چاو سەیری دنیا بکەن و یەك تێڕوانینیان هەبێ.

ئەو وڵاتە بەجۆرێك دروستکراوە، پەردە بەسەر هەموو جیاوازییەکاندا دراوە، لەبەرئەوەی دەسەڵات لە بەغدا نایەوێ بگۆڕێ و خۆی لە دەسەڵاتدارانی پێشوو جیابکاتەوە، بۆ درێژەدان بەو عەقڵیەتە، دەسکاری کردنی تەلارە کۆنەکەی عێراق بە کوفر دەزانێ، ئەزموونی ١٠ ساڵی دوای ڕووخاندنی ڕژێمی سەدام دەریخست، کە ئەو عەقڵیەتە تایبەت نییە بە مەزهەبێك، نەك هەر ئەوە، بەڵکو ئەو عەقڵیەتە هۆکارێکی سەرەکیی کۆکەرەوەی شیعەو سوننەیە، چارەسەر تەنیا هەڵوەشاندنەوەی ئەو تەلارەیە، بۆئەوەی بەدیزاینی سەردەمی گەلان دابڕێژرێتەوە، کەواتە عێراقی نوێ، پێویستی بە سێ تەلار هەیە بۆ کوردو شیعەو سوننە، زەمینەی ئەو شێوازەش لەبارە، ئەوەتا دیمەنەکان پێمان دەڵێن، پێکهاتەکان چیدی بەو جۆرە فەرمانڕەواییەی بەغدا، کە بەناوی یاساو دەستوورەوە دەکرێ، ڕازی نابن، چونکە لە ڕاستی دەستوور پێشێل دەکرێ، بەناوی دەستوور و یاساوە دکتاتۆرییەت دەگەڕێتەوە، ئەوەی لە عێراقی نوێدا کاری بۆ دەکرێ، بەنزین کردنە بەو ئاگرەی چەندین ساڵە لە هەناوی ئەو وێرانەیە بەربووەو، دروستکردنی سۆتنگە(محرقە) یەکی دیکەیە لە سایەی دەستوورێك کە کاری پێ ناکرێ، بۆ سوتاندنی هیواو ئاوات و هەموو شتێك، جا کە ئەو سۆتنگەیە لە دروستکردندابێت، حیکمەت لە بێدەنگی و سەیرکردنی ئەو دیمەنەی لە بەغدا دەگوزەرێ لەچیدایە؟

٢٠١٣-٣-١٢

# چارەسەری ڕیشەیی
# نەك هەڵمژینی ناڕەزایی

دەکرێ بە عێراق بوترێ وڵاتی قەیرانەکان، بەڵام لەمە تراژیدیاتر ئەوەیە، کە هێزو پێکهاتەی سیاسی هەن، بەردەوامی قەیران بە قازانج بۆخۆیان دەبینن، تا بتوانن لە سایەی پشتکردنە دەستوور، زۆرترین دەسکەوت وەدەست بێنن، ئەمەش بۆ ئەوەیە زیاتر لە دەسەڵات بمێننەوە، بەڵام ئەو دۆخە گورزی کوشندەی لە تەواوی پێکهاتەکانی عێراق داوە، چونکە ئەوەی ئەمڕۆ لە عێراق دەگوزەرێ، زامنکردنی مانەوەیە لە دەسەڵات و هەوڵدانەوە بۆ چەند گێمێکی دی لە فەرمانڕەواییدا، بەمەش ئەوەی چۆتە خانەی لەبیرچوونەوەو حیساب بۆ نەکردن تەنیا گەلانی عێراقن. گرفتی سەرەکیی عێراق، جێبەجێ نەکردنی دەستوورو، فەرامۆش کردنی ئەو ڕێککەوتنانەیە کە بۆ دەربازبوون لە قەیران ئیمزاکراون، وەك ڕێککەوتننامەی هەولێر لە ٢٠١٠ کە تەنیا ئەو بەشەی لێ جێبەجێ کرا، کە پەیوەست بوو بە پێکهێنانی حکومەتی عێراق، بەمەش تەنیا شیعە بەشی خۆی لە دەسکەوتی ڕێککەوتنی هەولێر وەدەستهێنا و کوردو سوننەش لێی بێ بەش بوون، ئەو ڕێککەوتننامەیە، جارێکی دی پێکهاتەکانی عێراقی لەسەر بنەمای تەوافوق و هاوبەشی کۆکردبۆوە، ڕۆژی ٧-٣-٢٠١٣ پەرلەمانی عێراق بەبێ ئامادەبوونی کورد، بودجەی ساڵی ٢٠١٣ ی تێپەڕاند، ئەمەش لە کاتێکدایە، خەڵکی کوردستان لە گەرمەی یادکردنەوەی ٢٢ ساڵەی ڕاپەڕین و ٢٥ ساڵەی پرۆسەی کۆمەڵکوژی و لەناوبردنی کورددایە، ڕەفتاری بەغدا پرسیار لای کورد دروست دەکات، ئەو پرسیارەش ڕۆژی ١٤-٣-٢٠١٣ لە کۆنگرەی نێودەوڵەتی ناساندنی جینۆسایدی کورد لە هەولێر بەڕێز سەرۆکی هەرێمی کوردستان کردی، ئاخۆ (کورد هاوپەیمان و شەریکە؟ ئەگەر وەڵام بە بەڵێ بێت، ئەوا هاوپەیمانیەتی وەها نییە)، ئەوەی لە بەغدا بەدی دەکرێ ئەوەیە کە هاوپەیمانیەتی تەنیا بۆ تاکتیك بەکاردێنن، دیدی ئەوان بۆ کورد هێشتا بەچاوی شەریکایەتی نییە، پێیانوایە دەبێ کورد پاشکۆبێت، بەڵام وەك سەرۆك بارزانی وتی کورد پاشکۆی کەس نییە.

کورد کارەکتەرێکی سەرەکیی چارەسەرکردنی کێشەکانی عێراق بووە، کاتێ بەغداش خۆی لە جێبەجێ کردنی دەستوور دەدزێتەوەو، ڕێز لە ئیمزای خۆی لەو ڕێککەوتنانەی لەگەڵ

هەرێمی کوردستان کردوونی ناگرێ، کورد هەمیشە وەبیری بەغدای هێناوەتەوە، کەوا پێویستە لەرێی گفتوگۆوە، قسە لەو گرفتانە بکرێت، کەچی سەرۆك وەزیرانی عێراق نوری مالیکی پشتی لەدەستوورکردووەو، لەبیری چووە سەردەمی (عێراقێکی نوێیە) و پەنای بردۆتە بەر هێز، عەمەلیاتی دیجلەو جەزیرەو بادیە، نموونەی زەقی پشتکردنە لە دەستوور، لە هەموو ئەو شوێنانەی بەغدا سوپای بۆ جوولاند، وەك کەرکووك و خانەقین و زوممار و شەنگال و نەینەوا، ڕووبەڕووی نارەزایی بۆوە، لە تازەترین هەولی هەولێر ئەو نامەیە بوو کە بۆ هاوپەیمانی نیشتمانی (شیعە) رەوانەکرا، کەچی دوای دوو مانگ بە شێوەیەکی عمومیات و دارشتنێك وەلام درایەوە، کە پەنجەی نەخستبووە سەر گرفتەکان و هیچی لێ هەلناکرێ، رۆژی ١٢-٣-٢٠١٣ ئیبراهیم جەعفەری و نوری مالیکی و عەممار حەکیم بۆ قسەکردن لەبارەی دۆخی ئالۆزی عێراق کۆبوونەوە، رۆژی دواتر عەممار حەکیم رایگەیاند، کە تاکرەویی شیعە لە دەسەلاتدا مەترسیدارە، ئەمەش لەو دۆخەی ئەمرۆدا هەستی پێ دەکرێ و، عێراق پێیدا تێدەپەرێ، کە ئەو ولاتە بەدەم چەند قەیرانێکی قوولەوە دەنالێنێت، پرسیار ئەوەیە ئایا هەست کردن بەو مەترسییە لەلایەن هەندێ لایەنی هاوپەیمانی شیعە، بۆ بانگەشەی هەلبژاردنە، یان بەراستی بانگەوازێکە بۆ بەخۆداچوونەوە لە حوکمرانیدا؟ ترس لەوەیە بەهۆی کولانی شەقامی سوننەو دژایەتی کردنی مافەکانی کورد، هەندێ لێدوان و نەرمی نواندن، بەردێك بێت دوو چۆلەکەی پێ بکوژرێ، لەلایەك بۆ هەلمژینی نارەزایی کوردو سوننەو ئەو لایەنە سیاسییانەی گلەییان لە تاکرەویی حکوومەتی عێراق هەیەو، لە لایەکی دیکەش بانگەشەیەکە بۆ هەلبژاردن، هەردوو مەبەستەکە، بەهیچ شێوەیەك چارەسەری قەیرانەکانی عێراق ناکەن، ئەوەی لەو لێدوانانە دەخوێندرێتەوە، کە پاش تێپەراندنی بودجەی ٢٠١٣ و نیگەرانیی کورد، فرێدراونەتە بازاری راگەیاندن، بۆ هێورکردنەوەو هەلمژینی نارەزاییەکانە، نەك بۆ چارەسەری ریشەیی، بەمەش، ئەو عەقلیەتەی خۆی لە چارسەری دەدزێتەوە، لە ئێستاوە چەندین قەیران بەسەریەکدا کۆدەکاتەوەو دەیکاتە دیاری بۆ نەوەکانی داهاتوو.

٢٠١٣-٣-١٧

# مریشکی کییڤ ... کەی دەگاتە عێراق؟

لەڕووی زمانەوانییەوە قسە لەبارەی (جیاخوازەکان)ـەوە ناکـەم، بـەڵکو بـەلای ڕەهەنـدی سیاسیی ئەو وشەیەدا دەچم، کە بەدرێژایی سەدەی بیستەم و بە ئێستاشەوە، بۆ ناشرین کردنی جووڵانەوەی ڕزگاریخوازیی نیشتمانی کوردستان، بە هەر هەستان و شۆڕشێکی کورد گـوتراوە، کە داوای مافی ڕەوای کوردی کردووە، جیاخوازەکان یان عەرەب گوتەنی(الانفصاليون الاكـراد) هەمیشـە لەسـەر زاری دەسـەڵاتدارانی بەغـداو پایتەختـە عـەرەبی و ناوەنـدە سیاسـی و کولتوورییـەکانی جیهـانی عـەرەب بـووە، هـەرکاتێ ویسـتبێتیان بـەکاریان هێنـاوە، بەکارهێنانەکەش بێ ترس و سـڵەمینەوە بـووە، چـونکە هەمیشـە پشـتیوانێکی ئیقلیمـی و جیهانییان هەبووە، ناسیونالیزمی عـەرەبی لـە بـەکارهێنانی ئـەو وشـەیەدا، دنـەی ناوەنـدە سیاسییەکانی لە ناوچەکەو لەسەر ئاستی جیهـانیش داوە، بۆئـەوەی بـەردەوام بەرەیـەك دژی جووڵانەوەی خەڵکی کوردستان بکاتەوەو، شەرعییەت بە شاڵاوی تەعریب و جینۆساید بـدات، تەنانەت خۆبەڕێوەبردنێکی ئاسایی کورد لە سەر خاکی خۆیدا، بە کـوفرێکی گـەورە دابـنێ و دنیای لێ بێنێتە دەنگ.

با زۆر نەچـینە نـاخی مێـژووەوە، کـە چـۆن هێـزە گـەورەکانی جیهـان لـە ئاسـت ئـەو گەلەکۆمەکێیانەی لە کورد کراوە، بێ دەنگ یان بەشداری کارابوون، لە دەیەی کۆتایی سەدەی بیستەم، وردە وردە لەگەڵ ئەو گۆڕانە گەورەیەی بەسەر جیهاندا هات، دەرووی خێریش بەڕووی کوردا کرایـەوەو، زەمینەیـەك بـۆ ئامـادەبوون هاتەپێشـەوە، ئـەو ئامادەبوونـە لـە سـایەی سیستەمی نوێی جیهاندا، وای لە کورد کـرد ڕۆژو شـەو بـژمێرێ، ئـاخۆ کـەی وەك گـەلانی جیهان، هیواو ئاواتی گەورەی دێتەدی. ڕووداوەکانی سەدەی بیست و یـەك، بـەجۆرێك هاتنـە پێشەوە، کە ئەم سەدەیە بە سەدەی گەلان ناو ببرێت، بەڵام ئەوەی بەلای ئەو گەلانەوە مایـەی سەرنجە، ئەوەیە کە هێشتا لایەنگرانی (یەکپارچەیی خاك) کاریگەرییان هەیە، بەتایبەتیش کە

هێزی گەورەی وەك ویلایەتــە یــەكگرتووەكانی ئەمــەریكا، لــە لێدوانــە ڕەسمییەكانیــدا، ئــەو دەستەواژەیە ڕادەگەیــەنێت، ئــەوەی زۆر بــەوردی ســەیری دیمەنــەكانی عێــراق بكــات، بــۆی دەردەكەوێت، دەست گرتن بە (یەكپارچەیی خاك) چ زەبرێكی گەورەو گورچــكبڕ لــە ئایندەی پێكهاتەكانی عێراق دەدات، ئاخر عێراق لە ئــان و ســاتێك دایــە، وێــڕای ئــەو نەوتــە زۆرەی هەیەتی، بەڵام ئێستا هیچ میللەتێكی نەداری دنیا خۆزگەی پێ ناخوازێ، چــونكە لەڕاســتیدا قۆناغەكانی دابەشبوونی عێراق خەملّیون، ئەگەر هەر هێزو لایەنێك، خۆی بە حەكیم بزانــێ و پێی وابێ دەتوانێ جارێكی دی، بە هەمان ئەو ئاراستەو ڕێگەیەی بەغــدا دەیــەوێ، پێكهاتــە سەرەكییەكانی ئەو وڵاتە كۆبكاتەوەو نەیەڵێ لێك جوداببنەوە، ئەوا ئــەو حەكیمــە دەكەوێتــە هەڵەیەكی گەورەوە، چونكە دەرمانی ئەو حەكیمە، دەردی عێراق دەرمان ناكات. ڕۆژی ٢٤-٣-٢٠١٣ جۆن كیری وەزیری دەرەوەی ئەمەریكا سەردانی بەغــدای كــرد، بــەڵام پــێ ناچــێت لایەنە شیعی و سوننیەكان، بەو ئاسانییە بێنە ڕایێ، بارودۆخیش تا ئاڵۆزتر دەبێت، لــەبارەی پەیوەندی هەولێر-بەغداشەوە، ناكرێ واشنتۆن هەمان داخوازیی بەغدا، بەتایبەتیش لە بواری نەوتەوە، بەزمانێكی دیكە لە هەولێر بكات، چــونكە گرفتەكــە لەوەدایــە، بەغــدا پشــت لــە ڕێككەوتن دەكات و بەدوای چارەسەریدا ناگەڕێ، ناكرێ هەولێر بە نیەت پاكی و بێ دوودڵــی ئامادەی گفتوگۆبێت و بەغداش هەر كات بەڕێ بكات، هەولێر لە هاتن و چــوون و گفتوگــۆی بێ بەڵێن هیلاك بووە، سەرۆك بارزانی لــەم بارەیــەوە نــوێترین ئامــاژەی هەیــە ولــە وەڵامــی نامەیەكی ئاراس شێخ جەنگی لە ٢٧-٣-٢٠١٣ وتی:" من هیچ مانعێكم نییە بچــمە هــەر شوێنێكی دونیا، ئەگەر دەسكەوتی بۆ گەلی كوردستان تێدابێت، ئەگەر بزانم چوونم بۆ بەغــدا ئەنجامی دەبێت، ئەوا بەبێ دوودڵی دەڕۆم، بەڵام هەمووتان دەزانن چــەندجار چــووم، چــەندین جار بەڵێنیانداو ڕێككەوتین لەسەر زۆر شت كە لە بەرژەوەندیی كوردستان و پرۆسەی سیاســیی عێراق بوو، بەڵام ئیحترامی ئیمزای خۆیان نەگرت و پشتیان لە بەڵێنەكان كردو، چ زەمانەتێك هەیە من بچمە بەغدا كێشەكان چارەسەر دەكرێن؟"[١]

گرفتی عێراق، لە بەغدا ئاڵۆز دەكرێ نەك هەرێمی كوردستان، ئەوە حكوومەتی بەغدایــە پشت لە دەستوور دەكات و، تاكڕەوانە لەبەرژەوەندی یەكلایــەن بڕیــار دەدات، مامەڵــەكردنی هەرێمی كوردستان لە چوارچێوەی دەستووری عێراقە، كەواتە هەرلایەنێك وەك لایەنی ســێیەم لە نێوان بەغداو هــەولێر، ناوبــژیوان بێــت، بێلایــەنی لەدەســت دەدات ئەگــەر بڵــێ هــەولێر تاكلایەنە مامەڵە بە نەوت دەكات، بەڕێز نێچیرڤان بــارزانی ســەرۆكی حكوومــەتی هــەرێمی

کوردستان ڕۆژی ٢٧-٣-٢٠١٣ لەوبارەیەوە ڕایگەیاند:" حکومەتی هەرێمی کوردستان هەر هاوکاری و ڕێککەوتنێك لە بواری وزەدا لەگەڵ تورکیا بکات، لە چوارچێوەی دەستووری عێراقدا دەبێت و لە بەرژەوەندی هەموو عێراقدا دەبێت". [٢]

دۆخی عێراق بەئاقارێکدا چووە، پێویستی بە چارەسەرێکی ڕیشەیی هەیە، ئەو چارەسەرەش بەلای زۆر ناوەندی ئەکادیمی و سیاسی و میدیاییەوە دابەش بوونە، تەنیا نموونەی ئەمەریکا دێنینەوە، کە (جۆ بایدن) ی جێگری سەرۆکی ئەمەریکا، بەر لەوەی ئەو پۆستە وەربگرێ، پرۆژەی دابەش کردنی عێراقی بۆ سێ ناوچەی کوردو سوننەو شیعە پێشکەش بە کۆنگرێس کرد، ئێستا بایدن بە خاوەنی پرۆژەی دابەش کردنی عێراق ناسراوە.

لەم سەردەمەدا، ئەستەمە لە سەرزەمینێکدا، پێکهاتەکانی بەرەو لێکترازان بچن، بەزۆر پێکەوە کۆبکرێنەوە، ئەگەر ناسیونالیزمی عەرەبی ئەمەریکاو کورد بە سەبەبکاری دابەش بوون بزانێ، ئەوا ئێستا دۆخەکە گەیشتۆتە قۆناغێك، تادێت ناکۆکیی نێوان سوننەو شیعە قووڵتردەبێتەوەو هەریەکەیان بەو قووڵاییە ستراتیژییەی هەیانە، زیاتر بەرەو مەیلی خۆسەپاندن و سەرەنجام لێك جیابوونەوە دەڕۆن، کەواتە ئەوە هەرێمی کوردستان نییە گێچەڵ بە بەغدا دەکات، بەڵکو پێکهاتە سیاسییەکانی سوننەو شیعە بەجۆرێك کاردەکەن، کە بەلای یەکتر قەبوڵ کردندا ناچن، کورد مەیلی سەربەخۆیی نەشاردۆتەوە، بەڵکو واقیعیانە رەفتاری کردووە، مانەوەی لە عێراقێکدا، کە تیایدا مافەکانی پارێزراوبن پێ ئەهوەن و ئاسایی بووە، بەڵام ئەوە بەغدایە بەوە ڕازی نییە، بە سەرنجدان لەو دیمەنانەی عێراق، ئەوە گەڵاڵە دەبێت، کە ئەوە بەغدایە پاڵ بە هەرێمیەوە دەنێت لێی جیابێتەوە، ئەو واقیعە لای دیپلۆمات و سیاسەتمەدارانی ئەمەریکا بە ڕوونی دەبیندرێت، ئەوەتا پیتەر گالبریسی باڵیۆزی پێشووی ئەمەریکا لە کرواتیا، لە وتووێژێکدا لەگەڵ ڕۆژنامەی ڕادیکاڵی تورکی، لە وەڵامی پرسیارێکدا ئاخۆ هەڵوێستی ئەمەریکا لە هەمبەر دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی چ دەبێ؟ لە وەڵامدا دەڵێ:" ئەمەریکا بەردەوام ئەو ڕستەیە دووپات دەکاتەوە((بۆ ئێمە یەکپارچەیی خاکی وڵاتان گرینگترین مەسەلەیە)) بەڵام ئەو ڕۆژە ئەگەر بێت، ئەمەریکا پشتیوانی لە کوردستان دەکات، هەڵوێستی ئەمەریکا بە نیسبەت بابەتی هاوشێوە، مایەی پێکەنینە، لێدوانی ١ ی ئابی ١٩٩١ ی جۆرج بوش لە کییێف-ی پایتەختی ئۆکرانیا وەبیربهێنینەوە، بوش ئەوکات باسی لە یەکپارچەیی سۆڤیەت کرد، بەڵام تەنیا پاش چەند مانگ، خەڵکی ئۆکرانیا بە ریفراندۆمێك، داوای جیابوونەوەیان کرد، هەربۆیە لێدوانەکەی بوش، وەك

گاڵتەکردنێك ناوزەدکرا، بە ((مریشکی کییێف)) ناوبانگی دەرکـردووە، یـانی ئەمـەریکا وەك کەرەستەیەك تەماشای جوگرافیا دەکات"[3]. لە نێو ئەو بارودۆخەی عێراقدا، پرسیارێك دێتە پێشەوە، ئایا سەرزەمینی عێراق بۆ هاتنی مریشـکی کییێـف گونجـاو نییـە، یـان سـەردەمی ئۆکرانیاو عێراق لێك جیاوازن؟ ئەوکات یەکێتی سـۆڤیەت هەڵدەوەشـایەوەو کۆمـار لـەدوای کۆمارەکانی سەر بە یەکێتی سۆڤیەت، سەربەخۆییان ڕادەگەیاند، ئەوەی لە عێراقـی سـەدەی بیست و یەکیش دەگوزەرێ، دەوڵەتێکی مەرکەزی لەبەریەك هەڵوەشاوەتەوەو، هەندێ هێز لـە هەوڵی گەڕاندنەوەدان، بۆ سەردەمی مەکەزییەت، نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانی عێراق بـەو ئاقارەدا کاردەکات، بەڵام واقیعی عێراق شتێکی دیکەیە، ئێستا هەلومەرجی لەبارە، توبڵێی پابەندبوونی ئەمەریکا بە یەکپارچەیی خاکی عێراق، هاتنی مریشکی کییێڤی بەدوادابێت؟ یان لە بەختی ئێمە ئەو مریشکە ناگات؟

## پەراوێزەکان:

١-بۆ دەقی نامەکـەی بـەڕێز مسـعود بـارزانی سـەرۆکی هـەرێمی کوردسـتان، بڕوانـە ڕۆژنامەی کوردستانی نوێ، ژمارە(٦٠٣٦) ڕۆژی ٢٨-٣-٢٠١٣ .

٢-بۆ زانیاری زیاتر لەوبارەیەوە بڕوانە: ڕۆژنامەی خەبات ژمـارە (٤٢٨٦) ڕۆژی ٢٨-٣-٢٠١٣.

٣-بۆ زانیاری زیاتر دەربارەی دەقی ئەو وتووێژە بڕوانە: گۆڤاری تورکیاناسی، ژمارە (٢٨) ئاداری ٢٠١٣ ، لاپەڕە (٥٨-٦١).

١-٤-٢٠١٣

# ١٠ساڵەی ئازادکردنی عێراق

# کورد لە دەیەی یەکەمی عێراقی نوێدا

ئەو قۆناغەی لە دوای ٩-٤-٢٠٠٣ دەست پێدەکات، کە کۆتایی بە دەسەڵاتی دکتاتۆریی سەدام حسێن هێندرا، بە عێراقی نوێ ناسراوە، نوێ بەو مانایە، کە: چی دی دەسەڵاتەکان لە دەستێکدا کۆنەبنەوە، رێز لە ئیرادەی خەڵك بگیرێ و دەسەڵات لەرێی هەڵبژاردنەوە ئاڵوێر بکرێ، ئیعتیبار بۆ هەموو پێکهاتەکانی ئەو وڵاتە دابندرێ و شەراکەت و تەوافوق بنەمای بڕیارو کاری پێکەوەیی بێت، سوپا وەك جاران نەبێتە ئامرازی خۆسەپاندنی تاکەکەس و تاکە لایەن، داهات بە یەکسانی بۆ هەموو پێکهاتەکان بێت، هەرێمی کوردستان بەپێی دەستوور مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، لە هەمووی گرنگتر، کار بە دەستوور بکرێ کە ٨٠٪ ی خەڵکی عێراق دەنگی پێداوە، ئەمەش بۆ یەکەم جارە، دەستوور بەو شێوەیە دەخرێتە راپرسییەکی راستەقینە، جێی خۆیەتی بەدوای وەڵامی ئەو پرسیارەدا بگەڕێین، ئاخۆ لەو دە ساڵەدا کورد لە کوێی قۆناغە نوێیەکەدایە؟

بۆ کورد گرنگە، بەچاوی هەڵسەنگاندنەوە، سەیری دەیەی یەکەمی عێراقی نوێ بکات و، خوێندنەوەیەکی ورد بۆ ئەو دە ساڵە لە سەردەمی نوێی ئەو وڵاتە فرە نەتەوەو ئاین و مەزهەبە بکات، ئاخۆ بەکوێ گەیشتووەو، چۆن کۆسپەکانی رێگای چوونە دەیەیەکی دی لادەبات. لە چاوگێڕانەوە بە دەیەی یەکەمی عێراقی پاش رژێمی سەدام، پێویستمان بە خوێندنەوەیەکی هەمەلایەنە، لە چەند رووێکەوە دەبێت، تا بەهۆیەوە، قسە لەسەر چەند ئاستێکی جیاجیای وەك: ناوخۆی کوردستان، عێراق، ئاستی ئیقلیمی و نێودەوڵەتی بکەین.

## ناوخۆی کوردستان

باسکردنی ناوخۆی کوردستان، پێش ئاستی عێراق و ئیقلیمی و نێودەوڵەتی، لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، کە هەمیشە دۆخی ناوخۆی وڵات، بڕیار لەسەر چۆنیەتی ئامادەبوون لەبەرامبەر ئاستەکانی دی دەدات، بە مانایەکی دی، گرنگی دان بە بەرەی ناوخۆ، هەرێمی کوردستان وەك فاکتەرێکی کارا پێشان دەدات، بەوپێیەی رووخاندنی رژێمی بەعس، رووداوێکی گەورە بوو، پێویستی بەوە کرد، کورد وەك هێزێك لە گۆڕەپانەکەدا دیاربێت.

گرنگیی ئەو قۆناغە لەوەدابوو، کە شەڕی نەگریسی ناوخۆ کۆتایی پێهاتبوو، پرۆسەی ئاشتەوایی کوردستان، لە ساڵی ١٩٩٨ دەستی پێکرد، کاتێ ئەمەریکا شەڕی رزگارکردنی عێراقی لە دکتاتۆرییەت راگەیاند، نزیکەی پێنج ساڵ بوو، کۆتایی بە شەڕی ناوخۆ هاتبوو، ئەمەش بۆ هەرێمی کوردستان گرنگ بوو، بە جۆرێك کە لەگەڵ دەست پێکردنی جموجۆڵی ئۆپەراسیۆنی ئازادکردنی عێراق، جووڵەی وەخۆکەوتنی کوردیش لەبەرامبەر ئەو رووداوە خێراتر بوو، ئیدی کۆبوونەوەکانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان و لایەنە سیاسییەکان، زیاتر بەو ئاراستەیەدا بوو، بەمەش هەرێمی کوردستان بووە رەگەزێکی کارای گۆڕینی بارودۆخی عێراق و رووخاندنی رژێمی سەدام، ئەو یەکدەنگییەی کورد و هێزە سیاسییەکان، وەك قۆناغی کۆتایی هەشتاکانی سەدەی رابردوو بوو، کە بەر لە راپەڕینی ١٩٩١ی خەڵکی کوردستان، هەموو لایەنە سیاسییەکان یەکدەنگ بوون، یەك هەڵوێستی هێزە سیاسییەکان، کاریگەرییەکی زۆری بەسەر لایەنی مەعنەوی جەماوەردا هەیە، بۆیە تەبایی نێوان لایەنە سیاسییەکان، هۆیەکی گرنگ بوو، بۆ چوونە ناو قۆناغی دوای رووخاندنی دەسەڵاتی دکتاتۆری.

قۆناغی دەیەی یەکەمی عێراقی نوێ٢٠٠٣-٢٠١٣ بە بەراورد لەگەڵ قۆناغی دوای راپەڕین ١٩٩١-٢٠٠٣ لە رووی هەڵبژاردنەوە جیاواز بوو، بەجۆرێك لە قۆناغی دوای راپەڕین تا رووخاندنی رژێمی سەدام، لە کوردستاندا یەك هەڵبژاردن لە ١٩٩٢ کرا، کەچی لە قۆناغی دەیەی یەکەمی دوای ٢٠٠٣ دوو هەڵبژاردن کراوە، ئەو دۆخە سیاسییەی کوردستان سەری بۆ ئەوە کێشا، کە جگە لەو حزبانەی حکوومەت بەڕێوە دەبەن، لە ٢٠٠٩ دا ئۆپۆزسیۆنیش پەیدابێ.

ڕووداوی گەورەی ئەو ماوەیە، کردنەوەی باڵەفڕگەی نێودەوڵەتی هەولێرو سلێمانی بوو، کە کاریگەرییەکی زۆری کردەسەر پەیوەندی هەرێمی کوردستان و وڵاتـان، کردنـەوەی باڵەفڕگـە، گەورەترین کۆسپی لەسەر ڕێی کرانەوە بەرووی جیهاندا لابرد، فەراهەم بوونی ڕێگەی ئاسمانی، بووە بناغەی پێشکەوتنی کایەکانی ژیانی کۆمەڵگەی کوردستان.

لە لایەکی دیکەوە، لە دەیـەی یەکـەمی دوای ٢٠٠٣ کـورد لـە سـەرزەمینێکی بـەمین چێندراودا، دەستی بۆ نەوت بردو، ڕێگەی بۆ هاتنی چەندین کۆمپانیای بـەناوبانگی جیهـانی لەرووی نەوتەوە خۆش کرد، تا بەوەگەیشت لە ٢٠١٣ و لە کۆتایی دەیەی یەکـەمی عێراقـی نویێ، ڕەوانەی بازاڕەکانی ئەوڕوپا کرد.

لەرووی پەیوەندی دیپلۆماسییەوە، هەنگاوی باشی هەڵێنا، بەجۆرێك کە ژمارەیـەکی زۆری کونسولگەریی وڵاتان لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان کرانەوە، لە نێو هەر پێنج ئەندامە هەمیشەییەکەی ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی، تەنیا چین کونسوڵگەری نەکردۆتەوە، ئەویش هاتۆتە مەیدان و سەرەتای هەنگاوەکانی دەست پێکردووە، پایتەختی وڵاتانی بڕیاربەدەستی جیهان، لەو ماوەیەدا چەندین جار بەشێوەی فەرمی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیان داوەت کردووە، زۆرجاریش سەرۆك بارزانی داوەتی کۆڕو کۆبوونەوەو کۆڕبەندی گەورەی وەك یەکێتی ئەوروپاو ئەمسـاڵیش بـۆ یەکـەم جـار داوەتی کۆڕبەندی داڤۆس کرا، سەرۆکی حکوومەت و شاندی حکوومەتیش بـەردەوام لـە لایەن حکوومەتەکانەوە داوەتکراون، لەبەرامبەریشدا وەفـدی وڵاتـان سـەردانی هـەرێمی کوردستانیان کردووە.

لەگـەڵ هـەموو ئـەو بەرەوپێشەوەچـوونە، هێشـتا نەتوانـدراوە بـۆ دابینکردنـی پێداویستییەکانمان پشت بەخۆمان ببەستین، بەتایبەتیش چاوی هەمووکەس روو لە کشتوکاڵە، کە بەتەواوی ببوژێتەوەو سەرچاوەی سەرەکیی خۆراکمان بێت، ئەوەی لە هـەمووی زیـاتر وەك دیاردەیەك بۆتـە مایـەی مشـتومڕو قسەلەسـەرکردنی گـەرموگوڕ، ئەوەیـە کـە گەنـدەڵی و کەموکوڕی و ڕۆتین لە هەندێ جومگەی دامەزراوەکانـدا، کاریگـەریی نـەرێنی دەکاتـە سـەر بەرەی ناوخۆی کوردستان، دەخوازرێ هەوڵی جدی بۆ بدرێ.

## له ئاستی عێراقدا

كه ئۆپەراسیۆنی ئازادكردنی عێراق له لایەن ئەمەریكاوه دەستی پێكرد، ١١ ساڵ بوو كورد لەڕێی دامەزراوەكانی پەرلەمان و حكوومەتی هەرێمی كوردستانەوە، هەرێمی كوردستانی بەڕێوه دەبرد، بۆیه بۆ ئەو ئۆپەراسیۆنه ئامادەبوو، بەمەش هەرێمی كوردستان بووه خاڵی دەسپێك و وێستگەیەكی گرنگی ئەو رووداوه گەورەیه.

بوونی هەرێمی كوردستان وەك دیفاكتۆیەك، سەنگێكی پێ بەخشی بوو، كه نەدەكرا له حیساباتەكانی دوای رووخانی رژێمی بەعس لەبەرچاو نەگیرێ، چونكه له دروستكردنەوەی عێراقی نوێدا، رەگەزێكی كارا بوو، له قۆناغی ئینتیقالیدا، ئەنجوومەنی حوكم ١٢ ی تەموزی ٢٠٠٣ به بڕیاری دەسەڵاتی كاتی هاوپەیمانان له ٢٥ ئەندام (١٣ عەرەبی شیعە، ٥ عەرەبی سوننه، ٥ كورد، ١ توركمان و ١ مەسیحی) پێكهێندرا، ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بەپێی بڕیاری ١٥٠٠ ، ئەنجوومەنی حوكمی بەگرنگ وەسف كرد، كه نوێنەرایەتیەكی بەرفراوانی عێراق دەكات، پێنج كورد بوونه ئەندامی ئەو ئەنجوومەنە، كه بریتی بوون له بەڕێزان مام جەلال، سەرۆك مسعود بارزانی، سەلاحەدین بەهائەدین، مەحمود عوسمان، دارا نورەدین، موحسن عەبدولحەمید. بوونی كارای كورد لەسەرەتای پرۆسەی سیاسی عێراقدا، بەتایبەتیش له ئەنجوومەنی حوكم، نیگەرانییەكی له ژینگەی ناسیونالیزمی عەرەبی لێكەوتەوەو، بەیت و بالۆرەی دابەشبوونی عێراقیان لێدایەوە، لێرەوە، هەرزوو كۆسپی بەردەم كورد پەیدابوون، كه بەدرێژایی ئەو ماوەیه رێگرییان له كورد كردووە، بەتایبەتی لەكاتی داڕشتنی یاسای كاتی بەڕێوەبردنی دەوڵەت، كه مەسەلەی خاك و ئەو ناوچانەی لەدەرەوەی ئیدارەی حكوومەتی هەرێمی كوردستاندابوون، له ماددەی ٥٨ی ئەو یاسایەدا جێگیركرا، له داڕشتنی دەستووری هەمیشەیی عێراقیشدا، پاش شەڕێكی گەورەو دوورودرێژ له بەغدا، كه هەوڵ دەدرا، ئەوەی له ماددەی ٥٨ ی یاسای كاتیی بەڕێوەبردنی دەوڵەتدا هاتووە، پشت گوێ بخرێ، بەڵام كورد هەوڵی زۆری داو مەسەلەی خاكی له ماددەی ١٤٠ ی دەستووردا چەسپاند، كه ٨٠٪ی خەڵكی عێراق دەنگیان بەدەستووردا، ئیدی رێككەوتنێكیش له نێوان پێكهاتەكانی عێراق كرا، كه عێراق لەسەر بنەمای هاوبەشی و تەوافوق بەڕێوەبچێت، بەمەش هەر لەو كاتڕا، كورد هەوڵی داوه، خۆی وەك هاوبەش له بەغدا ببینێ، بەو پێیەی دوای

عەرەب، دووەم نەتەوەی سەرەکییە لە عێراقدا، هەر لەسەر ئەو بنەمایەشدا سەرۆك کۆماری عێراق بەکورد درا، بەڵام پێ بە پێ، دژایەتی کورد لە عێراقی نوێدا دەستی پێکردەوە، بەجۆرێك کە پەیوەندی هەولێرو بەغدا بە هەڵکشان و داکشاندا تێپەڕیوە، چونکە بەغدا پشتی لە دەستوور بنەمای پێکەوەسازان و هاوبەشی کردووە، لەو رووەشەوە، لە دژایەتی کردنی کورددا، مەسەلەی زۆرینەی پەرلەمانییان بەکارهێناوە، ئەمەش پشتکردنە لە تەوافوق و هاوبەشی، کە عێراقی لەسەر دامەزراوە، وەك گەلەکۆمەکیی ۲۲ ی تەمموزی ۲۰۰۸ کە بەزۆرینەو بێ کورد دەنگیان لەسەر یاسای ۲۳ دا کە یاسایەکی تایبەت بوو بە کەرکوك و غەدرێکی گەورەبوو لە کورد، بۆیە بە خۆپێشاندانی سەرتاسەری لە کوردستان وەڵام درایەوە، سەرۆکی هەرێمی کوردستان بەتوندی بەرامبەر ئەو گەلەکۆمەکییە وەستایەوە، رۆژی ۲۸ ی لە کەرکوك خۆپێشاندانێکی گەورە بۆ رەتکردنەوەی یاساکە کراو، شۆڤێنییەکان بە تەقینەوە وەڵامی خۆپێشاندەرانیان دایەوە، کە ژمارەیەکی زۆر شەهید و بریندار بوون، دواتر لە شارو شارۆچکەکانی دیکەی کوردستان بۆ پشتیوانی کەرکوك خۆپێشاندان کرا، لە ۷ — ۳- ۲۰۱۳ بەبێ ئامادەبوونی پەرلەمانتارانی کورد، پەرلەمانی عێراق بودجەی پەسند کرد، زۆرجاریش پەیوەندی هەولێرو بەغدا گەیشتۆتە حاڵەتی لەشکرکێشی شوپای عێراق و سەنگەر قایمکردن لە لایەن پێشمەرگەوە، وەك پەلاماری سوپا بۆ سەر خانەقین و جەلەولاو زوممارو شەنگار، دواتر ئۆپەراسیۆنی دیجلەی لە چەند فیرقەیەکی سوپا پێکهێنا، بۆ ئەوەی لەرێی سوپاوە ئیدارەی ئەو ناوچانە بکات، کە لە دەستووردا بە ناوچەی ناکۆکی لەسەر هاتوون، بۆ ئەمەش نوری مالیکی سەرۆك وەزیران زاراوەی (ناوچە تێکەڵەکان) ی بەکارهێنا، ئەمەش وەك ئاماژەیەك بوو بۆ پشتکردنە دەستوور، لەگەرمەی ئەو رووداوانەشدا، سەرۆکی هەرێمی کوردستان، بڕیاریدا (ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم) لە جیاتی (ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان) بەکاربهێندرێ، دواتر ئەو پەیوەندییە گەیشتە حاڵەتی گەڕانەوەی پەرلەمانتارو وەزیرەکانی کورد لە بەغداوە.

بەغدا هەمیشە بەچاوی ترسەوە سەیری هەرێمی کوردستانی کردووە، چونکە هەرێمی کوردستان و بەشەکانی دیکەی عێراق، وەك دوو سەرزەمینی لێك جیاواز دەبیندرێن، تەنانەت لە دەرەوەی عێراق، هەرێمی کوردستان بە عێراقەکەی دیکە ناودەبەن، ئەمەش بۆ ئەو سەقامگیری و ئارامییەی کوردستان دەگەڕێتەوە، کە بۆتە سەرزەمینێکی لەبار بۆ وەبەرهێنان و جموجۆڵی بازرگانی، ئەمە وای لە هەندێ پەرلەمانتاری عەرەب کرد، کە بڵێن ئەو بارە

پێشکەوتووەی هەرێمی کوردستان، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە بودجەی هەرێمی کوردستان بەزیاد دەزانن، لەکاتێکدا بەغدا ١٧٪ ی بەشە بودجەی کورد بەتەواوی نادات، ئەمەش بۆ داپۆشینی فەشەلی حکوومەتی بەغدایە، کە نەیتوانیووە خزمەتگوزاری پێشکەش بە پارێزگاکانی عێراق بکات، بەتایبەتیش دوای ئەوەی ڕێژەی بێکاری و هەژاری لە پارێزگاکانی دیکەی عێراق لەچاو هەرێمی کوردستان بەرزترە، وەزارەتی ناوخۆ و وەزارەتی بەرگری عێراق، نەیانتوانیوە ئەمنیەتی خەڵك بپارێزن و کاری تەقینەوەو کوشتن لەبەرزبوونەوەدایەو، هەندێ جار لە بەغدا گەیشتۆتە حاڵەتی ئەوەی پەلاماری وەزارەت و دامودەزگاکان بدرێت، کەچی لە کوردستاندا دامودەزگای پاراستنی ئاسایش ڕۆڵی کارای هەیە لە دابینکردنی ئەمن و ئاسایش و زەمینەی جموجۆڵی بازرگانی و وەبەرهێنان. لە کاتێکدا کۆتایی بە دەیەی یەکەمی عێراقی نوێ دێت، پەیوەندی هەولێرو بەغدا، لە داکشاندایە، ئەمەریکاش هاتۆتەوە سەر خەت، بەڵام تا ئێستا هیچ ئەنجامێکی لێنەکەوتۆتەوە، ئەمجارە کورد رایگەیاندووە، کە کرداری دەوێ، نەك قسەو بەڵێنی بێ کردار، لە کۆتایی دەیەی یەکەمدا، عێراق بە پاشاگەردانی و ئاڵۆزیدا تێدەپەڕێت، لە لایەك سوننە ڕژاونەتە سەر شەقام و دروشمی رووخاندنی حکوومەت بەرزدەکەنەوە، هەندێ جاریش باس لە بەهارێکی دیکەی عەرەبی دەکەن، ئەمەش وای لە حکوومەت ( کە بەدەست شیعەوەیە) کردووە، خوێندنەوەی دیکە بۆ دۆخەکە بکات، هەندێ بۆچوون دۆخی عێراق وادەخوێننەوە، کە لەبەرامبەر دوو ڕێبژار دایە، یا دابەش بوون یان شەڕی ناوخۆ، لەو نێوەشدا، کورد خۆی کۆدەکاتەوە، لەرێی ئەو کۆبوونەوانەی بەسەرپەرشتی سەرۆك بارزانی بەڕێوە دەچن، بەتایبەتیش کۆبوونەوەی لایەنە سیاسییەکان و پەرلەمانتارو وەزیرەکانی کورد لە بەغدا، کە لە دوا کۆبوونەوەدا بڕیاری پێکهێنانی (لیژنەی گەڵاڵەکردنی هەڵوێست) درا، بۆ کۆکردنەوەی هەڵوێست و بیروبۆچوونی هەموولایەك، سەبارەت بە بەغدا، ئاخۆ کورد چۆن بڕیار بدات؟ لەگەڵ ئەوەشدا، ئەمەریکاییەکان بەرژەوەندییان لەوەدایە، پرۆسەی سیاسی عێراق بەو ئاراستەیەدا نەچێت کە کۆسپ بۆ نەوتی عێراق دروست بکرێت، چاوەڕێ دەکرێ عێراق ببێتە وڵاتێکی بەهێزی خاوەن نەوتێکی زۆر، کەواتە بۆ ئەمەریکا مانەوەی عێراقێکی یەکپارچەی خاوەن نەوتێکی زۆر، گرنگترە لە عێراقێکی پارچە پارچە کراوی پڕ لە گرفت و کۆسپی زۆری بەردەم نەوت، جا ئەمەیان لەسەر حیسابی هەر پێکهاتەیەکیش تەواوبێت گرنگ نییە، ئەم تێڕوانینەی ئەمەریکا بۆ عێراق، بەلای داخوازیی کورددا نایەتەوە.

### لە ئاستی ئیقلیمی و نێودەوڵەتیدا

لە سەرەتای پرۆسەی سیاسی عێراقدا، کورد بەهێز بوو، ئەوەندەی توانیشی لە دەستووردا بیچەسپێنێ، بۆ ئەو بەهێزییەی ئەوکات و، هاوپەیمانی لەگەڵ شیعەدا دەگەڕێتەوە، ئەمەش بۆ سەرەتای پرۆسەی سیاسی لە عێراقی نوێدا، لە وڵاتانی دراوسێ و لای ئەمەریکاییەکانیش قبوڵ بوو، لەبەر ئەم هۆیانە:

١-شیعە بۆ کۆنترۆڵکردنی عێراق پێویستی زۆری بە کورد هەبوو، بەو پێیەش هەردووکیان زەبری سەدام حسێنیان بەرکەوتبوو، هاوپەیمانیەکە باشتر دەچەسپا، بەم شێوەیە، هەردوولا رۆڵی سەرەکییان لە دارشتنی دەستووردا بینی، ئەمەریکاش بێدەنگی هەڵبژارد، چونکە پێویستی بەوەبوو پرۆسەی سیاسی نەوەستێ.

٢-ئێران لە سەرەتای پرۆسەکەدا، لە کورد رازی بوو، چونکە کورد رۆڵێکی کارای هەبوو، ئەو رۆڵەش لەبەرئەوەی سودی بە شیعە گەیاند، ئێران لەبەرامبەر چەسپاندنی مافی کورد لە دەستووردا، هەڵوێستی توندی نەنواند.

٣-بەوپێیەی تورکیا لە سەرەتای راگەیاندنی ئۆپەراسیۆنی ئازادکردنی عێراقدا، هاوکاری ئەمەریکای نەکرد، بۆیە لەسەرەتادا کەمتر لە نێو هاوکێشەکانی عێراقدا دەبیندرا، دیدی تورکیا لە سەرەتای پرۆسەکەدا بۆ هەرێمی کوردستان، بەجۆرێك بوو، لەگەڵ بەرژەوەندی هەرێمی کوردستاندا نەدەهاتەوە، لەبەرئەوە، پەیوەندییەکانی پەرەپێنەدا، لەم رووەوە، ئێران پێش تورکیا کونسولخانەی کردەوە، لەرووی بازرگانیشەوە، زووتر پەرەی پێدا، کەچی دواتر تورکیا بەهۆی گۆڕینی تێڕوانینی بەرامبەر بە هەرێمی کوردستان، زیاتر هاتەپێشەوەو لە کۆتایی دەیەی یەکەمی عێراقی نوێدا، قەبارەی بازرگانیی لەگەڵ کوردستان تا ٨ ملیار دۆلار هاتووەو شارەزایان پێشبینی دەکەن زیاتر بێت و بگاتە ١٢ ملیار دۆلار. ئەمەریکا لەبەر خاتری بەغدا داوای لە تورکیا کردووە بێ ئاگاداری بەغدا رێگە بە گواستنەوەی نەوتی هەرێمی کوردستان نەدات، بە هەرێمی کوردستانیشی راگەیاندووە، تاکلایەنە مامەڵە لەگەڵ نەوت نەکات.

بەشێوەیەکی گشتی، لەم دە ساڵەدا هەرێمی کوردستان، پەیوەندیی لەگەڵ زۆر وڵاتی جیهان باش کردووە، توانیویەتی کۆمپانیای گەورەی بەناوبانگ لە سەر ئاستی جیهان

(ئەمەریکی و بەریتانی و فەرەنسی و رووسی نەرویجی و تورکی...) بهێنێتە هەرێمی کوردستان بۆ وەبەرهێنان لە بواری نەوت، بەلاّم لەبیرمان نەچێت، هەرێمی کوردستان چەند هەوڵی پتەوکردنی ئەو پەیوەندییانە دەدات، بەغداش دوو ئەوەندە هەوڵی تێکدانی ئەو پەیوەندییانە دەدات.

## ئەنجام

لە خوێندنەوەیەکی خێرای، کورد لە دەیەی یەکەمی عێراقی نوێدا، ئەمانە بەرچاو دەکەون:

١-کورد لە سەرتای دەیەکەدا بەهێزبوو، بەهۆی هاتنەوەی لەگەڵ دیدی هەندێ هێزی عێراقی (بەتایبەتیش شیعە) و ئیقلیمی و تەنانەت ئەمەریکیش، بۆی چووەسەر داخوازییەکانی خۆی بخاتە نێو دەستوورەوە.

٢-لەگەڵ بەهێزبوونەوەی بەغدا، بەرە بەرە گێچەڵ بەوەندە مافەی نێو دەستوورکراو بەغدا خۆی لە جێبەجێ کردنی بوارد، بەمەش پەیوەندی هەولێرو بەغدا ناکۆکیی تێکەوت.

٣-ئاراستەی ئەمەریکا بەرەو گرتنەخۆی عێراقە، چونکە چاوی جیهانی لەسەرە، کە لەدوای چەند ساڵێکی دی، ئەو عێراقە دەبێتە دەوڵەتێکی بەهێزو خاوەن داهاتێکی زۆری نەوت.

٤-پێویستە کورد ئاوڕێکی جدی لەو دە ساڵە بداتەوە، کە لە سەرەتای پرۆسەکەدا بەهێزبوو، چی دەسکەوت و کە بەغداش بەهێزبوو، دەسکەوتەکانی بەکوێ گەیشت.

٥-بەرەی ناوخۆی کوردستان زۆر گرنگە، زۆرجار بەغدا فرە هەڵوێستی کوردستانی قۆستۆتەوەو سودی لێوەرگرتووە، بەلاّم لەکاتی یەك هەڵوێستی بەغدا هاتۆتەوە پێش.

٦-دەیەی یەکەمی عێراقی نوێ تەواو بوو، ئەنجام ئەوەیە، ئەگەر بەغدا دەرفەتی لەباری دەسکەوێت، لە هەمووی پەشیمان دەبێتەوە، بۆ بڕیارێکی لەو جۆرەش ناسیونالیزمی عەرەبی هەمیشە لەسەر خەتە، سەرکردەکانی سوننەش لەگەڵ وەدەستهێنانی داواکانیان، بۆ ئەوکارە ئامادەن.

٧-هەوڵ بدرێ مەسەلەی جینوسایدکردنی کورد لە هەموو پایتەختە گرنگەکانی جیهانـدا کاری لەسەر بکرێ و، پشتیوانی دەولی بۆ ئەو مەسەلەیە وەدەست بهێندرێت.

٨-لە مەسەلەی نەوتدا پشتیوانی دەولی زیاتر بکرێت، بەتایبـەتیش ئەوروپاییـەکان، کـە لەڕێی تورکیا سەرچاوەیەکی دەوڵەمەندی نزیکیان دەست دەکـەوێت، خێرابـوون لـەو پرۆژەیـە نیشتمانییەدا زۆر گرنگە، ئەمەش وەك بەهێزی کوردە لە سەرەتای پرۆسەکە، کە توانی داوای خۆی لە دەستووردا جێگیربکات، بۆ نەوتیش هەروایە، چونکە تائێستا بەغدا لەورووەوە، وەك پێویست سەرکەوتوو نەبووە، گرفتە زۆرەکانی دی ڕێگریی لێ دەکەن، کەواتە سەرکەوتنی کورد لە نەوتدا، دیفاکتۆیەك دروست دەکات، کە نەکرێ دەستبەرداری بن.

٩-پێویستە بۆ دەیەی دادێ، کورد هەموو ئەو ئەگەرو سیناریۆیانەی باسیان لێوە دەکرێت لەبەرچاو بگرێت، ئەگەری شەڕی ناوخۆ، ئەگەری دابەشـبوون، ئەگـەری مانـەوەی عێـراق بـە یەکگرتوویی، تا رادەی بێ دەنگی ئەمەریکا لە حوکمڕانییەکی مەرکـەزیی خـاوەن نـەوتێکی زۆروزەوەندی بێ گرفت،

٢٠١٣-٤-٩

# بەشی بەڵگەنامەکان

## سەرۆکایەتی هەرێم نیگەرانە لەسەر دواکەوتنی پڕۆژەی دیمستۆرا دەربارەی ناوچە دابڕاوەکان

١٩-٥-٢٠٠٨

لەماوەی چەند ڕۆژی داهاتوودا دیمستۆڕا پڕۆژەی چارەسەری نەتەوەیەکگرتووەکان لـەبارەی ناوچـە دابڕاوەکـانی کوردسـتان دەخاتـە بـەردەم سـەرکردایەتی کوردسـتانی عـێراق، بـەڵام واپێدەچێت کە لەوادەی خۆی دواکەتبێت .

لەو بارەوە فواد حوسێن، سەرۆکی دیـوانی سـەرۆکایەتی هـەرێمی کوردسـتان نێگـەرانی سەرۆکایەتی هەرێمی ڕاگەیاند دەربارەی دوواکەوتنی پڕۆژەی دیمستۆڕا :

ئێمە نـازانین هۆکـاری ئـەو دوواکەوتنـە چـی یـە ؟ بـەڵام ئێمەسـەرمان سـوورماوە لـە دوواکەوتنی پڕۆژەکەی دیمستۆڕا، ئێمە لەو بارووذۆخە، دووجار کۆبوەنەوەمان لەگەڵ دیمسـتۆڕا کردووە و گەشبین بووە بەوەی پێش ١٥ ئەم مانگە پڕۆژەکە ئامادەبکات و پێشکەشی بکات

## راگەیاندراوێك لە كۆبونەوەی فراوانی سەركردایەتی هەرێمی كوردستان سەبارەت بە راپۆرتی بەرێز(( ستیڤان دیمستورا )) نێردراوی نەتەوەیەكگرتوەكان لە عێراق

بەسەر پەرشتی بەرێز مسعودبارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان رێكەوتی ٢٠٠٨/٦/٩ لە سەلاحەدین كۆبونەوەیەكی فراوان بەسترا تایبەت بو بە راپورتەكەی (( ستیڤان دی مستورا ))بۆ قۆناغی یەكەمی چارەسەركردنی ئەو ناوچانەی دابراون لەهەرێمی كوردستان . لە كۆبوونەوەكەدا هەرسێ سەرۆكایەتیەكەی هەرێمی كوردستان و ئەنجومەنی باڵای پارتەسیاسیەكان و لایەنەسیاسیەكانی بەشداربوو لە پەرلەمان و حكومەتی هەرێمی كوردستان ئامادەبوون.

لە كۆبونەوەكەدا بەراشكاوی باس لە ناوەرۆكی راپۆرتەكەكرا وشیكردنەوەی پێویستی بۆكراو داواكرا ئەم خاڵانەی خوارەوەی لەبارچاوبگیرێت :-

١- بەشداربوانی كۆبونەوەكە نیگەرانی و نارازیی خۆیان دەربری بەرامبەر ناوەرۆكی راپورتەكە كە بە هیچ شێوەیەك چاوەروان نەدەكرا بەم چەشنە بێت و بەم پێیە ناتوانرێت بكرێت بە بنەمایەكی گونجاو بۆ چارەسەر كردنی كێشەكان.

٢- زۆربەی ئەو هەنگاوانەی لە میكانیزمی جێبەجێ كردنی راپورتەكەدا كاری پێكراوە دورە لەو خاڵانەی پێشتر بۆ چارەسەركردنی كێشەكان رێكەوتنی لەسەر كرابوو.

٣- خۆلادان لەناوەرۆك و داواكاری دەستور بۆ جێبەجێكردنی مادەی (١٤٠)

٤- كۆمیتەكەی بەرێز دیمستۆرا زیاتر خۆی بە كاری لاوەكی خەریك كردوە لەبری ئەوەی كارلەسەر كرۆكی كێشەكان بكات و بەشێكی زۆری راپورتەكە تەرخان كراوە بۆ هەندێك وردەكاری لەم ناوچانەدا كەئەركی ئەوان نەبوو.

بەگشتی بەشداربووان نارازی خۆیان دەربری بەرامبەر راپورتەكە و بە نەگەتیڤیان لەقەلەم دا و بۆ ئەم مەبەستە بریاردرا نامەیەكی فەرمی ئامادەبكرێت تیایدا وردەكارییەكان بۆچارەسەركردنی هەڵەكانی ناو راپۆرتەكە و داخوازیەكانی هەرێمی

کوردستان لەخۆبگرێت و بنێردرێت بۆ بەرێز ((ستیڤان دیمستورا) و لیژنـەی پەیوەنـدی دار و هەروەها کۆمیتەیـەکیش لـە نوێنـەرانی هـەرێمی کوردسـتان پێکبهێنرێـت بـۆ دانوستاندن لەگەڵ نوێنەری نەتەوەیەکگرتوەکان لە عێراق.

لە کۆتایدا بەشداربوان داوایانکرد ئەم نیگەرانیە لەبەر چاو بگیرێـت و هەڵە و کەم و کوریەکانی ناو راپورتەکە چارەسـەر بکرێـت و ئـەم قۆناغـەش نەکرێتـە بنـەما بـۆ قۆناغەکانی داهاتوو.

هەولێر

٢٠٠٨/٦/٩

# سەرۆکی هەرێمی کوردستان: ماددەی ١٤٠ گەیشتۆتە قۆناغێکی زۆر هەستیار

ئەمڕۆ دووشەممە ٢٠٠٨\٧\١٤ بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین لەگەڵ حزب و لایەنە سیاسییەکانی هەرێمی کوردستان کۆبووەوە.

لە کۆبوونەوەکەدا، سەرۆك بارزانی تیشکی خستە سەر مەسەلەی کەرکوك و شوێنە دابڕاوەکانی دیکە هەرێمی کوردستان و رێگەکانی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ ی دەستوور و مەسەلەی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان بە تایبەتی لە شاری کەرکوك و میکانیزمە پێویستەکانی پتەوکردنی پێکەوەژیانی ئاشتییانەی لە نێوان سەرجەم پێکهاتەکانی کەرکوك و بەشدارپێکردنی سەرجەم پێکهاتەکان لە بەڕێوەبردنی شارەکەدا و هەروەها زۆر بە وردیش دەربارەی یەکەم شیکردنەوەی نەتەوە یەکگرتووەکان دوا کە تیایدا چەند پێشنیارێك کراون بۆ دیاریکردن و یەکلایکردنەوەی چارەنووسی چوار قەزا کە سنوورەکانیان ناکۆکییان لە سەرە و ئاماژەشی بەو هەڵانە کرد کە لە یەکەم شیکردنەوەکەدا هاتوون و هیوای خواست کە ئەو هەڵانە لە دووەم و سێیەم شیکردنەوەدا دووبارە نەبنەوە و تەئکیدیشی لەوەکردەوە کە نوێنەری سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان دیمستۆڕا بەڵێنی ئەوەی داوە کە لە دووەم و سێیەم شیکردنەوەدا ئەو هەڵانە دووبارە نابنەوە و زیاتر واقعیانەتر بن.

هەر سەبارەت بە ماددەی ١٤٠ ی دەستوورەوە ، سەرۆك بـارزانی روونیکـردەوە کـە ئـەو ماددەیە گەیشتۆتە قۆناغێکی زۆر هەستیار کە پێویستە وەك حزب و لایەنی سیاسی کوردی و تورکمانی و ئاشووری هەڵوێستێکی یەکگرتوومان لە بەرامبەریدا هەبێ، چونکە مەسەلەیەکە تەنها پەیوەندی بە لایەنێکەوە نییە، بەڵکو بە گشت لایەن و گەلی کوردستانەوە و داواشی لە لایەنە سیاسییەکانی ئامادەبووی کۆبوونەوەکە کرد کە پشتگیرییەکی تەواو لەو لیژنەیە بکـەن کە بۆ جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ لە هەرێمی کوردستاندا بڕیاری پێکهێنانی دراوە.

ئەمەو هەریەکە لە حزب و لایەن سیاسییەکانی بەشـداربووی کۆبوونەوەکـە را و سـەرنجی خۆیان سەبارەت بە تەوەرەکان خستە روو و هەر هەمووشیان کۆك بوون لەسەرخسـتنی کـاری ئەو لیژنەیە و بەیەك هەڵوێستیش رووبەرووی هەموو ئەگەرەکان ببنەوە

# وتەبێژی فەرمی سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان ئەم لێدوانەی ڕاگەیاند

ئەمڕو (٢٢ ی تەموزی ٢٠٠٨) سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق پێشێلكاریەكی دەستوری ئەنجام دا كە پێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆی ئەنجوومەن بوو، لە كاتێكدا هەڵسا بە ڕێكخستنی پرۆسێسی دەنگدانی نهێنی، خۆی لە چوارچێوەی یاریەكی سیاسی دەنواند، وەك كۆدەتایەك بوو لە دەستوری عێراق و تەوا و خۆ لادانێك بوو لەو تەوافوقە سیاسیەی كە لە دوای ڕوخانی ڕژێم لە (٢٠٠٣) وە تاكو ئەمڕۆ پرۆسەی سیاسی لەسەری دەڕوات.

سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق لە پرۆسەیەكی نهێنی دا پالّی بە ئەنجوومەنەوە نا لەمەڕ یاسای پارێزگاكان و ماددەی پەیوەندیدار بە پارێزگای كەركوك لە كاتێكدا نوێنەرانی پێكهاتە نەتەوەیی و سیاسیەكان لەسەر شێوازێكی گونجا و بۆ تێپەڕاندنی یاسای هەڵبژاردنەكانی ولاّت ڕێكەوتبوون.

ئێمە لە كاتێكدا ئەم هەڵسوكەوتە چاوەڕوان نەكراوە لە سەرۆكی ئەنجوومەنی نوێنەران و ئەوانەی كۆك بوون لەگەڵی دا ڕەت دەكەینەوە، لەهەمان كاتدا پابەند نەبوونی هەرێمی كوردستان بە ئەنجامەكانی ئەم پرۆسە نادەستوریە ڕادەگەیێنین، چونكە ئەوەی لەسەر بنەمای نادروست بنیات بنرێت نادروست دەردەچێت.

ئێمە بەتوندی نیگەرانی خۆمان لەم شێوازانە دەردەبڕین و ئەگەر كەسانی تریش پێوەی پابەندبن ئەوە وامان لێدەكات كە چاو بە هەڵوێستەكانمان و تەنانەت هاوپەیمانیەتیەكانمان بخشێنینەوە، لەبەر ئەوەی گەلەكەمان مارانگازی ئەم جۆرە سیاسیەتە پێچاو پێچ و هەڵوێستە نادەستوریانە بویتەوە كە لەگەڵ تەوافقە سیاسیەكان ناگونجێت.

ئێمە داوا لە ئەنجوومەنی نوێنەران و بەڕێز سەرۆك كۆمار و دەستەی سەرۆكایەتی دەكەین بەرهەڵستی ئەم پرۆژە گومان لێكراوانە بكەن كە لە بەرژەوەندی ئەجندای عێراق دانیە و

ئامانجی دروستکردنی کۆسپ و تەگەرەیە لە بەردەم ڕێڕەوی دیموکراتی و نیشتامانی و پڕۆسێسی هەڵبژاردنی ئەنجوومەنی پارێزگاکان و هەوڵدانێکە بۆ پەکخستنی سەرجەم پرۆسە سیاسیەکان، ئێمە دڵنیان کە نیشتمان پەروەران و دڵسۆزان لە لایەنە سیاسیەکان بە هوشیاریەوە دەڕواننە ئەم هەڵسوکەوتە نا بەرپرسیاریانە .

داوا لە هەموو پارت و هێز و کەسایەتیەکان لە ڕۆڵەکانی هەرێمی کوردستان دەکەین یەك دەنگ و یەك ڕیز بن بۆ پوچەڵ کردنەوەی ئەم پیلانە ترسناکە.

**وتەبێژی فەرمی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**

**سێ شەمە (٢٢ / تەموزی / ٢٠٠٨)**

# ڕاگەیاندراوی کۆبوونەوەی فراوانی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و سەرۆك و نوێنەرانی حزبە کوردستانیەکان

ئەمڕۆ پێنج شەممە (٢٤/ تەموزی /٢٠٠٨) کۆبوونەوەی فراوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان و سەرۆك و نوێنەرانی حزبە کوردستانیەکان بۆ تاوتوێکردنی "یاسا" ی هەڵبژاردنی پارێزگاکان کە لەلایەن ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق تێپەڕیبوو و تیایدا ماددەی (٢٤) ی پەیوەندیدار بە پارێزگای کەرکوکی پێوە لکێنرابوو بەڕێوەچوو.

ئامادەبووان هەموو لەسەر ئەوە کۆکبوون کە پڕۆسەی بڕیاردان لەسەر یاساکە خۆدزینەوە و پێچەوانەی پەیڕەوی ناوخۆی ئەنجوومەنی نوێنەران و دەستوری عێراق بووە،هەروەها هەوڵدانێکی ڕوون و ئاشکرا بووە بۆ لە باربردنی ماددەی (١٤٠) ی دەستوور.

کۆبونەوەکە لە ئەنجامە نێگەتیڤەکانی ئەم پڕۆسەیەی کۆڵیەوە و کە دەچوونە لە پڕەنسیپی تەوافق، کە بنەمای پڕۆسەی سیاسیە لە عێراقدا، هەروەکوو ئەم یاسایە دەبێتە ئەگەری پەکخستنی ڕێڕەوی دیموکراسی عێراق و لە خزمەت دوژمنانی گەلانی عێراق دا دەبێت.

ئامادەبوانی کۆبونەوەکە، هەڵوێستی ئەنجوومەنی سەرۆکایەتی عێراقیان بەرز نرخاند و بە کۆی دەنگ ئەم یاسایەیان ڕەتکردوە بۆ ئەنجوومەنی نوێنەران، ئەمەش ئەوە نیشان دەدات کە بەڕێزان سەرۆك کۆمار و جێگرەکانی بەم هەنگاوە لێزانیانەیان، دەریان خست کە جێبەجێ کردنی ئەم یاسایە دەبێتە هۆکاری ئاژاوە و نەمانی ئەمن و ئاسایشی وڵات.

بڕیاردان بەم شێوازە نادەستوریە، وا لە پارت و سەرکردایەتی کوردستان دەکات کە چاو بە هاوپەیمانیەتی و پەیوەندی لەگەڵ لایەنەکانی تردا بخشێنێتەوە، چونکە دەرکردنی ئەم شێوازە بڕیارەی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق بۆ ڕۆڵەکانی کوردستان بە هەموو پێکهاتەکانی لە کورد و تورکمان و کلد و ئاشوری .. نیشانەی ئەوەیە کە هەندێك لە ڕوانگەی پاشخانی کولتوری

شۆڤینی و خۆبەزل زانین هەڵسوکەوت لەگەڵ دۆزی گەلی کوردستان بە گشتی و میللەتی کورد بەتایبەتی دەکەن.

لە عێراقدا نوێنەرانی گەلی کوردستان تەنیا بەشدار بووی پڕۆسەی سیاسی و حوکم نین بەڵکو هاوبەشن، هەرکەسێك بەم شێوەیە هەڵسوکەوت لەگەڵ هاوبەشی بکات دەبێت ڕەچاوی ئەوە بکات کاردانەوەی بەرامبەر وەك و خۆی دەبێت یان بە هێزتر.

هەڵسوکەوت کردن لە مەسەلەی کەرکوك و ناوچەکانی تر بە تەجاوز کردنە سەر دەستوور و فێڵ کردن لە یاسا، نابێتە ئەگەری چارەسەری کێشەکان بەڵکو قوڵتریان دەکات.

ئەوەی لە ئەنجوومەنی نوێنەران ڕویدا زەنگێکی ترسناك بوو بۆ خەڵکی کوردستان، ڕۆژگارە تفت و تاڵ و ئینکاری کردن لە مافەکانمان وەبیر دێنێتەوە. ئێمە هۆشیاری دەدەین کە ئەم یاسایە دیاردەیەکی ڕەشبینە و هەوڵدانە بۆ یاساکردنی ( تعریب ) و دەربەدەرکردن و کۆنترۆڵ کردنی شاری کەرکوك، ئەمەش لەلایەن پێکهاتەکانی گەلی کوردستان بەتوندی ڕەتدەکرێتەوە.

ئێمە داوا لەو برا عەرەب و دڵسۆز و نیشتمان پەروەرانە دەکەین لە عێراق، کە بڕوایان بە پرۆسەی سیاسی هەیە ئەم سیاسەتە پێچاوپێچیە ئیدانە بکەن و جەخت لەسەر برایەتی و بەرژەوەندی نێوان کورد و عەرەب بکەنەوە، هەروەکوو باوەڕمان وایە کە پێکهاتەکانی تر لە تورکمان و کلد و ئاشوری و عەرەبەکانی کوردستان شان بەشانی گەلی کورد دژی ئەم هەولانە دەوەستن چونکە ئامانجی زەرەمەندە بۆ هەموو لایەك و بۆ دیموکراسی و فرەیی و پێکەوە ژیان و یەکێتی ئارەزومەندانە.

ئێمە پابەند بوونی تەواوی خۆمان بە دەستوری عێراق و کاروانی دیموکراسی ڕادەگەیێنین و پاڵپشتی هەموو هەوڵێك دەکەین لە پێناو بنیاتنانی عێراقێکی دیموکراسی و فیدراڵی ئازاد کە هەموو لایەك لە سایەی دا بە مافی بگات .

داوا لە هەموو ڕۆڵەکانی کوردستان دەکەین بە هەموو پێکهاتە و لایەنە سیاسیەکانی دژی ئەم سیاسەتە یەك ڕیز و یەك هەڵوێستێکی یەکگرتوویان هەبێت .

هەروەها لە کۆبوونەوەکەدا ئامادەبوان کۆمەڵێك بڕیاری پێویستیان دا بۆ هوشیار کردنەوە و ئامادەکاری ڕای گشتی لە کوردستان، کۆبوونەوە جەختی لەسەر بەردەوام بوونی پەیوەندیەکان لەگەڵ دەستەی سەرۆکایەتی کۆمار لە بەغدا و سەرۆکایەتی ئەنجوومەنی وەزیران و هێز و لایەنەکانی کردوەوە بۆ چارەسەرکردنی ئەو هەڵە گەورەیەی کە سەرۆکی ئەنجوومەنی

نوێنەران و چەند ئەندامێکی تر تێیکەوتبوون، ئەویش لە پێناو پارێزگاری کردن لـە پرۆسـەی دیموکراسی و خزمەتکردنی سەرجەم پێکهاتەکانی گەلی عێراق .

جێگای ئاماژە پێکردنە کۆبوونەوە فراوانەکـە بەسـەر پەرشـتی بـەڕێز مەسـعود بـارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و بـە ئامـادەبوونی کۆسـرەت ڕەسـول علـی جێگـری سـەرۆك و سەرۆکی ئەنجوومەنی نیشـتمانی کوردسـتان و سـەرۆکی حکومـەتی هـەرێم و جێگرەکانیـان بەڕێوەچوو.

**پێنج شەممە ٢٤/تەموزی/٢٠٠٨**

## سەرۆكی هەرێم:
## جارێكی تر بەهیچ شێوەیەك ژێر دەستی قبولْ ناكرێت

٢٠٠٨-٧-٢٧

بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان لە میانەی دیداری لەگەلْ رایان كرۆكەر باڵیۆزی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمەریكا رایگەیاند" یان دەبێت گەلی كوردستان شەریكی راستە قینە بێت یاخود نابیٚ سیاسەتی تاكرەوی بەرامبەری پیادە بكرێت، چونكە جارێكی تر بەهیچ شێوەیەك ژێر دەستی قبولْ ناكرێت".

ئێوارەی دوێنیٚ مەسعود بارزانی سەرۆكی كوردستان لە بەغدا پێشوازیی لە رایان كرۆكەر باڵیۆزی ئەمەریكا لە عێراق و شاندێكی یاوەری كرد كە پێكهاتبوو لە باڵیۆز تۆماس كرێچیسكی و باڵیۆز رۆبێرت فۆرد .

لە دانیشتنێكدا، پرۆژە یاسای هەڵبژاردنی پارێزگاكان و چۆنیەتی دەنگدان لەسەر ئەو یاسایە و هەڵوێستی لایەنە سیاسییەكان بەرامبەر بەو یاسایە و ماف و خواستەكانی گەلی كوردستان و چۆنیەتی رەتكردنەوەی لە لایەن سەرۆكایەتی كۆمارەوە گفتوگۆیان لەسەر كرا .

سەرۆكی هەرێمی كوردستان راشكاوانە نیگەرانی خۆی و گەلی كوردستانی بەرامبەر بەو هەڵوێستەی ژمارەیەك لە لایەنەكانی ناو ئەنجومەنی نوێنەران نیشان دا و تەئكیدی لەوە كردەوە كە ئەگەر ئەم هەڵوێستە هەڵوێستێكی بنەڕەتی و بەردەوام بیٚ بەرامبەر بە گەلی كوردستان ، ئەوە لادانە لە دەستوور و گەلی كوردستانیش قبوولّی ناكات .

له لایەکی تریشەوە ، سەرۆکی هەرێمی کوردستان شێوازی تێپەراندنی ئـەو یاسـایەی بـە رەوشێکی خەتەرناك لە قەڵەم دا کە بۆتە سەرهەڵدانی ئاماژەی جۆراوجۆری خەتەرناك لـە لای خەڵکی کوردستان .

هاوکات مەسعود بارزانی تەئکیدی لەوە کردەوە : یان دەبـێ گـەلی کوردسـتان شـەریکی راستەقینە بێت یاخۆد نابێ سیاسەتی تاکڕەوی بەرامبەری پیادە بکرێ، چونکە جارێکی تر بە هیچ شێوەیەك ژێردەستەیی قبۆڵ ناکات .

لە لایەن خۆیەوە باڵیۆزی ئەمەریکا لە عێراق هیوای خواست کە ئەو هەڵەیەی کراوە چاك بکرێت و پرۆسەی دیالۆگیش بەردەوام بێت بۆ چارەسەرکردنی ئەم کێشەیە.

## راگەیاندراوی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە خۆنیشاندانی جەماوەری کەرکوك

سەبارەت بەو کردەوە تیرۆریستیەی خۆپیشاندانە جەماوەرییەکەی ئەمڕۆی شاری کەرکوکی کردە ئامانج، سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان لە راگەیەندراوێکدا ئاماژەیداوە، کە جارێکی دیکە ئاشتیخوازی گەلی کوردستان و بنەمای پێکەوە ژیانی برایانەی هەمووانی دووپات کردووە و بەڵام بە داخەوە لە بەرامبەر ئەم هەڵوێستە سەردەمییەی جەماوەری کەرکوك بۆ جارێکی دیکە تیرۆریست و ناحەزانی گەلی کوردستان پەنایان بۆ تیرۆرو و کاری تیرۆریستی بردەوە و تەقینەوەیەکیان لە نێو حەشاماتی خۆنیشاندەران ئەنجام دا و لەگەڵیشیدا خۆنیشاندەرانیان گولەباران کرد، ئەمەش دەقی راگەیەندراوەکەیە:-

هاوکات لەگەل ئەو هەولانەی کە لە بەغدا بۆ چارەسەری گرژییەکانی پاش تێپەراندنی یاسای ئەنجومەنی پارێزگاکان دەدرێت ، ئەمرۆ دوو شەممە ۲۸ی تەمموز جەماوەری بەشەرەف و نیشتیمانپەروەری کەرکوك وەك هەڵوێستێکی سەردەمیانە و بۆ دەربرینی نارەزایی خۆیان لە بەرامبەر تێپەڕاندنی گوماناوی پرۆژە یاسای هەلبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان و ماددەی ۲٤ی نێو پرۆژە یاساکە کە تایبەتە بە کەرکوك ،زیاتر لە ۲۰۰ هەزار کەسیان رژانە سەر شەقام و گۆرەپان و جێگا گشتیەکانی شارەکە و لە خۆنیشاندانێکی هێمن و ئاشتیانەدا خواست و داواکارییە یاساییەکانی خۆیانیان خستە روو کە تیایاندا جێبەجێکردنی ماددەی ۱٤۰ی دەستوری هەمیشەیی و ڕەتکردنەوەی پرۆژە یاسای هەلبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان لە ریزی پێشەوەی خواست و داواکاریەکانیان بوو ، ئەم هەڵوێستە نیشتیمانپەروەرییەی کەرکوك ، جارێکی دیکە ئاشتیخوازی گەلی کوردستان و بنەمای پێکەوە ژیانی برایانەی هەمووانی دووپات کردووە ، ئێمە لە کاتێکدا ئەم خۆنیشاندانە ئاشتی و هێمنانەیەی جەماوەری کەرکوك بەرز دەنرخێنین ، سوپاسی خۆنیشاندەرانی کەرکوك و تێکرای جەماوەری کەرکوك بە گشت پێکهاتەکانیەوە دەکەین، بەڵام بە داخەوە لە بەرامبەر ئەم هەلوێستە سەردەمییەی جەماوەری کەرکوك بۆ جارێکی دیکە تیرۆریست و ناحەزانی گەلی کوردستان

پـەنایان بـۆ تـیرۆرو و کـاری تیرۆریسـتی بـردەوە و تەقینەوەیـەکیان لـە نێـو حەشـاماتی خۆنیشاندەران ئەنجام دا و لەگەلیشیدا خۆنیشاندەرانیان گوللەباران کرد کە بووە هۆی شەهید و بریـندار بـوونی ژمارەیـەکی زۆر لـە خـەڵکی سـیڤیل ، ئـەم کردەوەشـیان بەڵگەیـەکی حاشاهەڵنەگرەکە خۆسـازدانی پێشـوەختەی ئـەو تاوانبارانـە دەسـەلمێنێت .ئێمـە ئـەم کـارە تیرۆریستیە ریسواو مەحکوم دەکەین و داوا لە دەزگا پەیوەندیدارەکانی شارەکە دەکەین کە بە دواداچوون و لێکولینەوەی یاسایی بۆ ئاشکرا کردنی تیرۆریسـت و ئەنجامـدەرانی ئـەم تاوانـە تیرۆریسـتییە وئەوانەشـی کـە دالـدەی تیروریسـتان دەدەن ئـەنجام بـدەن هـەمووانیش دلنیـا دەکەینەوە کە ئەم کار و کردەوە تیرۆریستیەی ئەمرۆ و تەواوی پیلانـی دوژمنـان لـە بـەردەم خواست و داخوازیەکان□ی گەلی کوردستان دا کە لە خونیشاندانی کەرکوك دا دووپات کرانەوە رێگر نابن بەلکو سوور بوونی گەلی کوردستان لە سەر عەدالەتی دۆزەکـەی و جێبـەجێکردنی ماددەی ١٤٠ نیشان دەدات.

لە خوای گەورە داواکارین جێگەی شەهیدان بەهەشتی بەرین بێت و هیوای چـاکبوونەوەی خێراش بۆ بریندارەکان دەخوازین.

**سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**

**٢٨ی تەموزی٢٠٠٨**

## پەیوەندی تەلەفۆنی سەرۆکی ئەمەریکاو سەرۆکی هەرێم

## سەرۆکی هە رێم:

## خەڵکی کوردستان لەگەڵ هەڵبژاردنی پارێزگاکاندایە بە شێوەیەك لە چوارچێوەی دەستووری هەمیشەیی دا بێت

٢-٨-٢٠٠٨

سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا "جۆرج بووش" لە میانەی پەیوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ سەرۆکی هەرێمی کوردستان، هیوای خواست لایەنە عێراقییەکان لەهەمبەر یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان بگەنە رێککەوتن، سەرۆکی هە رێمی کوردستان "مەسعود بارزانی" دووپاتیکردەوە کە خەڵکی کوردستان لەگەڵ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پارێزگاکانن، بەشێوەیەك لە چوارچێوەی دەستوری هەمیشەیی عێراقدا بێت. دوێنی شەو ، لە پەیوندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ سەرۆکی هەرێمی کوردستان "مسعود بارزانی"، سەرۆکی ویلایەتە یەککگرتووەکانی ئەمەریکا "جۆرج بووش" وێرای خۆشحاڵی دەربڕین بۆ ئەو پەیوەندییەی، باسی یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان کرد و هیوای خواست گشت لایەنە عێراقییەکان لەسەر یاساکە رێك بکەون.

لە لای خۆیەوە سەرۆك بارزانی روونیکردەوە کە سەردانەکەی بۆ بەغدا بۆ ئەوەیە کە بەشدار بێ لە دۆزینەوەی چارەسەرێکی گونجاو بۆ گشت ئەو کێشانەی کە پەیوەندییان بە پرۆسەی سیاسی عێراقەوە هەیە، لەوانە یاسای هەڵبژاردنی ئەنجومەنی پارێزگاکان و لەو پێناوەشدا هەموو هەوڵێکی خستۆتەگەر و تەئکیدیشی لەوە کردەوە کە خەڵکی کوردستان لەگەڵ ئەنجامدانی هەڵبژاردنی پارێزگاکانن، بەشێوەیەك کە لە چوارچێوەی دەستوری هەمیشەیی عێراقدا بێت.

## سەرۆکی هەرێمی کوردستان:
## پشتگیری لە داواکەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك دەکەین

٢٠٠٨-٨-٤

ئێوارەی ئەمڕۆ لەمیانەی ئەو کۆنگرە رۆژنامەوانییەی کە لە فڕۆکەخانەی نێودەوڵەتی هەولێر سازیکرد، سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەوەڵامی پرسیارێکی رۆژنامەنووسان سەبارەت بە داواکەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك بۆ چوونە پاڵ هەرێمی کوردستان، گوتی:

داواکەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك مەرجی داناوە بۆ چوونە پاڵ هەرێمی کوردستان کە ئەوەیش ئەوەیە ئەگەر مادەی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیی عێراقی فیدراڵ جێبەجێ نەکرا، ئەوسا ئەوان بڕیاری چوونە پاڵ هەرێمی کوردستان دەدەن، هەر بۆیە ئەگەر داواکەیان جێبەجێ نەکرا، مافێکی دەستووری و یاسایی خۆیانە بێنە پاڵ هەرێمی کوردستان.

سەرۆکی هەرێمی کوردستان گوتیشی: ئێمە پشتگیری لە داواکەی ئەنجومەنی پارێزگای کەرکوك دەکەین و داوایەکی دەستووری و یاساییە.

سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە بەشێکی دیکەی قسەکانیدا روونیکردەوە: پۆستە وەزیفییەکانی لە کەرکوك زۆرینەیان بەدەست پێکهاتەکانی دیکەوەن ٥٧٪ وەزیفەکان بەدەست عەرەبەوەیە، ٢٣٪ی بەدەست تورکمانە و ئەوەی تریشی کە دەمینێتەوە بەدەست کورد و ئاشوورییەوەیە.

سەرۆکی هەرێمی کوردستان راشیگەیاند" ئێمە هیچ کاتێك لاریمان نەبووە لە بەشداری کردنی پێکهاتەکانی کەرکوك لە بەڕێوەبەردنی پۆستە ئیدارییەکان".

## سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان پێشوازی لە پەسەندکردنی ڕێککەوتننامەی ئەمنی کرد

**٢٠٠٨-١١-٢٨**

فواد حوسێن، سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان لـە لێدوانێکـدا پێشـوازی سەرۆکایەتی کوردستانی لە ڕێککەوتننامەی ئەمنی عێراق - ئەمەریکا ڕاگەیاند و ئاماژەیدا کە سەرۆکایەتی هەرێم دەمێکە پشتیوانی لەم ڕێککەوتننامەیە دەربڕیوە کە لـە بەرژەوەنـدی عێراقییەکاندایە وە پێمانوایە مادەکانی پەیوەست بەو ڕێککەوتننامەیە لە بەرژەوەندی عێراق و بەرژەوەندی ڕەوشی ئەمنی و ئابووری عێراقدایە.

سـەرۆکی دیـوانی سـەرۆکایەتی هـەرێمی کوردسـتان ئومێـدەواری دەربـڕی بـەوەی ئـەم ڕێککەوتننامەیە ببێتە فاکتەرێك بۆ بونیادنانی دامەزراوەی دەستووری و سەربازی و ئەمنی و ئابووری لە عێراقدا، وێڕای ئەمانەش ببێتە مایەی بونیادنانی سیستەمێکی یـەکگرتوو، کـە تاکە زەمانەتێکە بۆ هەموو لایەك.

# نامەیەکی کراوە لە سەرۆك مەسعود بارزانی بۆ ناوەندە میللی و فەرمییە عەرەبیەکان لە پێناو نەهێشتنی بەدحاڵیبوون و پتەوکردنی لەیەکگەیشتنی هاوبەش

بەناوی خودای مەزن و دلۆڤان
نامەیەکی کراوە بۆ ناوەندە میللی و فەرمییە عەرەبیەکان
لە پێناو نەهێشتنی بەدحاڵیبوون و پتەوکردنی لەیەکگەیشتنی هاوبەش

سەلامی خوداتان لێ بێ

بەبۆنەی هاتنەوەی هەردوو ساڵی نوێی کۆچی و زایینی، خۆم بە خۆشحاڵ و بەختەوەر دەبینم جوانترین پیرۆزبایی لە سەرجەم خوشك و برا موسوڵمان و مەسیحیەکان لە سەرانسەری جیهان و بە تایبەتی لە عێراق بکەم، لە خودای پەروەردگار داواکارم ئەم دوو بۆنەیە بە خێر و ئاشتی و پێشکەوتن بەسەر هەمووواندا بێنێتەوە.

ئەم دەرفەتەش بە هەل دەبینم تاوەکو ئەم نامەیەتان ئاراستە بکەم، بەو هیوایەی یارمەتیدەر بێ بۆ روونکردنەوەی وێنەکە و لابردنی بەدحاڵیبوون.

پێویستمان بەوە نیە زیاتر لەبارەی وردەکاری رایەڵەکانی پەیوەندی نێوان هەردوو گەلی کورد و عەرەب بدوێین لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، نەخاسمە لە عێراقی فیدراڵ، لەبەر ئەوەی ئەو پەیوەندیانە هەر چەند باسیان لێوە کرابێ، پەیوەندییەکی مێژوویی و کەلتووری و جڤاکی و ئایینین و ئاوێتەی ئامانجگەلێکی سیاسی هاوبەش بوون لە پێناو ئازادی و مافەکانی مرۆڤ و دیموکراتیەت.

ئەوەی مایەی خۆشحاڵیشە کە هەردوو لایەن بە پێکەوەژیانێکی هاوبەش گەیشتوون لەسەر بنەمای یەکگرتنێکی ئارەزوومەندانەی دیموکرات و ئازاد ی پەرەسەندوو، ئەویش لەسەر

شەنگستەی دانپێدانانێکی دەستووری و یاسایی بە مـافی گـەلی کوردسـتان بـۆ بـەڕێوەبردنی کاروبارەکانی خۆی، بە گوێرەی ئەم یەکێتیە فیدراڵییەی کە عێراقی نوێ دوای رزگار بوونی لە دیکتاتۆرییەت و سیاسـاتی شـۆڤینی، وەکـو ئـەزموونێکی بـاڵای دیمـوکراتی و مرۆڤایـەتی دەیخاتەڕوو و دەبێتە چرایەك بۆ گەلان و وڵاتانی رۆژهەڵاتی موسوڵمان.

بۆیە لێپرسراوێتی هاوبەشمان دوو بەرابەرە لەهەمبەر سەرخستنی ئەم ئەزموونـەی ئێسـتا لەسەر بنەمای ئازادیی هەڵبژاردن و پەیڕەوکردنی دیموکراتی بەرقەرارە.

لەسایەی ئەم هەڵبژاردنە راست و دروستەی فیدراڵیزمی دیموکراتییش، مافەکان دابەشبوون کە هەموو پێکاتەکانی دیکەش بگرنەوە:( تورکمان، کلـدان، ئاشـووری، سـریان)، بێگومـان سیستمی فیدراڵیزمی دیموکراتییش تەنها ئەو کاتە بەرکەماڵ دەبێ کە هـەموو پێکهاتـەکانی وڵات مافەکانی خۆیان هەبێ بە پێی دەستوور و هەر یەکەو بە گوێرەی توانا و پێگەی خۆی.

رێزگرتنی مافە سیاسـی و نەتـەوەیی و ئایینیـەکانی کەمینـەکانیش سـەنگی مەحـەکی ئەزموونەکەمانە لە عێراقی نوێ.

پەیوەندیەکانی کورد و عەرەبیش بە درێژایی مێژوو بە شێوازی جیاجیا تێپەڕیوە و زۆربەی جارەکان رۆڵی کورد لەبەر چاو نەگیراوە و نکووڵی لە مافەکانیان کراوە و بە توندوتیژی و هێز و ستەمکاری بۆچوونەکانیان چەپێنراوە، لە هەنـدێ کـاتیش پەیوەندیـەکان نـەرم و سروشـتی بوونە، پەیوەندی کەلتووری هەمەچەشنیش لە نێوان هەردوو لایەندا پەرەی سەندووە.

کورد لە سەرجەم بوار و کایە مەعریفی و وێژەیی و دیـرۆك و ئایینیـەکان و تەنانـەت لـە خودی زمانی عەرەبییشدا بەشداری لـە دەوڵەمەنـدکردنی کـەلتووری ئیسـلامی و عەرەبیـدا کردووە.

کورد هەر وەها لە وڵاتانی جیاجیـای ناوچـەکەدا بەشـداربوونێکی کـارای لـە بنیاتنـانی شارستانیەتدا کردووە، هەر وەهـا بەشـداری بـەرگریکردنی لـە رزگـاری و سـەربەخۆیی ئـەو گەلانەدا کـردووە دژ بـە هێـرش و پـەلامارە دەرەکیـەکان و ژمارەیـەك رابـەر و سـەرکردەی

مێژوویی ناوداری پێشکێش کردووە و هەرەبەرچاویان سەلاحەدینی ئەیوبی یە، لە نێو کورداندا چەندین کەسانی پسپۆر و ئەقڵمەندی مەزن هەڵکەوتوون لە بوارەکانی بەڕێوەبردنی دەوڵەت و هونەرەکانی ئاوەدانکاری و بیناسازی و سەرکردایەتیکردنی سوپا و لە سەردەمەکانی خەلافەت و ئیمبراتۆریەکاندا بەشداریەکی سەلمێنراوی پێشکێش کردووە، سەرەڕای ئەوەی کورد لە زۆربەی ئەو سەردەمانەدا دووچاری بێبەشبوون و فەرامۆشکردن و چەوساندنەوە بۆتەوە.

گەلی کورد هەتا ئێستاش لەپێشەوەی خەباتکاران و داخوازکارانی بەرقەرارکردنی ئازادی و مافەکانی مرۆڤ و دادپەروەری و دیموکراتیەتە لە وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناڤین، لەبەر ئەوەی ئەو دەبینێ کە سەرکەوتنی دیموکراتیەت و دادپەروەری نزیکترین رێگایە بۆ بەدەستهێنانی مافە نەتەوەیی و کۆمەڵایەتیەکان و لابردنی ئەو ناهەقی و جەورەی بەدرێژایی مێژوو لێی کراوە.

نزیکترین گەواهییش لەسەر رەوت و رێبازی دیموکراتیانەی گەلی کورد، پەیڕەوکردنی دروشمی دیموکراتیەت بۆ عیراق و دەستەبەرکردنی مافە رەواکانی گەلی کوردە لە لایەن بزاڤی رزگاریخوازیی کورد، لەبەر ئەوەی لای سەرکردایەتی کورد روون و ئاشکرا بو کە دۆزی کورد و کێشەکانی دیکەی عێراقیش چارەسەر نابن بەبێ بەرقەراربوونی دیموکراتیەت لە عێراق.

بۆیە سەرکردایەتی کورد ئاشتبوونەوەی نیشتمانی و بەکاربردنی گیانی لێبوردەیی وەکو نەگۆڕێك پەیڕەوکرد و لە چەندین بۆنە و لە کۆبوونەوەکانی ئۆپۆزسیۆنی عێراقی بەر لە رووخانی رژێم، داکۆکی لەم پرانسیپە کرد.

دوای رزگارکردنی عێراقیش لە ساڵی ٢٠٠٣ داوای بەستنی کۆنگرەیەکمان کرد بۆ ئاشتەوایی نیشتمانی و لە ٢٦. ٢٧/ ئادار/ ٢٠٠٤ کۆنگرەیەك بۆ ئەم مەبەستە لە هەولێر ساز کرا، ئێستاش ئێمە بانگڕادێری ئەو ئاشتەواییەین لە پێناو پتەوکردنی دیموکراتییەت و فیدراڵیزم، پێشمان وایە کە پرۆسەی دارشتنی دەستووری هەمیشەیی و ئەنجامدانی راپرسیی لەسەری بەو شێوازە دیموکرات و ئازادەی بەڕێوەچوو، هەنگاوێکی هەرە گرنگی دەستووری یاساییە لەسەر رێگای ئەو ئاشتەواییە نیشتمانیەی پێویستە لەسەر بنەمای لەیەك

تێگەیشتنی بەرابەر و ڕێزگرتنی هەر لایـەنێك لـە مـاف و تایبەتمەندیـەکانی لایەنەکـەی دی ڕەگداکوتیێ و قوولێ بێتەوە.

پەرۆشی ئێمەش بۆ پارێزگاریکردن لە دەق و ڕۆحی دەستوور هەر لەم سۆنگەیەوەیە.

ئێمـــە هـــەولێ تۆڵەســـەندنەوە نـــادەین بـــەڵکو داوا و دووپـــاتی گرنگیـــی ســـەلماندن و بەدەکیومێنتکردنی ئەو تاوانە قێزەونانە دەکەینەوە کە دژ بە گەلی عێراق و بە تایبـەتیش دژ بە کـورد ئەنجامـدران، لـە کـاولکردنی ٤٥٠٠ گونـدەوە تـا دەگاتـە لـەناوبردنی بەکۆمـەڵی فەیلیەکان و بارزانیەکان و هەڵەبجە و شالاوەکانی ئەنفال.

ئێمـــە داوای جـــێ بـــەجێکردنی دادپـــەروەری و بەمافگەیانـــدنی ســـتەملێکراوان و قەرەبووکردنـــەوەی کەســـوکاری قوربانیـــان دەکـــەین، ئەمـــەش بەتـــەنیا لەوانەیـــە یارمـــەتی سارێژکردنی زۆر لەو برینە بەسۆیانە بدات، کە لەو ڕەفتـارە وەحشـیگەرانەی ڕژێمـی پێشـوو هاتنە کایەوە ئەوانەی بەناهەق ئەنجامیدان.

کەسانی بە ئینساف و ئاگادار لە عێراق بەبیریان دێ کە هەرێمی کوردستانی عێراق بەر لە ســاڵی ٢٠٠٣ نیمچـە سـەربەخۆ بـو و ئـەو بـەخۆی ڕێگـای تێکەڵبوونـەوەی یـەکگرتنێکی ئارەزوومەندانەی عێراقیانەی هەڵبژارد و سیستمێکی دیموکراتی پێشکەوتووی بەلاوە باشتر بو لەسەر بنەمای پێکەوەژیانی ئاشـتیانە و چـالاکانە چـووە نێـو پرۆسـەی سیاسـی عێراقـەوە. بەمەش ئەوەی مستەفا بارزانی لە ساڵی ١٩٤٣ داوای کرد بەدەست هات، کاتێـك بـەیانێکی مێژوویی ناوداری ئاراسـتەی گـەلی عێـراق کـرد و تیایـدا لـەو کاتـەی ڕووبـەڕووی هێرشـی هێزەکانی حکومەتی عێراق و بەریتانیا دەبۆوە گوتی کە ئەو ( شەڕی عێراقیـەکان ناکـات )، بەڵکو دژ بە زوڵم و ستەمی پاشـایەتی بـەریتانیا دەجـەنگێ و بـەرگریش لـە مـافی هـەموو عێراقیەکان دەکات.

بارزانی پاشان ئەمەی لە هەموو ماوەکانی دواتریش دووپات کردەوە هەتا دوا ڕۆژی ژیانی خۆی، بە بەردەوامیش چ لە سەردەمی بەرخودانی چەکداری و چ لە دانوستانەکانی ئاشتیانە، پەرۆشی بەرقەرارکردنی دیموکراتیەت بو بۆ هەموو عێراقیەکان و دەستەبەرکردنی ئازادیەکان و پتـەوکردنی برایـەتی کـورد و عـەرەب و وەلانـانی توندوتیـژی و ڕق و کینـە، و لەسـەرەتای شێستەکانی سـەدەی رابـردوو داوای دامەزرانـدنی سیسـتمێکی پەرلـەمانیی عێراقـی کـرد، ئەمەش هۆی ئەوە بو کە لە سەردەمی جیاوازدا چەندین کەسان و حزب و کەسایەتی عێراقـی

به جیاوازی ئینتیمای هزری خۆیانەوە بێنــە نێــو بــەرەی هاوکــاری لەگــەڵ شۆڕشــی کوردیــدا بەسەرکردایەتی بارزانی.

هاوکاری و پشتگیریکردنی ئەو سیاسی و رۆشنبیر و خەباتکارە عەرەبە عێراقیانە بۆ بزاڤی رزگاریخوازی کورد و بە تایبەت لە ساڵی ( ١٩٦١ )، ئەوساو ئێستاش بەردەوام سەرمایەییێکی هزریی دەوڵەمەندە و دەرفەتەکانی پێکەوەژیانی ئاشتیانە پتەو دەکات لەسەر بنەمای یەکێتی ئارەزوومەندانە.

لەم رووەشەوە، بەشــانازیەوە هەڵوێســتی مــەزنی ســەماحەتی ئیمــام موحســن ئەلحــەکیم بیردێنینەوە ( رەزای خودای لیّ بیّ ) کاتیّ شەڕی دژ بــە کــورد و کــاولکردنی دێهاتــەکانیانی حەرام کرد. کەسایەتی دیموکراتخوازی ناوداریش عەزیز شەریف لەســاڵی ( ١٩٥٢ ) ەوە داوای رێگەچارەی فیدراڵی کردووە بۆ دۆزی کورد و لەم بارەیەوە کتێبێکی نووسیوە و تیایدا داکۆکی لە مافی خۆبڕیاردانی چارەنووس دەکات بۆ نەتەوەی کورد.

هەر وەها بەڕێز و نەوازشەوە ئاماژە بە رۆڵی شێخی خوالێخۆشبو نــازم ئەلعاســی دەکــەین کــە بوێرانە داوای دانپێدانانی دەرکرد بە مافەکانی گەلی کورد و کۆتاییهێنان بە شەڕو کوشتار.

ئێمە هاوکاری و هاودەنگیی عەرەبیی بۆ گەلی کورد چ لە عێراق یان لەسەر ئاســتی ناوچــەکە، بە باشترین پشتگیری لەقەڵەم دەدەین بۆ سووربوونمان لەسەر پێکەوەژیانی ئاشتیانەی هاوبەش.

هەر وەها بە شانازیەوە هەڵوێستی پشتگیرانەی ســکرتێری پێشــووی کۆمکــاری عــەرەبی عەبدولڕەحمان عەززام بیر دێنینــەوە کــە لــە ســاڵی ١٩٤٣ داوای لــە وڵاتــانی عــەرەب کــرد پشتگیری لە داوا و مافە رەواکانی گەلی کورد بکەن. لە دوای ئەویش ژمارەیــەك لێپرســراو و رۆشنبیری عەرەب هەمان هەڵوێستی رزگاریخوازانەیان گرتەبەر، بەرچاوترینیشیان خوالێخۆشبو جــەمال عەبدولناســر و خوالێخۆشــبو مــەلیك فەیســەل و خوالێخۆشــبو مــەلیك حوســێن و خوالێخۆشبو حافز ئەلئەسەد و کاك موعەممەر قەزافی.

ئێمە رێز و سلاّومان بۆ هەموو کەسایەتییێکی سیاسی و رۆشنبیری عەرەب هەیــە، رێــز و سلاّومان بۆ هەموو نووسەر و هونەرمەند و رۆژنامەنووسێکی عەرەب هەیە، رێــز و ســلاّومان بۆ هەموو بزوتنەوە و حزبێکی عەرەبی هەیە لەهەر شوێنێك بن و لە هەر قۆناغێك پشــتگیری خۆیان بۆ تێکۆشان و مەینەتیەکانی کورد دەربڕی بیّ و بەتایبەتی لــە رۆژانــی تەنگانــەدا لــە ساڵی ١٩٦٣ و دواتریش لە رۆژانــی شــاڵاوەکانی ئــەنفال و کیمیابارانــدا. هــەر وەهــا رێــز و

سلاّومان بۆ ئەو ئازیزە دیموکراتخوازە عەرەبانەی عێراق و دەرەوەی عێراق، ئەوانەی پالّپشتبوون بۆ ئەزموونی دیموکراتی و راگەیاندنی فیدرالّیەت لە کوردستان لە سالّی ۱۹۹۲ و هەتا دەگاتە دەرچوونی دەستووری هەمیشەیی.

بێگومان ئەو کەسە بەئینسافانەی عەرەب بەبیریان دێ لە سالّی ۱۹۹۱ و دوای سەرکەوتنی راپەڕین، بەرەی کوردستانی و جەماوەری کوردستان چۆن مامەڵەیان لەگەلّ کوڕانی دەزگای سوپای عێراق و کارمەندانی دیکەدا کرد و چۆن بەرەی کوردستانی پارێزگاریی لە ژیانی دەیان هەزار لەوانە کرد، کە خۆیان بەدەستەوە دابو و لە بارودۆخێکی ناهەمواردا بەشدارییان لە ژیانی ئەواندا کرد، هەر وەها بەرەی کوردستانی چۆن هانی هاولاّتیانی کوردستانی دەدا تاوەکو پێشوازی لەو خانەوادە عەرەبانە بکەن و ڕێزیان لێ بگرن، ئەوانەی لە بەغدا و شارەکانی دیکەوە لە سالّی ۱۹۹۱ لە دۆزەخی جەنگ هەلاّتبوون.

ئەمەو وێڕای هەموو هەولّێکی زڕاندن و ئاوەژووکردنی راستیەکان لە لایەن دژمنانی دیموکراتیەت و برایەتی کورد و عەرەبەوە، هاولاّتیانی مووسلّ و کەرکوك و دیالا لەدوای رزگاربوون لە سالّی ۲۰۰۳ باش دەزانن کە هێزەکانی پێشمەرگە چۆن ئەوانی پاراست و رێگایان نەدا رەفتاری تۆلّەسەندنەوە سەرهەلّبدا.
ئەم ئاستەی تێگەیشتنی هاوبەش بۆ هاوکاریکرنی یەکتر هەر ئاوەها لەپڕ و بەیەکجار نەهاتۆتە کایەوە، بەلّکو گیانی هاوکاری و لەیەکگەیشتن، لە ئەنجامی تێکۆشانێکی درێژ و سەختی قوربانیدان و لێبوردەییەوە هاتۆتە بەرهەم.

بەلاّم ئەوەی ئەمڕۆ جێگای داخە ئەوەیە، کە هەندێ لە شۆڤینیستانی توندڕەوی تەسکبین لە هەندێ توێژ و ناوەندی عەرەبی و لە هەندێ بالّی حکومەتی فیدرالّیشدا هەولّی رفاندنی ئەو گیانە هاوبەشە دەدەن و دەیانەوێ پەیوەندیە برایەتیە مێژووییەکان لە ناوەرۆکەکەیدا بەتالّ بکەنەوە، لە شوێنیشیدا دۆخێکی لەنگ و نالەباری نوێی ئاوێتەبووی تەشەرئامێز و رقەبەراتییەکی نەتەوەییانەی زیانبەخش بخولقێنن و برینەکانی رابردوو بورووژێنن.

ئێمە داوا لە هەموو دڵسۆزان دەکەین، لە حزبەکان و هۆزەکان و رێکخراوە مەدەنی و پیشەییەکان و لە دیموکراتخوازانی ئازادیمەند ئەوانەی لە گرنگیی قۆناغەکە تێدەگەن و لایەنگری سیستمی فیدراڵی دیموکراتی و پێکەوەژیانی ئاشتیانەن، داوایان لێ دەکەین بۆ ئەوەی شانبەشانی یەکتر کار بکەین لە پێناو رسواکردن و ئیدانەکردنی هەر کەس و ئاراستەیەکی تانەوەشێنی هەستبریندارکەر، هەر وەها بانگهێشتە راستگۆییانەکەی خۆمان دووپات دەکەینەوە بۆ پتەوکردنی تێکۆشان لە پێناو سەرخستنی ئاشتەوایی نیشتمانی سەرانسەری و چارەسەرکردنی کێشەکان لەسەر بنەمای دەستوور و یاسا و دایەلۆگی دیموکراتیانە و شەراکەتی راستەقینەی هاوسەنگ، دیسان داوای دەستهەڵگرتن لە توندوتیژی و خۆبەدوورگرتن لە قسەی زبری زمانی راگەیاندن و رۆژنامەوانی و لێدوانەدان دەکەین، بۆ رێگەگرتن لە هەر کەسێك هەوڵ بدات کێشەکان بکاتە ناحەزیی نێوان کورد و عەرەب و کار بۆ ژیاندنەوەی دکتاتۆرییەت بکات، بۆیە لەسەر هەموومان پێویستە پەند لە ئەزموونەکانی رابردوو وەربگرین.

وەسسەلامو عەلەیکوم

**براتان**

مەسعود بارزانی

٢٠٠٩/١/١

# پەیامی سەرۆکی هەرێم بە بۆنەی کۆتایی هاتنی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەی پارێزگاکان

بە ناوی خوای مەزن و دلۆڤان

بە بۆنەی کۆتایی هاتنی هەڵبژاردنەکانی ئەنجومەنی پارێزگاکان کە لە رۆژی٣١-١-٢٠٠٩ ئەنجام درا، پیرۆزباییەکی گەرم لە گەلی عێراق بە گشتی و گەلی کوردستان بە تایبەتی دەکەم.

ئەم هەڵبژاردنانە هەنگاوێکی دروست بوون بۆ قوڵکردنەوەی پرۆسەی دیموکراسی لە عێراقدا و پێشمان خۆشە لە رێگای سندوقی دەنگدانەوە گۆرانکاری پێویست بکرێ، نەك لە رێگەی زۆر و زۆرداریییەوە.

ئێمە رێز لە ئیرادەی جەماوەری گەلی عێراق دەگرین و هێواداین دەنگدانی خەڵکی کوردستان بە کورد و عەرەب و تورکمان و کلدان و ئاشوری و سریانەوە، بە موسلمان و مەسیحی و ئێزدییەوە، لە ناوچە دابراوەکانی هەرێمی کوردستان پەیامێکی زۆر روون و ئاشکرا بێ کە ئەم خەڵکە چیان دەوێت.
ئومێدەوارم و داواکاریشم لە ئەنجومەنی نوینەرانی عێراق و حکومەتی فیدراڵ و نەتەوەیەکگرتووەکان و ئەمریکا و هەموو لایەنە پەیوەندارەکان کە ئیتر فەراموشکردنی جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ بەسە و رێز لە ئێرادەی خەڵکی ئەو ناوچانە بگرن.

با ئەم بوونەیە بکەینە هاندەرێك بۆ چەسپاندنی زیادتری دیموکراسی و گیانی تەبایی و برایەتی و پێکەوەژیان.

سوپاسی بێپایانم بۆ جەماوەری تێکۆشەر و خۆراگری ناوچە دابڕاوەکان کە بەو پەڕی جۆش و پەرۆشەوە رویان لە سندووقەکانی دەنگدان کرد و پەیامی خۆیان بە ناوەوە و دەرەوە گەیاند، و پیرۆزبایی ئەو سەرکەوتنەشیان لێ دەکەم کە حەتمەن ئەو ئێرادەیەیان سەرکەوتوو دەبێت.
سوپاس بۆ هێزەکانی پۆلیس و سوپای فیدرال و پێشمەرگە و پۆلیس و ئاسایشی هەرێمی کوردستان کە بە شێوەیەکی زۆر رێك و پێك و سەرکەوتوو ئەرکی خۆیان لە پاراستنی باری ئەمنی لە هەموو ناوچەکاندا بەجێ هێنا.

سوپاس بۆ هەموو دەزگا حزبی و حکومی و لەشکری و جەماوەری بۆ رۆڵی سەرکەوتوانەیان بە بێ ئەوەێ هچ خالێکی لاواز بدەنە دەست ناحەزانی کوردستان.
سوپاس بۆ کۆمیسیونی سەربەخۆی باڵای هەڵبژاردنەکانی عێراق و لێژنە فەنییەکان و کەنالەکانی راگەیاندن کە بە شێوەیەکی زۆر رێك و پوخت ئەرکی خۆیان بەجێ گەیاند.

مسعود بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
٢/ ٢ / ٢٠٠٩

# هیلاری کلینتۆن بە تەلەفۆن پەیوەندی بە سەرۆکی هەرێمی کوردستانەوە کرد

بەیانی ئەمڕۆ یەکشەممە ٢٠٠٩/٤/٢٦ خاتوو هیلاری کلینتۆن وەزیری دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بە تەلەفۆن پەیوەندی لەگەڵ بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کرد.

لەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەدا، پەیوەندییەکانی نێوان هەردوولا خرایە بەرباس و تەئکیدیش لە پەرەپێدانی ئەو پەیوەندییانە کرایەوە.

هەروەها تەئکید لەسەر کاراکردنی هاوبەش کرایەوە بۆ عێراقێکی گەشاوەتر کە تێیدا هەموو گەلانی عێراق بە ئازادی بژین و بە مافە رەواکانی خۆیان شاد بن.

هەر لەو پەیوەندییە تەلەفۆنییەدا هەردوولا پشتگیریی بەردەوامی خۆیان بۆ پرۆسەی سیاسی و پابەندبوون بە دەستوور و پرەنسیپی دیموکراتیەت دووپات کردەوە.

## وتەبێژێك بەناوی دیوانی سەرۆكایەتی هەرێم:
## لیستی ئەلحەدبا ءهەوڵی تێكدانی سەقامگیریی ناوچە كێشەلەسەرەكان دەدات

وتەبێژێك بەناوی دیوانی سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان ئەم لێدوانەی راگەیاند: ئەسیل نوجەیفی سەرۆكی لیستی ئەلحەدباء (پارێزگاری نەینەوا) رۆژی هەینی ٢٠٠٩/٥/٨ هەوڵیدا بچێتە ناوچەی بەعشیقە بە بیانووی ئەوەی لە میهرەجانێكی وەرزشی ئامادە دەبێ و هەڕەشەی بەكارهێنانی هێز دەكات، نوجەیفی هێزێكی گەورەی پۆلیس و نزیكەی (٥٠) ئوتومبێلی پڕ لەچەكداری لەگەڵدا دەبێ، بەڵام خەڵكی ناوچەكە كە هەواڵی ئەو هەوڵەی نوجەیفی دەبیستن، بەتوندی ئەو كارە رەتدەكەنەوە و خۆیان بۆ ناڕەزایی دەربڕین لە بەرامبەر هاتنی ناوبراو بۆ ناوچەكەیان ئامادە دەكەن، ئەمەش وەكو گوزارشت كردن لەو تووڕەییەی لەدڵ و دەروونیان پەنگی خواردبۆوە، لەبەر ئەوەی خەڵكی ئەو ناوچەیە دەنگیان بۆ لیستەكەی نوجەیفی نەدا و بێجگە لەوەش ئەو ناوچەیە دەكەوێتە سنووری ناوچە كێشەلەسەرەكان كە ماددەی (١٤٠) ی دەستووری هەمیشەیی عێراق جەختی لێكردووە.

بۆیە هاتن بۆ ئەو ناوچانە و بەم شێوە ورووژێنەر و گومانایییە، بو بە مایەی هێنانەئارای دۆخێكی نائارام بۆ دانیشتووانی ناوچەكە، لەبەر ئەوەش هێزەكانی پێشمەرگە كە لەساڵی ٢٠٠٣ لەو ناوچەیەدان، كەوتنە حاڵەتی ئامادەباشییەوە بۆ هەر رەوشێكی چاوەڕوانكراوی كتوپڕ و هەر وەها وەكو خۆئامادەكردنێك نەك ئەوەی ئەسیل نوجەیفی پەنا بباتە بەر بەكارهێنانی هێز، ئەو نوجەیفیەی دانیشتوانی ناوچەكە رەتیان كردەوە بێتە ناوچەكەیانەوە، بەهۆی ئەوەی كە لیستی حەدباعهەلێكوتاوەتە سەر هەموو پۆستە ئیداریەكانی مووسڵ و هزری رەگەزپەرستی پەیڕەو دەكات و رازی نەبو نوێنەرانی ئەو ناوچانە لە ئیدارەی پارێزگای نەینەوا بەشداری بكەن.

ئەمەو سەردانەکەی نوجێفی وەکو مانۆڕێکی پیشاندانی هێز و بە مەبەستی نانەوەی قەیران بووە، ئەگەر ئەو سەردانەش ئەنجام بدرایە ئاکامێکی یەکجار خراپی لێدەکەوتەوە و مەترسییێکی زۆریشی بەسەر رەوشی ئەمنیی ناوچەکە و تەواوی ناوچەکانی سنووری نەینەواوە دەبو.

ئێمە رایدەگەیەنین کە ئەگەر ئەسیل نوجەیفی لەسەر ئەو سیاسەتە ورووژێنەرە بەردەوام بێ، دەبێتە هۆی پێکهێنانی قەیرانی گەورە، کە بەم رەفتارەیشی بوو بە بەشێك لە کێشەکە نەك بەشێك لە چارەسەر، بۆیە ناکرێ هاوکاری بین و وەکو (پارێزگاری نەینەوا)ش مامەڵەی لەتەکدا بکرێ، لەبەر ئەوەی کۆمەڵانێکی زۆری دانیشتووانی مووسڵیش ئەوە رەتدەکەنەوە.

لە کۆتایشدا ئەم رەفتارە دژ بە ئیرادە و ویستی هاوڵاتیانی ئەو ناوچانە ئیدانە دەکەین، ئەو رەفتارانەی لەگەڵ ئەو بەهایانەی دیموکراتیەتیش یەکناگرنەوە کە ساڵانێکی دوور و درێژ جەماوەر قوربانی لە پێناودا پێشکێش کردووە.

بۆیە رایدەگەیەنین و دووپاتی دەکەینەوە کە ئێمە لەسەر دەستپێوەگرتنی ئەو دەستکەوتانە بەردەوام دەبین لەسەر رێگای بنیاتنانی عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵ و فرەیی و یەکگرتوو، کە تێیدا دەستوور زامنی مافی سەرجەم پێکهاتەکانی بێ، بە هیچ شێوەیەکیش ناکرێ رێگە بە سەرکەوتنی رەوتی شۆڤینیانەی تۆتالیتار بدرێ.

وتەبێژێك بەناوی
دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان
٢٠٠٩/٥/٩

## دەقی وتاری سەرۆکی هەرێمی کوردستان
## لە ڕێوڕەسمی دەستپێکردنی بە فەرمی هەناردەکردنی پترۆڵی هەرێمی کوردستان

١/ ٦ / ٢٠٠٩

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

برای بەڕێزم جەنابی مام جەلال سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ
ئامادەبووانی بەڕێز
میوانە بەڕێزەکان
خوشك و برایانی خۆشەویست
هەموو لایەك زۆر زۆر بەخێر بێن بۆ هەولێر
پایتەختی هەرێمی کوردستان و پایتەختی دووەمی عێراق.

بە راستی ئەمڕۆ ڕۆژێکی مێژووییە بۆ هەموومان، بۆ هەموو تاکێکی خەڵکی عێراق، و سەرکەوتنێکی گەورەشە بۆ هەموو گەلی عێراق، ئەوەی زۆر زۆر جێگای شانازی و سەرفرازییە بۆ ئێمە ئەوەیە کە ئەم سەرکەوتنە گەورە بۆ عێراق، هەرێمی کوردستان و حکومەتی هەرێمی کوردستان تۆماری کرد.

من بەم بۆنەیەوە پیرۆزباییەکی گەرم لە هەموو گەلی عێراق دەکەم و بە تایبەتی لە خەڵکی هەرێمی کوردستان، و سوپاسێکی بێ پایانی حکومەتی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی سامانە سروشتییەکان دەکەم بۆ ئەم دەستکەوتە گەورەیە.

سوپاس بۆ خوای گەورە کە هێزی پێداین خۆمان رابگرین بەرامبەر بەهەموو ئەو فشار و تەهدید و تۆمەتانەی ئاراستەی ئێمە دەکرا بە ناهەق.

ئیمڕۆ ئیسباتمان کردو وەڵامێکی زۆر روون و رەوانمان دا بە هەموو لایەك، کە بەڵێ ئێمە پابەندی دەستووری عێراقین، بەڵێ نەفتی عێراق و غازی عێراق بۆ هەموو خەڵکی عێراقە و داهاتەکەشی بۆ هەمووخەڵکی عێراقە، ئێمە بە کردەوە ئیسباتمان کرد ئەمڕۆ.

ئەمە دەستپێکێکی زۆر زۆر گەورەیە بۆ دروستکردنی ژێرخانەیەکی بەهێز بۆ هەرێمی کوردستان و بۆ عێراقیش و ئێمە بەردەوام دەبین لەسەر سیاسەتەی خۆمان، چونکە پێمان وایە سیاسەتێکی راستە و لە بەرژەوەندی هەموو گەلی عێراقدایە و ئینشائەڵلا هەنگاو دەنێین بەرەو سەرکەوتنی باشتر و دەستکەوتی باشتر.

و جارێکی تر من زۆر زۆر سوپاستان دەکەم بۆ بەشداربوونتان، هەر وەها من سوود لەم دەرفەتە وەردەگرم کە ئەمڕۆ رۆژی (٦/١ )ە، پیرۆزباییەکی گەرم لە برای بەڕێزم جەنابی مام جەلال و هەموو سەرکردایەتی یەکێتی نیشتمانیی کوردستان و هەموو ئەندامان و لایەنگرانی بکەم بەبۆنەی ٣٤ ساڵ تێپەڕبوون بەسەر دامەزراندنی، هەروەها تەئکید دەکەمەوە لەسەر ئەو هاوپەیمانییە ستراتیجییەی نێوان پارتی و یەکێتی، کە زۆر زۆر پتەوە و پابەندین پێی، چونکە بە حەقیقەت لەبەرژەوەندی نەتەوەییماندایە، و هەروەها لەبەرژەوەندی هەموو گەلی عێراقدایە، لەبەر ئەوەی ئەو هاوپەیمانییە هاوپەیمانییەکی ستراتیجییە و هەتا سەر دەبێ ئینشائەڵلا. جارێکی تر ئینشائەڵلا سەرکەوتنی گەورەتر و دەستکەوتی گەورە تر بۆ هەموو گەلی عێراق و بۆ هەرێمی کوردستان، هەر خۆش و شادو سەرکەوتوو بن و زۆر سوپاس.

## دەربارەی راپۆرتی (یۆنامی)پەیوەست بەناوچە کێشەلەسەرەکان فوئاد حوسێن سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێم ئەم لێدوانەی راگەیاند

لەگەڵ گەیشتنی راپۆرتی تایبەت بەناوچە کێشە لەسەرەکان، کەلەلایەن تیمێکی سەر بەنوێنەری تایبەتی سکرتێری گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بەرێز ستیڤان دیمستۆرائامادەکرابوو، بەفەرمانی بەرێز مسعودبارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لیژنەیەکی تایبەت بۆدیراسەتکردنی راپۆرتەکە پێکهێنرا، دوای تاوتوێکردنی راپۆرتی ناوبراو بەشێوەیەکی هەمەلایەن و لەژێر دیراسەتکردنێکی تەواودا، بەرێز مسعودبارزانی نامەیەکی ئاراستەی بەرێز دیمستۆرا کرد، کەتیایدا جەخت لەسەر چەسپاندنی بنەما دەستوریەکان دەکاتەوە دەربارەی ناوچە کێشە لەسەرەکان.

هەرلەم بارەیەوە بەرێز فوادحسین گوتی: بەشێوەیەکی گشتی نامەکەسێ خاڵ لەخۆ دەگرێت،جەختکردنەوە لەسەرپابەندبوونی تەواو بەدەستوری هەمیشەیی ئێراق و ماددەی ١٤٠، کەبەبنەمای سەرەکی چارەسەرکردنی کێشەکان دادەنرێت.

هەروەك دوو پاتیکردەوە وتووێژی نێوان حکومەتی فیدراڵ وحکومەتی هەرێم دەبێتە چوارچێوەی راستەقینەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەم دۆسیەیە، ئەویش لەسەر بنەمای پابەندبوون بەدەستوور.

لەکۆتایی نامەکەی بەرێز سەرۆکی هەرێم، ئاماژە بۆئەوە کراوە ئەم لیژنە تایبەتیەی هەرێم هەڵدەستێت بەناردنی وەڵامێکی تێر و تەسەل دەربارەی راپۆرتەکە بۆ بەرێز دیمستۆرا، لەکاتێکی نزیکدا.

# نامەیەکی هەردوو سیناتور ماکین و لیبرمان

.

٢٧ / ٦ / ٢٠٠٩

دەقی نامەی هەردوو سیناتور جۆن ماکین و جۆزێف لیبرمان بۆ سەرۆکی هەرێمی کوردستان و سەرۆکی حکوومەتی هەرێمی کوردستان:

بەرێز مسعود بارزانی، سەرۆکی هەرێمی کوردستان

بەرێز نێچیرڤان بارزانی، سەرۆکی حکومەتی کوردستان

لە کاتێکدا کە هاوڵاتیانی حکومەتی هەرێمی کوردستان خۆیان ئامادە دەکەن بۆ هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و سەرۆکی هەرێم لە ٧/٢٥، دۆستایەتی ئەمریکا لە گەل کوردی عێراق دووپات دەکەینەوە. ئەو دوستایەتیە مێژوویيەی کە لە نێوان ویلایەتە یەکگرتوەکان و کوردی عێراق لە سەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەشی کاتی نیە، بەڵکو ئەم دۆستایەتیە رەگی داکوتاوە لە سەر بنەمای بەهای هاوبەش کە گرنگترینیان بریتین لە: پابەندبوون بە هەڵبژاردنی ئازاد و پاك و دیموکراتیانە و کێبرکێ و میدیای سەربەخۆ و چالاك و کۆمەڵگای شارستانی و سەروەری یاسا.

بۆ زیاتر لە ١٠ ساڵ، بە پێچەوانەی بەشەکانی تری عێراق کە لە ژێر حوکمی زۆرداری سەدام حسێن دەیانناڵاند، کوردی باکوری عێراق مەشخەڵی ئازادی و فرەحزبیان هەڵکرد. لە ٢٠٠٣ دا، گەلانی ئێمە و ئێوە پێکەوە شەریان کرد بۆ ئازادکردنی عێراق کە نەك تەنها بووە هۆی لەناوچونی رژێمی دیکتاتۆری و درِندانەی سەدام، بەڵکو بەدیهاتنی دیموکراسی کە لە ژێر سایەیدا هەموو خەڵکی عێراق دەتوانن بەشداری لە هەڵبژاردن بکەن و ئاشتیانە رێبەرەکانیان دەستنیشان بکەن، هەروەکو لە زۆر پارێزگای عێراق کە لە مانگی کانونی دووەمی ئەمساڵدا ئەنجامدرا.

به هەمان شێوە، ئێمە بە پەرۆشەوە دەڕوانینە هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان و سەرۆکی هەرێم لە ٧/٢٥. ئومێدوارین و چاوەڕوان دەکەین کە ئەم هەڵبژاردنە ببێتە "ستانداردێکی زێرین" لە ناوچەکە بۆ ئازادبوون، شەفافیەت، کێبرکێ، دوور لە دەستێوەردان و ترساندن، کە زۆر جار لە رۆژهەلاتی ناوەراستدا روو دەدەن. ئێمە بە تایبەتی خۆشحاڵین بە پەیدابوونی پارتی ئۆپۆزیسیون، و باسکردنی هەڵبژاردن بە شیوەیەکی رەخنەگەرانە لە لایەن میدیای سەربەخۆی کوردیەوە، کە ئەمەش هێمایەکی قوڵبوونەوەی دیموکراسیە لە کوردستان و ئەمەش بۆ رێبەرایەتی ئێوەی بەرێز دەگەڕێتەوە.

ئەو شەرعیەت و مسداقیەتی پرۆسەی دیموکراسی کە لە چەند هەفتەی ئایندە لە هەرێمی کوردستان لە ژێر چاودێری دەبێت، نەك لایەنێك یان تاکە کەسێکی تایبەت، دەبێتە بناغەی دۆستایەتی هەمیشەیی ئەمریکا لەگەڵ خەڵکی هەرێمی کوردستان.

ئومێدوارین کە هەڵبژاردنەکانی ٢٥ تەمووز سەرکەوتنێکی گەورە بێت بۆ خەڵکی هەرێمی کوردستان و قۆناغەکی گرنگ بێت بۆ پێشوەچوونی دیموکراسی لە ناوچەکە. سوپاستان دەکەین بۆ رێبەرایەتی بەرچاو و مەبدەئیانەتان و ئۆمێدوارین کە دەرفەتمان هەبێ سەردانی هەولێر بکەین لە ئایندەیەکی نزیکدا.

لەگەڵ رێزماندا

سیناتور جۆن ماکین

سیناتور جۆزێف لیبرمان

# لێدوانی وتەبێژێك بە ناوی دیوانی سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان

هەندێ رۆژنامە بڵاویان كردۆتەوە كە گوایە بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان تەنازولی لە چەند ناوچەییەكی كوردستانیی كردووە، ئێمەش لە بەرامبەر ئەم قسە هەڵبەستراوانەدا رایدەگەیەنین كە پرسی سنووری هەرێمی كوردستان لە چوارچێوەی ماددەی (١٤٠) ی دەستووری هەمیشەیی عێراقی فیدراڵ رێگەچارەی بۆ دۆزراوەتەوە و ناوچەكانی هەرێمی كوردستانیش بە پێی ئەو ماددەیە دیاری دەكرێن، وەكو چەندین جار و لە چەندین بۆنەدا بەڕێز سەرۆكی هەرێم ئەم هەڵوێستەی خۆی دووپات كردۆتەوە و جەختیشی لەسەر پابەندبوونی هەرێمی كوردستان بە دەستووری هەمیشەیی عێراق و ماددەی (١٤٠) كردووە. هەروەها رایدەگەیەنین كە بەڕێز سەرۆكی هەرێم تەنازول لە بستێكی خاكی هەرێمی كوردستان ناكات و هەرێمی كوردستان نایەوێ بستێكی هەر ناوچەیەك زەوت بكات كە كوردستانیی نەبێ، ماددەی (١٤٠)ی دەستووری هەمیشەیی عێراقیش بڕیار لە سنووری سیاسی هەرێمی كوردستان دەدات و هەر ئەو ماددەیەش رێگاچارەی ئەو پرسەی دەستنیشان كردووە.

وتەبێژێك بە ناوی
دیوانی سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان
٢٠٠٩/٦/٣٠

## پەیوەندیەکی تەلەفۆنی نێوان جۆزیف بایدن جێگری سەرۆکی ئەمریکا و بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان

ئێوارەی رۆژی سێ شەممە ٢٠٠٩/٧/٧ له لەپەیوەندیەکی تەلەفۆنی نێوان هەردوو بەرێزان جۆزیف بایدن جێگری سەرۆکی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و مسعودبارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، پەیوەندی پتەوی نێوان هەردووگەلی ئەمریکا و کوردستان و حکومەتی ئەمریکاو سەرکردایەتی هەرێم دووپاتکرایەوە.

لەلایەن خۆیەوە جێگری سەرۆکی ئەمریکا ئاماژەی بەڕۆڵی کورد کرد لە پرۆسەی سیاسی عێراق، هەروەها ئاماژەی بۆ سەقامگیری و پێشکەوتنی هەرێمی کوردستان و ڕۆڵی پێشمەرگە لەدروست بوون و چەسپاندنی ئاسایش و هێمنی لەناوچەکەدا کرد.

هەردولاش باسیان لە کۆمەڵێك پرسی گرنگ و پەیوەست بە بارودۆخی سیاسی گشتی کرد لە عێراق، سەرەرای باسکردن لەپەیوەندیەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا.

کێشە هەڵواسراوەکانی نێوان حکومەتی ئیتیحادی و هەرێم، بەتایبەتی کێشەی ناوچە کێشە لەسەرەکانی تایبەت بەمادەی ١٤٠ی دەستوری هەمیشەیی ئێراق، لەو بابەتانە بوون کە لەو پەیوەندیە دا باسیان لێوەکرا، هەردوو بەرێزان جۆزیف بایدن و سەرۆك بارزانی دووپاتیان کردەوە بۆ جێبەجێکردنی مادەی ١٤٠ی دەستور زۆر لەکاتی خۆیدا دواکەوتووە.

هەر لەو پەیوەندیە تەلەفۆنیەدا کەنزیکەی کاتـژمێرێکی خایانـد، ئامـاژە بـۆ پـرۆژەی یاسای نەوت و غاز و یاسای دابەشکردنی داهاتی نـەوت کـرا و لـەم بارەیەشـەوە جێگـری سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بیر و بۆچوونی خۆی و چۆنیەتی دۆزینـەوەی ڕێگـە چارەکانی خستە ڕوو.

لەلای خۆیەوە سەرۆك بارزانی ڕۆڵی بەرێز جۆزیف بایدنی بـەرز نرخانـد لەئێسـتا و پـێش وەرگرتنی ئەرکی نـوێی وەك جێگـری سـەرۆکی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئـەمریکا، هـەروەها خۆشحاڵی و ڕێزی خۆی نیشـان دا بـۆ جێگـری سـەرۆکی ئـەمریکا بەرامبـەر گرنگـی دان و تێگەیشتنی زۆریان لە کێشەکانی عێراق بەشێوەیەکی گشـتی و ڕەوشـی هـەرێمی کوردسـتان بەشێوەی تایبەت.

لەبەرامبەر بیروڕای بـەرێز جێگـری سـەرۆکی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکادا،سـەرۆك بارزانی دوپاتیکردەوە کێشـە هەڵپەسـێردراوەکان پێویسـتە بەشـێوەی گفتوگـۆی ڕاسـتەوخۆ لەنێوان حکومەتی ئیتیحـادی و حکومـەتی هـەرێم لەسـەر بنـەمای دەسـتوری هەمیشـەیی چارەسەربکرێن.

سەبارەت بە ناوچە کێشەلەسەرەکان، سەرۆك بـارزانی دووپـاتیکردەوە دەسـتور و مـادەی ١٤٠ڕێگە چارەی بۆ کێشەکانی ئەو ناوچانە داناوە.

هەروەها سەرۆك بارزانی هەڵوێستی هەرێمی کوردستانی نوێکردەوە سەبارەت بە دەستور و مادەی ١٤٠ و پەیەستبون و پابەندبوون پێوەی.

هەروەك سەرۆك بارزانی بیر و بۆچونەکانی بـەرێزجۆزیف بایـدنی بەرزنرخانـد بەکردنـەوەی دەرگـای دیـالۆگ لەگـەڵ حکومـەتی ئیتیحـادی بـۆ گفتۆگـۆکردن دەربـارەی بابەتـە هەڵپەسێردراوەکان و کێشەکانی تر.

لەکۆتایدا سەرۆك بارزانی سوپاسی جێگری سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای کرد بۆ ئەم پەیوەندیە تەلەفۆنیە و هیوای سـەرکەوتنی بـۆ خواسـت لەئەرکـە جۆربەجۆرەکانیـدا و لەنێویاندا ئەوانەی پەیوەندیان بە دۆسیەی ئێراقەوە هەیە، هەروەها بەڵێنی کارکردنی هاوبەش و بەردەوامی بەبەرێزیان دا بۆ گەیشتن بەچارەسـەرکردنی بابەتـە ئاڵۆزەکـانی سـەر گۆڕەپـانی سیاسی لە ئێراق.

## سكرتێری ڕۆژنامەنووسیی سەرۆكی هەرێم

## بەیاننامەیەكی دەستەی عولەمای موسلمینی عێراقی ڕەتكردەوە

١١ / ٧ / ٢٠٠٩

دەستەی عولەمای موسلمین لە عێراق لە بەیاننامەیەكدا كە ژمارە شەش سەد و سیی و هەشتی لە سەرە، ئاماژە بەوە دەكات كە گوایە هەوڵێكی گوماناوی لە ئارادایە بۆ كاراكردنی كردەیی دابەشكردنی عێراق، بە هاریكاری هەندێ هێز و كەسایەتی و بە پاڵپشتی ژمارەیەك لە وڵاتانی دەوروبەر و ناوی سەرۆكی هەرێمی كوردستانیش وەك یەكێك لەو كەسایەتیانە ناودەبات.

بەر لە هەر شتێك پێویستە دەستەی عولەمای موسلیمن ڕۆڵی چاكسازیی ببینێ، نەك فیتنە درووستكردن، ئایا هەر بە فیتنەی ئەو دەستەیە نەبوو دیاردەی تیرۆر و خەڵك كوشتنی لە سەر پێناسە لە عێراق پەرەی سەند و بە كردەوە كۆمەڵگەی عێراقی بە پێی تایفە دابەشكرد ؟.

ئایا هەر ئەو نەهجەی ئەو دەستەیە نەبوو كە عێراقی گەیاندە ئەو بارەی ئەمڕۆ كە بە هەموو پێوەرێك سەرەتایەك بوو بۆ ئەو دابەشكردنەی كە باسی لێوەدەكات ؟

ئێمە لە كاتێكدا ناوەڕۆكی ئەو بەیاننامەیە ڕەتدەكەینەوە، داوا لەو دەستەیە دەكەین كە ئەگەر بەڵگەی لە دەستە وەك ئەوەی كە خۆی دەڵێ با بڵاوی بكاتەوە، ئەگینا وەك فیتنەیەكی لێ دێ كە خوای گەورە لە قورئاندا فەرموویەتی: ئەلفتنەت و ئەشد و من القتل..

**سكرتێری ڕۆژنامەنووسی سەرۆكی هەرێمی كوردستان**

## پەیامی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە بۆنەی سەرکەوتن و راگەیاندنی دوا ئەنجامی هەڵبژاردنەکانی کوردستان

بە ناوی خوای مەزن و دلۆڤان

بنەماڵە و کەسوکاری سەربەرزی شەهیدانی کوردستان.. هاووڵاتیانی خۆشەویست.. جەماوەری تێکۆشەری کوردستان

.. خوشکان برایان..

پێشەکی، سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورەو میهرەبان کە پرۆسەی دەنگدان و هەڵبژاردنەکانی هەرێمی کوردستان لە ٢٥ی تەمووزی ٢٠٠٩ بە شێوەیەکی سەرکەوتوویی و بەبەشداریی رێژەیەکی زۆری هاووڵاتیانی کوردستان کۆتایی پێ هات. بۆیە بەم بۆنەیەوە پیرۆزباییەکی گەرم ئاراستەی گشت چین و توێژەکانی خەڵکی کوردستان و تەواوی دانیشتووانی هەرێم و سەرجەم لایەن و لیست و قەوارە جیاجیاکان و هەواداران و لایەنگرانیان دەکەم کە بە گیانێکی دڵسۆزانە و هەست کردن بە بەرپرسیارییەتی نیشتمانی بەشدارییان لە هەڵمەتەکانی بانگەشەی پرۆسەی دەنگدان و هەڵبژاردنی نوێنەرانیان بۆ پەرلەمانی کوردستان و سەرۆکایەتی هەرێم لە خولی نوێیاندا کرد.

**جەماوەری خۆشەویستی کوردستان.**

بێگومان هەڵبژاردنی ئەمجارە لە هەرێمی کوردستان، لە رووی فۆرم و پێکهاتەو شێوازەکانی بانگەشەکردنی قەوارەکان، رووێکی تازە و شارستانی پێشکەش بە جیهان کرد و لە ناوخۆشدا پرۆسەکە شێوەیەکی نوێی پێشکەوتنی کۆمەڵگەی کوردستانی بە خۆوە بینی، کە بەپێی بنەماکانی دیموکراسی و ئازادی رادەربڕین بنیات نرابوو.

به گشــتی پرۆســەکە ئامادەکارییــەکی بــاش و گونجــاوی بــۆ کرابــوو و کــاتێکی بــاش و دەرفەتێکی فراوانیش خرایە بەردەم هەموو لیست و قەوارە جیاوازەکان تا بتوانن ئازادانە و بێ هیچ گیرو گرفتێك و سانسۆرێك هەڵمەتی پروپاگەندە بۆ کاندید و لیست ونوێنــەرانیان بــەڕێوە ببەن، دوای راگەیاندنی ئەنجامە بەراییەکانیش، دەرفەتێکی باشیان بۆ رەخسێنرا تا هــەر چــی سکالایان هەیە بە بەڵگەوە بیخەنە روو، بۆ ئەم مەبەستەش زیاتر لە دە رۆژ کۆمسیۆنی باڵا و چاودێرانی UN شەو و رۆژ بۆ دەرخستنی راستی ئەو سکالآیانە خەریکی لێکۆڵینــەوەی ورد بوون، به گشتی پرۆسەکە ئاماژەیەکی روون و ئاشکرابوو بۆ پێشکەوتنی ئاســتی هووشــیاریی سیاسی و کۆمەڵایەتی و برەودان بە نوێبوونەوەی لایەنەکانی ژیانی دیموکراسیانەی کۆمەڵگەی کوردستان، لە پاڵ ئەمــەدا، بەدەنگــەوە هــاتنی پرۆســەکە نیشــانەی دڵســۆزیی و وەفــاداریی رۆڵەکانی گەلی کوردستانی خستەروو بەرامبەر بــەو دەســتکەوتانەی کــە بــەخوێنی هــەزاران شەهید و خەبات و تێکۆشــانی پێشــمەرگە قارەمانــەکان هاتوونەتــەدی، ئەمــەش بــۆ خــۆی دووپاتکردنەوە و سووربوونی گەلەکەمانە بۆ هێنانەدی ئامانجە رەواکانی و هــەنگاونان بــەرەو ئاییندەیەکی گەشتر.

**جەماوەری تێکۆشەری کوردستان..**

**خوشکان برایان..**

ئێمە سەربەرزین بەوەی کە جارێکی دی لەپێش چــاوی میــدیاکانی جیهــانی و چــاودێرانی نێودەوڵەتی و رێکخراوەکانی کۆمەڵگەی مەدەنییەوە هەنگاوێکی دیکــەی دیموکراســیمان نــا، ئەم هەنگاوەشمان بە شێوەیەکی ئازاد تێپەراند، بەمەش ئەو راستیەمان بۆ گشت لایەك سەلماند کە گەلی کوردستان، گەلێکی هووشیار و ئاشتیپەروەر و دیموکراتیخوازە. لەم پرۆسەیەدا، ئەو گەلە تێکۆشەرە بۆ جیهانی دووپــاتکردەوە کــە خــاوەن ئیرادەیــەکی قــوڵی نیشــتمانییە، لــە رۆژگاری چارەنووسسازدا بەیەك هەڵوێست و یەکریز سەرەرای بوونی جیاوازیی لە بیرو بۆچوون، ئەرکە نەتەوەییەکانی خۆی بەجێ دەگەیەنێت، واتە لە ئاشتیدا تەباین و لە تەنگانەشدا براین، پشت بەخوا و بەهێز و بڕوای پۆڵایینی گەلەکەمان، شان بەشــانی یــەکتر بــەردەوام دەبــین لــە دابینکردنی دوا رۆژێکی بەختــەوەر بــۆ رۆڵــەکانی ئــەمڕۆ و نــەوەکانی داهاتوومــان. هــەروا سووربوونی خۆمان دووپات دەکەینەوە کە بە هەوڵ و تێکۆشانی دیموکراسی و ئاشتیانەوە کــار

بۆ هێنانەدی مافە رەواکانمان لە چوارچێوەی یاسا و دەستوور لە عێراقی فیدراڵدا دەکەین و هەمیشەش دەستوور دەکەینە چەك بۆ هێنانەدی ئەو مافانە.

**خوشکان برایان..**

کوردستان بۆ هەمووانە و خێرو بێریشی بۆ هەموو لایەکە بەبێ جیاوازی. هەموومان برا و کە سوکاری یەکترین، ئێمە رێز لە هەر تاکێکی کوردستانی دەگرین بە جیاوازی رەنگ و دەنگەکانەوە. ئەم پرۆسەیەی کە هەموومان تێیدا بەشداربووین، بە نیعمەتێکی خودایی و دیاردەیەکی دروست و بە پێشکەوتنێکی زۆر گەورە و گرنگ لە مێژووی گەلی کوردستان دادەنرێ، ئازادی بیرو بۆچوون و رادەربڕین لە چوارچێوەی یاسا و پرانسیپەکانی مافی مرۆڤ و دوور لە ئازاردان و توندوتیژیی، بە مافێکی بنچینەیی هاووڵاتیانی ئەم هەرێمە دەزانین. لە بەرامبەردا ئەرکی هەمووڵایەکمانە چی وەك تاك یان وەك قەوارە و پارتی سیاسی، رێز لە بەها نیشتمانی و دەستکەوتەکانی خەڵکی کوردستان و ئەزموونەکەی بگرین و بەوپەڕی دڵسۆزییشەوە داکۆکیان لێ بکەین و بە چاوی سووکەوە لە بەر هەر مەرامێك بێ سەیریان نەکەین، پێکەوەش کار بۆ دابینکردنی مافە دەستوورییەکان و گێڕانەوەی ناوچە دابڕاوەکانی هەرێمی کوردستان و بە هێزکردنی پێگەی هەرێم لە ناوخۆ و دەرەوەی وڵات و پاراستنی بەرژەوەندییە باڵاکانی لە عێراقی فیدراڵدا بکەین. وێرای ئەمەش پێویستە لە سەر هەمووڵایەك پەرلەمان و حکومەتی هەرێم و سەرۆکایەتی هەرێم بە موڵکی خۆی بزانی و هەوڵیش بدات برەو بە ژیان بۆ خۆشگوزەرانی هاووڵاتیان بدات لە دوورترین گوندەوە تا دەگاتە شارو شارۆچکەکان، بۆ ئەوەی هەمیشە جێی متمانەی ئەو جەماوەرە بین، دەبێ هەموومان لەئاست ئەو بەڵێن و بەرنامانەدا بین کە لەهەڵمەتی هەڵبژاردندا خستمانە بەردەم خەلکی کوردستان.

یەکتر قبووڵکردن و رێزگرتن لە یاسا و گەڕانەوە بۆ رای خەڵك لە هەرپرسێکی نیشتمانی و نەتەوەیی، کۆڵەگەیەکی پتەو و بەهێزی کۆمەڵگەی کوردستانیە کە دەبێ هەموومان پابەندی بین و بیکەینە

**بەرنامەی کارکردنمان.**

**خوشکان.. برایان..**

کوردستان لە دوای ئەم هەڵبژاردنە پەرلەمانییە نوێیە پێ دەنێتە قۆناغێکی تازەی سیاسی و دیپلۆماسی گرنگ لەسەر ئاستی ناوخۆ و جیهان و دەوروبەر، بۆیە پێویستمان بە نەخشە و پلانی تازە و بەرنامەی دیراسەکراو هەیە بۆ پەرە پێدانی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ وڵاتانی دراوسێ لەسەر بنەمای بەرژەوەندی هاوبەش، لە ناوخۆشماندا پێویستە یەکڕیزیی خۆمان بپارێزین و ناومالّی خۆشمان باشتر ڕێك بخەینەوە، لەم ڕووەوە پێویستمان بە هاوکاری یەکتری و سوود وەرگرتن لە توانای گشت لایەك هەیە، سەردەم سەردەمی برایەتی و زیاتر یەکخستنی ریزەکانە.

**خوشکان.. برایان..**

هێشتا ئاستەنگ و تەحەدیاتی زۆرمان لە پێشە، ناحەزان هەمیشە لە هەوڵدان گرفتمان بۆ دروست بکەن و تۆوی فیتنە و دووبەرەکی لە ناوماندا بڕوێنن، بۆیە خوازیارم بە هەوڵ و هیممەتی هەمووولایەك تەبایی و یەکڕیزی خۆمان بپارێزین و بوار نەدەینە هیچ کەس و لایەنێك بارودۆخەکەمان لێ تێك بدەن.

لە پرۆسەی هەڵبژاردندا هەموومان سەرکەوتوو بووین، بۆیە پڕبە دڵ سوپاسی هەمووولایەك دەکەم بە تایبەتی جەنابی سەرۆك مام جەلال بۆ ئەو ڕۆڵە گەورەیەی کە نواندی. هەروا سەرۆك و ئەندامانی لێژنەی باڵای پاڵپشتیکردن لیمان وەك پاڵێوراوی سەرۆکایەتی هەرێم، کە بەگیانێکی ماندوونەناسانە و پشوو درێژی ئەرکەکانیان بەجێ گەیاند.. ئەو لاو و خوشك و برایانەی کە خۆبەخشانە کاریان لە ناو تیمەکانی لیژنەی ناوبراو کرد لە سەرجەم پارێزگا و شار و شارۆچکەکانی کوردستان.. لیژنەی باڵای هەڵبژاردنی لیستی کوردستانی و لیژنە فەرعییەکانیان بۆ ڕۆڵی بەرچاویان.. لیژنەی باڵای ئاسایشی هەڵبژاردن کە توانیان ڕەوشی سەقامگیریی و ئەمنیەتی هاووڵاتیان و پرۆسەکە بپارێزین.. دەزگاکانی ڕاگەیاندن بە ڕادیۆ و کەناڵە ناوخۆیی و کەناڵە ئاسمانییەکان و ڕۆژنامە و گۆڤارەکان.. سەرۆك و ئەندامانی کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان لە ئێراقدا.. هەروا بەرپرسان و ئەندامانی دەستەی هەڵبژاردن لە کوردستان، کە سەرکەوتووانە ئەرکەکانی سەرشانیان بەجێ گەیاند..

ئاژانەسەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان و نێردراوە دیپلۆماسیەکانی ولآتانی دراوسیٚ و هاوپەیمان..
هێزەکانی پێشمەرگەو زێرەڤانی و ئاسایش و پۆلیسی هەرێمی کوردستان.. دەزگاکانی تەندروستی و بەرگریی شارستانی.. سەرجەم فەرمانبەرانی دامودەزگاکانی حکومەتی هەرێمی کوردستان کە هەریەکە و بەشێوەیەك هاوکار بوون لە سەرخستنی پرۆسەکە.. هونەرمەندان وەرزشوانان و پیشەوەران و ئەندامانی سەندیکا و رێکخراو و سەنتەرو کۆمەڵە و دامودەزگاکانی دیکەی کۆمەڵگەی مەدەنیی ناوخۆ و بیانی.. چاوەدێرە بەڕێزەکان و کەناڵەکانی راگەیاندنی بیانی کە لەدەرەوەی کوردستان بۆ چاودێریی کردنی پرۆسەکە هاتبوون.. تێکڕای چین و توێژەکانی کوردستان کە لە ماوەی رابردوودا زۆر زەحمەتیان کێشا و تەحەمولی گشت بارودۆخێکی هەڵبژاردنیان کرد.. لە کۆتاییدا، سوپاسی بێ پایانم بۆ هەموو ئەو خوشك و برا و دۆست و ئازیزانە کە دەنگیان پێ داوم و متمانەیان شەرەفێکی گەورەیە، پێیان رادەگەیەنم کە من لە هەر پلە و پایەکدابم هەر پێشمەرگە و خزمەتکاری کوردستانم

هەروا سوپاسی ئەو ئازیزانەش دەکەم کە دەنگیان بە کەس و لایەنەکانی دیکە دا و بەشداربوون لە سەرخستن و بەڕێوەچوونی پرۆسەکە، بەمەش هەموومان براوەبووین، سەرکەوتنێکی گەورەمان بۆ کوردستان تۆمارکرد و بە هەمووانیش دەڵێم کە هێشتا رێگەیەکی دوورو درێژمان لە پێشە و ئەرکێکی زۆر چاوەڕێمان دەکات و کوردستانیش پێویستی بە هەموومانە.بژی کورد بژی کوردستان

مەسعوود بارزانی

سەرۆکی هەرێمی کوردستان

٧ ی ئابی ٢٠٠٩

## راگەیەندراوێك لە سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستانەوە

## دەربارەی مەسەلەی پۆستی جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراق

ماوەیەكە لێدوانی جیاجیا و دوور لە راستی سەبارەت بە پۆستی جێگری سەرۆك وەزیرانی عێراقی فیدراڵەوە دەدرێت و هەندێ لە میدیاكانیش لە نووسینەكانیاندا وا پیشانی خەڵكی دەدەن كە گوایە لەسەر ئەو مەسەلەیە ناكۆكی لە نێوان پارتی ویەكێتی دا هەیە.

ئەوەی پێویستە بگوترێ، هیچ ناكۆكییەك سەبارەت بەو مەسەلەیە لە نێوان هەردوولا نییە و ئەو پۆستەش لە لایەن سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستانەوە بڕیاری لەسەر دەدرێ و پەیوەندی بە كەسی دیكەوە نییە.

هەروا داوا لە هەموو كەس و لایەنێك دەكەین بە كەیفی خۆیان لێدوان دەربارەی ئەو مەسەلەیە نەدەن.

سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان
٢٠٠٩/٩/٢٦

# ڕاگەیەندراو

لەسەر بانگهێشتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان ئەمڕۆ ٢٠٠٩/١٠/٢٢ لە هەولێر نوێنەرانی سەرجەم ئەو پارت و لایەنە کوردستانیانەی کە لە لایەن کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکانی عێراقەوە تۆمارکراون کۆبوونەوە.

لە کۆبوونەوەکەدا چەندین بابەتی پەیوەست بە پڕۆسەی هەڵبژاردن لە عێراق و پرسی کەرکوك خرانەڕوو. وێڕای باس کردنی پرۆژەی یاسای پێشنیارکراوی هەڵبژاردنەکان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق، ئامادەبووان داکۆکیان لە سەر یەکخستنی هەڵوێست و ووتاری کوردستانی سەبارەت بە پرسە چارەنووسسازو دەستووریەکان کرد.

لەم کۆبوونەوەیەدا چەند بڕیارێك وەرگیران، لەوانە:-

- داکۆکی لەسەر ئەوە بکرێت کە هەڵبژاردنەکان لە کەرکوك هاوکات لەگەڵ پارێزگاکانی تری عێراق ئەنجام بدرێت بە بێ جیاوازی.

- ڕەت کردنەوەی دابەش کردنی کەرکوك بۆ چەند ناوەندێکی هەڵبژاردن لەسەر بنەمای ڕەگەزی، لەبەرئەوەی ئەم کارە دژی پرەنسیپی دیموکراسی و دەستووری عێراقە.

- سەرجەم پارت و قەوارە سیاسیەکان سەبارەت بە پرسی کەرکوك یەك هەڵویست بوون و، پابەند بوونی تەواویان لەسەر جێ بە جێ کردنی ماددەی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیی عێراق دووپات کردەوە.

- پێکهێنانی لیژنەیەك بۆ دیراسەت کردنی ئەو بۆچوونانەی پەیوەستن بە یەکخستنی ڕاکان کە خزمەتی بەرژەوەندیەکانی گەلی کوردستان بکات.

هەروەها نوێنەرانی سەرجەم پارت و قەوارە کوردستانیەکان داکۆکیان لەسەر بەردەوام بوون و پەرەپێدانی ئەم جۆرە دانیشتنانە کردەوە، بەمەبەستی قووڵ کردنـەوەی کـاری هاوبـەش لـە هەموو بوارەکاندا.

ئامـادەبووان هەڵوێسـتی پـڕ بایـەخ و کاریگـەری نوێنـەرانی گـەلی کوردسـتانیان لـە ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقدا بەرز نرخاند لە ڕووبەڕوو بوونەوەی ئەو هەولانەی کە هـەن بـۆ دژایەتی کردنـی مافـە ڕەواکـانی گـەلی کوردسـتان کـە لـە دەسـتووردا هـاتووە. هـەروەها ئامادەبووان ڕێزو پێزانینی خۆیان دەربڕی بۆ هەڵویستی ئەو ئەندامانەی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراقی فیدراڵ کە پاڵپشتیان لە دۆزی ڕەوای گەلی کوردستان کرد. لـە کۆتاییشـدا سوپاسـی بەڕێز جەنابی سەرۆکی هەرێمی کوردستانیان کرد بۆ ئەم دەستپێشخەریە گرنگە.

هەولێر
٢٠٠٩/١٠/٢٢

# تەرجەمەی دەقی بەیاننامەی کۆشکی سپی لە مەڕ دەرچوونی یاسای هەڵبژاردن لە عێراق:

٨ / ١٢ / ٢٠٠٩

ولایەتە یەگرتووەکان پیروزبایی لە خەڵکی عێراق و نوێنەرە هەڵبژێردراوەکانییان بە بۆنەی دەرچوونی یاسای هەموارکراوی هەڵبژاردن دەکات و ئێمە بە خۆشحاڵیەوە چاوەڕێی هەڵبژاردنەکانی نیشتیمانی دەکەین. ئەم گفتوگۆیانەی کە بونە هۆی دەرچوونی یاسای هەڵبژاردن ئەوە دەگەیێنێت کە عێراقیەکان و سەرکردەکانیان پابەندن بە کۆنترۆڵکردنی ئایندەی خۆیان و چارەسەرکردنی ناکۆکیە کانیان بە شێوەیەکی ئاشتیخوازانە بە پێی دەستوری عێراق.

لەساڵی ٢٠٠٥ەوە ولایەتە یەگرتووەکان پاڵپشتی لە دەستوری عێراقی کردووە وەك بنەمایەك بۆ گشت عێراقیەکان کە بتوانن مافەکانیان بپارێزن و هەروەها بە یەکەوە کار بکەن بۆ بنیادنانی یەکگرتنەوەی نیشتیمانی. ئەم دەستوورە لە گەڵ دروست کردنی حکومەتی هەرێمی کوردستان کاریگەریان هەبووە بۆ سەر سەقامگیری عێراق. ولایەتە یەگرتووەکانی پاڵپشتی بەهێزی خۆی بۆ خەلکی عێراق و حکومەتی هەڵبژێردراو دوپات دەکاتەوە، هەروەها ڕێزی خۆی بۆ دەستوری عێراق دوپات دەکاتەوە، لەگەڵ مادەی ١٤٠ کە ناوچەناکۆکیدارەکان وەك کەرکوك و سنورە ناکۆکیدارەکانی تری ناوخۆ دەگرێتەوە، هەروەها مادەی ١٤٢ کە باس لە پرۆسەی هەموارکردنی دەستور دەکات. بەردەوام دەبین لە پاڵپشتیکردن لە خەڵکی عێراق و حکومەتی هەڵبژێردراویان کە کار دەکەن بۆ جێبەجی کردنی دەستوی عێراق بە شێوەیەکی تەواو و دادپەروەرانە.

گرفتی زۆر لە بەردەم عێراق هەیە، لەگەڵ هەبوونی نارەزایی لە نێوان حکومەتی عێراق و هەرێمی کوردستان. ویلایەتە یەکگرتووەکان ئامادەیە بۆ یارمەتیدانی گشت عێراقیەکان بۆ ئەوەی لە دەوری یەك کۆببنەوە و چارەسەری نوێی سیاسی بدۆزنەوە بۆ ئاسانکردنی گرفتە

کۆنەکانیان، ترسە کۆنەکان لاببەن و بەیەکەوە ئایندەیەك بنیاد بنێن وەك ولاتێکی سەرفراز، شوێنی مێژوویی خۆی لە کۆمەڵگای نێودەولەتی بەدەست بێنێت.

دوای هەڵبژاردنەکانی پەرلەمان لە ٢٠١٠، عێراق بە پێی دەستور و یاساکانی لە ٢٠١٣ و ٢٠١٤ هەلبژاردنەکان ئەنجام دەدات. سەرژمێریەکی سەردەمیانە و وورد و تەواو دەبێتە هۆی ئاسانکاری بۆ ئەنجامدانی هەڵبژاردنەکانی ئایندە، وە ولایەتەیەگرتووەکان ئامادەیە بۆ یارمەتی دانی حکومەتی عێراق بۆ ئەنجامدانی سەرژمێریەکی راست و دورست لە ساڵی داهاتوودا، ئەمەش وەك پایەییێکە بۆ یارمەتیدانی عێراقێکی سەقامگیر کە حکومەتێکی دادپەروەرانە و بەرپرس بێت لە بەرامبەر خەڵکی عێراق.

ولایەتە یەککگرتووەکان سوپاسی نەتەوە یەککگرتووەکان دەکات بۆ ئەو رۆڵە پڕ بایەخەی کە دەیبینێت لە یارمەتیدانی خەڵکی عێراق و ئامادەکردنیان بۆ هەڵبژاردنەکانی داهاتوو وە سۆزی خۆی بۆ پاڵپشتیکردنی نوێنەری

## دەقی وتاری سەرۆکی هەرێم لە بارەی یاسای هەڵبژاردنەکان

١١ / ١٢ / ٢٠٠٩

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

گەلی کوردستانی تێکۆشەر

خوشك و برایانی خۆشەویست

پێم خۆشە لە وردەکاری مەسەلەی یاسای هەڵبژاردنی عێراق ئاگادارتان بکەمەوە. لەمانگی ئۆکتۆبەری رابردوو دەست کرا بەگفتوگۆکردنی یاساکە لە پەرلەمانی فیدراڵ لەبەغدا، لەو گفتوگۆیانەدا پێشنیارێك بۆ ئێمە هات، کە دیسان کەرکووك حاڵەتێکی تایبەتی هەبێت و پێشوەخت ٢کورسیش بە عەرەب و تورکمان بدرێ.

لێرەدا زۆر دیارە کە غەدرێکی یەکجار زۆر گەورە لە کورد دەکرێ، هەروەها بۆ کەرکووك لە پارێزگاکانی دیکە جیا بکرێتەوە. لەبەر ئەوە زۆر بەتووندی ئێمە ئەوەمان رەتکردەوەو قبوڵمان نەکرد، هەرچەندە زۆر تەلەفۆناتیش کرا لەوانە تەلەفۆنی جێگری سەرۆکی ئەمەریکا، بەڵام تێم گەیاند کە ئەمە غەدرێکی گەورەیە و دوورە لە هەموو مەنتیق و یاسایەك و پێچەوانەی هەموو دەستوورێکیشە. لەبەر ئەوە ئێمە ناتوانین ئەمە قبوڵ بکەین، جا ئەوەبوو ئەمە سەری نەگرت، پاشان کەوتنە ئەوەی چۆن کورسیەکان دابەش بکەن، لەوەشدا هەم دیسان بەتەمابوون غەدرێکی گەورە لە کورد بکەن، لە ٣٥تا ئەو پەڕی ٣٨کورسی بۆ کورد دانرابوو، ئەو وەختە من لە برۆکسل بووم کەسەردانی یەکێتی ئەورووپام هەبوو، کە پەیوەندیان پێوە کردم مەسەلەکە بەم شێوەیە، لەوێ من بەیاننامەیەکم دەرکردو رامگەیاند کە ئەگەر بەمشێوەیە بێت نادادپەروەری تێدایەو غەدرێکی زۆری تێدایە بەرامبەر بەکورد. لەبەر ئەوە ئێمە ناتوانین بەشداری لە هەڵبژاردن بکەین ئەگەر بەمشێوەیە بێت و بایکۆتی دەکەین.

لێرەدا من دەمەوێ پڕ بەدڵ سوپاسی هەموو گەلی کوردستان و هەموو هێزە سیاسییەکان بکەم کە هەموو یەکهەڵوێست بوون و پشتیوانیەکی گەرمیان لێکردم، سوپاستان دەکەم، دوای ئەوە دیسان جارێکی دیکە لە ٢٣_١١ یاساکە لە پەرلەمان خرایە بەر دەنگدان، لەوێ

هاوپەیمانی کوردستان و ئیئتیلافی عێراقی دەنگیان بە یاساکەدا کە لەوێدا تەنها ٣٩کورسی بەر کورد دەکەوت. دوای ئەوە ڤیتۆی بەڕێز هاشمی بەسەر داهات، لە کۆتاییدا مەسەلەکە لە یاسا دەرچوو بوو بە ڕێککەوتنی سیاسی و بووە مامەڵەکردن، ئەوەندە کورسی بۆ ئەم و ئەوەندە کورسی بۆ ئەو، کە بوو بە مەسەلەی ژمارە. من ناردم و هەندێ لە پسپۆڕانی هەڵبژادن هاتن، لەگەڵ وەفدێکی هاوپەیمانی کوردستان لەبەغدا لەگەڵ وەفدێکی پەرلەمانی کوردستان، گوتم دەبێ بێن و بچینە ناو وردەکارییەکانەوە، مەسەلە چییە بوو بە مەسەلەی ژمارە؟ لەوێدا هەندێ شتی زۆر سەیرمان بۆ دەرکەوت کە پسپۆڕەکان بۆیان روونکردینەوە. بەپێی مەزەندەی ئەوان، بەم بارودۆخەی کە هەیە بەشی هەرێمی کوردستان لە ٤٣کورسی تێناپەڕێ، سەبەبەکەشی ئەوەیە: خەڵکی تر ساختەکاریان کردووە، راستیان نەگوتووە، هەقیقەتیان نەگەیاندووە، ژمارەی ساختەیان بۆ وەزارەتی بازرگانی ناردووە، بەڵام لە هەرێمی کوردستان دەزگاکانمان هەقیقەتیان گوتووە و ئێمە پێمانخۆشە هەمیشە هەقیقەت بگوترێ، بەڵام دەبوایە رێگە لەو ساختەکارانەی تر بگیرابوایە.

لە کوردستان هەرچی ئەمری خوای کردووە ئاگاداری لایەنی پەیوەندیدار کراوە، هەرچی جێگەی گۆڕیوەو خەڵکی ئاوارە کە گەڕاونەتەوە کەرکووك، مووسڵ و دیالە ئاگاداری لایەنی پەیوەندیدار کراوە. وەك ئەوەی زانیاری بەمن درا لێرە کەم کراوەتەوە، بەڵام لەوێ دیسان نەخراونەتەوە سەر لیستەکان، کەچی خەڵکی دیکە بەکەیفی خۆی ژمارەی خۆی زیاد کردووە، من دوێنێ داوام لە جەنابی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی هەرێمی کوردستان کرد، کە لیژنەیەك دابنێین بۆ دەستنیشان کردنی خەلەلەکان و کێ کەمتەرخەم بووە لەو مەسەلەیەدا، ئیتر کە چووینە ناو ئەو وردەکاریانەوە، وەفدی UNداوای کرد بێت. رۆژی ٣ی مانگ وەفدی UN بەسەرۆکایەتی بەڕێز ملکرت کە نوێنەری تایبەتی سکرتێری گشتی UNـە هات. ئەوان وردەکاری زۆریان پێبووە، ئەوانیش چوونە ناو ئەو وردەکاریانەوە، ئەم هەموو ژمارەیە لای ئەوانیش هەبوو. زۆر هەوڵدرا کە ئێمە بە ٤٠، ٤١کورسی رازی بین، من پێمگوتن ئێمە پشت بەرای پسپۆڕەکانی خۆمان دەبەستین، بڕیاری کۆتاییش لە پەرلەمان دەدرێ، گووتیان وەخت کەمەو وەخت نەماوە، لەبەر ئەوە داوام کرد وەفدی پەرلەمانی کوردستان بەدەسەڵاتێکی تەواوەوە بچنە بەغدا، سەرۆکی پەرلەمان و نوێنەری هەموو کوتلەکانی پەرلەمان پێکەوە بچن و لەوێ لەگەڵ هاوپەیمانی کوردستانی هەماهەنگی بکەن و خۆیان

بگەنە قەناعەت، چونکە مەیدانی ئەوان لەوێن لەگەڵ UN لەگەڵ ئەمەریکا لەگەڵ لایەنە عێراقییەکان دانیشن و نەهێڵن غەدر لە کورد بکرێ و هاوسەنگییەکی تێدا بێت.

بێگومان خەڵکی تریش هەیە، وەنییە بڵێین هەرچی ئێمە بمانەوێ و بڕیاری لێ بدەین، ئەوبڕوات. ئەمە دانوستاندنە لەگەڵ خەڵکی تریش. ئیتر ئەوەبوو ٥-ی مانگ وەفدەکە رۆیشتن، رۆژی ٦ی مانگ دوا وادە بوو، دەبوایە ئەو رۆژە بڕیاری کۆتایی بدرێت. ئێوارەکەی لەسەرەتاوە جێگری سەرۆکی ئەمەریکا، دوای ئەوە سەرۆکی ئەمەریکا خۆیان تەلەفۆنیان بۆ کردم و بایەخی هەڵبژاردنیان بۆ عێراق، بۆ ئەمەریکا بۆ کورد نیشاندا، منیش هاوبیریان بووم و گووتم بەڵێ راستە ئێمەش هاوبیرین لەگەڵ بەڕێزتان، هەڵبژاردن بۆ هەموو لایەك زۆر گرنگە، بەڵام دەبێ هاوسەنگیەکی تێدابێت، دەبێ دادپەروەری تێدا بێت. هەروەها پێشم گوتن ئێمە وەفدی پەرلەمانی کوردستان — مان ناردووە و ئێستا لە بەغدان لەگەڵ هاوپەیمانی کوردستان. بڕیاری کۆتایی لای ئەوانە.

لەم پەیوەندییە تەلەفۆنیەدا هەردوو بەڕێزیان تەئکیدیان کردەوە لەسەر پابەندی خۆیان بەرامبەر هەرێمی کوردستان، بەرامبەر دەستوور، بەرامبەر ماددەی ١٤٠، بەرامبەر سەرژمێریەکی رێکوپێك لەساڵی ئایندە، هەروەها داوامان لێکرد پاشان ئەوە یا بەنامەیەك یا بە بەیاننامەیەکی رەسمی ئەم هەڵوێستەیان دەربڕن. ئەوەبوو بە بەیاننامەیەکی رەسمی و بەناوی وایت هاوسەوە دەرچوو، کە ئەمە یەکەمجارە ئەمەریکا لەم ئاستە هەڵوێستی خۆی نیشاندا بەرامبەر بەو مەسەلانەی کە بۆ ئێمە چارەنووسسازن.

من پەیوەندیم بە برادەرانی خۆمانەوە کرد و ئاگادارم کردنەوە کە ئەم تەلەفۆنە کراوە و ئەو رۆژە و ئەو ئێوارەیە لە پەیوەندییەکی بەردەوام دابووم تا درەنگی شەو، بەڵام پێمگوتن ئێوە لەوێن، ئێوە تەقدیری ئەو بەرژەوەندییە دەکەن، ئێوە لەوێ تەقدیری ئەوە دەکەن، کە تا رادەیەك، ئەگەر تا رادەیەکی کەمیش بێت هاوسەنگی و دادپەروەری تێدایە یا نا؟

دواشت ئاگاداریان کردینەوە کە ژمارەکە سەرکەوتووە بۆ ٤٣کورسی ئەمە کەرکوك، مووسڵ، دیالە، تکریت و بەغدای تێدا نییە کە کوردی لێیە، لە کەرکوك ژمارەیەکی زۆر هەیە و پەنا بەخوا لە مووسڵیش دەنگێکی زۆر دەهێنین، بەڵام ئەمە تەنها بۆ هەرسێ پارێزگای سلێمانی و هەولێر و دهۆکە.

هەروەها راشیانگەیاند ئەگەر ئێمە ئەو ٤٣کورسیەش رەت بکەینەوە، مانـای ئەوەیـە بـۆ یاساکە دەگەڕێتەوە و لەوانەیە جارێکی تر هاشمی ڤیتۆی بکاتەوە، کە ڤیتۆی کردەوە ئێمە بـۆ ٣٩کورسی دەگەڕێینەوە، واتە ئەوکاتە ٤٣کورسی نامێنێ. لەبەر ئەوە پێمان باشبوو کە ئەمە بڕوات.

من پێموایە تا رادەیەك سەرکەوتنیان بـە دەسـتهێناوەو دەستخۆشـیان لێدەکـەین. بـەڵام ئەگەر لەمن بپرسن یا لەخۆشیان بپرسن کە ئەمە هەموو هەقی ئێمەیە؟ ئایا بەدڵی ئێمەیـە؟ من دەڵێم وەڵڵا بەتەواوی بەدڵی من نییە، بەڵام ئەمە مەسەلە دانوستاندنە. دیارە لەمە زیاتر نەدەکرا، ئەوە نییە بڵێی هەرچی مافی ئێمەیەو هەرچی ئێمە ویستوومانە بەدەستهاتووە، بەڵام بەشێکی زۆریشی بەدەستهاتووە، پاشان لەهەمووی گرنگتر ئەوەیە دوای هەڵبژاردن یەك لایەن بەتەنها ناتوانێ بڕیاربدات، نە ئێمە نەهیچ لایەنێکی عەرەبیش. واتە دەبێ هاوپەیمانی دروست بکەین. ئێمە لەوەدا دەبێ وریا بین و هاوپەیمانی لەگەڵ ئـەو هێزانـە بکـەین کـە بڕوایـان بـە دەستوورو مافی گەلی کوردستان و پێکەوە ژیان هەیە. ئێمە بەو هاوپەیمانیە دەتوانین هێزێکـی بەقوەت لەناو پەرلەمان دروست بکەین و لەوێ هەرچی لەبەرژەوەنـدی عێـراق و کوردسـتان و ناوچەکەدایە، لەوێ دەربازی بکەین، ئەوە لەهەمووی گرنگترە بۆ ئێمە. لە هەمووشی گـرنگتر ئەوەیە وەکو کورد و وەکو کوردستانی ئێمە یەکهەڵویست بین، کە زۆر شتمان پێـدەکرێ. مـن پێموایە ئەمە مەسەلەیەکی نەتەوەییە، پێویست ناکات موزایـەدات لەسـەر یـەکتری بکـرێ، لەسیاسەتدا ئەمە نییە یاسەدا سەد هەرچی من دەمەوێ و مافی خۆمە هەمووی وەربگـرم یـا هیچ. ئەمە خـەباتێکی بەردەوامـەو بـەردەوامیش دەبـین. جـارێکی تـریش پـەیمان بەگـەلی کوردستان بەگەلی خۆمان دەدەینەوە کە تا دوا دڵۆپی خوێنمـان ئێمـە سـازش لەسـەر مـافی گەلەکەمان نەکەین. لە کۆتاییدا هەر شادو سەرکەوتوو بن.

## وتەبێژێك بەناوی سەرۆكایەتی هەرێم : بڕیاری دەستەی پێداچوونەوە پێچەوانەی دەستوور و یاسای لێپرسینەوەو دادپەروەرییە

بڕیاری دەستەی پێداچوونەوە بە هەڵوەشاندنەوەی بڕیارەکانی دەستەی لێپرسینەوە و دادپەروەری و رێدان بە هەموو کاندیدە دوورخراوەکان بۆ ئەوەی بەشداری لە هەڵبژاردنەکان بکەن، بڕیارێکی نا دروستە و لە رووی ناوەڕۆکەوە لێی نەکۆڵراوەتەوەو هۆکاری سیاسی لە پشتەوەیە، بۆیە دەبوو دەستەی پێداچوونەوە لەو تانانەی کە پێشکەشی کرابوون بکۆڵیبایەوە سەرەرای لێکۆڵینەوەی باکگراوەندی ئەو ناوانەی یاسای لێپرسینەوە و دادپەروەری دەیانگرێتەوە بەر لەوەی ئەم هەڵوێستەی وەرگرتبایە و مافی بەشداریکردنی هەڵبژاردنەکانی بەوانە بەخشیبا، چونکە ئەو لیستەی دەستەی لێپرسینەوەو دادپەروەری ئامادەی کردووە ناوی کەسانێکی تێدایە دەستیان لە تاوانکاری دژ بە رۆڵەکانی گەلی عێراق هەیە، هەروەها ناوی کەسانێکی تێدایە کە هەڵوێستی سیاسی دیاریکراویان هەیە.

بۆیە ئێمە بڕوامان وایە کە دەبوو دەستەی پێداچوونەوە ئەو ناوانەی لەو لیستەدا هاتبوو و پێشکەشی کرابوون جیا کردبایەوە و بەپێی پێداچوونەوەی تانەکان لەگەڵ دیاریکردنی بۆچوونی خۆی سەبارەت بەوەی ئایا مافی بەشداریکردنیان هەیە یان نا، نەك بچێت بڕیار بدات و مافی بەشداریکردنیان پێ بدات بەبێ ئەوەی لە بابەتەکە بکۆڵێتەوە.

بۆیە ئێمە دووپاتی دەکەینە و دەڵێین کە بڕیارەکە بەپەلە دراوە و پێچەوانەی دەستوورو یاسای لێپرسینەوە و دادپەروەرییە و نەبۆتە هۆی چارەسەرکردنی کێشەکە بەڵکو ئاڵۆزتری کردووە، جگە لەوەی کە پێچەوانەی ناوەرۆك و حوکمی دەستوورە.

وتەبێژێك بەناوی
سەرۆكایەتی هەرێمی کوردستان
٢٠١٠/٢/٤

## سەرۆكايەتی هەرێمی كوردستان خۆشحاڵی خۆی بەرامبەر بەبریاری بەجینۆسایدناساندنی دۆسیەی هەڵەبجە دەردەبڕێت

رێكـەوتی ١/٣/ ٢٠١٠ دادگـای بـاڵای تاوانـەكان لـەعێراق دۆسـیەی كیمیابـارانی هەڵەبجەی بەجینۆسایدناساند، ئەم بریـارەی دادگـای بـاڵا وێـرای ئـەوەی زەمینـەی زیـاتر دەرەخسـێنیٚ بۆبـەجیهانی كردنـی ئـەم كەیسـەو لـیٚ پێچـینەوە لەسـەرجەم تاوانبـاران و هەمووئەو كەسانەی دەستیان لەم تاوانـەدا هـەبووە، لەهـەمان كاتـدا پشـتیوانیكردنێكی بەهێزە بۆ داكۆكیكردن لەمافی قوربانیان و قەرەبووكردنەوەی زیان لێكەوتووان.

سەركردایەتی سیاسی كوردستان ماوەیەكی درێژ لەهەوڵی بەردەوامدا بووە بۆبـەجیهان ناساندنی ئەم دۆسیەیەو دادگایكردنی تاوانباران و ئەنجامدەرانی كارەساتەكە كەخۆشـبەتانە بەرهەمەكەی قۆناغ بەقۆناغ هاتە دی، ئەمەش سووربون و دڵسۆزی سەركردایەتی سیاسـی نیشان دەدات بەرامبەر بەكێشەومەینەتیەكانی گەلی كوردستان .

سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان لەكاتێكدا خۆشحاڵی خۆی بۆئەم بریارەی دادگای باڵای تاوانەكان ، دەردەبرێت لەهەمان كاتدا ستایشی رۆڵی دادگاو تیمی پارێزەرانی ئەم دۆسیەیە دەكات بۆسەرخستنی ئـەم بریـارەو دەرخسـتنی راسـتیەكان ، هـەروەها پیرۆزبـایی گـەرم ئاراستەی گەلی كوردستان بەگشتی و كەس و كاری قوربانیانی كارەساتی هەڵەبجە دەكـات بەتایبەتیئەم سەركەوتنە مەزن و مێژووییە دەكەینە دەرفەتێك بۆتازەكردنەوەی هەڵوێسـتی نەگۆرمان لە پشتیوانیكردن و هاوكاری كەس و كاری قوربانیانی ئـەم دۆسـیەیە ، چـونكە كارەساتی هەڵەبجەی شەهید مەسەلەیەكی ویژدانی یەو تاهەتایە لەدڵ و دەروونـی خـەڵكی كوردستان بەزیندویی دەمێنێتەوە...

وتەبێژێك لە سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان
٢/٣/٢٠١٠

## پەیامی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە بۆنەی کۆتایی هاتنی پرۆسەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراقەوە

بە ناوی خوای گەورە ومیهربان

سڵاوی برایەتی

بە بۆنەی سەرکەوتنی پرۆسەی هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نیشتمانی عێراقەوە، پێم خۆشە گەرمترین پیرۆزبایی ئاراستەی هەموو گەلی عێراق بکەم، بە تایبەتی لە گەلی کوردستان.

سوپاسی بێ پایان بۆ جەماوەری کوردستان و هەموو برایانی خۆشەویست لە پێشمەرگە و پۆلیس و ئاسایش وهەموو دەزگاکانی پەیوەندار بە پاراستنی ئەمن و ئاسایش لە هەرێم کە توانیان کەشێکی سەقامگیر بۆ هاوڵاتیان دابین بکەن تا بەو پەڕی ئازادی و دڵنیاییەوە دەنگی خۆیان بدەن.

سوپاس بۆ هەموو کوردستانیانی دەرەوەی وڵات کە سەرەڕای دروستکردنی کۆسپ لە بەردەم بەشدارییان لە لایەن هەندێ لە رەگەزپەرستانەوە بەڵام وەك بینیمان بە جۆش و خرۆشێکی زۆرەوە ڕوویان لە سەندوقەکانی دەنگدان دەکرد.

سوپاسی هەموو قەوارە سیاسییەکانی بەشداربووی هەڵبژاردن دەکەم کە بە هیمەتی هەموو لایەك رێگەنەدرا هیچ رووداوێکی ناخۆش رووبدات و بەمەیش هەڵبژاردن بە شێوەیەکی ئاسایی بەرێوەچوو.

هەروا سوپاسی هەموو میدیاکان دەکەم و هەر لە ئێستاوەش پیرۆزبایی لە هەموو ئەو خوشك و برایانە دەکەم کە متمانەی جەماوەر بە دەست دەهێنن.

بۆ ئێمەی کوردستانی دووپاتی دەکەمەوە کە دەبێ بەرامبەر بە کێشە نەتەوایەتیەکانمان یەك هەڵوێست بین و نوێنەرانی گەلی کوردستان پێکەوە کار بۆ جێبەجێکردنی دەستوور، بە تایبەتی ماددەی ١٤٠ بکەن.

لەسەر ئاستی عێراقیشدا ئومێدەوارم کە هەموومان بە خۆماندا بچینەوە و ڕوو لە برایەتی و هاوکاریکردنی یەکتر بکەین و پێکەوە عێراقێکی فیدراڵ و دیموکرات بنیاد بنێین و پابەندی دەستوور بین و یاساش سەروەر بێت لە عێراقدا و هەمووشمان پێکەوە هەوڵ بدەین شەڕی تیرۆر لە عێراق دوور بخەینەوە و بەرژەوەندییە باڵاکانی وڵاتیش لە لایەن هەموو لایەکەوە لە بەر چاو بگیرێن.

مسعود بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
٢٠١٠/٣/٨

## لەكۆبوونەوەی سەرۆكی هەرێمی كوردستان

## لەگەڵ لیستەبراوەكانی كوردستان

## شاندی دانوستاندنی كورد لەگەڵ بەغدا دیاریكرا

پێش نیوەڕۆی ئەمرۆ سێ شەممە٦/٤/٢٠١٠ لەسەلاحەدین، بەرێزمسعودبارزانی سەرۆكی هەرێمی كوردستان لەگەڵ نوێنەرانی لایەنەسیاسیەكان ولیستەكانی كوردستان كەبەشداربوون لەهەڵبژاردنی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق و سەركەوتووبون لەهەڵبژاردندا كۆبوونەوەیەكی گرنگی ئەنجامدا، لەكۆبوونەوەكەدا گفتوگۆدەربارەی پەرەسەندنەكانی سەرگۆرەپانی سیاسی دوای هەڵبژاردن و یەك هەڵوێستی كورد لەبەرامبەر قۆناغەكانی داهاتو و چۆنیەتی دانوستاندن لەگەڵ لیستەكانی تری عێراقی كرا،لەكۆتایی كۆبوونەوەكەشدا ئەم خاڵانەی خوارەوە بڕیاریان لەسەردرا:

١-دەستنیشانكردنی شاندێك بۆ دانوستاندن لەگەڵ لایەنە سیاسیەكان و لیستە براوەكانی تر لە عێراق بەمەبەستی دامەزراندنەوەی حكومەتی نوێی عێراقی فیدراڵ.

٢-دامەزراندنی لیژنەیەك بۆدیراسەتكردنی ئەوبەرنامەیەی كەسەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان پێشكەشی كرد دەربارەی دیاریكردنی میكانیزمێكی گونجاو و ئەولەویاتی خەڵكی كوردستان بۆگفتوگۆكردن لەگەڵ لایەنە سیاسیەكانی عێراق.

گوتەبێژێك بەناوی

سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان

هەولێر ـ ٦/٤/٢٠١٠

# کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و نوێنەرانی پارت و قەوارە کوردستانیەکان

بە سەرپەرشتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و ئامادەبوونی بەڕێز د.کەمال کەرکووکی سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان، ئەمڕۆ شەممە ٢٠١٠/٤/١٧ نوێنەرانی ئەو پارت و قەوارە کوردستانیانەی کورسییان لە هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکەی ئەو دواییەی عێراق بەدەستهێنا، کۆبوونەوەیەکیان سازکرد بە مەبەستی تاوتوێکردنی ئەو پێشنیارانەی لەلایەن خۆیانەوە خرابوونەڕوو سەبارەت بە بەرنامەی دانوستانکردن لەگەڵ لیست ولایەنە عێراقییەکان لە پێناو پێکهێنانی حکوومەتی نوێی عێراق.

هەروەها لە کۆبوونەوەکەدا رەشنووسی پەیڕەوی ناوخۆی کاری هاوبەشی نێوان پارت و قەوارە کوردستانییەکان لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و پێکهاتەی شاندی دانوستانکاریش قسەوباسی لەبارەوە کرا.

ئەمەو کۆبوونەوەکە داکۆکی لەسەر ئەوە کردەوە کە پارت و قەوارە کوردستانییەکان بە دیدێکی کراوە سەبارەت بەهەموو لیستە براوەکان دانوستانەکانی خۆیان دەست پێدەکەن وهەر وەها بە گیانی کارلێکی لەگەڵ سەرجەم ئەو دید و پێشنیارانەش مامەڵە دەکەن کە خزمەت بە پرۆسەی سیاسی عێراق دەگەیەنێ لەپێناو پێکهێنانی حکوومەتێکی ئیئتیلافیی بنکە فراوان کە تێکڕای پێکهاتەکانی عێراق لەخۆ بگرێ، بنچینەی دانوستان و هاوپەیمانییە داهاتووەکانی پارت و قەوارە کوردستانییەکانیش لەگەڵ لیست ولایەنە سیاسییە عێراقییەکان پشت بە بەرنامەیەکی روون دەبەستێ کە پەیوەستە بە رەوشی عێراق بە گشتی و ئەولەویاتە کوردستانییەکان.

لەکۆتاییدا نوێنەرانی پارت و قەوارە کوردستانییەکان بڕیاریاندا کۆبوونەوەکانیان لە رۆژانی داهاتووشدا بەردەوامییان هەبێ بۆ ئەوەی بەرنامەی دانوستان و پەیڕەوی ناوخۆ و پێکهاتەی شاندی دانوستانکار بەتەواوی گەڵاڵە ببێ و داڕشتەی کۆتایی بۆ بکرێ.

## نص بنود الورقة الكردية التي وافق عليها نوري المالكي لكي يكون رئيسا للوزراء

حصلت وكالة انباء براثا على نص بنود الورقة الكوردية والتي وافق عليها نوري المالكي من اجل ان يكون رئيسا للوزراء . وكان المالكي قد فاجأ حتى أعضاء حزبه (الدعوة) بقبوله ١٨ بنداً وردت في ورقة العمل الكردية المكونة من ١٩ بنداً من ضمنها قبوله الاعتراف بالاستثمارات النفطية التي جرت في إقليم كردستان وإعطاء الإقليم حق الاستكشاف والتصدير». وانه «وافق أيضاً على إعطاء حصة ثابتة من الموازنة الاتحادية الى إقليم كردستان»، كما اعطى «المالكي الضمانات الكافية للأكراد لتنفيذ المادة ١٤٠ من الدستور لحسم موضوع محافظة كركوك والمناطق الأخرى المتنازع عليها في محافظات نينوى وصلاح الدين وديالى». الا أن «النقطة الخلافية الوحيدة هي مطلب الأكراد اعتبار الحكومة مقالة عند انسحاب وزرائهم منها، وهذه هي النقطة التي اعترض عليها المالكي وطلب من الوفد الكردي المفاوض برئاسة القيادي في الحزب الديموقراطي الكردستاني روز نوري شاويس حذفها أو تعديلها». **وفيما يلي نص البنود :**

١-الالتزام بالدستور وبنوده كافة وبدون انتقائية وحماية النظام الديمقراطي الاتحادي.

٢-تشكيل حكومة شراكة وطنية تمثل المكونات العراقية الاساسية.

٣- مبدأ الشراكة والمشاركة في القرار وذلك من خلال :

أ- تشكيل مجلس امن وطني من خلال تشريع يتم اقراره بالتزامن مع تشكيل الحكومة.

ب- تبني نظام داخلي لمجلس الوزراء يثبت مرجعية المجلس والقرار الجماعي وتوزيع الصلاحيات الادارية والمالية بين رئيس الوزراء ونوابه.

ج- مراعاة مبدأ التوافق.

٤- تشكيل المجلس الاتحادي خلال السنة التقويمية الاولى من عمل مجلس النواب ولحين تشكيله يتمتع رئيس الجمهورية ونائبيه بحق النقض.

٥- تعديل قانون الانتخابات بما يحقق التمثيل العادل للعراقيين.

٦- اجراء التعداد السكاني في موعده.

٧- اعادة النظر بهيكليات القوات المسلحة وقوى الامن الداخلي واقرار مبدأ التوازن وتنفيذه.

٨- تطبيق مبدأ التوازن في كل مؤسسات الدولة من وزارات وهيئات مستقلة..الخ.

٩- تطبيق المادة ١٤٠ من الدستور وتوفير الميزانية المطلوبة لتنفيذه خلال سقف زمني لا يتجاوز السنتين.

١٠-المصادقة على مشروع قانون الموارد المائية خلال السنة التقومية الاولى من عمل مجلس النواب (حسب اخر مسودة متفق عليها ).

١١-المصادقة على مشروع قانون النفط والغاز خلال السنة التقويمية الاولى من عمل مجلس النواب (حسب اخر مسودة متفق عليها) . وقبوله الاعتراف بالاستثمارات النفطية التي جرت في إقليم كردستان وإعطاء الإقليم حق الاستكشاف والتصدير».

١٢- تمويل وتجهيز وتسليح حرس الاقليم (البيشمركة) كجزء من منظومة الدفاع الوطني العراقية.

١٣- تأييد مرشح ائتلاف الكتل الكردستانية لرئاسة الجمهورية.

١٤- تعويض ضحايا النظام السابق وبضمنهم ضحايا الانفال والحرب الكيماوية في حلبجة والمناطق الاخري تعويضا سريعا وعادلا.

١٥- التمثيل الكردستاني في الوزارات السيادية ومجلس الوزراء والهيئات المستقلة وكافة مؤسسات الدولة بصورة عادلة ووفق الاستحقاق القومي.

١٦- ان يكون للجانب الكردستاني حق البت في مرشحي الوزارات السيادية والوزارات الاخرى ذات الصلة باقليم كردستان.

١٧-ان يكون الامين العام لمجلس الوزراء مرشحا من ائتلاف الكتل الكردستانية.

١٨- تعد الحكومة الائتلافية مستقيلة حال انسحاب الطرف الكردستاني بسبب خرق دستوري واضح او عدم تنفيذ البرامج المتفق عليها.

١٩- تلتزم كتلة رئيس الوزراء في البرلمان وفي مجلس الوزراء بمساندة المشاريع الانفة الذكر

# کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ شاندی دانوستانکاری ئیئتیلافی فراکسیۆنە کوردستانییەکان

ئەمڕۆ شەممە ٢٠١٠/١١/٢٧ بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین بە ئامادەبوونی سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان و سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران و نێچیرڤان بارزانی و کۆسرەت رەسول عەلی و سکرتێرو ئەمینداروو نوێنەرانی هێزو لایەنە سیاسییەکانی کوردستان لەگەڵ شاندی دانوستانکاری ئیئتیلافی فراکسیۆنە کوردستانییەکان کۆبووەوە.

لە سەرەتای کۆبوونەوەکەدا ، سەرۆك بارزانی وێرای بەخێرهێنانی ئامادەبووان رایگەیاند کە مەبەست لە ئەنجامدانی ئەو کۆبوونەوەیە بۆ ئەوەیە کە باس لە قۆناخی داهاتوو بکەین ، ئەو گرێکوێرەی کە لە سەر دەستی کورد کرایەوە و سەرکەوتنێکی گەورە بوو بۆ عیراق و گەلی کوردستان و سەرکەوتنەکەش پێگەی گەلی کوردستانی لە عیراقی نوێدا دەرخست بە پێچەوانەی ئەوانەی کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە گوایە سەنگ و پێگەی کورد لاواز بووە .

سەبارەت بە دەستکەوتەکان و بەرکەوتی هەر لایەنێکی ناو ئیئتیلافی فراکسیۆنە کوردستانییەکانیش ، سەرۆك بارزانی تەئکیدی لەوەکردەوە کە هەر چۆن لە هەوڵەکان بەشداربوون دەبێ ئەوهاش لە دەستکەوتەکان بەشداربن و پۆستەکانیش بە شێوەیەکی عادیلانە بێنە دابەشکردن و هیوای خواست ئەو یەکریزییەی کە لە قۆناخی رابردوودا نوێنرا بەردەوامی هەبێت ، چونکە هێزو سەنگی کوردستان لەو یەکریزییەدایە.

پاشان بارودۆخی دانوستاندنەکانی ئەم دواییەی بەغدا و گفتوگۆ لەسەر میکانیزمی دابەشکردنی خالەکان لەسەر پۆستە سیادییەکان و وەزارەتەکان و سیناریۆکانی پێکهێنانی حکومەتی داهاتوو و هەڵوێستی ئیئتیلافی فراکسیۆنە کوردستانییەکان لە بارەی ئەو سیناریۆیانە تاوتوێکران و لەم بارەوە د.رۆژ نوری شاوەیس سەرۆکی شاندی دانوستانکاری

ئیئتیلافی فراکسیۆنە کوردستانییەکان هەڵوێستی هەر یەك لە قەوارەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق خستەڕوو سەبارەت بە چۆنیەتی دابەشکردنی پۆستە سیادییەکان و وەزارەتەکان و لەم رووەوە کۆبووەکان تەئکیدیان لەسەر دابەشکردنی ئەو پۆستانە بە شێوەیەکی عادیلانە و بە ڕەچاوکردنی ئەوەی کە کورد نەتەوەی دووەمە لە عیراقدا کردەوە ، ئەمە سەرەڕای تەئکیدکردن لەسەر وەرگرتنی ئەو دەستە سەربەخۆییانەی کە لە دەستووردا ناویان هاتووە کە هەندێکیان بە بەر کورد دەکەون.

هەر لە کۆبوونەوەکەدا پێشنیارکرا کە چۆن لە قۆناغی پێشوودا کارنامەیەکی کوردستانی هەبوو ، پێویستە بۆ قۆناغی داهاتووش کارنامەیەکی تر هەبێت و ئیئتیلافی کوردستانیش بە تایبەتی پاش دەستبەکاربوونی ئەنجومەنی نوێنەران و کارکردنی بەرەو پێکهێنانی لیژنەکانی ئەو ئەنجومەنە رۆڵی کارای خۆی لە چۆنیەتی دابەشکردنی ئەو لیژنانە ببینێت.

دەربارەی ئەنجومەنی نیشتمانی بۆ سیاسەتە ستراتیژییەکانیش ، کۆبوونەوەکە جەختی لەسەر بایەخی ئەو ئەنجومەنە کردەوە کە دەبێ ئەنجومەنێکی کاریگەر بێت و تیایدا شەراکەتی تیا بەرجەستە بکرێ.

هەر یەك لە ئامادەبووان بیرو بۆچوونی خۆی سەبارەت بە تەوەرەکانی کۆبوونەوەکە دەربڕی و هەر هەمووشیان تەئکیدیان لەوە کردەوە کە سەرکەوتنی دەستپێشخەرییەکەی سەرۆك بارزانی وای کردووە کە پێگەی کورد لە ئاستێکی باشدا بێت ، دەستپێشخەرییەکە توانی هەر سێ سەرۆکایەتیەکەی عیراق دەست نیشان بکات بۆیە پێویستە وەکو ئیئتیلافی فراکسیۆنە کوردستانییەکان بەردەوام بێت لەسەر دانوستانکردن لەگەڵ لیستەکانی دیکەدا و هەوڵیش بدات هەموو لایەنەکان بەشداری لە حکومەتی داهاتوودا بکات.

لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا ، سەرۆك بارزانی داوای لە شاندی دانوستانکاری کوردستان کرد کە لیژنەیەك لە ناوخۆیدا پێك بهێنێت بە مەبەستی دەستنیشانکردنی ئەو پۆستانەی کە بۆ گەلی کوردستان پێویستن و بەر لە پێکهێنانی حکومەتیش پێویستە هەموو رێککەوتنەکان بێنە ئیمزا کردن.

## پیرۆزبایی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە تێکڕای گەلی کوردستان بە بۆنەی بە جینۆساید ناساندنی دۆزی کوشتن و کۆچپێکردنی کوردانی فەیلی

بەناوی خوای گەورە ومیهرەبان

پیرۆزبایی لە کوردانی فەیلی وتێکڕای گەلی کوردستان دەکەم بە بۆنەی راگەیاندنی بڕیاری بە جینۆساید ناساندنی دۆزی کوشتن وکۆچپێکردنی کوردانی فەیلی لەلایەن دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق، ئێمە پێشوازی لەو بڕیارە دەکەین کە تەواوکەری بڕیاری دیکەی ئەو دادگایەیە سەبارەت بە هەردوو دۆزی ئەنفال و هەڵەبجە.

ئەمە بۆنەیەکە بڕوای دادپەروەریێتی کێشەکەی خۆمان لەلا پتەوتر دەکات وهاوکات گەورەیی قەبارەی ئەو جەور وستەمەش دێنێتەوە یاد کە بەسەر ئێمەی کورد هاتووە، بۆیە داوا لە سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەکانی عێراقی فیدراڵ وهەرێمی کوردستان دەکەین هەموو بەدواداچوونێك بکەن بۆ بەمافگەیاندنی کوردانی فەیلی لە هەموو روویێکەوە و گشت ئامرازێکیش دەستەبەر بکەن لە پێناو قەرەبووکردنەوەیان وگەڕاندنەوەی ئەو مافانەی رژێمی لەناوچوو لێیانی زەوت کردبوو.

مسعود بارزانی

سەرۆکی هەرێمی کوردستان

٢٠١٠/١٢/٢

# دەقی ڕێککەوتننامەی هەولێر

دوای هەڵبژاردنی ٢٠١٠/٣/٧ ی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عێراق، هێزو لایەنەبراوەکان نەگەیشتنە هیچ ڕێککەونێك و نەتواندرا حکوومەتی عێراقی فیدراڵ پێبهێندرێ، ناکۆکییەکان بەجۆرێك قووڵبوونەوە، کە مەترسی هەڵگیرسانەوەی شەڕی تایەفی لێدەکرایەوە، دوای ئەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دەستپێشخەرییەکی بۆ چارەسەری دۆخی چەقبەستووی عێراق کرد، هەموو لایەنەکان بانگەوازی سەرۆك بارزانییان قبووڵ کرد، ئەوەبوو دوای ٨ مانگ لە هەڵبژاردن، ڕۆژی ٢٠١٠/١١/٨ تەواوی لیستە براوەکانی هەڵبژاردنی پەرلەمانی عێراق لە هەولێر کۆبوونەوە، هەموو لایەنەکان لەسەر خاڵەکانی ڕێککەوتنەکە ڕێککەوتن و کە لەسەر بنەمای تەوافوق دەسەڵاتەکانی عێراق دابەش کران، جارێکی دی هەرسێ پێکهاتە سەرەکییەکی عێراق (کورد و عەرەبی شیعەو عەرەبی سوننە) بە ڕێککەوتن دەسەڵاتە سیادییەکانیان بەسەردا دابەش کرا، بەڵام دوای ئەوەی حکوومەتی عێراق پێکهێندراو نوری مالیکی بووە سەرۆکی حکوومەت، جارێکی پێکهاتەی کوردو عەرەبی سوننە پەراوێزخران و تاکڕەوی لە بەڕێوەبردنی عێراقدا کراو پشت لەو ڕێککەوتننامەیە کراو دەستوور پێشێ کرا. ئەمەش دەقی خاڵەکانی ئەم ڕێککەوتنە کە لە ماڵپەڕی مەدا وەرگیراوە.

**نص اتفاقية اربيل** تنفرد المدى بنشر نص اتفاقية أربيل كاملة ، مع الاتفاقيات الفرعية بين التحالف الكردستاني و ائتلاف دولة القانون وبين ائتلاف العراقية و التحالف الكردستاني. وان المدى و كما وعدت قرّاءها واستجابة للمطالب التي صدرت عن المرجعية الدينية في النجف الاشرف و المطالب الشعبية، تفي بوعدها برغم التأخير وكان سبب التأخير الذي حصل ، ان المدى بذلت جهوداً كبيرة من أجل الكشف عن كل الاتفاقية وملاحقها والاتفاقات الجانبية بين الكتل السياسية. ونود أن ننوه أن ما نشرته بعض الصحف والمواقع الالكترونية لم يكن سوى جزء من الخطوط العامة للاتفاقية.

**محضر اجتماع لجنة متابعة تنفيذ اتفاقات**

**مبادرة السيد مسعود بارزاني**

اجتمعت اللجنة العليا لمتابعة وتنفيذ مبادرة السيد مسعود بارزاني في الساعة السابعة من مساء يوم الثلاثاء الموافق ٢٠١١/٢/٨ بحضور كل من السيد حسن السنيد ود. سلمان الجميلي والسيد روز شاويس في مقر إقامة السيد روز نوري شاويس وتوصلت إلى النتائج التالية:

١- المجلس الوطني للسياسات العليا:

تم الاتفاق على المسودة المرفقة باستثناء الفقرة المتعلقة بالتصويت على رئيس المجلس، حيث يرى التحالف الوطني بان التصويت على الرئيس ينبغي ان يكون في المجلس، أما رأي العراقية والكردستاني هو ان ينتخب المجلس الوطني أو يرشح رئيس الجمهورية اسم رئيس المجلس الوطني ويصادق عليه في مجلس النواب.

٢- النظام الداخلي لمجلس الوزراء:

تم الاتفاق على عرض المسودة المعدة من قبل مجلس الوزراء السابق مع الآراء والتعديلات المرفقة معها على مجلس الوزراء من أجل تشكيل لجنة من الوزراء المتحالفين لإقرار المسودة النهائية داخل مجلس الوزراء ويكلف السيد رئيس الوزراء ونائبه روز نوري شاويس والدكتور رافع العيساوي بمتابعة هذا الملف مع مجلس الوزراء.

٣- إصلاح عمل مجلس النواب (السلطة التشريعية

تم الاتفاق على إحالة هذا الملف الى كل من مجلس النواب ومجلس الوزراء من أجل تنفيذ المحاور المتفق عليها الواردة في الملف كل حسب اختصاصه.

٤- إصلاح عمل السلطة التنفيذية:

تحال الورقة المعدة من قبل لجنة التفاوض الى الحكومة لتنفيذ الالتزامات المتفق عليها ويتابع من قبل اللجنة العليا.

٥- المساءلة والعدالة:

أ -تم تنفيذ بعض بنود الورقة ومنها رفع الحظر عن د. صالح المطلك ود. ظافر العاني وكذلك تم تجميد عمل الهيئة من قبل الحكومة ما عدا الاعمال الروتينية.

ب- فيما يخص تشكيل هيئة المساءلة والعدالة وفق القانون الحالي للمساءلة والعدالة تم إحالة هذا الأمر الى الحكومة لغرض تشكيل الهيئة وإرسال المرشحين الى مجلس النواب لغرض التصويت عليهم بأسرع وقت، ويتابع الأمر من قبل د. صالح المطلك.

ت- فيما يخص موضوع إعادة النظر بقانون المساءلة والعدالة تكليف لجنة المساءلة والعدالة في مجلس النواب لمتابعة الأمر.

٦- ورقة الإصلاح القضائي:

يتابع تنفيذ الورقة من قبل اللجنة العليا مع رئيس مجلس القضاء الأعلى ويعقد اجتماع بينهما خلال الأيام القادمة.

٧- التوازن الوطني:

أ -الاتفاق على إعداد مسودة قانون هيئة التوازن التي قدمت من قبل لجنة الأقاليم في الدورة البرلمانية السابقة وفق المادة ١٠٥ من الدستور والاتفاق السياسي لمبادرة السيد مسعود بارزاني ويكلف رئيس مجلس النواب ونائباه بمتابعة تحقيق ذلك.

ب- تستمر لجنة التوازن السابقة المؤلفة من قبل السيد هوشيار زيباري والسيد هادي العامري والدكتور رافع العيساوي بمتابعة عملها في ترشيح الوكلاء والسفراء والدرجات الخاصة أو تشكل لجنة جديدة متفق عليها من قبل الحكومة.

ت- التوصية الى مجلس الوزراء بتحقيق التوازن الدستوري عند ترشيح القادة العسكريين.

ث -فيما يخص تعيين المدراء العامين: ضمن مبادرة السيد مسعود بارزاني اتفقت الكتل على تحقيق التوازن الدستوري من درجة مدير عام فما فوق على مستوى دواوين الوزارات الاتحادية.

جـ- تتم متابعة تنفيذ ورقة التوازن من قبل اللجنة العليا.

٨- الملف الأمني:
تحال الورقة الى الحكومة والى لجنة الأمن والدفاع لتنفيذ ما متفق عليه ويتابع الأمر من قبل اللجنة العليا.
٩- ورقة المسائل العالقة مع إقليم كردستان:
تحال الورقة الى الحكومة لتنفيذ ما متفق عليه.
١٠- تستمر اللجنة بمتابعة الملفات اعلاه وما تؤول إليه.
تحدد النقاط غير المتفق عليها وتناقش في جلسة خاصة للجنة العليا من أجل التوصل الى حلها، وفي حالة عدم حسم أي موضوع من المواضيع المتبقية تحال الى اجتماع القادة.

الدكتور/ سلمان الجميلي
السيد/ حسن السنيد
السيد/ روز نوري شاويس

**النقاط المتفق عليها ضمن مبادرة السيد مسعود بارزاني**

المحور الأول / الجانب الإداري والمالي:
١- امتياز الأعضاء: إعادة النظر بالقوانين الصادرة الخاصة بامتيازات الأعضاء واستبدالهم (الحقوق، الرواتب، الحمايات، التقاعد، الصلاحيات المالية والإدارية.(
٢- إصلاح الدائرة البرلمانية: وتقوية كادرها كي تقوم بمسؤولياتها في تهيئة القوانين للتشريع ومتابعة قوانين اللجان المختلفة ضمن سقف زمني محدد وعدم إهمال القوانين المقدمة على شكل مشروع أو مقترح قانون من والى المجلس.
المحور الثاني/ التشريعات والقوانين:
١- إعادة تشكيل لجنة التعديلات الدستورية: بما يكفل مشاركة حقيقية لجميع الكتل الفائزة في هذه اللجنة وإنجاز التعديلات المتفق عليها.
٢- السقف الزمني للتشريعات: وضع سقف زمني لتشريع جميع القوانين التي أوجز الدستور تشريعها لكنها لم تشرع وان يتم ذلك بالتنسيق بين الدائرة البرلمانية واللجنة القانونية واللجان

البرلمانية المختصة من جهة ورئاسة المجلس والكتل السياسية من جهة أخرى وحسب الأسبقية والأولوية التالية:

-قانون المحكمة الاتحادية

-قانون النفط والغاز

-قانون المصالحة الوطنية

-قانون تنظيم الأجهزة الأمنية

-قانون الأحزاب

-قانون مجلس الاتحاد

-قانون الانتخابات

-قانون مفوضية الانتخابات

-قانون شبكة الإعلام

-قانون هيئة النزاهة

-قانون المفتشين العامين

-قانون ديوان الرقابة المالية

-قانون هيئة التوازن

-قانون الإيرادات الاتحادية

-قانون العمل الصحفي وحماية الصحفيين

٣- تشكيل اللجان البرلمانية الدائمة: وتوزيع رئاستها ونيابتها والمقررين وفق الاستحقاق الانتخابي والتوازن الدستوري.

المحور الثالث / الدور الرقابي:

١- تفعيل ارتباط الهيئات المستقلة بمجلس النواب: وفقاً للدستور (هيئة النزاهة، ديوان الرقابة المالية، شبكة الإعلام، هيئة الاتصالات والإعلام (وطبقاً لقرار المحكمة الاتحادية.

٢- إنهاء ومعالجة قضية المسؤولية أو المنصب الرسمي بالوكالة (وزير وكالة، رئيس هيئة، ووكيل وزارة.. الخ) خلال ثلاثة أشهر من بداية عمل مجلس النواب مع ضمان التوازن الدستوري.

٣- تفعيل دور أجهزة الإعلام المختلفة باعتبارها سلطة رابعة وتشريع قانون العمل الصحفي وقانون حماية الصحفيين.

٤- وضع آلية واضحة متفق عليها لاستدعاء واستجواب أعضاء السلطة التنفيذية وعدم ترك ذلك لتفسير هيئة الرئاسة.

**النقاگ المتفق عليها چمن مبادره السيد مسعود بارزانی**

١- قانون الأجهزة الأمنية وصلاحياتها:

إقرار قانون الأجهزة الأمنية الذي يحدد الأجهزة الأمنية العاملة ومهام صلاحية كل جهاز لتحقيق حالة التكامل وتجنب التقاطعات في اختصاصات الأجهزة الأمنية.

٢- ضرورة تأهيل الأجهزة الأمنية بما يحقق أعلى درجات المهنية.

٣- إخضاع الأجهزة الأمنية للمساءلة في مجلس النواب (وفقاً للسياقات الدستورية) سن القوانين اللازمة لفرض أشد العقوبات القانونية بالجهات التي يثبت انها تتخابر لصالح جهات أجنبية.

٤- التحقيق مع جميع القيادات والعناصر الأمنية التي ترد شكاوى ضدها بارتكاب خروقات لحقوق الإنسان وعدم منح الحصانة لأي منها ولأي مبرر كان.

٥- تفعيل دور مجالس المحافظات وفق الدستور وقانون مجالس أجهزة المحافظات بما يضمن تنفيذ قرارات تلك المجالس المتعلقة بالملف الأمني.

٦- إنشاء مراكز بحثية للاستفادة من المتقاعدين.

٧- ضبط وتعزيز الحدود بالأجهزة الحديثة بما يضمن السيطرة على الحدود.

٨- التشدد مع المتسللين عبر الحدود بصورة غير شرعية.

٩- تشكيل جهاز خاص بالطوارئ لمتابعة حالات الكوارث الوطنية وتقديم الحلول والمعالجات السريعة اللازمة للمناطق المتضررة.

١٠- تعزيز دور وصلاحيات جهاز المخابرات الوطني وبناء كوادره بما يلزم متطلبات الأمن الوطني للعراق ومكافحة التجسس ومتابعة النشاط الاستخباري الأمني على الأراضي العراقية وسن القوانين الفعالة بهذا الشأن.

**النقاگ المتفق عليها چمن مبادره السيد مسعود بارزانی**

١- عدم جواز الجمع بين رئاسة مجلس القضاء الأعلى ورئاسة المحكمة الاتحادية أو محكمة التمييز.

٢- الإسراع بإقرار قانون المحكمة الاتحادية والاتفاق على تسمية أعضائها.

٣- الإسراع بتشكيل قانون السلطة القضائية وفق الدستور وتفعيل وتطوير عمل جهاز الادعاء العام.

٤- الإسراع بإقرار قانون مجلس القضاء الأعلى.

٥- حظر عمل القضاة خارج تشكيلات مجلس القضاء الأعلى.

٦- مراجعة قانون الإرهاب.

**النقاگ المتفق عليها چمن مبادره السيد مسعود بارزانی**

١- تحقيق التوازن الوطني في:

أ- وكلاء الوزارات.

ب- السفراء.

ت- رؤساء الهيئات والمفوضية المستقلة.

ث- في الوزارات الأحادية والمؤسسات العسكرية والأمنية من درجة مدير عام فما فوق أو ما يقابله (قيادات الفرق بديوان الوزارات.. الخ

٢- يقر قانون هيئة التوازن في فترة لا تتجاوز الستة أشهر منذ بدء لجان البرلمان أعمالها وتؤسس الهيئة مباشرة بعد نفاذ القانون بتوافق الكتل.

٣- تعتمد الهيئة التوازن الدستوري وتضمن حقوق جميع الأقاليم والمحافظات في جميع مؤسسات الدولة بما في ذلك المؤسسات الأمنية والعسكرية ولجميع المستويات.

٤- تفعيل دور مجالس الوزارات والهيئات المستقلة ومنح صلاحيات مناسبة لوكلاء الوزارات ومعاوني رؤساء الهيئات المستقلة لتحقيق المشاركة.

٥- تفعيل الدستور والقوانين ذات العلاقة بالتعيين والتوظيف والإسراع في تأسيس مجلس الخدمة الاتحادي) الذي نصت عليه المادة (١٠٧) من الدستور وأقره مجلس النواب السابق في فصله الأخير.

**النقاط المتفق عليها ضمن مبادرة السيد مسعود بارزاني**

١- اعتماد مبدأ الكفاءة والمهنية وتحقيق التوازن الدستوري في الوظائف العامة طبقاً لقانون مجلس الخدمة العامة.

٢- إعادة التوازن الدستوري الناتج عن تعيينات الفترة الماضية وضمان تمثيل المحافظات دستورياً (غير متفق عليها).

٣- ضمان المشاركة الحقيقية للأطراف المؤتلفة في الحكومة في صناعة القرار (السياسي، الأمني، الاقتصادي.

٤- إقرار نظام داخلي متفق عليه ينظم عمل مجلس الوزراء ويحدد السياقات والصلاحيات للمجلس ولأعضائه.

٥- تنظيم المؤسسات الأمنية غير المنصوص عليها في الدستور في الوزارات الأمنية كل حسب اختصاصه وحسبما تسمح الظروف الأمنية بذلك وبالتدرج.

٦- ترتبط المبادرة التعليمية والزراعية بالوزارات المختصة ولا تتخذ أي مبادرة مستقبلاً إلا بقرار مجلس الوزراء.

٧- تفعيل الدور الإشرافي لمجلس الوزراء على الأداء الوزاري.

٨- تفعيل معالجة ظاهرة الفساد الإداري والمالي.

٩- الالتزام بوحدة الخطاب الحكومي الرسمي.

١٠- منع الجمع بين المناصب التشريعية والتنفيذية.

١١- منع التدخل المباشر بأعمال الوزارات عبر الوكلاء والمستشارين والمدراء العامين لصالح أي جهة حزبية والتعامل مع الوزير بصيغة الرئيس الأعلى لوزارته.

١٢- يلتزم رئيس مجلس الوزراء والوزراء كافة بقرارات مجلس الوزراء والقوانين النافذة

باعتبارهم يمثلون الدولة في وزاراتهم وليس ممثلين لمكوناتهم او كتلهم السياسية ومن يخالف تتخذ الخطوات اللازمة لإقالته.

١٣- يكون المفتش العام في الوزارة من غير كتلة الوزير.

**النقاط المتفق عليها ضمن مبادرة السيد مسعود بارزاني**

١- في القضايا المصيرية مثل (الحرب والسلم، الاتفاقات الإستراتيجية، التعديلات الدستورية) يكون بالتوافق ١٠٠%.

٢- في القضايا الإستراتيجية والمهمة يكون التصويت بنسبة أكثرية النصف زائدا واحد.

٣- في القضايا الإجرائية اليومية يكون التصويت (نصف زائد واحد.

النقاط المتفق عليها ضمن مبادرة السيد مسعود بارزاني

١- تجميد قرارات الهيئة الحالية ماعدا تمشية الأمور الروتينية.

٢- تشكيل هيئة المساءلة والعدالة وفقاً للقانون.

٣- إعادة النظر بقانون المساءلة والعدالة من خلال إجراء التعديلات ويتم الاتفاق عليها لغرض عدم استخدام القانون بمعايير مزدوجة أو لأغراض سياسية ويتم التعامل مع الملف وفق القانون.

١- يعلن في مجلس النواب عن اتفاق الكتل على تشكيل المجلس الوطني للسياسات العليا وسيشرع مجلس النواب قانوناً بذلك.

٢- يعلن عن العمل على استثناء السادة: (راسم العوادي، صالح المطلك، ظافر العاني) من اجتثاث البعث وذلك بعد استكمال السياقات القانونية الضرورية.

٣- يصرح السيد مسعود بارزاني بان للمجلس الوطني للسياسات العليا بحث قضايا المصالحة الوطنية واتخاذ قرارات بشأنها ضمن سياقات المجلس المتفق عليها.

**مسعود بارزاني        إياد علاوي        نوري المالكي**

**بغداد**

**١١/١١/٢٠١٠**

بسم الله الرحمن الرحيم

أربيل

اتفاق أولي　　　　الأحد ٨/٨/٢٠١٠

انسجاماً مع المصلحة الوطنية العليا ومن أجل الإسراع في تشكيل الحكومة يلتزم الطرفان بما يلي :

١- الالتزام بالدستور وتنفيذه .

٢- اعتماد خارطة طريق لتشكيل الحكومة الجديدة كما يلي :

أ- السيد جلال طالباني رئيساً للجمهورية

ب- السيد نوري المالكي رئيساً للوزراء

ج- يكون منصب رئيس مجلس النواب العراقية ورئيس المجلس الوطني للسياسات الاستراتيجية للدكتور اياد علاوي

٣- يعمل الطرفان بجدية من أجل مشاركة كافة الكتل السياسية في الحكومة الجديدة .

٤- تكون وزارة الدفاع والداخلية والأمن الوطني والمخابرات بعهدة كفاءات مستقلة يتوافق ~~الجميع~~ ~~عليها~~ الطرفان بشأنها أولاً ثم الأطراف

٥- تشكيل لجنة عليا من دولة القانون (حزب الدعوة الإسلامية) والحزب الديمقراطي الكردستاني) برئاسة السيدين المالكي والبارزاني وثلاثة من كل طرف ... مهمتها الاتفاق على جميع القضايا الاستراتيجية

واتخاذ مواقف موحدة حيال كل القضايا العالقة بين الحكومة
الاتحادية والإقليم، ولا يجوز أن يتخذ أي طرف موقف
استراتيجي إلا بموافقتها

٦- اجراء الاصلاحات الإدارية الضرورية واتخاذ موقف موحد
حيالها (المجلس الوطني للسياسات الاستراتيجية، نظام مجلس
الوزراء، تعديل قانون الانتخابات ..... الخ.

٧- حل المشاكل العالقة مع الإقليم:
المادة ١٤٠، تسليح وتجهيز وتمويل حرس الإقليم،
قانون النفط والموارد المالية... الخ

نوري المالكي
حزب الدعوة الإسلامية
٢٠١٠/٨/١٨

مسعود بارزاني
الحزب الديمقراطي الكوردستاني
٢٠١٠/٨/١٨

# سەرۆك بارزانی خۆشحاڵی خۆی بۆ بڕیاری ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقی فیدراڵ دەربری

بە ناوی خوای مەزن و دلۆڤان

ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقی فیدراڵ لە کۆبوونەوەی ئەمڕۆی خۆیدا و لە سەر پێشنیاری هەموو لیستە کوردستانیەکان ، بە تێکرای دەنگ بڕیاریدا ئەو کارەساتەی کە ڕۆژی ١٩٨٨/٣/١٦ بەسەر خەڵکی شاری هەڵەبجە هات جینۆسایدە.

ئێمە وێرای خۆشحاڵی دەربڕین بە دەرچوونی ئەو بڕیارە ، سوپاسی هەموو کوتلەکانی ناو ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراقی فیدراڵ دەکەم و دەستخۆشیش لە هەموو لیستە کوردستانییەکان دەکەم کە پێکەوە پرۆژە بڕیارەکەیان پێشکەش بە ئەنجومەنی ناوبراو کردبوو ، هیواخوازم کە زۆر بە وردی ئەو بڕیارە بێتە دیراسەکردن و ئەگەر و چۆنیەتی قەرەبووکردنەوەی قوربانیانی کارەساتەکە دیاری بکرێن بە مەبەستی کەمکردنەوەی ئێش و ئازاریان.

مسعود بارزانی

٢٠١١/٣/١٧

## سەرۆکی هەرێمی کوردستان

## خۆشحاڵیی خۆی بە بڕیاری دادگەی باڵای تاوانەکان لە عیراق دەربڕی

بە ناوی خوای مەزن و دلۆڤان

دوێنێ لە دانیشتنی ژمارە ٤٠ ، دادگەی باڵای تاوانەکان لە عیراق ، کەیسی ئەنفال وکۆمەڵکوژی بارزانییەکانی بە جینۆساید و تاوان دژی مرۆڤایەتی ناساند.

ئێمە وێرای خۆشحاڵی دەربڕین بە دەرچوونی ئەو بڕیارە کە تەواوکەری بڕیاری دیکەی ئەو دادگایەیە ، سوپاسی هەموو ئەو بەرێزانە دەکەین کە لەو کەیسەدا کاریان کردووە و دەرچوونی ئەو بڕیارەش بڕوای دادپەروەرێتی کێشەکەی خۆمان لەلا پتەوتر دەکات و هاوکات گەورەیی قەبارەی ئەو ستەمەش دێنێتەوە یاد کە بەسەر گەلەکەماندا هاتووە کە ئەمەیش ئەو باوەڕەمان لەلا دەچەسپێنێت کە ئایندە هەمیشە بۆ خەڵکی ستەملێکراوە و روو رەشیش هەر بۆ ستەمکارانە.

بەم بۆنەیەوە داوا لە سەرجەم لایەنە پەیوەندیدارەکانی عیراقی فیدراڵ و هەرێمی کوردستان دەکەین هەموو بە دواداچوونێك بکەن بۆ بە مافگەیاندنی کەسوکاری قوربانیان و بۆ ئەمەیش گشت ئامرازەکان دەستەبەر بکەن لە پێناو قەرەبوو کردنەوەیان و کەمکردنەوە لە ئێش و ئازاریان.

مسعود بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
٢٠١١/٥/٤

| جمهورية العراق<br>وزارة الداخلية<br>وكالة الوزارة لشؤون الشرطة<br>العلاقات والاعلام |  | Republic of Iraq<br>Ministry of Interior<br>Ministry agency for<br>Police affairs |
|---|---|---|

العدد ٢٦٧١٤

التاريخ ٢٢/ ٥ /٢٠١١

No:
Date: / /

دولة السيد رئيس الوزراء / وزير الداخلية وكالة المحترم
تحية وتقدير..

**م/ حادث ارهابي**

**نود ان نعرض لدولتكم مايلي:-**

١. بتاريخ ٢٠١١/٥/١٩ تعرضت محافظة كركوك الى حادث ارهابي جبان نتج عنه انفجار سيارتين مفخختين احداها متوقفة داخل كراج لوقوف السيارات بالقرب من المديرية العامة لشرطة محافظة كركوك، وأدى هذا الحادث الغادر عن استشهاد واصابة عدد من ضباط ومنتسبي المديرية اعلاه المبينة اسمائهم في القائمة المرفقة طياً ، واكراماً لشهداء وجرحى هذا الحادث نقترح تكريم الشهداء مبلغ مليون دينار عراقي والجرحى مبلغ (٥٠٠) الف دينار.

٢. كما نود العرض بأن عدد من عناصر اسايش اقليم كردستان قد استشهد وأصيب في هذا الحادث الغادر والمبية اسمائهم في القوائم المرفقة طياً نرجو التفضل بالنظر بتكريمهم وفق ماترونه مناسباً وفق الصلاحيات الممنوحة لدولتكم الكريمة .

ولدولتكم سداد الامر وصواب القرار... مع التقدير:

**المرفقات**

قائمة بأسماء الشهداء/ ٢

قائمة بأسماء الجرحى/ ٢

الفريق الدكتور
أيدن/ خالد قادر
وكيل الوزارة لشؤون الشرطة
٢٠١١/٥/٢٢

موافق على الفقرة (١)
٥/٢٢

م.. مدحت للتالي ... توقيعه

# پەیامێك لە سەرۆكی هەرێمی كوردستانەوە بۆ خەڵكی خۆشەویستی كەركووك

بە ناوی خوای مەزن و دلۆڤان

خوشك و برایانی بەرێز

زۆر باش لە ئێش و ئازارەكانی ئێوەی خۆشەویست تێدەگەین چ لە ڕووی كارەباوە بێت یان خزمەتگوزارییەوە و ئەو ماوەیەش هەمیشە پێداگیریمان لەسەر گەیاندنی كارەبای هەرێم بۆ كەركووك كردووە و داوامان لە حكومەتی هەرێم كردووە كە بە زووترین كات برێكی كارەبای هەرێم بداتە كەركووك و ناوچە دابڕێندراوەكانی دیكە بۆ ئەوەی كەمێك لەو ئێش ئازارەی ئێوە كەم بكەینەوە تا ئەو كاتەی بە پێی ماددەی ١٤٠ی دەستوور ئەو شوێنانە هەر هەموویان دەگەڕێنەوە سەر هەرێمی كوردستان.

لە هەفتەی رابردوودا و لە كۆبوونەیەكماندا لەگەڵ سەرۆك و جێگری سەرۆكی حكومەت و وەزیری كارەبای هەرێم بڕیارماندا كە وەك سەرەتا ١٠٠ مێگاوات لە كارەبای هەرێم بدرێتە پارێزگای خۆشەویستی كەركووك و ئەم بڕیارەش چووە بواری جێبەجێكردنەوە و لە سەرەتای مانگی داهاتووشدا ئەو بڕە كارەبایە دەبێ بە ٢٠٠ مێگاوات كە بەمەیش تا رادەیەكی باش پێویستی كەركووك لە كارەبا دابین دەكرێ.

ئێمە سوورین لە سەر بایەخدانی هەرێم بە پارێزگای خۆشەویستی کەرکووك و بەهانا هاتنی هاونیشتیمانیانی بە تایبەتی لەو وەرزە گەرمەدا و بە دڵنیاییەوەش دەڵێم رەنگدانەوەی پرۆسەی چاکسازی زۆر بە جوانی لە پرسی کارەبای کوردستاندا بەدیارکەوتووە و ئێستا بڕی کارەبا لە هەرێم لە سەرووی ٢٠ سەعاتە کە ئەم کارەش بە هەموو شێوەیەك جێگەی دەستخۆشیکردنە لە حکومەت بە تایبەتی وەزارەتی کارەبا و بەردەوامیش دەبین لە زیاتر کردنی خزمەتگوزاری دیکەی پێویست بە کەرکووك و هەموو ناوچە دابڕێندراوەکانی دیکە.

مسعود بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
٢٠١١/٦/٢٧

# سەرۆكی هەرێمی كوردستان وەڵامی لێدوانێكی نوری مالیكی سەرۆك وەزیرانی عێراقی فیدرال دەداتەوە

بە ناوی خوای مەزن و دلۆڤان

رۆژی پێنج شەممەی رابردوو بەرێز نوری مالیكی سەرۆك وەزیرانی عیراق لە لێدوانێكیدا بۆ سەرۆك خێڵەكانی بەغدا هۆشداری دایە لایەنە سیاسییەكانی وڵات لە هەوڵدانیان بۆ پێكهێنانی هەرێمی تر و روونیكردەوە كە هەنگاوی لەو جۆرە دەبێتە هۆی جیابوونەوە و هەڵگیرسانی شەڕی ناوخۆ كە ئەمەیش بەرای ئەو یەكێتی خاكی عیراق دەخاتە مەترسییەوە.

من سەرم لەو لێدوانە سورماوە ، چونكە داواكاری لەم جۆرە شتێكی یاساییە و دەستووری هەمیشەییش ئەو مافەی سەلماندووە و هیچ مەترسییەك دروست ناكات ، بەڵكو بە پێچەوانەوە یەكریزی گەلی عیراق پتەوتر دەكات.

تەئكیدی دەكەمەوە كە پابەند نەبوون بە دەستوور ، عیراق بەرەو هەڵدێر دەبات نەك داوای بە هەرێمكردن.

مسعود بارزانی

سەرۆكی هەرێمی كوردستان

٢٠١١/٧/٩

# بەیاننامەی سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە تێپەڕاندنی رەشنووسی یاسای نەوت لە لایەن ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقەوە

پاش نەبوونی سیاسەتێکی فیدراڵی لە بارەی نەوتەوە بۆ ماوەی پتر لە شەش ساڵ و خۆدزینەوەیەکی بێ پاساو لەرووی جێبەجێکردنی رێککەوتننامە سیاسییەکان و خۆدزینەوەیەکی ئاشکرا بەرانبەر بە پەسەندکردنی یاسای فیدراڵی نەوت و پاش ئەوەی جەخت لەسەر بەردەوامبوونی تەوافوق و سازان کرایەوە پێش پێکهێنانی ئەم حکوومەتەی ئێستای عێراق وەك مەرجێکی سەرەکی بۆ بەشداریکردنی هاوپەیمانی کوردستانی لەو حکوومەتەدا، ئێستا لە ناکاو رەفتارێکی دیکەی ئەنجومەنی وەزیرانمان بۆ دەردەکەوێت کە بەبێ ئامادەبوونی ئەندامە پەیوەندیدارەکانی ئەنجومەن رەشنووسێکی زۆر جیاوازتری سەبارەت بە نەوت تێپەڕاند تەواو جیاواز لەوەی پێشتر رێککەوتنی لەسەر کرابوو.

ئەوەبوو شێوازی تێپەڕاندنی رەشنووسەکە لەلایەن وەزارەتی نەوتەوە بەو شێوەیە بوو کە داوای دانیشتنێکی بەپەلەی کرد بە رۆژێك بەر لە وادەی سازدانی و خستنە رووی بەڵگەنامەیەکی گرنگ کە لە پەنجا لاپەڕە تێدەپەڕێت لە ماوەی چەند خولەکێکدا، کە ئامادەبووان وایان دەزانی رەشنووسەکە پێشتر لەسەری رێککەوتوون، ئەویش بەمەستی غافڵگیرکردنی هەموو ئەندامانی ئەنجوومەنی وەزیران (ئامادەبووان و ئامادەنەبووان)و بە سووك سەیرکردنی رێککەوتننامە سیاسییەکان و نەهێشتنی متمانە بۆ سەپاندنی شێوازێکی ناوەندی کە بە هەناسەیەکی ستەمگەرانە داڕێژراوە بۆ سەپاندنی دکتاتۆریەتی بڕیاری ئابووری و خستنی جڵەوی گشتی بە ژێر دەستی هەندێك، بەڵکو ئەوە زۆر لەوەوە دوورە لە دەستووری فیدراڵی و هەڵسوکەوتی دیموکراسیدا هاتووە کە رۆڵ و مافەکانی هەرێمەکان و پارێزگەکانی

لەپاراستنی هاوسەنگی لەگەڵ رۆڵی حکوومـەتی فیدراڵیـدا پاراسـتووه، کـه لـه دەسـتووردا ئاماژەی پیٚ دراوه، ئەویش بۆ دابینکردنی ماف و یەکیەتی و دوارۆژی گەلی عیٚراق.

لەکاتیٚکدا سەرۆکایەتی هەریٚمی کوردستان ئیدانەی ئەم مانۆڕە دەکات، هاوکات داوا لـه ئەنجومەنی وەزیران دەکات دەستبەجیٚ رەشنووسی وەزارەتی نەوت بکیٚشیٚتەوه، ئەویش لەبـەر ئەوەی لەگەڵ ناوەرۆکی دەستوور و ریٚڕەوی یاسایی ناو ئەنجومەنی وەزیراندا ناگونجیٚت تـا ئـەو کاتەی پیٚداچوونەوەی بۆ دەکریٚت، داواش لە سەرۆکایەتی ئەنجومـەنی نویٚنـەران دەکـەین ئـەو رەشنووسەی لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانـەوە پیٚشـکەش کـراوە رەت بکاتـەوە و لـە ریٚـڕەوەی یاسادانانی ئیٚستای خۆیدا بەردەوام بیٚت، بە مەرجیٚك رەچـاوی هــەر هـەمـوارکردنیٚك بکریٚـت لەلایەن هەموو لایەنەکانەوە پیٚشکەش بکریٚت، بە تیٚبینییەکانی هاوپـەیمانی کوردستانیشـەوە لەسەر ئەم رەشنووسەی ئیٚستا لەلایەن لیژنەی نەوت و وزەوە بۆ یەکەمین خویٚندنەوە پیٚشکەش کراوە، چونکە هاوپەیمانی کوردسـتانی تیٚبینییـەکانی خـۆی لـە قۆنـاغی هەموارکردنەکانـدا پیٚشکەش دەکات کاتیٚك دەگاتە دووەمین خویٚندنەوە، ئەویش پیٚـی پابەنـدبوونمان بـە ریٚـڕەوی یاسایی و دەستووری و، پاراستنی بەرژەوەندی گشتی لەلایەن ئیٚمەوە.

گوتەبیٚژیٚك بە ناوی
سەرۆکایەتی هەریٚمی کوردستانەوە
٥ی ئەیلوولی ٢٠١١

# سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ نوێنەر و بەرپرسانی هەرێم و نوێنەر و بەرپرسە کوردەکان لە بەغدا کۆبووەوە و لە کۆتاییشدا بەلاغی کۆتایی کۆبوونەوەکە راگەیەنرا

١٤ / ٩ / ٢٠١١

ئەمڕۆ بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کۆبوونەوەیەکی فراوانی بە ئامادەبوونی سەرۆکایەتی و نوێنەرایەتی پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ بەرپرسان و نوێنەرانی کوتلە کوردستانییەکان لە بەغدا کە لە وەزیران و ئەندامانی پەرلەمان و بەرپرسانی دیکە پێکهاتبوو گرێدا .

**پاشان بەلاغی کۆتایی کۆبوونەوەکە راگەیەنرا کە ئەمە دەقەکەیەتی :**

لە سەر داوای بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان کۆبوونەوەیەکی فراوان بە ئامادەبوونی سەرۆکایەتی و نوێنەرایەتی پەرلەمان و حکوومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ بەرپرسان و نوێنەرانی کوتلە کوردستانییەکان لە بەغدا کە لە وەزیران و ئەندامانی پەرلەمان و بەرپرسانی دیکە پێکهاتبوو گرێدرا.

لە کۆبوونەوەکە پرسی گرنگی جیاجیا و ئەو کێشانەی کە رووبەرووی پرۆسەی سیاسی و دیموکراسی عێراقی لە ئێستادا دەبنەوە و رێگاچارەکان و سەرکەوتن بەسەریاندا باسیان لێوەکرا.

کۆبوونەوەکەش جەختی لەسەر پێویستی پابەندبوون بە هاوپەیمانیەتیەکان و رێککەوتنەکان کە حکوومەتی فیدراڵی لە بەغدا لەسەری پێکهاتووە کردەوە بە پشتبەستن بە

دەستپێشخەریی سەرۆك بارزانی ، سەرەڕای ئەوەی کۆبوونەوەکە تێبینی دواکـەوتنێکی زۆر لە جێبەجێکردنی بڕگە گرنگەکان دەکات لە ڕێککەوتنەکانی ئیمزا لەسەرکراو بە تایبـەتی ئەوەی پێوەستە بە بنەماکانی شەراکەتی نیشتیمانی و پرینسپی هاوسەنگی لەسەر بنەمای دەسـتوور و، ڕێککـەوتن لەسـەر پڕکردنـەوەی وەزارەتـە ئەمنیـەکان، هـەروەها نـەبوونی ئاراستەیەکی دروست بۆ چارەسەرکردنی کێشە هەڵواسراوەکان لەگەڵ هەرێمی کوردسـتان و کەمتەرخەمی تیایاندا، بـە جۆرێـك کێشـەی راسـتەقینە هـەن کـە ڕێگـری لـە پرۆسـەی شەراکەتی نیشتمانی و پرۆسەی دیموکراسی دەکەن.

هەر لە کۆبوونەوەکەدا باس لە مەترسیە راستەقینەکان کە گـەل و نیشـتمان دووچـاری دەبێتەوە لە ڕێگەی هێزە تیرۆریستییەکان و پاشمـاوەی رژێمـی پێشـوو و هـەموو ئەوانـەی دوژمنایەتی نشتیمانەکەمان و ئاراستەی دیموکراسی فیدراڵی دەکەن ، ئەمەش زەروورەتـی بەرگریکردن لە دەسـتکەوتەکانی گـەلی عێـراق و بـەردەوامبوون لـە پرۆسـەی سیاسـی و دیموکراسیی ئیجابیانە پێویست دەکات دوور لە پاوانخوازی لـە دەسـەڵات بـۆ باشـترکردنی ئازادییەکان و چەسپاندنی کۆڵەگەکانی حوکمکردن بە یاسا و مافەکانی مرۆڤ .

کۆبوونەوەکە داوا لەسەرجەم هێزەکانی بەشداربووی حکوومـەتی عێراقـی دەکـات کـە هەوڵی زیاتر بخەنە گڕ لە پێناو زاڵبوون بەسەر کێشەکانی هەنووکەیی بە گیـانێکی بـەرزی هەستکردن بە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر بـە گـەل و نیشـتمان لـە سـەرووی هەموویانـەوە پابەندبوون بە دەستوور کە پرۆسـەی سیاسـی لەسـەر دامـەزراوە و پرینسـپی تـەوافوقیش یەکێکە لە بنەماکانی و ڕێزگرتنیشی پارێزگاری لە یەکێتی نیشتیمان و گەلەکەی دەکات.
جێبەجێکردنی ڕێککەوتنەکان و گەڕانەوە بۆ بنەمای کارکردنی هاوبەش و گیانی هاوکـاری و دروستکردنی پردی متمانە لە نێوان هاوپشکەکانی پرۆسەی سیاسی و چەسپاندنی بنـەما دروستەکانی شـەراکەت لـە دروسـتکردنی بڕیـار ڕێگـەی راسـتن بـۆ بنیاتنـانی عێراقـی دیموکراسی فیدراڵی یەکگرتوو. ئەمەو کۆبوونەوەکە کۆمـەڵێك بڕیـاری گرنگـی بـۆ کـاری داهاتوو وەرگرت.

## سەرۆكی هەرێمی كوردستان لەگەڵ نوێنەرانی هێزو لایەنە سیاسییەكان و شاندی سیاسی هەرێم بۆ بەغدا كۆدەبێتەوە

ئەمڕۆ یەك شەممە ٢٠١١/١٠/١٦ بەرێز مسعود بارزانی سـەرۆكی هـەرێمی كوردسـتان بـە ئامادەبوونی د.كەمال كەركوكی سەرۆكی پەرلەمان و د.بەرهەم ئەحمەد سالح سەرۆك وەزیـران و جێگرانیان لەگەڵ نوێنەرانی هێزو لایەنە سیاسییەكانی هەرێم ( یەكێتی نیشتمانیی كوردسـتان و پارتی دیموكراتی كوردستان و حزبی سۆسیالیستی دیموكراتی كوردستان و یەكگرتووی ئیسـلامی و حزبی شیوعی كوردستان و كۆمەڵی ئیسلامی كوردستان و حزبی زەحمەتكێشانی كوردسـتان و بزوتنەوەی ئیسلامی ) و شاندی سیاسی هەرێم بۆ بەغدا كۆبووەوە.

لـە كۆبوونەوەكـەدا ، سـەرۆك بـارزانی وێـرای بـەخێرهێنانی نوێنـەرانی هێـزو لایەنـە سیاسییەكان و شاندی سیاسـی هـەرێم بـۆ بەغـدا ، كۆبوونەوەكـەی بـە دەسـتپێكی گـرنگ وەسفكرد بۆ گوێگرتن لە راپۆرتی شاندی سیاسی و تاوتوێكردنی ئەنجامی كۆبوونەوەكانی ئـەو شاندە لەگەڵ هێزو لایەنە سیاسییەكانی عیراقی و تەئكیدی لە سەر گرنگی پاراستنی یەكریزی هێزو لایەنە سیاسییەكانی هەرێم كردەوە لە ئاست مەسەلە نەتەوەییەكاندا.

پاشان راپۆرتی شاندی سیاسی پێشكەش بە نوێنەرانی هێزو لایەنە سیاسـییەكانی هـەرێم كرایەوە و ئەنجامی كۆبوونەوەكانیشیان لەگەڵ سەرۆك كۆمار و سـەرۆك پەرلـەمان و سـەرۆك وەزیران و هێزو لایەنە سیاسییەكانی عیراق بە ئیجابی وەسفكرد . سەرۆك بارزانی و نوێنەرانی هێزو لایەنە سیاسییەكانی ئامادەی كۆبوونەوەكە دەستخۆشیان لە شاندە سیاسـیەكە كـرد بـۆ ئەو كارو چالاكیە باشانەی كە لە بەغدا ئەنجامیان داوە . سـەبارەت بـە مەسـەلەی داگـرتنی ئالاّی كوردستانیش لە قەزای خانەقین شاندەكە روونیان كردەوە كە هیچ بڕیارێك بـە داگـرتنی ئالاّی كوردستان لە قەزاكـە لـە لایـەن سـەرۆكایەتی وەزیرانـی بەغـدا دەرنەچـووە ، بـەڵكو بەرپرسێكی وەزارەتی ناوخۆ بە هەماهەنگی لەگەڵ بەرێوەبەرایەتی پۆلیسـی پارێزگـای دیالـە گشتاندنێكیان بە بێ ئاگاداری سەرۆكایەتی وەزیران دەركـردووە و ئـەم رەفتـارەش لـە لایـەن

ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە رەتکرایەوە و تەئکیدیش لەوەکرایەوە کە ئەو ئالآیە بە هیچ شێوەیەك داناگیرێتەوە.

ئەمەو لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا و لە بەر رۆشنایی راپۆرتەکەی شاندی سیاسی هەرێم بۆ بەغدا و تەئکیدکردنی ئەندامانی شاندەکە لە سەر ئامادەیی هێزو لایەنە سیاسییەکانی بەغدا بە پابەندبوون بە دەستوور و رێککەوتنەکان و چارەسەرکردنی گیروگرفتەکانی نێوان هەرێم و بەغدا بڕیاردرا بە :

١- چونی شاندێکی حکومی بۆ بەغدا بۆ چارەسەرکردنی فایلە هەڵواسراوەکانی نێوان حکومەتی هەرێم و حکومەتی فیدراڵ.

٢- پێکهێنانی لیژنەیەکی باڵای سیاسی کە تیایدا نوێنەرانی هەرێم لە گشت هێزو لایەنە سیاسییەکانیەوە پێك بێت .

٣- بەهێزکردنی نوێنەرایەتی هەرێمی کوردستان لە بەغدا.

٤- دانانی دوو چاودێری سیاسی لە لایەن سەرۆك وەزیرانی عیراق و سەرۆکی کوردستان بۆ بەدواداچوونی کارو ئەرکەکانی نێوان هەرێم و بەغدا.

## سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ تێپەڕاندنی ئەو مەترسیانەی کە رووبەڕووی پرۆسەی سیاسی وڵات بوونەتەوە، داوای بەستنی کۆنگرەیەکی بەپەلەی نیشتمانی عێراقی دەکات

بەناوی خوای گەورەو میهرەبان

ئەوەی رۆژی یەکشەممە ٢٠١١/١٢/١٨ لە فڕۆکەخانەی بەغدا روویدا جێی نیگەرانییەکی زۆرە، کە بە شێوەیەکی نابەرپرسیارانە و نەشیاوانە رەفتار لەگەڵ بەرێزان هەردوو جێگری سەرۆك كۆمار خزیر ئەلخوزاعی و تارق هاشمی و جێگری سەرۆك وەزیران سالح ئەلموتلەگ و وەزیری دارایی رافع ئەلعیساویدا کراو بۆ چەند کاتژمێرێك رێگەیان نەدرا سەفەر بکەن، ئەمەیش هەرگیز قبووڵ ناکرێت، کە گوتراوە ئەوەی ڕووی دا لەبەر هۆکاری ئەمنی بووە.

پاراستنی ئاسایش و سەقامگیری لە وڵاتدا بەرپرسیاریەتی هەمووانە، پێویستە هاریکار بین لەپێناوی ئەوەی هیچ بۆشاییەکی ئەمنی پاش کشانەوەی هێزەکانی ئەمەریکا روونەدات و ناشبێت کەمتەرخەمی بەرانبەر بە تیرۆر بکرێت، بەڵام هاوکات نابێت لایەنی ئەمنی تێکەڵ بە سیاسەت بکرێت یان بۆ ئامانجی دیکە بەکاربهێنرێت، بەڵکو پێویستە بۆ قەزا بەجێ بهێڵرێت تاوتوێی بکات و بڕیاری لەبارەوە دەربکات.

زۆر بە داخەوە رەوشەکە بەرەو تەنگژەبوونی توند دەچێت و شەراکەت لە حوکمدا لەبەردەم هەڕەشەدایە، بۆیە داوا لە هەموو هێزو لایەنەکان دەکەم هەنگاو بەرەو نیازپاکی و لێبووردەیی بنێن و چاو بە هەڵوێستە توندەکاندا بخشێننەوەو بۆ ئەو رێککەوتننامانە بگەڕێنەوە کە دەستپێشخەریەکەی پارساڵمان لەسەر بنیات نابوو لەسەرووی هەمووشیانەوە شەراکەت.

لە پێناوی گەڕاندنەوی وڵات بەرەو رێڕەوی کاری هاوبەش و شەراکەتی راستەقینە. پاش راوێژکردن لەگەڵ جەنابی سەرۆك كۆمار، داوای بەستنی کۆنگرەیەکی نیشتمانی بەپەلە دەکەین بۆ ئەوەی پرۆسەی سیاسی لە دارِمان رزگار بکەین و وڵاتیش لە نەهامەتی دوور بخەینەوە.

مەسعوود بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان
٢٠١١/١٢/١٩

# بەلاغی کۆتایی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ نوێنەرانی کوردستان لە ئەنجومەنی نوێنەران و حکومەتی فیدراڵی عیراق

ئەمڕۆ چوارشەممە ٢٠١٢/١/١٨ بە سەرۆکایەتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین نوێنەرانی کوردستان لە ئەنجومەنی نوێنەران و حکومەتی فیدراڵی عیراق کۆبوونەوە.

لە کۆبوونەوەکەدا ، ئامادەبووان :

١- پشتگیری خۆیان بۆ بەستنی ئەو کۆنگرە نیشتمانییە کردەوە کە بڕیار وایە لە دەرفەتێکی نزیکدا ببەسترێ بە مەبەستی دانانی بنەماکانی دەوڵەتێکی فیدراڵی دیموکراتی دامەزراوەیی بە پشت بەستن بە دەستووری هەمیشەیی عیراق و پرنسیپی پێکەوە ژیان و شەراکەتی راستەقینە لە حوکمدا.

٢- پاراستنی پرۆسەی سیاسی عیراق و تەئکیدکردن لە پرنسیپی تەوافوق بە پشت بەستن بە رێککەوتنەکانی هەولێر و رێککەوتنەکانی تری نێوان هێز و لایەنە سیاسییەکان.

٣- پەلەکردن لە دەرکردن و کارکردن بەو یاسایانەی کە پێویستن بۆ بەدامەزراوەیی کردنی دەوڵەتی عیراقی فیدراڵ.

٤- چارەسەرکردنی کێشەی کۆمسیۆنی باڵای هەڵبژاردنەکان کە لە مانگی نیسانی داهاتوودا کۆتایی پێ دێت.

٥- خستنە ڕووی ئەگەرەکانی پەرەسەندنی بارودۆخی ناوچەکە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ئەگەرانەدا .

٦- تاوتوێکردنی بودجەی ساڵی ٢٠١٢ و ئەو تێبینیانەی کە حکومەتی هەرێم و نوێنەرانی کوردستان پێشکەشی حکومەتی فیدراڵ کردووە .

٧- بە هێزکردنی میکانیزمی کارکردنی نوێنەرانی هەرێمی کوردستان لە بەغدا.

٨- تەئکیدکردن لە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستووری هەمیشەیی کە ماوەیەکی زۆرە جێبەجێ نەکراوە.

## پەیامی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە بۆنەی جەژنی نەورۆزی نەتەوەیی

٢٠١٢/٣/٢٠

**خوشك و برایانی ئازیز:**

کوردستانیانی خۆشەویست لە کوردستان و لە هاندەران پڕ بە دڵ پیرۆزبایەکی گەرم لە هەمووتان دەکەم بە بۆنەی جەژنی نەتەوەییمان جەژنی نەورۆزی پیرۆز.

بەر لە زیاتر لە ٢٥٠٠ ساڵ کورد ڕاپەری و دیکتاتۆریەتی قەبول نەکرد، لەو ڕۆژەوە کورد لە تێکۆشان و بەرخوداندا بووە لە پێناوی ئازادی و سەربەستی تا ئیمرۆ، ئەمە زۆر مانا هەڵدەگرێت مانای ئەوەیە کە ئێمە میللەتێکی زیندووین و میللەتێکین بندەستی و زۆرداری لە کەس قەبول ناکەین، میللەتێکین ئەبێ ئازاد بین و بە ئازادی بژین، ئەمە دەرسێکە بۆ ئێمە و هەموو خەڵکی تر.

**خوشك و برایان:**

لەم ڕۆژەدا زۆر کەس داوایان دەکرد، پەیوەندیان دەکرد کە لەم ڕۆژەدا مژدەیەکی خۆش و گەورە بە هەموو خەڵکی کوردستان رابگەینین، من دڵنیتان دەکەم انشاءالله ئەو ڕۆژە هەر دێت کە ئەم مژدەیەتان پێ رابگەیندرێت بەڵام دەبێت لە کاتێکی گونجاو دابێت، بەڵام دڵنیابن ئەو مژدەیە هەر دێت.

بەڕێزان ئێمە بە کاتێکی هەستیاردا تێدەپەرین لەم ڕۆژانەدا کابینەی حەوتەم دەست بە کار دەبێت و من زۆرم حەز دەکرد هەموو هێزە کوردستانیەکان بەشدار بن بە ئۆپۆزسیۆنیشەوە، بەڵام لەوە دەچێت برایانی ئۆپۆزسیۆن بڕیاریان دابێت بەشدار نەبن بەڵام ئومێدەوارم وەکو ئاوێنەیەك بن بۆ حکومەتی هەرێم و کەموکوریەکانی حکومەت پیشان بدەن بەو ئامانجە کە

گەندەڵی نەمێنێت، کەموکوری نەمێنن و ئەزموونەکەمان ڕۆژ بە ڕۆژ بەرەو پێشتر بچێت. هەروەکو زۆرجار ووتومە دەکرێت ئێمە بۆچوونی جیاوازمان هەبێت چەند حزب و رێکخراو بین بەلام ئەبێ هەموومان لە ژێر خێوەتی کوردایەتی بین بەتایبەتی ئێمرۆ کە جارێکی تر دیسان هەرێمی کوردستان کەوتۆتەوە بەر پلان و هێرشی نارەوای ناحەزان، زۆریان بە خەیاڵی خاویان ئومێدیان لەسەر ئەوە بەستووە کە درز دروست بکەن لە نێو هێزەکانی کوردستانیدا بەڵام ئەگەر بگاتە ئەو حەدەی کە تەهدیدی ئەمنی هەرێم و ئایندەی کورد و کوردستان بکرێت کورد هەموو یەکن، هەندێك کەس پەیدا بوون کە کەمن بەداخەوە وە بە ئێش و ئازارەوە ئەڵێم بێ نان و نمەکن چونکە ئەوەی کورد بۆ ئەوانی کردوە لەبەر چاویان نەماوە، ڕۆڵی کورد زۆر دیار و ئاشکرایە کوردستان هەمیشە پەناگایەك بووە بۆ لێقەوماوان و بۆ خەڵکی مەزلوم، ئەو چەند کەسەی ئیمرۆ لە بەغدا بە زۆر خۆیان سەپاندووە ئەوانە ئاوارە بوون لە کوردستان و کوردستان دەرگای خۆی کردبووەوە بۆیان، ئیمرۆ قەیرانێکی جددی هەیە لە عێراق کە ئێمە ئەلێین قەیرانێکی جددی هەیە ئەزانین ئەلێین چی، ئێمە هەوڵمان داوە هەمیشە کە چۆن خزمەتی کوردستان بکەین ئەوها خزمەتی برا عەربەکانمان و برا تورکمانەکانمان و ئاشووریەکان و کلدانیەکان بکەین لە هەموو عێراق ئێمە ویستوومانە خزمەتی هەموو عێراق بکەین.

دوای رووخانی ڕژێمی دیکتاتۆری لە ۲۰۰۳ بە هەموو توانایەکمانەوە هەوڵمان دا ئەزموونی کوردستان لە شوێنەکانی تری عێراقیش سوودی لێوەربگیرێت، بەداخەوە ئەوان سوودیان لە ئەزموونی ئێمە وەرنەگرت. ئێمە زۆر بە پەرۆشەوە هەوڵماندا نەبێتە شەر و ململانێی تایفەگەری و مەزهەبی و گوتمان و ئەیلێین نابینە بەشێك لەو ململانێیە، و ئێمە پێمان ناخۆشە یەك کوری عێراقی بکوژرێت چ لە بەصرا یا لە هەولێر یا لە بەغدا یا لە نەجەف یا لە هەر شارێکی تری عێراقی، هەموویان بە کەس و کار و خۆشەویستی خومانیان دەزانین . بەلام هەمووشتان ئەزانن کە ڕۆلی کورد ڕۆلێکی سەرەکی بووە لە رووخاندنی رژێم و لە دروست کردنی عێراقی تازە، وە بەتایبەتی پێش دوو ساڵ لە دامەزراندنی حکومەتی ئێستای عێراق بە پێی رێککەوتننامەی هەولێر، ئەگەر ڕۆڵی کورد نەبا خوا دەیزانی عێراق بەرەو چ هەڵدێرێك دەچوو. ئێستا بە داخەوە چەند کەسێکی کەم پەیدا بوون هەموو دەسەلاتیان ئیحتکار کردووە و ئیرهابێکی فکریان دروست کردووە نابێت کەس رەخنە بگرێت یان رەئی خۆی بدات ئەگەر نا هارئەبن وە دەکەونە پەلاماری جۆراوجۆر.

کاتی ئەوە هاتووە هەموو راستیەکان بۆ خەڵکی کوردستان و بۆ خەڵکی عێراق روون بکرێنەوە با بزانین خیلافی ئێمە لەسەر چییە.
خیلافی ئێمە لەسەر ئەمەیە:

-یەکەم شەراکەتە لە حوکم لە بەینی کورد و عەرەب (یەعنی عەرەبی شیعی و عەربی سوونی) لەگەڵ ڕیزگرتن و بەشداری کردنی مکوناتی تر کە ئەصلەن ئێستا ئەو شەراکەتە مانایەکی نەماوە.

-ئیلتزامە بەدەستوور کە ڕۆژانە خەرقی ئەو دەستوورە دەکرێت.
-جێبەجێکردنی رێککەوتننامەکانی هەولێرە کە ئەصلەن پشت گوێ خراون و جێبەجێ نەکراون. بە موجەرەد بە گەیشتنیان بۆ سەر حوکم هەموو رێککەوتنێکیان لە بیر چوو، دەستوریان لە بیر چوو، شەراکەتیان لە بیر چوو کە ئەمە عیلاقەی بە چارەنووسی عێراق و هەموو عێراقیەکانەوە هەیە هەر پەیوەندیان بە هەرێمی کوردستانەوە نییە.
ئینجا بێینە سەر ئەو خیلافانەی کە بەینی هەرێم و ئەو دەسەتەی کە دەسەلاتدارە ئێستا لە بەغدا.

١.لەسەر کەرکوك و ناوچە دابراوەکانە کە هەمیشە خۆیانی لیٚ ئەدزنەوە ئێمە ئەو پەری مرونەتمان بە کار هێنا، وە سوپاسی ئێوە ئەکەم جەماوەری خەڵکی کوردستان کە تەحەمولتان کردووە تا ئێستا، گەیشتووتە حەدێك رەنگە ئێوە گومان بکەن کە ئێمە بە جددی هەولمان نەداوە یا کەمتەرخەمیمان کردووە، ئێمە هەوڵمان داوە و کەمتەرخەمیشمان نە کردووە و بەڵام نیەتێکی پاکمان پیشان داوە ویستمان لە ڕێگەی دەستوورەوە چارەسەر بکرێت، ئێمە وامانزانی خەڵك ئیحترامی پەیمان دەگرێت، ئیحترامی ئیمزای خۆی دەگرێت، بە پێی دەستوورێك چارەسەری ئەو کێشانە دەست نیشان کراوە وە بێگومان ئەگەر بە پێی دەستوور چارەسەر کرابا و ئێستاش چارەسەر بکرێت ئەمە پەسەندە، بەلام مومکین نییە ئێمە واز لەم بابەتە بینین چونکە مەسەلەیەکی لە مەبدەئی مەبدەئی ترە بۆ ئێمە .

٢.مەسەلەی پێشمەرگە هەموو ئەزانن پێشمەرگە چ ڕۆڵێکی بووە بۆ هەموو عێراق ئێستا وەکو دوژمن، دوژمنایەتی پێشمەرگە دەکەن ئەمە پێنج شەش ساڵە هەرچی میزانییەی پێشمەرگەیە دزیویانە ناهێلن بێت بۆ کوردستان، لەوەش خراپتر ئەو چەند کەسەیە چاوەروانی ئەوە دەکەن فرۆکەی ئێف١٦ یان بۆ بێت بۆ ئەوەی جارێکی تر شانسی خۆیان لەگەڵ پێشمەرگە تاقی بکەنەوە بەم عەقلیەتەوە حوکمی عێراق دەکەن.

٣.مەسەلەی نەوت و غاز لە ساڵی ٢٠٠٧ لە مانگی شوباتی ٢٠٠٧ ئێمە ئیتفاقمان کرد لەسەر پرۆژەیەك بۆ نەوت و غاز کە بچیت بۆ پەرلەمان، ئەگەر تا مانگی ٥ی ئەو ساڵە لە پەرلەمان دەرباز نەبوو هەردووك لامان هەرێم و حکومەت بۆیان هەیە عقود ئیمزا بکەن ئێمە بە پێی دەستوور هیچ خیلافێکمان نییە نەوت و غاز مولکی عێراق و واریداتیشی بۆ هەموو خەڵکی عێراقە کەواتە بۆ قانونەکە نانێرن بۆ پەرلەمان بەڵام هەر کۆمپانیایەك بێت بۆ ئەوەی عەقدێك لەگەل هەرێم ئیمزا بکات ئەوان شێت ئەبن لە بەغدا ئەزانن ئەمە دەستوریە، موشکیلە ئەوە نییە کە ئەو عقودانە دەستووری نین، بەڵام چاویان هەڵناهێت و دژی ئەوەن کە کوردستان پێش بکەوێت، لەگەل ئەوەی ئەو عقودە خێری هەموو عێراقی تێدایە، ئێمە پابەندین کە ئەم واریداتە بۆ هەموو خەڵکی عێراقە، لەگەڵ ئەوەش ناهێلن هیچ کۆمپانیایەك بێ بۆ ئێرە ئەگەر تەهدیدی نەکەن، ئەگەر فشاری نەخەنە سەر بە ڕێگەی جۆراوجۆر.

٤.خاڵی تر دروستکردنی سوپایەکی یەك ملیۆنییە کە وەلای بۆ یەك نەفەر بێت، لە کوێی دونیا هەیە یەك نەفەر رەئیس وزەرا بیت قائد عامی قوات مسەلەحە بی، وەزیر دیفاع بی وەزیر داخلیە بی، رەئیسی موخابرات بی، رەئیسی مەجلسی ئەمنی قەومی بی، دوێنێش نامەیەك چووە بۆ بانکی مەرکەزی کە بانکی مەرکەزیش عائد بە خۆی بێت، چ ما بۆ خەڵکی تر ئەگەر زۆر کەس پێی وا بیت کە شیعەکان رازین بەم وەزعە شیعەکان پێش سوننە و کورد تەهمیش کراون . لە هەمووی ناخۆشتر ئەو چەند کەسە دەیانەوێت وا پیشانی بدەن کە کورد هەڵویستی گۆریوە لە شیعە یاخود هاوپەیمانی خۆی گۆریوە، ئەو شیعانەی ئێمە دەیانناسین پەیرەوانی حەکیم و صدر ئەوانەن کە هەمیشە لەگەڵ کورد وەستاون و هەمیشە کورد لەگەڵیان وەستاوە، لەمەودواش هەموو کات بەیەکەوە دەوەستین و لەیەك سەنگەرین، و ئەوانەی کە ئیدعای ئەوە دەکەن کە بەرگری لە مافی شیعە دەکەن بەرگری کردن لە مافی شیعە بەوە نابێ

هاوپەیمانانی شیعە تەهمیش بکەن بەوە نابێت دوژمن بۆ شیعە زیاد بکەن بەوە نابێت حساب بۆ خەڵکی تر نەکەن لە عێراق، ئێمە ئەلێین عێراق بۆ هەموومانە بۆ کوردە بۆ شیعەیە بۆ سونەیە بۆ تورکمانە بۆ ئاشورییە بۆ کلدانە بۆ هەموو خەڵکی عێراقە هەرکەسە و بە پێی حەجمی خۆی بە پێی موقعی خۆی. بەوە خزمەت شیعە دەکەن کە خەدەمات بۆ شیعەکان تەقدیم بکەن ئەمن و ئاسایش بۆ خەلکی عێراق تەئمین کەن، ئێوە چتان کردووە بۆ عێراق؟ فەرموون با حسابات هەمووی بخەینە سەر مێز .

ئێمە پابەندین بە هاوپەیمانەتی خۆمان لەگەل برایانی شیعە بەڵام نەك لەگەل ئەم چەند نەفەرە ئەم چەند کەسەی کە هەموو دەسەلاتێکیان ئیحتکار کردووە و حیساب بۆ هیچ کەسی تر ناکەن، وە من دلّنیام کە شیعەکان پێش کورد و سوننە رازی نین بەم وەزعە.

**خوشك و برایانی بەرێز:**

کاتی ئەوە هاتووە بلّێین ئیتر بەسە، عێراق بەرەو هەلّدێر دەچێت، خەریکە چەند کەسێك حوکمی عێراق بەرەو دیکتاتۆریەت ببەن، عێراق لە قەیرانێکی جددی دایە. بە نسبەتی ئێمە بە هیچ شێوەیەك قابلی قەبول نییە بەردەوام بوونی ئەم وەزعە، بۆیە داوا لە رابەرانی هەموو حزب و لایەنە سیاسیەکانی عێراق تێکرای عێراق دەکەم هەرچی زووتر دانیشن و بەپەلە چارەسەرێك بۆ ئەم وەزعە بدۆزنەوە ئالیەتی بۆ دابنێن و لە کاتێکی کورت چارەسەری ئەم وەزعە بکرێت ئەگینا ئێمە دەگەرێینەوە بۆ میللەتی خۆمان وە بڕیاری کۆتایی میللەتی ئێمە دەیدات پاشان با کەس گلەیی نەکات .

لە کۆتایدا سلاّو دەنێرین بۆ گیانی شەهیدانی عێراق بە تێکڕایی، شەهیدانی کورد و کوردستان، وە هەموو شەهیدانی ڕێگای رزگاری لەسەرتاسەری جیهان، جارێکی تر نەورۆزتان پیرۆز بێت و زۆر سوپاستان دەکەم.

## پشتگیریی سەرۆکایەتی هەرێم بۆ دەستپێشخەریی سەرۆك کۆماری عێراق و سەرکەوتنی کۆنگرەی نیشتیمانی

سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان هەر لە سەرەتاوە پشتگیریی خۆی بۆ دەسپێشخەرییەکەی بەڕێز جەلال تالەبانی سەرۆك کۆمار بۆ بەستن و سەرخستنی کۆنگرەی نیشتمانی ڕاگەیاندووە، هەروەها سەرۆکایەتی هەرێم لەگەڵ لایەنەکانی دیکە هەوڵ دەدا کە کۆنگرەکە لەم هەفتەیەدا و بەر لە بەستنی لووتکەی عەرەبی بێت ئەویش بە مەبەستی چارەسەرکردنی کێشەکان و خۆشکردنی کەشوهەوای بەستنی، بەڵام بە داخەوە کاتەکە بۆ پاش بەستنی لوتکە دواخرا.

لەبەر ئەوە و وێڕای بەرز هەڵسەنگاندنی کۆشش و دەستپێشخەرییەکەی بەڕێز جەلال تالەبانی سەرۆك کۆمار، ڕایدەگەینین و دووپاتی دەکەینەوە کە سەرخستنی کۆنگرەکە پشت بە پابەندبوونی تەواوی جێبەجێکردنی ڕێککەوتننامەی هەولێرو جێبەجێکردنی بەندەکانی دەبەستێت.

سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان
٢٠١٢/٣/٢٦

## راگەیاندنی هاوبەشی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێم لەگەڵ هێزە کوردستانییەکان

ڕۆژی سێشەممە ڕێکەوتی ٢٠١٢/٣/٢٧ هێزە کوردستانییەکانی هەرێمی کوردستان لەسەر بانگهێشتی بەڕێز سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمدا کۆبوونەوە.
بەرنامەی کۆبوونەوەکە بریتی بوو لە:

**١.بارودۆخی عێراق.**
**٢.سەردانی بەڕێز سەرۆکی هەرێم بۆ دەرەوەی وڵات.**

کۆبوونەوە بە ووردی هەڵوەستەی لەسەر دۆخی سیاسی عێراق بەگشتی و کێشەی نێوان بەغداد و هەرێمی کوردستان کرد. ئاکامی گۆڕینەوەی بیروڕای بەرپرسیارانەی بارودۆخەکە، کۆبوونەوە گەیشتە ئەو بڕوایە کە:

-کێشە سیاسیەکانی نێوان هێزە سیاسیەکانی سەراپای عێراق، بە تایبەتی لە نێوان عێراقییە و دەولەتی یاسا، ئاسۆی چارەسەر کردنی دیار نییە و نیەتی کۆتایی پێهێنانی کێشەکانیش، جگە لە تاکتیکی سیاسی، چارەسەری سیاسی تیا ڕەچاو ناکرێ. ئەمەش سایەی مەترسیدار دەخاتە سەر کۆنگرەی هێزە نشتیمانییەکانی عێراق، کە بڕیارە گوایە لە مانگی ئاییندەدا ساز بدرێت.

-سەبارەت بە کێشەکانی هەرێمی کوردستان و ناوەندیش: کۆبوونەوە نیگەرانە لە جێبەجێ نەکردنی ڕێککەوتننامە ١٩ خاڵیەکە کە پێش پێکهێنانی کابینەی بەڕێز مالکی دوای گفتوگۆیەکی تێروتەسەل، پەسند کراوە، ئینجا هاوپەیمانی کوردستان ڕەزامەندی لەسەر پێکهێنانی دوا کابینە دەربڕیوە. بەڵام مەخابن، خاڵەکان هەتا ئێستا چاوەڕێی جێبەجێ کردنن.

کێشەی نەوت و گاز، دەستی بەدەستی کردن لە جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ دا و بوودجە و چۆنیەتی سەرفکردنی، گرفتەکانی چۆنیەتی پێکهێنانی هێزەکانی چەکداری عێراق و پر چەك کردنیان، ڕۆڵی سوپای عێراق، چلۆنایەتی دابەشکردنی پلە و پایەکانی سوپا و پلە بەرزکردنەوە پێچەوانەی دەستوور، قۆرغکردنی دەسەلات و پۆستەکان و هەیئەتەکان لەلایەن سەرۆك وەزیرانەوە، ئەمانە سەرباری بەردەوام بوونی باری نائەمنی لە پارێزگای کەرکوك و ناوچە کێشەلەسەرەکانی پارێزگاکانی دیالە، نەینەوا، سەلاحەددین.

ئەو مەسەلانە و مەسەلە گەلێکی تریش، تێکرا کۆبوونەوەی گەیاندە ئەو بڕوایەی کە دەبێت هێزە سیاسیەکانی عێراق و کوردستان، بە پڕۆژەیەکی سیاسی و ئالیەتی چارەسەری نوێ لە ناوخۆیاندا بکەونە گفتوگۆ بۆ چارەسەر کردنی کێشەکان و دارشتنی بنەمایەتی سیاسی تەوافوقی حوکمرانی دەستەبەر لە عێراق و پەیوەندی عێراق و کوردستان، بۆ کۆتایی پێهێنانی قۆناغی ئالۆزی لەمەوبەر و کردنەوەی دەروازەی قۆناغێکی سیاسی نوێ لە نێوان هێزە سیاسیەکان و چۆنیەتی بەشداری کردنی کارامەتری هێزەکان لە حکومەتدا. پێشمان وایە گەر نەتوانین روانگەی هاوبەش بۆ ئەم قۆناغە نوێیە بدۆزینەوە، مەترسی زۆرمان هەیە کە نەدەست پێشخەریەکەی هەولێری بەرێز سەرۆکی هەرێم و نەکۆنگرە نیشتیمانییەکەی هێزە نیشتمانییەکان بە سەرپەرشتی بەڕێز سەرۆك کۆماری عێراقی فیدراڵ، بتوانن ئامانجەکانیان بەرەو چارەسەری بنچینەیی ببێکن.

سەبارەت بە ئەگەرە سیاسیەکانی ڕۆژهەلات و ناوچەکە و کوردستانیش، کۆبوونەوە وەکو مافێکی یاسایی و دیموکراسی جەختی کردەوە کە گەلی کوردستانیش وەکو هەموو گەلانی جیهان سوود لە هەر هەلێکی گونجاو ببینێت بۆ دیاری کردنی مافی چارەی خۆنووسین و بەدی هێنانی ئامانجە هەتا ئێستا بەدی نەهاتووەکانمان.

دەربارەی سەفەری جەنابی سەرۆکی هەرێمیش بۆ ولایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و چەندین ولاتی دیکەی ڕۆژئاوا، کۆبوونەوە هەلومەرجی سەفەرەکەی بە گرنگ زانی و بیروڕای پێویستیشی بۆ سەرخستنی باشتری سەردانەکە، گەلالە کرد.

لە کۆتایشدا تەواوی لایەنە بەشدارەکانی کۆبوونەوەکە کۆدەنگی و روانگەی هاوبەشیان لەسەر کێشەکان و چۆنیەتی چارەسەرکردنیان لەسەر ئاستی عێراق و هەروەها کوردستانیش دووپات کردەوە و بڕیار درا تەواوی تواناکان لە پێناوی

جێبەجێکردنی مادده و بڕگەکانی دەستوور و ڕێککەوتنە سیاسییەکان و خولقاندنی ژینگەیەکی سیاسی متمانەبەخشی چارەسەر، بخەنە کار.

**پارتی دیموکراتی کوردستان**
**یەکێتی نیشتمانی کوردستان**
**یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان**
**کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان**
**بزووتنەوەی ئیسلامی کوردستان**
**حزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان**
**حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان**
**بزووتنەوەی دیموکراتی تورکمان**
**بزووتنەوەی چاکسازی تورکمان**
**لیستی ئەربیلی تورکمانی**
**ئەنجوومەنی گەلی کلدان سریان ئاشوور**
**بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشوری**
**حزبی شیوعی کوردستان**

# سەرۆکی هەرێمی کوردستان سوپاسیی هەڵوێستە راشکاوانەکانی موقتەدا سەدری کرد

٢٠١٢/٤/١٦

لە پێوەندییەکی تەلەفۆنیدا لەگەڵ بەڕێز بەها و ئەلئەعرەجی یەکێك لە سەرکردەکانی ڕەوتی سەدرو ئەندامی ئەنجوومەنی نوێنەرانی عیراق" دکتۆر فوئاد حوسێن سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێم رێزو پێزانین و سلاوی بەڕێز مەسعوود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستانی بە سەماحەتی سەید موقتەدا سەدر گەیاند.

لە پێوەندییە تەلەفۆنییەکەدا سەرۆکی دیوانی سەرۆکایەتی رایگەیاند کە سەرۆك بارزانی سوپاسی بێ پایانی بۆ سەماحەتی سەید موقتەدا سەدر هەیە لەبری هەڵوێستە ڕاشکاوو بوێرەکانی لە بەرەنگاربوونەوەی ئەوانەی دەیانەوێت فیتنەگەری و دەمارگیری ڕەگەز پەرستی دژ بە کورد بورووژێنن. هەروەها فوئاد حوسێن سوپاسگوزاری سەرۆك بارزانی بۆ سەماحەتی سەید موقتەدا سەدر راگەیاند لەبری هەڵوێستی ڕوونی بەرانبەر بە پرسی کۆمیسیۆنی بالای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان و بڕیاری دەستگیرکردنی هەر یەك لە بەڕێزان فەرەج حەیدەری و کەریم تیمی و دووپاتیشی کردەوە کە سەرۆکی هەرێم بە تەنگەوەهاتنی سەماحەتی بەرانبەر بە پاراستنی دەزگەو دەستە سەربەخۆکان لە ولاتدا بەرز دەنرخێنێت.

# راگەیەندراوی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ حزب و لایەنە سیاسییەکان

٢٠١٢/٤/٢٣

ئەمڕۆ بەڕێز مەسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان دوابەدوای گەڕانەوەی لە گەشتەکەی بۆ وڵاتانی ئەمەریکا و ئەوروپا و تورکیا، لە بارەگای سەرۆکایەتیی هەرێم لەگەڵ حزب و لایەنە سیاسییەکانی کوردستان کۆبۆوە و چەند تەوەر و بابەتێك گفتوگۆیان لەسەر کرا.

**تەوەری یەکەم:**

سەبارەت بە گەشتەکەی سەرۆکی هەرێم بۆ ئەمەریکا و چەند وڵاتێکی ئەوروپا و تورکیا و ئەو دیدارانەی لەگەڵ سەرۆك ئۆباما و جێگری سەرۆك و وەزیری دەرەوەی ئەمەریکای ئەنجامی داوە، گفتوگۆی لەسەر کرا و هەڵوێستی سەرۆکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا و جێگرەکەی لە پشتیوانی کردن و جەخت کردنەوەیان لە پارێزگاری کردنی پرۆسەی دیموکراسی لە عێراق لە چوارچێوەی دەستووری هەمیشەیی و پابەندبوونیان بەو ئیلتیزام و پەیمانانەی داویانە بەرامبەر بە کورد و کوردستان بە گرنگ و بایەخەوە هەڵسەنگێندرا.

هەروەها لە کۆبوونەوەکەدا نیگەرانی لە پێشێل کردنی دەستوور دەربڕدرا و بە سەرەتای کێشەی گەورە زانرا لە بەردەم پرۆسەی بە دیموکراتیزە کردنی بوارەکانی ژیان لە عێراقی نوێ و پێشکەوتنی کوردستان، هەروەها لە کۆبوونەوەکەدا جەخت لە بەردەوامیی رەوتی دیموکراسی و چەسپاندنی سیستەمی فیدراڵی و پرنسیپی هاوبەشی و رێککەوتن لە حوکمڕانی وەکو بنەمای سەرەکیی حوکمڕانی لە عێراق پاش رووخانی رژێمی دیکتاتۆری کراوە و هەرگیز پێچەوانەی ئەم پرنسیپانەش جێگەی قبووڵ نین و ئەم کێشەیەش تەنیا پەیوەندیی بە کوردستانەوە نییە، بەڵکو

کێشـەی هـەموو عێراقییەکانـە بـە هـەموو نەتـەوە و ئـایین و ئاییینزایەکـەوە، بـۆ چارەسەریی ئەم قەیرانەش بەپێویست زانرا پێداگری لە جێ بەجێ کردنی دەسـتوور و رێککەوتننامەی هەولێر بکرێت.

**تەوەری دووەم:**

تەوەری دووەمی کۆبوونەوەکە تایبەت بوو بە هەڵوەستەکردن و تاوتوێ کردنی ئەو قەیران و ئاڵۆزیەی کە عێراق تووشی بوو ە و پرۆسەی سیاسی و دیموکراسیی گەیاندۆتە بـن بەسـت و لـە کۆبوونەوەکە جەخت لەسەر ئەم خاڵانە کراوە:

یەك هەڵوێستیی خەڵکی کوردستان و لایەنەسیاسییەکانی بـە گـرنگ زانـی و دەسـتووری هەمیشەیی عێراقیشی بە مەحەك و پێشـمەرجی پاراسـتنی یـەك پارچـەیی عێـراق فیـدراڵی لەقەڵەم دا.

تێکڕای هەوڵ و تەقەلاکان بە ئامانجی چارەسەریی قەیران و ئاڵۆزییەکان بەرز نرخێنـدرا و پشتیوانیی خۆی بۆ هەوڵەکانی سەرۆك کۆماری عێراقی فیدڕاڵ دەربڕی لەپێناو نزیك خستنەوە و ئەنجامدانی کۆبوونەوەی سەرکردەی هێزە سیاسیەکانی بەشدار لە پرۆسەی سیاسیی عێراق.

ئەم هەنگاوەش بە گرنگ زانرا بۆ فریاکەوتنی ئەم بارودۆخەی ئێستای عێراق، بـۆ ئـەوەی ناچار نەبین بەدوای بژاردەی دیکەدا بگەڕێین، چونکە بـەردوام بـوونی بـارودۆخی قـەیراناوی و ئاڵۆزی ئێستا جێگەی قبووڵ نییە.

هەروەها لە کۆبوونەوەکە جەخت لەسـەر جـێ بـەجێ کردنـی مـاددەی ١٤٠ی دەسـتوور و کێشەکانی یاسای نەوت و غاز و پێشمەرگە کراوە.

لە کۆتاییدا بڕیاردرا ئەم کۆبوونەوانە بەردەوام بن.

**پارتی دیموکراتی کوردستان**
**یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان**
**حزبی سۆسیالیستی دیموکراتی کوردستان**
**یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان**
**کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان**
**حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان**
**بزووتنەوەی دیموکراتی تورکمان**
**بزووتنەوەی ئیسلامیی کوردستان**
**بزووتنەوەی چاکسازیی کوردستان**
**بزووتنەوەی دیموکراتی ئاشووری**
**لیستی ئەربیلی تورکمانی**
**ئەنجومەنی گەلی کلدان سریان ئاشوور**
**حزبی شیوعیی کوردستان**

## کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ نوێنەرانی هەرێمی کوردستان لە ئەنجومەنی نوێنەران و حکومەتی عیراقی فیدراڵ

ئەمرۆ شەممە ٢٠١٢/٤/٢٨ بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین لەگەڵ نوێنەرانی هەرێمی کوردستان لە ئەنجومەنی نوێنەران و حکومەتی عیراقی فیدراڵ کۆبووە.

ئەجیندای کۆبوونەوەکە بریتی بوو لە باسکردنی رەوشی گشتی عیراق و سەردانەکەی ئەم دواییەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ ئەمریکا و تورکیا و چەند وڵاتێکی ئەوروپی. سەبارەت بە رەوشی گشتی عیراق سەرۆك بارزانی تیشکی خستە سەر ئەنجامی دیدارە راوێژکارییەکەی ئەمرۆ کە لە نێوان سەرۆك کۆمار و سەماحەتی سەید موقتەدا سەدر و سەرۆکی لیستی ئەلعیراقیە و سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەرانی عیراق و بە ئامادەبوونی بەرێزیان لە هەولێری پایتەختی هەرێمی کوردستان بەرێوە چوو و بە دیدارێکی سەرکەوتوو وەسفیکرد و جەختی لەوە کردەوە کە گەلی کوردستان رۆڵی بەرچاوی هەیە لە فراوانکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ هەموو پێکهاتەکانی دیکەی عیراقدا و جارێکی دیکەش دووپاتی کردەوە کە ئەو رەوشەی لە عیراق هەیە بژاردەی ئێمە نییە و پێویستە چارەسەرێکی ریشەیی بۆ بدۆزرێتەوە بە پشت بەستن بە دەستوور و رێککەوتنەکان.

لە تەوەرێکی دیکەی کۆبوونەوەکەدا، نوێنەرانی کوردستان لە بەغدا دید و بۆچوونی خۆیان سەبارەت بە رەوشی ئاڵۆز و ترسناکی عیراق خستەڕوو و دواتریش سەرۆك فراکسیۆنەکانی کوردستانی لە ناو ئەنجومەنی نوێنەران (هاوپەیمانی کوردستانی ، گۆڕان ، یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان و کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان) ئەوانیش بیرۆڕا و

بۆچوونەکانی خۆیان سەبارەت بە هەمان رەوش خستە ڕوو و پاش تاوتویٚ کردنی گشت بارەکان جەخت لە یەك گوتاری گەلی کوردستان کرایەوە بە تایبەتی لە بواری راگەیاندندا و هەموو لایەکیش کۆك بوون لەسەر پاراستنی یەکریزی و یەك هەڵوێستی گەلی کوردستان و نوێنەرانی لە بەغدا بە تایبەتی لە ئاست مەسەلە نەتەوەیی و چارەنووسسازەکاندا.

## ئەمەو لە کۆتایی کۆبوونەوەکەدا بڕیاردرا:

١- دیراسەت کردنی ئەو پێشنیارانەی کە لە لایەن سەرۆکایەتی هەرێمەوە کراون بۆ دانانی میکانیزمێکی پتەو بۆ پەیوەندی نێوان نوێنەرانی هەرێمی کوردستان لە بەغدا لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا.

٢- پەیوەندی کردن بە هەموو فراکسیۆنە کوردستانییەکان بۆ دانانی لیژنەیەك بۆ بەدواداچوونی کارەکانی لایەنە کوردستانییەکان لە ئەنجومەنی نوێنەران و حکومەتی فیدراڵ.

بسمه تعالى

يرى المجتمعون في اللقاء التشاوري :

اولا:- التأكيد على توفير الخدمات بكل جوانبها من خلال سياسة خدمية صحيحة و محاربة الفساد بموازات ذلك و خدمة الشعب و الالتزام بالدستور و بشكل خاص تلك المواد التي تحدد صلاحيات السلطات الثلاث و استقلالية كل منها ،وبشكل خاص الصلاحيات الممنوحة لمجلس الوزراء و الدور التنفيذي لرئيسه و الاخذ بالاعتبار (ان السلطة الاتحادية تتشكل من رئيس الجمهورية و مجلس الوزراء ) كما لفت اللقاء الانتباه الى ان تشكيل الحكومة بمرافقها المختلفة استند الى التوافق الوطني و ما يتطلبه ذلك من مشاركة القائمين عليه مشاركة فعلية في اتخاذ القرارات في مجلس الوزراء و البرلمان و المرافق الحكومية الاخرى .

ثانيا :- استمرار التداول مع سائر الكتل و الاطراف المشاركة و المعنية بالمسيرة الديمقراطية في البلاد ،لانضاج الحلول التي من شأنها انهاء الازمة المتفاقمة التي تتعرض لها العملية السياسية ،وتجاوز العواقب التي تهددها اذا لم يتم التوافق على انهائها و وضع البلاد مجددا على طريق بناء الدولة الديمقراطية ،دولة المؤسسات و المشاركة في القرار و الحريات و احترام ارادة الشعب العراقي بجميع مكوناته

ثالثا جرى الاتفاق في اللقاء على ضرورة ايجاد الاليات الوطنية لانهاء التفرد في ادارة الحكم و تسيير شؤون الدولة باعتماد ماتضمنته اتفاقية اربيل و ورقة التفاهم التي قدمها التحالف الكوردستاني و وافق عليها رئيس الحكومة و البيان الذي ادلى به سماحة السيد مقتدى الصدر في مستهل زيارته الى اربيل .

رابعا :التوجه بالعمل مع سائر الاطراف لتأكيد الالتزام بالاسس و المباديء و الاطر اعلاه كتدبير عملي عاجل لانهاء الازمة ،

و اتخاذ كل مايلزم من قرارات لتصفية المظاهر المتعارضة معها بما في ذلك الاوضاع الشاذة التي تعاني منها الادارات الحكومية التي تدار بالوكالة ،واحترام استقلالية القضاء والهيئات المستقلة وبشكل خاص اللجنة العليا للانتخابات والبنك المركزي وهيئة الاعلام والمؤسسات التابعة لها.

خامسا:

تفعيل دور البرلمان بصفته السلطة التشريعية و الحيلولة دون التدخل فيه و دعم توجهاته لاستكمال التشريعات التي من شأنها ارساء الحكم على اسس دولة القانون و المؤسسات و الحريات .

سادسا: وضع حد لأي مظهر من مظاهر الانفراد في اتخاذ القرار في الهرم الحكومي والنزوع نحو التسلط وتحزيب مرافق الدولة ومؤسساتها والهيمنة على شؤون البلاد ، وهو ما يتطلب وضع اليات وأطر ملزمة لمفهوم المشاركة والتوافق الوطني.

سابعا : تجنب كل ما من شأنه تحويل المؤسسة العسكرية والأمنية الى طرف في الصراع والاختلاف وتكريس عقيدتها الوطنية ، باعتبارها أداة لحماية البلاد والذود عن حريات وحقوق المواطنين .

ثامنا : في حالة رفض الالتزام بالمباديء والاطر الواردة في هذا الاتفاق ، وما يتم التوصل اليه مع الاطراف الأخرى ، تتخذ الخطوات العمليةخلال فترة زمنية لا تتجاوز خمسة عشر يوما لعرض الامر على التحالف الوطني و العمل على سحب الثقة من الحكومة في البرلمان وتشكيل حكومة شراكة وطنية حقيقية.

تاسعا :- تحديد ولاية رئيس مجلس الوزراء لدورتين بأثر رجعي، لتأمين تداول السلطة سلميا و تكريس أسس و مباديء الديمقراطية ،و الحيلولة دون تهيئة مناخات الانفراد و الدكتاتورية .

٢٠١٢/٤/٢٨

مقتدى الصدر

اياد علاوي

مسعود بارزاني

عن القائمة العراقية

أسامه النجيفي
رئيس مجلس النواب

## لێدوانی وتەبێژی سەرۆکایەتی هەرێم سەبارەت بە سەردانەکەی مالکی بۆ شاری کەرکوک

بەڕێز نوری ئەلمالکی نیازی راستەقینەی خۆی سەبارەت بە ماددەی ١٤٠ ی دەستووری عێراقی ئاشکرا کرد لە میانی ئەو سەردانەی دوێنێی بۆ کەرکوك. ئەو خۆی لەو پرسە بەدوور گرت و تەنانەت ئاماژەیەکیشی بە ماددەی ١٤٠ نەدا و لەلای خۆیەوە ناسنامەیەکی بۆ کەرکوك داتاشی وەك مانۆڕێك بۆ راکێشانی مەیلی هەندێ لە شۆڤینستان. ئەگەر بەڕێز مالکی بیەوێ کێشەی ناوچە دابڕێندراوەکان چارەسەر بکات، لەسەری پێویستە ماددەی ١٤٠ جێبەجێ بکات و دەرفەت بە دانیشتووانی کەرکوك بدرێ چارەنووسی خۆیان دەستنیشان بکەن. ناسنامەی کەرکوك بە هێنانی چەندین لیوای هێزی تایبەت و سووڕاندنەوەی فڕۆکە بە ئاسماندا دەستنیشان ناکرێ. ناسنامەی کەرکوك: شارێکی عێراقیە و ناسنامەکەشی کوردستانییە.

د.ئومێد سەباح عوسمان
وتەبێژ بەناوی سەرۆکایەتی هەرێم
٢٠١٢/٥/٩

# اجتماع النجف في ٢٠١٢/٥/١٩

## "البوابة العراقية" تنفرد بنشر "رسالة اجتماع النجف إلى التحالف الوطني": المالكي غير مناسب للحوار

- ٢٠١٢/٠٥/٢٢ ١٠:٥٣ م
- الاخبار, غير مصنف

**خاص"البوابة العراقية"**

تتضمن وثيقة اجتماع الذي حضره قادة قوى سياسية مهمة في منزل السيد مقتدى الصدر بالنجف والتى أرسلت إلى التحالف الوطنى أن المجتمعين دعو التحالف لاستبدال رئيس مجلس الوزراء نوري المالكي، وتنفرد "البوابة العراقية" بنشر الرسالة.

وتشير الرسالة التى بعثها المجتمعون في النجف إلى قيادة كتلة التحالف الوطنى، أن الأطراف المعترضة على أداء رئيس الحكومة تجاوزت مرحلة النقاش حول سحب الثقة عنه، وهى تتعامل مع المالكى بوصفه "طرفا غير مناسب للحوار"، وتطلب استبداله بمرشح "يستطيع تفكيك الأزمات المتلاحقة".

القادة الموقعين على الرسالة النجفية الذين قالوا أنهم لم يتسلموا من الجعفري "ما يشكل جوابا" على المطالب التى طرحها اجتماع أربيل، والذي انتهى ببعث رسالة إلى التحالف الوطنى تطلب من المالكى الالتزام بالاتفاقات المبرمة قبل تشكيل الحكومة نهاية عام ٢٠١٠، ومراجعة طريقة إدارة الدولة التى يحتج عليها جميع شركاء الائتلاف الحكومى، بوصفها مظهرا "للتفرد في إدارة الحكم والدولة".

وتذكر رسالة النجف "اطلعنا على الرسالة التى وصلتنا بتوقيع السيد الدكتور إبراهيم الجعفري باعتبارها ردا على اللقاء التشاوري في ٢٨ – ٤- ٢٠١٢ (في أربيل) ولم نجد في الرسالة ما يشكل جوابا على ما جرى التأكيد عليه من مطالب واضحة تتعلق بتطبيق الاتفاقيات والتفاهمات التى سبق إبرامها". وتضيف "وانطلاقا من الأسس التى حددت تصوراتنا في اللقاء المذكور (في أربيل) نتوجه لكم باعتباركم الإطار السياسى المعنى باختيار رئيس الوزراء، البحث عن بديل له"، مشيرة الى ان بديل المالكى يفترض أن "يستطيع تفكيك الأزمات المتلاحقة التي تدفع البلاد إلى مجابهة مخاطر جدية تلحق أفدح الأضرار بالمصالح الوطنية العليا، وتؤدي في المحصلة النهائية الى إضعاف الصف الوطنى وإعاقة مشروعنا المشترك".

كما أن رسالة المجتمعين في النجف أبلغت التحالف الوطنى بأن "أي بديل يؤدي إلى معالجة الأزمة ومعافاة الحياة السياسية وإيقاف التدهور في العمل الوطنى، ينبغى أن يتركز على وضع حد للنهج والسياسة الانفرادية في إدارة الحكم والدولة".

و تشير الرسالة بوضوح إلى أن قادة الكتل الرئيسية في البرلمان بمن فيهم السيد مقتدى الصدر، لم يعودوا ينتظرون جوابا من المالكى بشأن النقاط والمطالب السابقة، وان الأزمة دخلت مرحلة جدية تتصل مباشرة بطلب بديل لرئيس الحكومة، كما يكشف توقيع السيد الصدر على الرسالة التى تطلب استبدال المالكى، عدم دقة تصورات حاول ائتلاف دولة القانون إشاعتها مؤخرا بالقول إن زعيم التيار الصدري "ليس طرفا" في المطالبة بإقالة المالكى وانه "يحاول أن يتوسط لحل الخلاف" بين المالكي والتحالف الكردستاني والقائمة العراقية.

# ڕوونکردنەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەبارەت
# بە دوو بابەتی قسەکانی بەڕێز مالیکی

بەڕێز مالیکی لە چاوپێکەوتنیدا لەگەڵ کەناڵی (NRT) باسی چەند بابەتێکی کردووە کە پێویستیان بە وەڵامدانەوە هەیە

ئێستا لایەنی پەیوەندیدار خەریکە وەڵامەکە ئامادە دەکات و بڵاو دەکرێتەوە

بەڵام لێرەدا دەمەوێ وەڵامی دوو بابەتی سەرەکی بدەمەوە کە یەکێکیان بەندە بەو تۆمەتانەی دەدرێنە پاڵ هەرێمی کوردستان بە ناردنی نەوت بە شێوەیەکی قاچاغ و دووەمیشیان بەندە بە گوایە نەدانی وەزارەتێك بە بزوتنەوی گۆڕان

**دەربارەی بابەتی یەکەم**

زۆر جار بەڕێز مالیکی و دەوروبەرەکەی و تەنانەت خەلکی تریش، هەرێم بەوە تۆمەتبار دەکەن گوایە نەوت بە قاچاغ دەنێریتە دەرەوە

لە ڕێکەوتی (٢٠١٢/٤/٤) دوای ئەوەی یەکەم جار ئەم تۆمەتە ئاراستەی هەرێم کرا، داوامان کرد لێژنەیەکی هاوبەش پێك بهینرێت لە ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق و پەرلەمانی کوردستان بە بەشداری نوێنەری وەزارەتی نەوت و دارایی عێراق و وەزارەتی سامانە سروشتییەکان و دارایی هەرێم، بۆ لێکۆلینەوە لە تۆمەتی بە قاچاغ بردنی نەوت لە باشووری عێراق یان هەرێمی کوردستان . بەڵام بەداخەوە تا ئێستا داواکە بێ ئەنجام بوو و هیچ وەلامێکی نەدراوە و لێژنەکە دروست نەبوو

دووپاتی دەکەینەوە هەر کەس و لایەنێك بەڵگەنامەی هەبێت لەسەر بەقاچاغ بردنی نەوت لە هەرێمی کوردستان بۆ دەرەوە با بفەرمووێت بیخاتە روو، و هەموو لایەك دڵنیا دەکەینەوە کە هەر کەسێ دەستی لەمەدا هەبێت دەچێتە بەردەمی عەدالەت و چاوپۆشی لەکەس ناکرێت

**دەربارەی بابەتی دووەم**

بەڕێز مالیكی گوتبوی كە گوایە من دژی پێدانی پۆستی وەزاری بووم بە بزوتنەوەی گۆڕان و هەڕەشەی پاشەكشەم كردووە لە حكومەت ئەگەر بێت و پۆستێكی وایان پێ بدرێت

ئەمە دوورە لە راستی و بزوتنەوەی گۆڕان خۆی پێش هەموو كەسێ دەزانێ ئەمە راست نییە

من داوام كرد لە بزوتنەوەی گۆڕان و لایەنەكانی تری كوردستانی كە ئیئتیلافی فراكسیۆنە كوردستانییەكان دروست بكرێت . لەم رووەشەوە لە پێش هەڵبژاردنی ئەنجومەنی نەوێنەران و لەدوای هەڵبژاردن هەموو لایەنە كوردستانییەكان كۆبووینەوە . دواتر لەكاتی پێكهێنانی حكومەتی عێراقی فیدراڵ، داوا لە بزوتنەوەی گۆڕانیش كرا كە لە چوارچێوەی ئیئتیلافی فراكسیۆنە كوردستانییەكان كە یەككگرتووی ئیسلامی و كۆمەڵی ئیسلامیش تێدا بەشدار بوون وەزارەت وەربگرن، بەڵام بزوتنەوەی گۆڕان نەهاتن و بڕیاریاندا لەم چوارچێوەیە بەشداری نەكەن، لەم رووەشەوە هەموو حیزبە كوردستانییەكان شاهێدن

كاتێك بەڕێز مالیكی داوای كرد وەزارەتیان پێ بدرێت، پێمان راگەیاند كە لە بەشی خۆتان ئازادن چەند وەزارەتیان بدەنێ و پێمان باشە، بەڵام لە بەشی ئیئتیلافی فراكسیۆنە كوردستانییەكان ئەبێ لە رێگای هەرێمەوە بێت.

**مسعود بارزانی**
**سەرۆكی هەرێمی كوردستان**
**٢٠١٢/٥/٢٠**

# وەڵامی دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان بۆوتەکانی بەڕێز نوری مالکی لەگەڵ کەناڵی (ئێن. ئار. تی) رۆژی ٢٠١٢/٥/١٣

**بۆ رای گشتیی کوردستانی و عێراقی..**

بەڕێز نووری مالکی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی فیدراڵ لەسەرەتای دیدارەکەیدا لەگەڵ کەناڵی (ئێن. ئار. تی) رۆژی ٢٠١٢/٥/١٣ دەڵێ:(.. نا بۆ ئەوانەی،چ لە کوردستان و بەسرە، یان لە کەربەلا و هەر شوێنێکی دی لە عێراق زێدەڕۆیی بەسەر دەوڵەت و دەستوور و بەرژەوەندیی گەلەوە دەکەن...)، ئێمەش بەر لەوەی لە هەمان تەوەرەوە دەست پێبکەین کەپابەندنەبوونە بە دەستوور، لە بڕوانەبوونی جەنابی مالکی بە دەستوورەوە دەست پێ دەکەین و پێمانوایە بڕوانەبوون بە دەستوور و یاسا و ڕێککەوتنەکان لەلایەن بەڕێزیانەوە هۆکاری دروستبوونی قەیرانی ئەمڕۆی سیاسییە لە عێراقدا.

**بڕوانەبوون بە دەستوور:**

نووری مالکی لە خاڵی یەکەمی بەرنامەی حکوومەتەکەیدا کە لە رۆژی ٢٠١٠/١٢/١٢ لە دانیشتنی راگەیاندنی پێکهێنانی حکوومەتدا خوێندیەوە" دەڵێ: (پاراستنی دەستووری عێراق و پابەندبوون بە هەموو ئەو خاڵانەی پەسەندی کردوون.. بەدواداچوونی کاری ئەو لیژنانەی بەپێی دەستوور پێکهێنراون و بە تایبەتی ماددەی (١٤٠).. پێویستە لایەنە سیاسییەکان و ئەندامانی ئەنجومەنی وەزیران بە دەستوور و بەرنامەی حکوومەتەوە پابەند بن، لەبەر ئەوەی دەستوور و بەرنامەکە بنەمای هاوبەشن بۆگشت هێز و لایەنە بەشداربووەکانی پرۆسەی سیاسی).

بەڵام سەرۆك وەزیران نەك هەر پابەند نەبووە بە دەستوور، بەڵكو لێدوان و هەڵوێستەكانی جەنابیان ئەو راستییەپیشان دەدەن كەهەرلە بنەڕەتدا بڕوای بە دەستوور نەبووە، هاوكات ئیددیعای ئەوەش دەكات گوایە ئەو بڕوای پێیەتی كەچی خەڵكی دی بڕوای پێ نیە!!، بەڵگەشمان بۆ ئەم راستییە قسەی خۆیەتی:

مالكی لە دیدارەكەیدا لە ٢٠١٢/٥/١٣ لەگەڵ كەناڵی (ئێن. ئار. تی) دەڵێ:(.. ئەم ماددەیە ( واتە ماددەی١٤٠) یان ئەوەتا كەسێك نووسیویەتی كەنەزان بووە، یان بە ئەنقەست ئەو ماددەیەی داناوە كە هیچ كەڵكێكی لێ بەدی ناكرێ وەك ئامرازێك بۆچارەسەركردن....).

لە مانگی ئابی ٢٠١١، مالكی لە بەرامبەر كۆنگرەی (خاوەن تواناكان و دەستەبژێری رۆشنبیر)دا گوتی:(.. كاتێك دەستوورمان نووسی ئەوەمان لە ناو دەستووردا جێگیر كرد كە خۆمان دەمانویست، بەڵام دواجار بۆمان دەركەوت كە ئێمە لوغم مان لە ناو دەستووردا داناوە نەك ماف، هەر ئەو لوغمانەن كە رۆژ بە رۆژ دەتەقنەوە...)

سەرچاوە:http://www.youtube.com/watch?v=iLWrn٤v٧wso

لە ٢٠١١/١٠/٢٩ مالكی لە وەڵامدانەوەی داواكەی ئەنجومەنی پارێزگای سەلاحەددیندا دەڵێ: (حكوومەت لەگەڵ فیدراڵیزمدایە، بەڵام" كارێكی لەم شێوەیەپارچەبوونێكی نادەستووریانەی لێ دەكەوێتەوە، بۆیە مافی خۆمانە رووبەڕووی بوەستینەوە، چونكە ئەمانە هەمووی سەرەتایەكن بۆ جیابوونەوە...).

## پابەندنەبوون بە دەستوور:

### ١- راوەستانەوە دژ بە ناسنامەی دەوڵەتی عێراق:

بەڕێز مالكی تا ئێستا چەندین جار دژ بەو ناسنامەیە وەستاوەتەوە كە لە ماددەییەكەمی دەستووری هەمیشەیی عێراقدا هاتووە: ( كۆماری عێراق دەوڵەتێكی فیدراڵی یەكگرتووی سەربەخۆی خاوەن سەروەریی تەواوە.........)، هەروەها لە بڕگەی (دووەم)ی ماددەی (١١٧)دا هاتووە: (ئەم دەستوورە دان بەو هەرێمە نوێیانەدا دەنێت كە بەپێی ئەحكامەكانی دادەمەزرێن). ئەوەی لەو ماوەیەشدا بە ئاشكرایی روویدا ئەوەبوو كە مالكی هەموو داوایەكی

دەستووریانەی پارێزگاکانی بەسرە و ئەنبار و سەڵاحەددین و دیالەی ڕەتکردەوە کە دەیانویست هەرێمی فیدراڵیی دامەزرێنن، نازانین مالکی لەسەر چ بنەمایەك مافی بەخۆیدا ئەو داوایانە ڕەت بکاتەوە و بیانووی جیاجیا بهێنێتەوە و بڵێت ئێستا کاتی نیە هەرێمی نوێ لە عێراق پێکبهێنرێت ؟ کەچی لە کاتی نوسینی پرۆژەی دەستور مالکی لە هەموویان سورتر بو بو فیدرالی بەلام ئیستا دژیەتی چونکەپێی وایە ئەو ئیستا حاکمی هەموو عیراقە و فیدرالی لە دەستەلاتی ئەو کەم دەکاتەوە .

## ٢- پرسی پێشمەرگە (پاسەوانی هەرێم):

### أ- خەرجییەکان (مووچە – پڕچەك کردن - پێداویستی)، واتە نفقات (الرواتب التسليح – التجهيز):

لە ساڵی ٢٠٠٧ ەوە بەڕێز نووری مالکی لە کۆبوونەوەکانی ئەنجومەنی وەزیراندا ئیمزا لەسەر یاسای بودجە دەکات و لە ئەنجومەنی نوێنەرانیش پەسەند دەکرێ“ تازە بە تازە مالکی دێت و دەڵێ دانانی ئەو بڕگەیە لە نێو یاسای بودجە نادەستووریە!!، ئەگەر نادەستورییە“ هەڵەیەکی ئەوها زەقی نادەستووریی چۆن ئەوە شەش ساڵە بەسەر ئەنجومەنی نوێنەراندا تێپەڕ دەبێ؟!.

لە بڕگەی پێنجەمی یاسای موازەنەی گشتیی عێراقی فیدراڵی ساڵی ٢٠٠٧دا هاتووە:" ڕێککەوتن لە نێوان سەرۆك وەزیران و سەرۆکی هەرێم دەکرێ سەبارەت بە نەفەقات و چەکدارکردن و تەجهیزکردنی پاسەوانی هەرێم وەك بەشێك لە مەنزومەی بەرگریی عێراقی".

لە بڕگەی نۆیەمی یاسای موازەنەی گشتیی عێراقی فیدراڵی ساڵی ٢٠٠٩و لە بڕگەی پێنجەمی یاسای موازەنەی گشتی عیراق فیدرالی هەردو سالی ٢٠١١و٢٠١٢ دا هاتووە ( لەسەر سەروکی ئەنجومەنی وەزیرانی فیدراڵ پیویستە ڕێکەوتن لەگەل سەروکی هەرێمی کوردستان بکات سەبارەت بە نەفەقاتی (موچە و چەکدار کردن و تجهیز کردن )ی هێزەکانی پاسەوانی هەرێم ( پێشمەرگە)بەلام هەم دیسان هیچی نەکرد.

هەر سەبارەت بە بودجەی پێشمەرگەی کوردستان، مالکی بەڵێنی بە بەڕێز سەرۆکی کۆماری عێراقی فیدراڵ دابوو بودجەی (٧٠٠٠٠) هەفتا هەزار پێشمەرگە دابین بکات، کە ناوەرۆکی ئەو بەڵێنە بە بەڕێزان سەرۆکی هەرێم و جێگری سەرۆکی ئەمەریکا جۆ بایدنیش ڕاگەیەنرا بوو، کوا بەڵێنەکەی؟!. سەرەڕای ئەم هەموو راستییانە" کەچی دەبینین سەرۆك وەزیران دەڵێ پێویستە نەفەقاتی پێشمەرگە لەسەر ١٧٪هەرێم بێ!!، بێجگە لەوەش سەرۆك وەزیران لە ٢٠١٠/٤/١٦ و لە وەڵامی بەڕێز فەریق باربیرۆ فەرماندەی هێزەکانی ئەمەریکا لە عێراق نووسیویەتی: (.. سوپاستان دەکەین کە بەشداریتان کردووە لە مەشقپێکردن و دابینکردنی پێداویستی بۆ لیوایەکانی پاسەوانی هەرێمی کوردستان بۆ ئەوەی بتوانن لە بری حکوومەتی فیدراڵ ئەمن و ئاسایشی هەرێم بپارێزن.. من پاڵپشتیی لەو کارەتان دەکەم کە ئەو هێزانە مەشقیان پێ بکرێ و پێداویستیی سەربازیی ئەمەریکییان بکەوێتە دەست....)، ئەمە ئەگەر دووفاقی و ئیزدیواجییەت نەبێ، دەکرێ چ ناوێکی لێ بنرێ؟!!!.

هەر بۆ زانین" لە ساڵی ٢٠٠٧وە تا ساڵی ٢٠١٢، وەزارەتی بەرگریی عێراقی فیدراڵ مەبلەغی (٣٦،٠٦٦،٥٤٩) سی و شەش ترلیۆن و شەست و شەش ملیار و پێنجسەد و چل و نۆ ملیۆن دیناری لە نەفەقاتی سیادی بۆ خەرج کراوە کە بەشی وەزارەتی پێشمەرگە لەو مەبلەغەیە دەکاتە (٦،١٣١،٣١٤) شەش ترلیۆن و سەد و سی و یەك ملیار و سێ سەد و چواردە ملیۆن دینار، بەڵام هیچی لەو بەشەی خۆی پێ نەدراوە!.

بێجگە لەوەش، ئەوە ماوەیەکە ڕێگا نادەن ئەو کەرەستە و پێداویستییە سەربازیانەی ئەمەریکا بگاتە هەرێمی کوردستان کە لە سەربازگەی (تاجی) بۆ هێزەکانی پێشمەرگە تەرخان کراوە.

### ب – پێکهێنانی دوو فرقە سەربازیەکەی هەرێم:

لە ماددەی (٩)ی دەستووری عێراقدا هاتووە کە " هێزەچەکدارەکانی عێراق و دەزگا ئەمنییەکان لەپێکهاتەکانی گەلی عێراق پێك دەهێنرێن بە شێوەیەك کە هاوسەنگیی و هاوتایی لەبەرچاو بگیرێ بەبێ جیاکاریی و پەراوێزخستن....".

بەڵام بەپێی ئەو ئامار و داتایانەی لەلایەن لیژنەی هاوسەنگیی وەزارەتی بەرگریی عێراقەوە لە ساڵی ٢٠٠٧ کرا بوو، ڕێژەی کورد ٧٪ بو (ئەو ڕێژەیە ئێستا بۆ کەمتر لە ٤٪ نزم بۆتەوە)، کەپێویستە لە نێوان ١٧٪ تا ٢٠٪ بێ.هەر بۆ زانین" بەپێی ئامارەکان ئێستا

ژمارە و ڕێژەی بوونی کورد لەپێگەکانی وەزارەتی بەرگریی و نـاوخۆ و ئـەمنی نیشـتیمانی و دەزگـا ئەمنیـەکانی عێراقـی فیـدراڵ لـە نێـوان ٦٪ بـۆ ٧٪ دایـە.ژمـارەی ئەفسـەرەکانی بەڕێوەبەرایەتییەکانی وەزارەتی بەرگریی عێراق (٤٠٧) چوار سەد و هەفت ئەفسـەرن، تـەنیا (٢) دوو ئەفسەری کورد لە ناویاندان، کوا ئەو هاوسەنگییەی دەستوور باسی دەکات؟!.بۆیە لە سـاڵی ٢٠٠٨ لیژنەیـەك لـە نێـوان لایەنەپەیوەندیـدارەکانی عێـراق و هـەرێم پێکهێنـرا و کۆبوونەوەکانی ئەو لیژنەیە ئەنجامی باشی لێکەوتەوە، بەڵام دوای ئەوە بـەبێ هـیچ پاسـاوێك کۆبوونەوەکان لەپڕ ڕاگیران!!!. پێکهێنـانی دوو فرقـە سـەربازیەکەش هـەر بـۆ گەڕاندنـەوەی هاوسەنگیی ڕێژەی کورد بوو کە مالکیش لەسەری ڕازی بوو.

بۆیە بەڕێز مالکی لە ٢٠٠٧/٩/٢٢ ئەمری دیوانیی ژمارە(٨٦)ی دەرکـردووە سـەبارەت بەپێکهێنانی دوو فرقەی پیادە بۆ هەرێمی کوردستان (کە تا ئێستا جێبەجێی نەکردووە!!)، لە بڕگەی (٢) ئەمرەکەدا هاتووە: (سەبارەت بە دیاریکردنی شـوێنی بارەگـا و نیشـتەجێبوون و مەشقپێکردن و دابینکردنی چەك و پێداویستی و ئالیات بۆ ئەو دوو فرقەیە، بەپێی پلانێکـی هەماهـەنگی دەبـێ لـە نێـوان سـەرۆکایەتی هـەرێم و وەزارەتـی بـەرگریی و فەرمانـدەیی گواستنەوەی ئەمنیی هێزە فرەڕەگەزەکان).

وەك ئاماژەمان پێکرد کەلە ساڵی ٢٠٠٧وە هەرێمی کوردسـتان بـە بـەردەوامیی داوای پێکهێنانی ئەو دوو فرقە سـەربازییە دەکـات، بـەڵام تـا ئێسـتا پێـك نـەهێنراوە و پاسـاوی مالکیش بۆ ئەو دواخستنە ئەوەیە گوایە بەڕێز سـەرۆکی هـەرێم پێکهێنـانی ئـەو دوو فرقـە سەربازیەی ڕەتکردۆتەوە!!!، ئەگەر قسەکانی مـالکی ڕاسـت بـێ" بۆچـی دەبـێ حکوومـەتی هەرێمی کوردستان بە نووسراوی ژمارە (٢٦٩٣) لە ٢٠١١/١٠/٢٧ داوا لـە مـالکی بکـات کەپێویستە ئەو ئەمرەی خۆی جێبەجێ بکات، هەروەها بە نووسراوی ژمارە (٢٦٢)ی ئەمساڵ لە ڕۆژی ٢٠١٢/١/٣٠ جارێکی دی هەمان داوا لە مـالکی بکـات بـۆ ئـەوەی فـەرمان بـە وەزارەتی بەرگریی عێراق بکات بە مەبەستی جێبەجێ ئەو (ئەمرە دیوانی)ە؟!!.

### ج بەکارهێنانی سوپا لەکاروباری سیاسی وململانێی ناوخۆیی:

لە بڕگەی (أ)ی ماددەی (٩)ی دەستووردا هاتووە کە ".. نابێ هێزەچەکدارەکانی عێراق و دەزگا ئەمنییەکان بۆ داپڵۆسینی گەلی عێراق بە کار بهێنـرێن و دەسـت وەربدەنـە کاروبـاری سیاسی....).

مالکیش له دیدارەکەیدا دەڵێ:( ئومێدی ئەوە لە عاقڵمەندەکانی کوردستان و ناوەڕاست و باشوور دەخوازم دۆخەکە بەرەو ئاستی هەڵگیرساندنی شەڕ نەبرێ،بەڵام زۆر بە داخەوە من گوێم لە تەپڵی شەڕ دەبێ لە کوردستان....). هەروەها دەڵێ: (.. ڕێگا نادەم یەك گوللە لە کوردستان بتەقێنرێ، بۆ ئەوەی جارێکی دی کوردستان نەگەڕێنرێتەوە نێو دۆخی شەڕ و کێشە. دەبێ کار بۆ ئەوە بکەین جارێکی دی ڕۆژگاری مەینەتی بەسەر گەلی کورددا نەیەتەوە و دکتاتۆریەت و کوشتن و چەرمەسەریی بەسەریدا دووبارە نەبێتەوە....) و خۆی بە دڵسۆز تر و پەرۆش تر لە سەرکردایەتی سیاسی کورد بۆ گەلی کوردستان پیشان دا !!. بەڵام هەر مالکی بوو کە لە ڕۆژی٢٠١٢/٥/٨ هاتە کەرکووك و فرقەکانی ٥ لە دیالە و ٤ لە تکریت و ١٢ لە کەرکووك و ٣ لە سنووری هەولێر و ٢ لە مووسڵی خستە ئینزارەوە، دوو کەتیبەی تۆپخانە و فرقەی ١٧ی لە باشووری کەرکووك جێگیر کرد،.ئەگەر مەبەست لەم ڕەفتارە هەڵگیرساندنی ئاگری شەڕ نەبێ، مالکی چۆن ئەو هێزانە بەسەر دوو هێڵیدا دابەش دەکات و هاوکات بڕیاری ناردنی چەك و تەقەمەنی بۆ هێڵی دووەمی ئەو هێزانە دەدات، لە بەر ئەوەی بەپێی بنەما و پرانسیپی سەربازیی تەنیا بۆ حاڵەتی شەڕ و ڕووبەڕووبوونەوە تەقەمەنی بۆ هێڵی دووەم دابین دەکرێ، کەچی ئەو چەك و تەقەمەنی بۆ هەردوو هێڵەکە دەستەبەر کردبوو!!!.

لە کۆبوونەوەی لیژنەی باڵای کاری هاوبەش (ئێس دەبلیو جی)ی نێوان وەزارەتی پێشمەرگەی هەرێمی کوردستان و وەزارەتی بەرگریی عێراق و ئەمەریکیەکان کە لە ڕۆژی ٢٠١٢/٥/١٩ لە بەغداش سازکرا" لایەنی ئەمەریکی ئەو قسانەی نوێنەرانی وەزارەتی پێشمەرگەیان دووپات کردەوە و گوتیان: ڕاستە" ئێمە بە مانگی دەستکرد (قەمەر سناعی)چاودێری ئەو ناوچانەمان دەکرد کە هێزەکانی سوپای عێراق لەو ڕۆژەدا جووڵەیان پێدەکرا و ئەوەمان بەدی کرد کە لوولەی تۆپەکان ڕوویان لە کوردستانە و زەخیرەش لە تەك تۆپەکان دانرا بوون. دواتر لایەنی عێراقییش نەیانتوانی ئینکاریی بکەن" بۆیە دانیان بەو ڕاستییە دانا و گوتیان: (ئەمرمان پێکرا بوو ئەو کارە بکەین !). ئەو ڕەفتار و نیازەی نووری مالکی شتێکی سەیر نیە و نوێش نیە، لەبەر ئەوەی لە ساڵی ٢٠٠٨ کاتێك گرفتێکی بچووك لە خانەقین ڕوویدا، ئەو کاتەش مالکی بەم شێوەیە جووڵایەوە و فەرمانیدا کەتیبەیەکی تانك بۆ خانەقین ڕەوانە بکرێت بۆ شەڕی پێشمەرگە!. باشە کەسێك سەرۆك وەزیران بێت و لەبەر گرفتێکی بچووك ئامادە بێ تانك و زرێپۆش ڕەوانە بکات، ئەگەر گرفتی گەورەتر ڕووبدات و فرۆکەی (ئێف ١٦)ی لەبەر دەستدا بێت چاوەڕوانیچی لێ بکرێ!.

### د –رەفتاری نایاساییانە و پێکهێنانی هێز لە دەرەوەی یاسا:

بەڕێز مالکی خۆی وەك تاقە بەرگریکار لە دەستوور و یاسا پیشان دەدات!، بەڵام سەرکردایەتی گشتیی هێزەچەکدارەکان کە خۆی فەرماندەیەتی، هەتا ئێستا یاسای نیە و بە بێ بوونی هیچ یاسایەك ئەوەی خۆی بیەوێ دەیکات و تەواوی دەسەڵاتەکانی لەخۆیدا کۆکردۆتەوە. وەزارەتی بەرگریی عێراقیش بە هەمان شێوە هەتا ئێستا بێ یاسایە و بەیاسای کۆنی رژێمی سەددام بەڕێوە دەچێ!!!.

دەزگای قەلاچۆکردنی تیرۆر" بێجگە لەوەی وەك دامەزراوە ناوی لە هیچ پێکهات و هەیکەلییەتێکی سەربازیی و ئەمنیدا نیە، تا ئێستا بەبێ بوونی هیچ یاسایەك دەستبەکارە و سەرۆك وەزیران هەر رۆژەو بە دەزگا و دامەزراوەیەکەوە دەیبەستێتەوە!!!.

### هـ - گوایە سەرۆك وەزیران مافی جووڵەپێکردنی پۆلیسێکی نیە!.

جەنابی سەرۆك وەزیران لە دیدارەکەیدا دەڵێ:( پێویستە لە کوردستان هێزێکی فیدراڵی هەبێ بۆپاراستنی سنوورەکان ئەگەر سەروەریی عێراق رووبەڕووی مەترسی بۆوە، ئەمەش رۆڵی حکوومەتی فیدراڵەپێی هەڵبستێ، بەڵام ئایا ئێمە مافی جووڵەپێکردنی یەك پۆلیسمان هەیە لەناو خاکی هەرێم؟).

ئەم قسانەی مالکی هیچ بنەمایەکی راستی تێدا نیە" بەڵگەشمان بۆ ئەوە: لە ئێستادا (٣) لیوای پاسەوانی سنووری سەر بە وەزارەتی ناوخۆی عێراق لە هەر سێ شارەکەی هەرێم هەیە و ژمارەیان دەگاتە (١٥) پازدە هەزار پۆلیس کە فەرمان و مووچە و ئیدارەیان لە بەغداوەیە، وەك پۆلیسی گومرك و پاسپۆرت و نشینگە و رەگەزنامە لە هەرێمی کوردستان کە سەر بە وەزارەتی ناوخۆی عێراقن. جگە لەمانەش" لە هەموو پارێزگاکانی هەرێم بارەگایەکی بەڕێوەبەرایەتی ئاسایش و هەواڵگریی وەزارەتی بەرگریی عێراق هەیە، ئەگەر ژمارەی هەموویان کۆ بکەینەوە دەتوانین بڵێین زیاتر لە (٢٠٠٠٠) بیست هەزار چەکداری سەر بە دامودەزگاکانی حکوومەتی عێراق لە هەرێمی کوردستان بوونیان هەیە و ئەرکی خۆیان جێبەجێ دەکەن بێ ئەوەی هەرێم دەست لە کاروباریان وەربدات.

**و - دانانی فەرماندە سەربازیەکان بەبێ گوێدانە دەستوور و ئەنجومەنی نوێنەران:**

بڕیار و ڕەفتارە نادەستووریەکانی نووری مالکی ئەوەندە زەق و بەرچاون پێویست بە لێوردبوونەوە ناکات، ئەوەتا بەڕێزیان بە ئاشکرایی تەحەددای بڕگە (پێنجەم)ی ماددەی (٦١)ی دەستوور دەکات کە دەڵێ" ئەنجومەنی نوێنەران ڕەزامەندیی لەسەر دامەزرانی:( سەرۆکی ئەرکانی سوپا و یاریدەدەرانی و ئەوانەی لەپلەی فەرماندەی فرقە و سەرووترن و سەرۆکی دەزگای هەواڵگریی دەدات کە لەلایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوەپێشنیار دەکرێن).

بەڵام لە ڕاستیدا" جەنابی مالکی بەتاقی تەنیا ئەو دەسەڵاتە دەستووریەی لە ئەستۆگرتووە و تا ئێستا هەر خۆی کەسانێکی بۆ ئەو پلە و پۆستە سەربازی و ئەمنییانە دامەزراندووە، بەبێ ئەوەی بگەڕێتەوە بۆ دەستوور یان تەنانەت ڕاوێژێك بە ئەنجومەنی نوێنەران بکات!!!.

فەرموون با پرسیار ئاراستەی بەڕێزان سەرۆکی ئەنجومەنی نوێنەران و پەرلەمانتاران بکرێ، تا چەند ئاگاداری دانانی ئەو فەرماندەی فرقە سەربازیانەن کە لەلایەن مالکییەوەپلەیان دراوەتێ؟!، یان تەنانەت هاوپەیمانیی نیشتیمانیی لەو پرسە ئاگادارە؟!. بێجگە لەوەش" ئێستا (٢٨٠) دووسەد و هەشتا ئەفسەری پایە بەرز کە بەر (لێپێچینەوە و دادپەروەریی — المسائلە والعدالە) کەوتوون شوێنی گرنگیان لەناو مەراتبی سوپای عێراقیدا پێدراوەتەوە، چونکە وادیارە هەر ئەفسەرێك ئەگەر وەلائی خۆی بۆ مالکی پیشان بدات، یەکسەر لە ناو سوپای عێراقدا شوێنی گرنگتری پێ دەدرێت و ئیمتیازاتی زیاتر دەیگرێتەوە!!!. لەوەش زیاتر" سەرۆك وەزیران بڕگەیەکی دیکەی دەستووری پێشێل و بلۆك کردووە کە تایبەتە بەیاساکاریی خزمەتی ئاڵای وڵات یاخود خزمەتی بەجێگەیاندنی ئەرکی سەربازیی. بڕگەی (دووەم)ی ماددەی (٩)ی دەستوور دەڵێ:" خزمەتی ئاڵا بەیاسا ڕێك دەخرێ". بەڵام وا دیارە یاسایەکی لەم شێوەیە ئەگەر بوونی هەبێ، ئەو کاتە بەڕێز مالکی ناتوانێ بە ویست و ئارەزووی خۆی سوپایەکی زەبەلاحی ملیۆنی پێك بهێنێ!!!.

هەڵبەت لە سایەی بەردەوامبوونی دۆخێکی لەم شێوەیەی باسمان کرد کە تێیدا یاسا و دەستوور بوونیان نیە وجەنابی مالکی بەزۆری زۆردارەکی سەپاندوویەتی، هەر ئەو ئەنجامەی لێ دەکەوێتەوە کە لە دیدارەکەیدا بە ئاشکرایی بڵێت:" مەودای دەسەڵاتی فەرماندەی گشتیی هێزەچەکدارەکان لە دەستووردا کراوەیە، فەرموون دەستوور بگۆڕن"!!!. بەڵام ئەگەر جەنابیان کەسێکی پەرۆشی یاسا و دەستوور بێ وتا ئێستا بەپێویستی نەزانیوە ئەنجومەنی وەزیران پەیڕەوێکی ناوخۆی هەبێ؟! کە ماددەی (٨٥)ی دەستوور دەڵێ" پێویستە:" ئەنجومەنی

وەزیران پەیڕەوێکی ناوخۆ دابنێ بۆ بەڕێوەبردنی کارەکانی". مەبەست لە نەبوونی ئەو پەیڕەوەش روون و ئاشکرایە" تاوەکو جەنابی مالکی بتوانێ بە بێگەڕانەوە بۆ ئەنجومەنی وەزیران بە کەماڵی ئیسراحەت بریار بدات و حوکمرانیی بکات، بەمەش رێگە لە بەردەم شەراکەتی راستەقینە لە ئیدارەکردنی حکوومەت بگرێ!.

### ٣ – بەستنەوەی گشت دەستەجیاجیاکان بەخۆیەوە:

لە ماددەی (١٠٢)ی دەستووردا هاتووە:" کۆمسیۆنی باڵای مافەکانی مرۆڤ و کۆمسیۆنی باڵای سەربەخۆی هەڵبژاردنەکان و دەستەی گشتیی نەزاهە دەستەی سەربەخۆن و لەژێر چاودێریی ئەنجومەنی نوێنەراندان و کارەکانیان بەیاسا رێك دەخرێ". بەڵام عێراقییەکان ئاگادارن کەچۆن جەنابی مالکی هەوڵی داوە دەست بەسەر ئەو هەیئاتانەدا بگرێت و بیانخاتە ژێر رکێفی خۆیەوە، دوایین هەوڵیشی ئەوەبوو دەست بەسەر بانکی مەرکەزیدا بگرێ. لە رێگەی میزانیەی تەشغیلییەوەش دەیەوێت عێراق بکاتە کۆمەڵگایەکی سەربازیی کە تەنیا وەلائی بۆ ئەو هەبێت.

### ٤ – خۆدزینەوە لە جێبەجێکردنی ماددەی (١٤٠):

جەنابی مالکی لە خاڵییەکەمی بەرنامەی حکوومەتەکەیدا جەخت لەسەر (.. بەدواداچوونی کاری ئەو لیژنانەی بەپێی دەستوور پێکهێنراون و بە تایبەتی ماددەی ١٤٠....) دەکات، خۆیشی لەو دیدارەیدا وەك لەسەرەتادا باسمان کردووە، دەڵێ:(.. ئەم ماددەیە ( واتە ماددەی ١٤٠) یان ئەوەتا کەسێك نووسیویەتی کە نەزان بووە، یان بە ئەنقەست ئەو ماددەیەی داناوە کە هیچ کەڵکێکی لێ بەدی ناکرێ وەك ئامرازێك بۆچارەسەرکردن....)، لە شوێنێکی دی دەڵێ:( ئێمە لایەنییەکەمی ئەو ماددەیەمان جێبەجێ کردووە کە لە ئەستۆی خۆمان بووە وەك دەسەڵاتی جێبەجێکار. قۆناغی دووەمیش دیاریکردنی سنووری ئیداریی نێوان پارێزگاکانە و بەرپرسیارێتی ئەمەیان لە ئەستۆی من نیە بەڵکو لە ئەستۆی دەستەی سەرۆکایەتی کۆمارە...).

بەڕێز مالکی بە قسە لەگەڵ جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوورە" ئەگەرچی ئێستا ئەندامانی لیژنەی نووسینەوەی دەستوور بە نەزان و دەستی ئەنقەست تۆمەتبار دەکات!،

کەچی خۆی یەکێك بووە لە ئەندامانی ئەو لیژنـەی. هاوکـاتیش بـە کـردار و نهـێنی ئـەوەی لەدەستی هاتبێ بۆ دژایـەتیکردنی ئـەو ماددەیـە تەخسـیریی نـەکردووە، چـەند کەسـانێکی ناسراوی شۆڤینیی لای حەویجـەی هانـداوەو بـە بەخشـینەوەی ئیمتیـازات و بەڵێنـدان پێیـان دژایەتی کوردیان پێ دەکات، چەندین جاریش لای ئێمە دەیگوت" باشترە کەرکووك بـۆ کـورد بێت نەك بۆ ئەو تیرۆررستانە!!!. لەلایەکی دیکەشەوە، مالکی بەرپرسیارێتی جێبەجێ نەبوونی ماددەی ١٤٠ لەسەر خۆی لادەدا و دەیخاتە ئەستۆی دەستەی سەرۆکایەتی کۆمار و فەخامەتی سەرۆك کۆمار، ئومێدمان وایە جەنابی سەرۆك کۆمار وەڵامیان بداتەوە.

### ٥ - مالکی و گەندەڵی:

بەڕێز مالکی لەو دیدارەیدا باسی گەندەڵیی کردبوو، ئێمـە سـەبارەت بـەو گەندەڵییانـەی لەسایەی مالکیدا دەکرێن تەنیا دوو نموونە باس دەکەین:

**أ** - بەپێی بڕیاری سەرۆك وەزیران ژمارە (٩٣)ی سـاڵی ٢٠١١ و لەسـەر داوای جێگـری سـەرۆك وەزیـران بـۆ کاروبـاری وزە، بـە نووسـراوی ژمـارە (م.خ/٣٩٨) لـە ٢٠١١/٣/٢٩" گرێبەستێکی وەهمی لەگەڵ ژمارەیەك کۆمپانیای وەهمی بەسـتراوە بـۆ بەرهـەمهێنانی ٥٠٠ مێگاوات کارەبا بەرامبەر بە (٦،٣٤٨،٠٠٠،٠٠٠) شەش ملیار و سێ سەد وچـل و هەشـت ملیۆن دۆلار، بەڵام لە راستیدا نە کارەبا بەرهەم هات و نەپارەکەش دیارە!. لـە کاتێکـدا لـە ساڵی ٢٠٠٦ەوە بەڕێز مالکیبە سەدان ملیار دۆلاری لەبەر دەستدا بووە، کەچی نە کارەبای بۆ هاوڵاتیـان دابـین کـرد و نـە خزمەتگوزارییـە بنەڕەتییەکانیشـی پێشـکەش بـە ناوچـە هەژارنشینەکان کرد!.

**ب** - بەپێی نووسراوی دیوانی رەقابەی مالی (٣٧٨٧/١/٣/٤)، وەزارەتی بازرگانی عێراق لە ساڵی ٢٠٠٨ هەڵساوە بە کڕینی زەیت و رۆن کە دەکاتە (١٧٨، ١،٢٨٦) تۆن، لە کاتێکدا بەپێی پلانی ساڵانەی (الشرکە العامە لتجارە المواد الغزائیە)، عێراق ساڵانەپێویستی تەنیا بە (٤٧٣٠٠٠) تۆنە، جگە لەوەش، دزییەکی ئاشکرا لـە نرخەکـەدا کـراوە، چـونکە بـەپێی هەمان نووسراو، نرخی زەیتەکە (١٣٣٥) دۆلار بووە، بەڵام بە (٢٤٠٠) دۆلار عەقدی بـۆ کراوە، بەهەمان شێوە بۆ شیر کە نرخەکەی (٥٤٣٥) دۆلار بووە، بەڵام ئەوان بـە (٦٣٥٠)

دۆلار عەقدیان بۆ کردووە. سەرەڕای ئەو دزییە گەورەیە، لەبەر ئـەوەی وەزیـری بازرگـانیی پێشوو سەر بەخۆی بووە، جەنابی مالکی ئەو مەلەفی گەندەڵییەی بۆداپۆشیوە!.

ج — وەزارەتی دارایی هەرێم وەڵامی تۆمەتەکانی مالکی دەداتەوە دەربارەی گومرگ و بابەتی دارایی.

لە کۆتاییشدا“

بەبیر بەرێز مالکی دهێنینەوە وە دەڵێن : سەرەرای هەمو ئەو رێککەوتنانـەی هـەبووە لە نیوان هاوپەیمانی نیشتیمانی و هاوپەیمانی کوردسـتانی، ریککـەوتنێکی دوو قـۆڵی لـە نێوان سەروك بارزانی و مالکییدا ئیمزا کراوە لە رۆژی ٢٠١٠/١١/٨ لە سەر داوای خودی مـالیکی کە دەیگوت من دلنیاییم زیاتر دەبێت بۆ هاوکاری و ئایندە .

بە داخەوە جەنابی مـالیکی هەر کە دووبارە بوو بـە سـەرۆکی ئەنجومـەنی وەزیـران نـە ریککەوتنـەکانی لـە بـیر مایـەوە نـە ریـزی لـە ئیمـزای خـوی گـەرت. هـەر ئەوەنـدە رێککەوتنەکان لای ئەو گرنگ بوون تا بگاتەوە کورسیەکە . بەراستی کارەسـاتە کەسـێك بەرپرس بێت نە وەفای هەبیت و نە رێز لەپەیمان بگرێت .

--جەنابی مالکی خۆی لە سەروکی هەرێم بەپەروشتر دەزانیت بو کوردستان .!

پەروشیەکەی ئەو لەو بەلگەیەدا بەدەردەکەویت کەچۆن وەلامی جیگری وەزیـری نـاوخو بو کاروباری پولیس دەداتەوە کەژمارەیکی زور پولیس و ئاسایش لە کەرکوك شەهید بوون لە ئەنجامی کارێکی تیروریستی لە رۆژی٢٠١١/٥/١٩ .

جەوهەری مالکی و ئەو پەرۆشیەی بۆ کوردستان لەو تێبینیەیدا بەدیاردەکەوێت کـاتیَ وەڵامی پێشنیارەکەی وەزیری ناوخۆی فیدراڵ دەداتەوە دەربارەی چـۆنیەتی هاوکـاریکردنی شەهید و بریندارانی روداوە تیروریستیەکە کە چـۆن بـۆ شـەهید و بریـندارانی کـورد رازی نەبووە هاوکاریەکە سەرف بکریَ و نووسیویەتی( موافق علی الفقرە (١)،واتە رازی نـەبووە بو خالی (٢) ) کە ئەویش هاوکاری شەهید و برینداری کوردە. ئایا ئەم بەلگەیـە وەلامـی هەمو پرسیارێك ناداتەوە ؟

وا پیَ دەچیت مالیکی خوی لێگـوراوە، بـە هـەمو عـەقلی خـوی وا دەزانـی حـاکمی موتەلقی عیراقە .

ئەو بە تەوافق بوتە سەروکی ئەنجومەنی وەزیران وە لە سەر بناماکـانی ریککەوتنـەکان کە هەموی بەلاوە ناوە بەدەستوریشەوە.

ئەو وادەزانیت هەرێمی کوردستان چەند پارێزگایەکە دەبـێ سـەر بـە خـوی بـن و ئـەو مافانەی کەدەستور بـە هـەرێمی کوردسـتانی داون هـەموویانی لـێ بسـتێنێتەوە . واتـا گەرانەوەی عیراق بو حوکمی تاکە کەسی . نە بروای بە دیموکراسی هەیە نە بە فیدرالی نـە بەپێکەوەژیان. و عەرب گوتەنی ( من جرب المجرب حلت به الندامه).

دوا قسەشمان بۆ مالکی و ئەوانەی وەك ئەو بیر دەکەنەوە" رستەیەکی دیباجە و ماددەی (١)ی دەستووری هەمیشەیی عێراقە کە بڕوامـان پێیـەتی" لەبـەر ئـەوەی ئێمـە رێـز لـە ئیرادەی زیاتر لە (٨٠٪)ی گەلانی عێـراق دەگـرین کـە دەنگیـان بـۆ داوە. لـە دیباجـەی دەستووردا هاتووە:(پابەندبوون بەم دەستوورە" زامنیپاراستنییەکێتی ئارەزوومەندانەیگەل و ئەرز و سەروەریی عێراقی فیدراڵە).

لە ماددەی یەکـەمی دەسـتووری هەمیشـەیی عێراقیشـدا هـاتوو:( کۆمـاری عێـراق دەوڵـەتێکی فیـدراڵی یـەکگرتووی سـەربەخۆی خـاوەن سـەروەریی تـەواوە، سیسـتەمی حوکمڕانیی تێیدا کۆماریی پەرلەمانیی دیموکراتییـە. ئـەم دەسـتوورەش زامـنی مانـەوەی عێراقە بەیەکگرتوویی).

ئەوەی لەم وەڵامەدا هاتووە، تەنیا باسکردن و خستنەڕووی کۆمەڵێك بەڵگەن" پاڵپشت بە دەستوور و یاسـا و بڕیـار و ڕێککەوتنـەکان، ئـەگینا دۆسـیەی گەنـدەڵیی و دۆسـیەی هەستیار و مەترسیدارمان لەلا هەیە بیانخەینە ڕوو، ئەگەر پێویسـتی کـرد لـە داهـاتوودا ئەوانیش بڵاو دەکەینەوە.

**دیوانی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**
**٢٠١٢/٥/٢٤**

هاوپێچ/ دوو بەڵگەنامە

١- ڕێککەوتنی سەرەتایی نێوان سەرۆك بارزانی و نووری مالکی

٢- نووسراوێکی وەزارەتی ناوخۆی عێراق

## کۆبوونەوەیەکی راوێژکاری لە نێوان ئیئتیلافی ئەلعێراقیە و کوتلەی ئەحرار و هاوپەیمانی کوردستانی و لایەنی دیکە

ئێوارەی ئەمڕۆ ٢٠١٢\٥\٢٨ لە هەولێر بە سەرپەرشتی بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان و ئامادەبوونی ئیئتلافی ئەلئێراقیە و کوتلەی ئەحرار و هاوپەیمانی کوردستانی و لایەنی دیکە بۆ تەواوکردنی کۆبوونەوە راوێژکارییەکانی هەولێر و نەجەفی ئەشرەف کۆبوونەوەیەك بەڕێوەچوو بە ئامانجی راستەڕێکردنی رەوتی پڕۆسەی دیموکراتی و دانانی ئاستێك بۆ بەرنامەی تاکڕەوەی لە بەڕێوەبردنی ولات، دواتر ئەم بەیاننامەی خوارەوەیان بلاوکردەوە .

**بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان**

بۆ تەواوکردنی کۆبوونەوە راوێژکارییەکانی لە هەولێر و نەجەفی ئەشرەف گرێدران بە ئامانجی راستەڕێکردنی رەوتی پڕۆسەی دیموکراتی و دانانی ئاستێك بۆ بەرنامەی تاکڕەوی لە بەڕێوەبردنی ولات و دەستکردن بە پڕۆسەی بنیادنانی راستەقینە بە شێوەیەك یەکێتی گەلی ئێراق و پێشکەوتنی دابین بکات، ئەمڕۆ ئێوارە هێزە نیشتمانیەکانی ئیمزایان لەسەر یاداشتنامەی راوێژکاری رۆژی ٢٠١٢\٤\٢٨ هەولێر و دۆکیومێنتی نەجەفی ئەشرەف رۆژی ٢٠١٢\٥\١٩ کردووە، کە دواتر بە دوای داهات کۆبوونەوە و ئامادەبووان

دووپاتیان لە پابەندبوونیان بە جێبەجێکردنی سەرجەم ئەو بڕیارانە کردەوە کە لە کۆبوونەوەی نەجەفی ئەشرەف ڕێککەوتنی لەسەرکراوە، هەروەها دووپاتیان لە درێژەدان و فراوانکردنی ئەو کۆوبوونەوە راوێژکاریانە لە رۆژانی داهاتوودا کردەوە بۆ تەواوکردنی تەوافوق لەسەر میکانیزم و رێوشوێنی پێویست بۆ جێبەجێکردنی ئەوەی پێشتر لەسەری رێککەوتوون و دۆزینەوەی چارەسەرێکی نیشتمانی بە پەلە، کە جێبەجێکردنی شێوەی راستەقینەوەی دەستوور دابین بکات.

بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان سەرپەرشتی ئەو کۆبوونەوە راوێژکارییەی کرد بە ئامادەبوونی ئیئتیلافی ئەلعێراقیە و کوتلەی ئەحرار و هاوپەیمانی کوردستانی و لایەنی دیکە.

## لایەنەکانی دیداری ڕاوێژکاریی هەولێر- نەجەف کۆبوونەوەیەکیان سازدا و ڕاگەیاندراوێکیان دەرکرد

٢٠١٢/٦/١٠

لایەنەکانی دیداری راوێژکاریی هەولێر - نەجەف رۆژی ١٠ی حوزەیرانی ٢٠١٢ کۆبوونەوەیەکیان سازدا و بۆ دوایەمین پێشهاتە سیاسییەکان و ئەوەی پێوەندی بە لێسەندنەوەی متمانە لە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانەوە هەیە تەرخان کرا.

بەشداربووانی کۆبوونەوەکە جەختیان لەسەر درێژەدان بە کۆشش و هەنگاوی پێویست بۆ بەدیهێنانی ئامانجەکەیان بە پشت بەستن بە هەموو میکانیزمە دەستوورییەکان و ڕێ خۆش کردن تا بخرێتە واری جێبەجێ کردن کردەوە.

لەم رووەشەوە کۆبوونەوەکە بە داخ و ئەسەفەوە تێبینی ئەو هەنگاو و تەگبیرە نادروستانەی کرد کە سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران و تیمەکەی بۆ شکست پێهێنانی هەوڵە دەستوورییەکان گرتیانە بەر کە بۆ چاککردنی رەوشی سیاسی و سنووردانان بۆ تاکڕەوی و خۆسەپاندن و گۆڕینی ڕێڕەوی پرۆسەی سیاسی دیموکراسی دەدرێن، لەوانەیش هەوڵی گواستنەوەی ئەو جموجۆڵە بۆ ناو شەقام لە رێگەی جووڵاندن و هاندانەوە، بۆ بەرەنگاربوونەوەی ئەو هەوڵانەیش کۆبوونەوەکە جەختی لەسەر درێژەپێدانی پرۆسەی کۆکردنەوەی هێزە پەرلەمانییەکان لە چوارچێوە یاساییەکانەوە بۆ رووبەرووبوونەوەی دیاردەی خۆسەپاندن و تاکڕەوی لە بەڕێوەبردنی حکوومەت کردەوە و هاوکات لێپرسینەوە لەو پێشێلکارییانەی کە لە هەڵسوکەوت کردن لەگەڵ ئەندامانی ئەنجوومەنی نوێنەران و

مافی کارکردنیان بەپێی بۆچوون و بیروڕاکانیاندا کراوە و سەرکۆنەکردنی ئەو فشـارانەی کـە چەندین شێواز بەرامبەریان بە کارهێنراون.

کۆبوونەوەکە بڕیاری دا پەیامێکی روونکردنەوەدار ئاراستەی سەرۆك کۆمـار بکرێـت و تێیدا جەخت لە دروستی ئیمـزای ئەنـدامانی ئەنجوومـەنی نوێنـەران و هاوکـات ژمـارەی پێویستی دەستووریی بۆ متمانە لێ سەندنەوە دەکاتەوە ، کۆبوونەوەکە سەرلەنوێ جـەختی لەوە کردەوە دەبێت هەر جێگرەوەیەك کـە بـۆ سـەرۆکایەتی ئەنجوومـەنی وەزیـران کاندیـد دەکرێت لە هاوپەیمانی نیشتمانی بێت.







كۆمارى عيراق

سەرۆك

**الاخوة الاعزاء**

**الاساتذة مسعود البارزاني و د.أياد علاوي و أسامة النجيفي و السيد مصطفى المحترمين**

**تحية واحتراماً**

تسلمت شاكراً رسالتكم المؤرخه (اربيل – ٢٠١٢/٦/١٠ ) وارى من الواجب أن أجيب عليها بكل صراحة راجياً سعة صدركم وأستميحكم عذراً لما لايرضيكم منها :

ان رسالتكم تتضمن سوء فهم وعدم الدقة فى سرد والمواقف.

اولاً موضوع سحب الثقة من رئيس الوزراء

ورد موضوع سحب الثقة من رئيس الوزراء في اللقاء التشاورى الذي انعقد في اربيل. فكان موقفي الواضح هو انني محايد في الاجتماع بحكم كوني رئيساً للجمهورية لذالك لم اوقع الورقة التي هيأها الاستاذ فخري كريم ولم اسمح لرفاقنا القياديين الموجودين بالتوقيع عليها . ولكني والحق يقال قلت في معرض التعليق على اعتبار سحب الثقة ورقة ضغط وتخويف اذ رفض التحالف الوطني او رئيس الوزراء الالتزام بالمبادئ والاطر الواردة والاتفاقات السابقة فسأطلب من مجلس النواب سحب الثقة.

ولاشك انكم تتذكرون ان التركيز كان على ضرورة تنفيذ الاتفاقات السابقة والمطالب الجديدة للاصلاحات والشراكة وعدم الانفراد بالحكم.

ولكن الذي حدث هو انكم حولتم الموضوع برمته الى سحب الثقة.

١

٢

بسم الله الرحمن الرحيم

جمهورية العراق
الرئيس



كۆماری عیراق
سەرۆك

ثالثاً ملاحظات أخرى

١- لوكنا راغبين في افشال مشروع سحب الثقة لما أضفنا تواقيع نواب الاتحاد الوطني الكردستاني .

٢- طيلة فترة رئاستي لم يتمكن احد من اتهامي بألانحياز الا الى العراقية والكتل المنضوية تحت لوائها كما يشهد بذلك السيدان عادل وطارق اللذين سمعا من دولة رئيس الوزراء الاتهام لي بالانحياز الى الحزب الاسلامي .كما يشهد بذلك وقوفي ضد الاجتثاث للاساتذة صالح مطلك و عدنان الجنابي و اسكندر وتوت الذي اصبحوا نواباً بعد تدخلاتي المتكررة .

٣- هناك نقاط اخرى في رسالتكم لاأريد الرد عليها الأن ولكني ارجوكم منع الناطقين بأسمكم او الصحف القريبة منكم بالكف عن الاستفزاز و الاهانة الي حينما يزعمون باننا انفذ الاوامر الايرانية سابقاً ولاحقا .ارجو علمكم بانني املك الرد المفحم الذي اترفع عنه الأن .

والأن فانني أجدد الدعوة الى الاجتماع الوطني الذي سبق وان اتفقنا عليه مع التحالف الوطني مع الوعد المكتوب مني بانني ساقف معكم اذا رفضو الاتفاقات السابقة وطلباتكم المشروعة الاخرى ارجو سحب للثقة حينئذ من دولة رئيس الوزراء وحدي دون الحاجة الى تواقيع النواب.

رابعاً اسباب رفض سحب الثقة

لقد آن الاوان لاصارحكم بالاسباب الحقيقة التي تدفعني الى رفض تقديم طلب سحب الثقة والتي ليس بينها ابداً سبب الدفاع عن الاستاذ المالكي أو تزكية جميع فعالياته.

٤

جلال طالباني

## بەیاننامەی کۆبوونەوەی نێوان مەکتەبی سیاسیی پارتی یموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

لە درێژەی کۆبوونەوە هاوبەشەکانی هەردوو مەکتەبی سیاسی، ئەمڕۆ دووشەممە ڕێکەوتی ٢٠١٢/٦/١٨ لە سلێمانی، هەردوولا کۆبووینەوە بۆ تاوتوێکردنی بارودۆخی ئێستای کوردستان و پرۆسەی سیاسی لە عێراق و گرنگیی پاراستنی یەکڕیزی لە کوردستان و جەختکردنەوە لە پاراستنی ڕێککەوتنە ستراتیژییەکەمان، وەکو پێویستی ئەم قۆناغەی ئێستای گەلەکەمان تێیدایە و بەهێزکردنی پەیوەندیی دووقۆڵیی هەردوو حزب و لایەنەکانی دیکەی کوردستانیش و دابین کردنی ئاشتیی کۆمەڵایەتی سەبارەت بە ڕووداوەکانی ئەمدواییەی عێراق.

وەکو دوو حزبی هاوپەیمان لەگەڵ ئەوەشدا کە لە چارەسەر و گەیشتن بە ئامانج لە هەندێ بابەتدا لە پرۆسەی سیاسیدا، بۆچوونی جیاوازمان هەیە، بەڵام تێکڕای دید و بۆچوون و شیکردنەوە و ڕوونکردنەوەکان بۆ کامڵترکردن و بەهێزبوونی هەڵوێستەکانمانە بۆ بەرژەوەندیی باڵای نەتەوەیی و نیشتمانی، هەروەکو چۆن لە بنیاتنانەوەی عێراقی نوێ و دامەزراندنی سیستەمێکی دیموکراسی لە عێراقدا هاوهەڵوێستین، هەر ئاواش لەم تەنگژە سیاسیەی ئێستای پرۆسەی سیاسیی عێراق و ڕێگەگرتن لە دروستبونەوەی دیکتاتۆریەت لە هەر ڕەنگ و شێوازێکدا و هەنگاوەکانی پێویست بۆ هێنانەوەی ڕەوتی پرۆسەکە بۆ ڕێچکەیەکی دروست و تەندروست، هاوهەڵوێستین و دژ بە پەراوێزخستن و پێشێلکردنی مافی هەر پێکهاتەیەکی نەتەوەیی، ئایینی و مەزهەبی دەوەستین.

شایانی ئاماژەپێکردنە ی.ن.ك و پ.د.ك لە ڕوانگەی بەرژەوەندی و بەخەمەوەبوونی تەواوی پێکهاتەکانی عێراقی، بە عەرەب و کورد و تورکمان و کلدان و سریان و ئاشوری

لەهەموو بوارەکاندا بەگشتی بە لەبەرچاو گرتنی بەرپرسیارێتیی دەستوری بەڕێز سەرۆك کۆمار لەم هەوڵەی لایەنەکانی بەشدار لــە پرۆســەی سیاســیدا دەیــدەن، لــە چوارچــێوەی دەســتور و بەشێوەیەکی دیموکراسی و ئاشتیانە بۆ کێشانەوەی متمانە لە ســەرۆکی ئەنجومــەنی وەزیرانــی عێراقی فیدراڵ، هاوهەڵوێستین و هەنگاو بە هەنگاو لەگەڵ لایەنەکانی دیکەی کوردســتانی و عێراقی، پێکەوە لە کۆششداین.

هەردوولا بۆ هاوئاهــەنگ کردنــی هــەنگاوە هاوبەشــەکانمان بــەگرنگ زانــرا بــەم زووانــە کۆبوونەوەیەکی هاوبەش بە سەرپەرشتیی بەڕێز سەرۆك مەسعود بارزانی ئەنجام بدرێت.

ئەمەو کۆبوونەوە لە کەش و هەوایەکی شەفاف و لێکگەیشتن کۆتایی هات.

**یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان پارتی دیموکراتی کوردستان**
**٢٠١٢/٦/١٨**

# بەلاغی کۆتایی کۆبوونەوەی هەردوو مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان

ئەمڕۆ شەممە ٢٠١٢/٦/٢٣ بەسەرپەرشتیی سەرۆك بارزانی هەردوو مەکتەبی سیاسی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتی نیشتمانی کوردستان لە هاوینەهەواری پیرمام کۆبوونەوە و راگەیاندراوێکی هاوبەشیان بڵاوکردەوە تیایدا هەردوولا هاوڕایی و سووربوونی خۆیان لەسەر هەوڵەکانی کێشانەوەی متمانە لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق دووپات کردۆتەوە.

**ئەمەش دەقەکەیەتی:**

بەسەرپەرشتی سەرۆك مەسعود بارزانی کۆبوونەوەی هاوبەشی هەردوو مەکتەبی سیاسی لە سەلاحەدین ئەنجامدرا، لەم کۆبوونەوەشدا کە دوابەدوای کۆبوونەوەی هاوبەشی هەردوو مەکتەبی سیاسی لە بەرواری ٢٠١٢/٦/١٨ لە سلێمانی بەڕێوەچوو تەئکید لەسەر یەك هەڵوێستی و هاوپەیمانیەتی هەردوو حزب کرایەوەو سەبارەت بە قەیرانی ئێستای عیراق و پرۆسەی سیاسی بەتێروتەسەلی گفتوگۆکراو هەردوولا هاوهەڵوێست بوون سەبارەت بەمەترسی و نیگەرانییەکانی قەیرانەکە لەسەر بوارە جیاجیاکانی ژیانی سیاسی و سیستمی حوکمڕانی و ئەو ئاڕاستە نادروستەی کە دوچاری رەوشی چۆنیەتی بەڕێوەبردنی وڵات بووەتەوە، کە کاریگەرییەکی نەرێنی کردۆتە سەر پەیوەندییەکانی نێوان لایەن و پێکهاتەکان، کە کاریگەری بەسەر پەیوەندییەکانی دەرەکی عیراقیش داناوە.

بۆ دەربازکردنی عیراق لەم قەیرانەو راستکردنەوەی رەوشی پرۆسەی سیاسی و حوکمڕانی پارتی دیموکراتی کوردستان و یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان وەکو دوو حزب هاوڕاو سورن لەسەر هەوڵەکان بۆ کێشانەوەی متمانە لە سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران لە چواچێوەی رێوشوێنە دەستوری و دیموکراتیەکان و بەهاوبەشی و هاوکاری لایەنەکانی دیکە، بەرەچاوکردنی بەرپرسیارییەتی سەرۆك کۆمارو ئەرکە دەستوری و پابەندییەکانی بەگشتی.

سـەبارەت بەپەیوەنـدی دوو قـۆڵی نێـوان هــەردوولامان تەئکیـد لەســەر بــەردەوامبونی ئیلتزامکردن بە هاوپەیمانی ستراتیجی کرایەوەو کە لە بەرژەوەندی کوردســتان و عــیراق دایــە وەکو چۆن ڕێککەوتنەکە زەرورەتی قۆناغەکە بوو لە ئێستاشدا بــەردەوام بــوون و قۆڵکردنــەو پاراستنیشی زەرورەتی ئەم قۆناغەی ئێستایە لەسەر ئاستی عیراق و کوردستان و ناوچەکەدا.

کۆبوونەوە لە تەوەرێکی دیکــەدا تەئکیــدی کــردەوە لەیــەکڕیزی نێومــاڵی کوردســتانی و بەردەوامی هەوڵەکانی بۆ پاراستنی یەکڕیزی و تەبایی نێوان لایەنە سیاسییەکانی بەشـدار لــە پرۆسەی سیاسی بەلایەنەکانی ئۆپۆزسیۆنیشەوە.

کۆبوونەوە بڕیاریشیدا کە کۆبوونەوەکان و راوێژکردن و ئاڵوگۆڕی بیروڕاکان لەنێوان هەردوو مەکتەبی سیاسی بـۆ ســەرجەم بابەتــەکانی پەیوەســت بــە عــیراق و کوردســتان و ناوچــەکە بەردەوامبێت.

## سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان: قسەکانی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراقی فیدراڵ داوەتێکی راشکاوانەیە بۆ برەوپێدان وگرتنەبەری بژاردەکانی توندوتیژی

بەداخێکی زۆرەوە رۆژ ناڕوات ئەگەر تێیــدا ســەرۆکی ئەنجومــەنی وەزیــران بــەڕێز نــووری مالکی بە شێوازێکی دی خۆی نەنوێنێ و چەند لایــەنێکی دیکــە لــە مەبەســت و پلانــەکانی خۆیمان بۆ نەخاتەڕوو لە پێناو بە سەربازگەکردنی کۆمەڵگای عێراقــی و هانــدانی گرتنەبــەری بژاردەکانی توندوتیژیی وەك ئامرازێك بۆ گەیشتن بە مەرامە سیاسییەکان.

سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران ئەو بابەتەی لە میانی وتەکەی خۆیدا خســتەڕوو کــە دوێــنێ دووشەممە ٢٠١٢/٧/١٦ لە رێوڕەسمی ئاهەنگی دەرچــوواني خــولی شەســتەمینی ئەفســەرانی کۆلێژی پۆلیس پێشکەشی کرد و تێیدا بــە نەفەســێکی هەڕەشــەئامێز قســەکانی ئاراســتەی عێراقییەکان کرد هەر لە باکوورەوە تا باشوور و چەندین رستە و دەستەواژەی پڕاوپڕ لە لێــدان و زبریــی و توندوتیــژیی و هەڕەشــە و گوڕەشــەی بــەکارهێنا، وەك ئــەوەی وڵات دادگــا و دامەزراوەی یاسایی تێدا نەبێ!.

ئێمە بەر لە ئێستا هەڵوێستی خۆمان بۆ هاوبەشانمان راگەیانــدووە ســەبارەت بــەو هەڕەشــانەی رووبەڕووی پرۆسەی سیاسی بۆتەوە و مەترسیی خۆشمان لە بەرامبەر رەفتاری تاکڕەوانــەی ســەرۆکی

ئەنجومەنی وەزیران پیشانداوە و گوتوومانە کە وڵات و پرۆسەی دیموکراسی رووبەڕووی مەترسیی راستەقینە بوونەتەوە بەهۆی ئەو کردارانەی کەسێك نایگرێتەبەر ئەگەر مەبەست و مەرامی دەسەڵاتخوازیی نەبێ بۆ پەراوێزخستن و دوورخستنەوەی ئەوانی دی.

ئەوەی مالکی دوێنێ لە وتەکەیدا خستیەڕوو، هیچ گومانێك ناهێڵێتەوە کە رۆژ لە دوای رۆژ زیاتر پەرە بەو رەفتارانەی خۆی دەدات کە هاودژن لەگەڵ سادەترین بەهای دیموکراسی و بنەماکانی شەراکەت و هاوبەشیی، دەرەنجامی ئەو رەفتارانەشی زۆر خراپ و مەترسیدار بەسەر پێکەوەژیان و ئایندەی دیموکراسییەت لە وڵاتدا دەشکێتەوە، بۆیە ئێمە لە سۆنگەی پەرۆشییمان بۆ قوربانیدان و دەستکەوتی عێراقییەکان بە تێکڕای پێکهاتە جیاوازیەکانیەوە، سەرلەنوێ هەڵوێستی خۆمان رادەگەیەنین و هۆشداریی دەدەینە بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران کە ئەو رەفتارانەی دەبێتە مایەی لەناوبردنی سەرجەم دەستکەوتە بەدیهاتووەکان و هەموو هیوا و ئاواتێکی عێراقییەکانیش لەبار دەبات کە ئومێد بۆ بنیاتنانی وڵاتێك دەخوازن بیری توندوتیژیی و دەستەواژەکانی وەك " زەبر وەشاندن بە مشتی ئاسن" و "رووبەڕووبوونەوە لەگەڵ هەر کەسێك بیەوێ قەیرانی سیاسی بنێتەوە"ی تێدا نەبێ.

ئەوەی بەڕێز سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران باسی لێوە دەکات، داوەتێکی ئاشکرا و راشکاوانەیە بۆ برەوپێدانی رەفتاری زبر و گرتنەبەری بژاردەکانی توندوتیژیی، هەڵبەت ئەمەش پێشێلکردنێکی گەورەی دیکەیەتی دژ بە دەستوور، بۆیە ئێمە بانگی سەرجەم هێزە دیموکراسخوازەکان و هاوبەشە سیاسییەکانمان و تەواوی چین و توێژەکان و بە تایبەتی رۆشنبیران دەکەین کە بە ئاگاییەوە بڕواننە ئەوەی لە وڵاتدا روو دەدات و پشتگیریی لە پرۆسەی بنیاتنانی کاروانی دیموکراسییەتدا بکەن و رووبەڕووی ئەو هزر و بیر و رەفتارانە ببنەوە و رێگا نەدەن جارێکی دی وڵات بۆ نێو تاریکستانی دکتاتۆرییەتی نابووت و قێزەون بگەڕێندرێتەوە.

د.ئومێد سەباح
وتەبێژی فەرمیی بە ناوی
سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان
٢٠١٢/٧/١٧

## چەند وتەیەکی پێویست بۆ ڕای گشتی لە بارەی دۆخی عێراق و هەرێمی کوردستان

٢٠١٢/٧/٢٨

**مسعود بارزانی**

بە پێویستم زانی بە مەبەستی خستنەڕووی راستیەکان و تیشك خستنە سەر کرۆکی تەنگژەی نێوان هەرێمی کوردستان و بەغدا و بیرهێنانەوەی هۆکاری کێشەکان، نووسینێکی وا بخەمە بەر دیدی گەلی خۆشەویستمان.

کورد پێکهاتەیەکی سەرەکیی عێراقە و دوای پرۆسەی ئازادی بەشداریی کاریگەری هەبووە لە بنیاتنانی عێراقی نوێ. دەستووری نوێی عێراق و کارپێکردنی، تاکە زامنی پێکەوە ژیانی پێکهاتەکانی عێراقە. هەولْمانداوە لە چوارچێوەی ئەم دەستوورە پرۆڤەی ئەرك و مافەکانمان بکەین، بەڵام کەسانێك هەن کە دوای ئەوەی پێگەیان بەهێز کردووە، خۆیان لە پابەندبوون بەم دەستوورە دەدزنەوە و کار بۆ قۆرخکردنی زیاتری دەسەڵات دەکەن.

هەندێجار لە ناوخۆی هەرێم بە جۆرێك باسی ئەم تەنگژەیە دەکرێت وەك ئەوەی هۆکارەکەی ((کێشەی شەخسی من بێت لەگەل مالیکی)). من هیچ کێشەیەکی شەخسیم لەگەل بەڕێز مالیکی و هیچ کەسێکی دیکەی ناو لایەنەکانی تەنگژەکە نەبووە. مالیکی ساڵانێك لە کوردستان بووە و خۆی وەك دۆستێك نواندووە. دۆستێکی نزیکی منیش بووە و بەردەوام لە پەیوەندیدا بووینە و هەولْم داوە کێشەکان لەگەلیدا بە لێکتێگەیشتن چارەسەر بکرێن، بەڵام ئەو پابەندی هیچ بەڵێنێك نەبووە و تاکرەوانە هەڵسوکەوتی لەگەل بابەتەکان کردووە و دەیکات. من ئەو کاتە لە مالیکی نائومێد بووم کە لە ساڵی ٢٠٠٨سوپای عێراقی بە تانك و زرێپۆشەوە بۆ ڕووبەڕوو بوونەوەی پێشمەرگە ڕەوانەی دەورووبەری خانەقین کرد.

کێشەمان لەگەل ئەو عەقلییەتەیە کە لە بری زمانی دایەلۆگ بڕوای بە بەکارهێنانی هێزی چەك هەیە، مەترسیەکەم بۆ ئێستا نییە، بۆ چەند ساڵی داهاتووە کە ئەگەر ئەم عەقلییەتە بەو ئاراستەیە بواری بۆ بڕەخسێت و هێزی هەبێت، کێشەی گەورە بۆ هەرێمی کوردستان و عێراق دەنێتەوە.

بە پێی ئەو دەسەڵات و بەرپرسیارییە دەستووریانەی لە ئەستۆمانە، ئەمساڵ کە هەڵوێستمان لەبەرامبەر ئەم عەقلییەتە نواند، هیچ کێشەیەکی نوێمان دروست نەکرد وەك ئەوەی باسی دەکرێت، بەڵکو تەنیا باس و خواسی کێشەیەکمان وروژاندەوە کە ساڵانێکە هەیە و وەکو پێویست هەڵوێستی لەبەرامبەر وەرنەگیرابوو. چەندین ساڵە بەڵێنی جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی دەستوور و کێشە هەڵواسراوەکان دەدرێت، بەڵام هەنگاوی جددی و جێگەی ئومێد نەنرا. نە مادەی ١٤٠ هەنگاوی کرداریی بۆ نرا، نە بابەتی بودجە و پێداویستی پێشمەرگە جێبەجێ کرا و نە ڕەشنووسی یاسای نەوت و گاز کاری بۆ کرا، لە ناو سوپای عێراقیشدا دژایەتی بەرپرسان و ئەفسەرانی کورد کرا و هەوڵی دوورخستنەوەیان درا . لە دوای ڕێککەوتنی هەولێریش بەردەوام خۆیان لە جێبەجێکردنی ناوەڕۆکی ڕێککەوتنەکە دزیوەتەوە، بۆیە چەمکی شەراکەتی راستەقینە لە حوکمڕانیدا زۆر بێڕەنگ بووە و ئەوەی بەدی کراوە تەنیا پاوانخوازی و گەڕانەوە بۆ عەقلییەتی دیکتاتۆری بووە. دوای ئەو هەموو بەڵێنانەیان بابەتی داڕشتنی پەیرەوی ناوخۆی ئەنجوومەنی وەزیرانیان پشتگوێ خست و ئەوەی بەدی دەکرا تەنیا دەسەڵاتی رەهای مالیکی بوو لە گشت بوارەکانی ئیداری و ئەمنی و سەربازی و ئابووری، ئەمەشیان پێشێلکردنی چەمکی دەستووریی سیستەمی حوکمڕانیی عێراقە، چونکە بە پێی دەستوور سەرۆکی حکومەت، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانە نەك سەرۆك وەزیران. لە نێوان ئەم دوو ناونیشانەشدا جیاوازییەکی زۆر هەیە، بەو پێیەی سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیران سیاسەتی پێکهاتەی ئەنجوومەنی وەزیران پەیڕەو دەکات و ناتوانێت تاکڕەوانە هەنگاو بنێت.

بودجەی پێشمەرگە ساڵانێکە پەسند کراوە، بەڵام ڕێگری لە گەیشتنی بە هەرێم دەکرێت و ئەمەشیان دەست بەسەرداگرتنێکی ئاشکرای پشکی هەرێمە لە سامانی نیشتمانیدا ، چونکە ئەو بودجەیە وەك خەرجییە سیادییەکان لە بەشی هەرێم دەبڕدرێت . پێشتر هەرێم و بەغدا بە ئامادەبوونی ئەمریکییەکان ڕێککەوتن، کە پێشمەرگە وەك بەشێك لە سیستەمی بەرگریی عێراق گشت پێداویستییەکانی بۆ دابین بکرێت و لە بودجەی بواری بەرگریی عێراق پاڵپشتیی دارایی بکرێت، لە سەر ئەم بنەمایەش چەك و پێداویستی بۆ پێشمەرگە دابین کرا، بەڵام وا چەند ساڵە لە کۆگاکانی سەربازگەی (تاجی)دا دەستی بەسەردا گیراوە و ڕێگری لە گەیشتنی بە پێشمەرگە دەکرێت.

لە بارەی مامەڵە لە گەڵ فایلی گرێبەستەکانی نەوتیش ماوەیەکی زۆرە چ لە ئاستی ناوخۆی کوردستان و چ لە بەغدا قسەی لەسەر دەکرێت. گرنگە گشت لایەك بزانن چەند

ساڵێکە داوا دەکەین لیژنەیەکی شارەزا و بێلایەن پێداچوونەوە بە گشت فایلەکانی تایبەت بـە نەوت لە هەرێم و عێراق بکات و گشت لادانە دەستووری و کەموکورییەکان دەستنیشان بکات ، بەڵام خۆیان لەم بابەتە دەدزنەوە، هەرجارە و ڕادەگەیەنن کە لیژنەیەکیان پێکهێناوە و دواتر بێدەنگ دەبن، ئەم خۆدزینەوەیە بۆ؟ ئایا ئەم هەرایە لـە سـەر نـەوتی هـەرێم بـە مەبەسـتی بەلاڕێدا بردنی ڕای گشتی نییە تا ئاوڕ لە هەڵسوکەوتەکانی وەزارەتی نەوتی بەغـدا لـە گـەل فایلی نەوت لە عێراق بە گشتی نەدرێتەوە؟.

ئێمە پشوومان فراوان بووە وبەردەوام داوامان کردووە کە لایەنە عێراقی و کوردستانییەکان بە دانوستان و گەڕانەوە بۆ دەستوور کێشـەکان چارەسـەر بکـەن. ئێمـە بـەردەوام چـاوەڕوانی چارەسەرییەکی عێراقییانە بووین و دەرگای دانووستانمان لەگەل هیچ لایـەنێك کـە بـڕوای بـە دانوستان هەبووە، دانەخستووە، بەڵام گەر چارەسەری عێراقییانە لە ئـارادا نـەبوو ، زانیمـان پێگیری بە دەستوور ناکرێت ئەوکات پەنا بۆ چارەسەریی کوردستانی دەبەین و بۆ ڕا و ویستی خەڵکی کوردستان دەگەڕێینەوە. پەیامی من لە نەورۆزی ئەمساڵیشدا تەنیا هەر ئەمە بوو.

ئەوەبوو دواتر کۆبوونەوەی لایەنە عێراقییەکان ئەنجام درا تا چارەسەریی کێشەکان بکـەن، بەتایبەت داوا لە هاوپەیمانی نیشتمانی کرا کە کار بکەن بـۆ ئـەوەی مـالیکی پێگیربێـت بـە دەستوور و ئەو ڕێککەوتنانەی لە نێوان گشت لایەنەکانی ناو پرۆسەی سیاسی واژوو کراون.

بابەتی سەندنەوەی متمانە لە مالیکی لـە نێـوان هەڵوێسـتە جیاجیاکانـدا قسـەی زۆری لەسەر کرا. هەندێك وا پیشان دەدەن کە ئەمەیان پرۆژەی من بووە، بەڵام ڕاستییەکەی وا نییە و پرۆژەی کەسانی دیکە بوو نەك هی من. مـن پێشـنیاری دیکـەم هـەبوو بـۆ گـۆڕینی ئـەو نەهجەی کە مالیکی لە سەری دەڕۆیشت. پێشنیارم کرد چاکسازیی ڕیشـەیی لـە سیسـتەمی حوکمڕانی عێراقدا بکرێت و بنەماکانی دیموکراسی و یەکتر قبوڵ کردن پتـەو بکـرێن، چـونکە کرۆکی کێشەکە ئەمەیە، بەڵام دوای ئەوەی هێزە سیاسەکانی دیکـە بـە ئامـادەبوونی بـەرێز سەرۆك کۆمار کۆبوونـەوە، بابـەتی سـەندنەوەی متمانـە بـوو بـە داواکـاریی ئامـادەبووانی دانیشتنەکە و منیش پاڵپشتیی ئەو کۆدەنگییەم کـرد و لاریـم نـەبوو، چـونکە ڕاسـتییەکەی ئەزموونەکانی ڕابردوو لە جێبەجێنەکردنی ڕێککەوتنەکان و پابەندنەبوون بە دەستوور دەرگای ئومێدی بە مالیکیی داخستبوو.

من لەم هەڵوێستەم پەشیمان نیم و ئەرکی سەرشانی خۆم جێبەجێ کردووە.

بەداخەوە لە ناوەوەی هەرێم ئەم بابەتە هەستیارە ئاوێتەی بابەتی شەخسی و ململانێ و موزایەداتی سیاسی کرا، ئەمەشیان کارێکی نارەوابوو بەرامبەر ماف و داخوازییەکانی گەلەکەمان و زیانی بۆ ناومالّی کوردستانی و پێگەی لە عێراقدا هەبوو. بە ئەرکی سەرشانی خۆمم زانی ئەم هەڵوێستە دەرببڕم و هۆشداری ئەوە بدەم کە ئەوەی ئەمڕۆ لە بەغدا کاری بۆ دەکرێت لە داهاتوویەکی نزیکدا مەترسیی گەورەی بۆ گشت لایەك لێدەکەوێتەوە، بابەتەکەم وروژاند تاکو گشت لایەك بە ئەرکی سەرشانی خۆیان هەستن.

ئێستاش هەر کەسێك لەو بڕوایەدایە دەتوانێت کێشە هەڵواسراوەکان لەگەل مالیکی یەکلابکاتەوە، ڕێگا لەبەردەمی کراوەیە و ئامادەم بە پێی دەسەڵاتی خۆم فایلی ئەم کێشانەیان ڕادەست بکەم. کێ دەتوانێت بێت و سیستەمی دیموکراسی و حوکمڕانی لە عێراقدا بخاتە سەر ڕاستەڕێی و لە دەست پاوانخوازی و قۆرخکاری دەریبێنێت با هەنگاو بنێت.

کورت و پوخت من ویستوومە داکۆکی لە مافە دەستووریەکانی کورد بکەم و لە هەمانکاتیشدا بەرگری لە سیستەمی دیموکراتیك لە عێراقدا بکەم. ویستوومە ئەوە بڵێم گەر ڕەوشەکە بەم ئاراستەیە بەردەوام بێت، دوای چەند ساڵی دیکە هەڕەشەی گەورە بۆ سەر مافەکانی کورد و سەرجەم پرۆسەی سیاسی لە عێراقدا دروست دەبێت.

دەبێت گشت لایەك بزانن کە کێشەکە تەنیا پەیوەست بە هەرێم نییە، کێشە بارودۆخی تێکڕای عێراقە. ئێمە بەشدار بووین لە دروستکردنی عێراقی نوێ و قوربانیمان بۆی داوە . ئێمە خێر و خۆشیی هەموو گەلانی عێراقمان دەوێت. ئاواتمان ژیانێکی شایستەیە بۆ تێکرای پێکهاتەکانی عێراق. بەڵام بڕیاربەدەستان لە بەغدا داخوازییەکانی گەلانی عێراقیان پشتگوێ خستووە و بەردەوام تەنگژە دروست دەکەن تاکو کەموکوڕیەکانیان پەردەپۆش بکەن. بە پێی هەموو پێوەرەکان حکومەت لە بەغدا لە خزمەتکردنی هاوولاتیانیدا سەرکەوتوو نەبووە. حکومەتی عێراق لەم ساڵانەدا زیاتر لە نیو ترێلیۆن دۆلاری لەبەر دەستدا بووە، ئەم سەروەت و سامانە چیی بەسەر هات؟ با گەلانی عێراق بپرسن کوا ئاوەدانی، کوا خزمەتگوزاری؟ زیاتر لە ٢٠ ملیارد دۆلار تەنیا بۆ کارەبا تەرخان کرا، ئەی کوا ئەنجامەکەی؟ با حکومەتی عێراق خۆی بە خزمەتی هاوولاتیانەوە خەریك بکات نەك بەردەوام کێشە بۆ هەرێم یان لایەنە سیاسییەکان دروست بکات.

لەم وڵاتە دەوڵەمەندەدا هاووڵاتیان شایستەی ژیانێکی باشتر و خزمەتی زیاترن، بەڵام هێشتا دەسەڵات لە بەغدا لە دابینکرنی کەمترین خزمەتگوزاری سەرکەوتوو نەبووە، کەچی لە جیاتی پەلە کردن لە بەرەوپێشبرنی خزمەتگوزاری پەلە لە خۆ پڕ چەککردن دەکەن بۆ ئەوەی بە هەڕەشە و گوشاری سەربازی خۆیان بسەپێنن.

دەمەوێت لێرەدا بە هەڵگرانی ئەو عەقلییەتە بڵێم، سەردەمی ئەوە بەسەرچوو بیر لەوە بکەنەوە جارێکی دیکە هێزە سەربازییەکانیان و ئەمن و پۆلیسیان بێنن و بە سەر گەلەکەماندا بیانسەپێنن. ڕێگە نادەین عێراق بۆ دواوە بگەڕێننەوە و بەرژەوەندیی گەلی کوردستان و گەلانی دیکەی عێراق بکرێتە قوربانی هیچ ئەجندایەکی ئیقلیمی یان ویستی بەرتەسکی شەخسی.

دەڤەرەکە گۆڕانکاری گەورەی بەخۆوە بینیوە و گۆڕانکاری زۆرتریش بەڕێوەیە،ئێمە لەکاتێکدا پشتیوانی لە سەرکەوتنی ئیرادەی گەلانی ناوچەکە دەکەین، دیسان لەم هەلومەرجە هەستیارەدا خوازیارین یەکڕیزیی ناوماڵی کورد بپارێزرێت.

با گشت لایەك بەرژەوەندییە باڵاکانی گەل و نیشتمان لە سەرووی بەرژەوەندییە تەسکەکان دابنێین. ئەم تەنگژانەی لە عێراق و ناوچەکەدا هەن ئامرازی موزایەدەی سیاسی و بەکارهێنانیان لە دژی یەکتر نین، هەر کارێکی وا بۆ سەر داهاتووی کورد و کوردستان لە دەڤەرەکەدا مەترسیدار دەبێت. ئەم رەوشە بەرپرسیارییەتیەکی گەورەی مێژوویی خستۆتە سەر شانی هەموو لایەك.

هەست بە بەرپرسیاریەتی خۆم دەکەم بەرامبەر پاراستنی بەرژەوەندییەکانی کوردستان و عێراق و پرۆسەی دیموکراسی، هەروەها خۆم بە پارێزەری ئازادی و کەرامەتی هاووڵاتیانی کوردستان دەزانم و شانازیش بەم ئەرکەمەوە دەکەم و هیوادارم هەموومان پێکەوە هێز و توانامان بخەینە گەڕ بۆ گەیاندنی نەتەوەکەمان بە کەناری ئارامی ئاشتی و ئازادی و ژیانێکی شایستەتر و پڕ سەربەرزی.

# رونكردنەوەیەك لە بزوتنەوەی گۆڕانەوە

ئەمڕۆ ۲۰۱۲/۷/۲۹ ئاگـادارکراین کـە سـبەینیٚ ۷/۳۰ لەسـەر داوای سـەرۆکی هـەرێم کۆبونەوەی هەمو لایەنە سیاسیەکانی کوردستان دەکریٚ لەسەر بارودۆخی نویٚ لە کوردسـتان و ناوچەکە.

ئێمە وەك بزوتنەوەی گۆڕان بریارماندا کە بەشداری نەکەین لەو کۆبونەوەیەدا، وە لە هەمو کۆبونەوەیەکی لەوجۆرەدا، چونکە هەرکاتیٚ کە تەنگژەیـەك لـە کوردسـتاندا دروسـت دەبێـت ئەوکاتە ئۆپۆزسیۆن داوادەکرێت بۆ بەشداریکردنیان لە ئالۆزی و کێشەکاندا. بە پێچەوانەوە لە بڕیارە سیاسییە گرنگ و چارەنوسسازەکاندا تاکلایەنە و بیٚ پرس و را بڕیار دەدرێـت هـەروەك تێپەراندنی ئەو یاسایانەی کە رەهەندی نیشتیمانیان هەیە بە بیانوی زۆرینەوە، کە پێویسـتبو بە تەوافوقی نیشتمانی تێبپەڕن، بـۆ نمونـە تێپەڕانـدنی بەپەلـەی یاسـای بودجـەی گشـتی و دامەزراندنی ئەنجومەن و دەزگای ئاسایش لە چەند رۆژی رابردودا، سەرەڕای ئەوەی ئۆپۆزسیۆن چەندین پاکێج و پرۆژە یاسا و سەرنجی پێشکەش کردبو کە سەرجەمیان پشتگویٚ خران.

بزوتنەوەی گۆڕان هەرگیز نابێتە پاشکۆی هیچ لایەنێك کە بە تەنها بڕیاردەر بـیٚ و رۆڵـی ئۆپۆزسیۆن وەك لایەنێکی گرنگ پشتگویٚ بخات.

پرسیاریشمان ئەوەیە کە ئایا ئەو دەزگا و دامەزراوەیە کامەیە کە بڕیاری سیاسی دەدات و شەڕ و ئاشتی لە کوردستان بە دەست ئەوە؟

بزوتنەوەی گۆڕان
۲۰۱۲/۷/۲۹

# کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە گەل سێ سەرۆکایەتی هەرێم و حزبە کوردستانیەکان

**بە ناوی خوای بەخشندە و میهرەبان**

ئەمرۆ دووشەمە ٢٠١٢/٧/٣٠ بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بە ئامادەبوونی سەرۆکی پەرلەمان و سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان سەرپەرشتی کۆبوونەوەیەکی کرد لەگەڵ سەرۆك و نوێنەرانی هێز و لایەنە سیاسییەکانی کوردستان و تیایدا رەوشی سیاسی ئەمرۆی هەرێم و عیراق و ناوچەکە و هێنانی هێزی سەربازی بۆ ناوچەکانی شنگاڵ و زومار خرایە بەرباس و لەم رووەوە لیژنەی هەماهەنگی لەگەڵ سوپای عیراق و هێزەکانی ئەمەریکا دوا پەرەسەندنەکانی ئەم دوو ناوچەیان خستەڕوو و شیکردنەوەیەکی وردیان سەبارەت بەو رێککەوتننامە و دیکۆمێنتانە پێشکەش بە ئامادەبووان کرد کە تا ئێستا لە لایەن حکومەتی فیدراڵەوە کاریان پێنەکراوە و دواتریش هەر یەك لە لایەنە سیاسیەکان دیدوبۆچوونی خۆیان خستەڕوو و هەرهەمووشیان یەکانگیر بوون لە سەر ئەم خاڵانەی خوارەوە :

١- جەختکردنەوە لەسەر یەکریزی و یەکهەڵوێستی ماڵی کورد و ئامادەیی لە داکۆکیکردن لە دەستکەوتەکانی گەلی کوردستان.

٢- کێشە سیاسیەکان بە هێز یان بە هەڕەشە چارەسەر ناکرێن ، بەڵکو بە رێگەی جێبەجێکردنی دەستوور و رێککەوتننامەکان و گرتنەبەری رێگەی دیالۆگ .

٣- دووپاتکردنەوە لە سەر برایەتی نێوان کورد و عەرەب و پێکهاتەکانی دیکە وەکو بنەمایەکی سەرەکی بۆ حوکمرانی عیراق.

٤- کۆبووەکان خوازیارن لایەنە عیراقیەکان و رای گشتی عیراق رۆڵی مێژوویی خۆیان ببینن لە پاراستنی دیموکراسی و دامەزراوەیی و کاری بەکۆمەڵ لە بەرێوەبردنی دەسەڵاتدا.

**یەکێتی نیشتمانی کوردستان**
**حزبی شیوعی کوردستان**
**حزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان**
**یەکگرتووی ئیسلامیی کوردستان**
**کۆمەڵی ئیسلامیی کوردستان**
**حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان**
**بزوتنەوەی ئیسلامی لە کوردستان**
**پارتی دیموکراتی کوردستان**

## بەياننامەی حكومەتی هەرێمی كوردستان سەبارەت بە بڕیاری داخستنی نوێنەرایەتی حكومەتی هەرێم لە بەغدا

نوسینگەی سەرۆك وەزیرانی عیراق یەكلایەنە و بێ ئاگاداركردنەوەی حكومــەتی هــەرێمی كوردستان، بەنوسراوی ژمارە ١٣٧٣ لە٢٠١٢/٨/٨ نوێنەرایەتی هەرێمی لە بەغدا بــەبیانوی نەبوونی بنەمای قانوونی داخست.

حكومەتی هەرێمی كوردستان ناڕەزایی خۆی بەرامبەر ئەم بڕیــارەی نوســینگەی ســەرۆك وەزیرانی عیراق دەردەبڕێت و دوپاتیشــی دەكاتــەوە كەئــەم هــەنگاوە ســەرەڕای ئــەوەی هــیچ بنەمایەكی قانوونی نییە، كاریگەری خراپیشی لەسەر رێكخستنی پەیوەنــدی نێــوان هــەرێم و حكومەتی فیدڕاڵ دەبێت كە بــەگوێرەی دەســتوور رێكخــراوە، جگــە لــەوەی پەیوەنــدی هــەر هەرێمێك لەچوارچێوەی دەوڵەتێكی فیدرالیدا پێویستی بەدامەزراوەیەكی قــانوونی هەیــە بــۆ هەماهەنگی و رایكردنی كاروبارەكان لەنێوان هەردولادا.

لەهەمان كاتیشدا ئەو راســتیە بــیر هــەموو لایــەك دەخەینــەوە كــەزیاتر لەشــەش ســاڵە نوێنەرایەتی هەرێم بەنوسراوی نوسینگەی بەرێز نوری مالیكی سەرۆك وەزیرانی عیراق بەژمارە ١٠٦٣ لە٢٠٠٦/٧/٢٤ دامەزراوەو بەپێی هەمان فەرمان كارەكــانی خــۆی لەبەغــدا بــەرێوە بردووە و چەندین نووسراو و بڕیاری ئیدارییش لەنێوان نوێنەرایەتی هەرێم و حكومەتی فیــدڕاڵ ئالوگۆڕ كراون كەئەمانە هەمووی بەڵگەن لەسەر ئــەوەی بــوونی ئــەم نوێنەرایەتیــە لەبەغــدا قانوونیە، ئەمەش هیچ پاساوێك بۆ بڕیاری داخستنی نوێنەرایەتی هەرێم ناهێڵێتــەوە لەلایــەن نوسینگەی سەرۆك وەزیرانی عیراقەوە.

ســــەرەڕای ئەمانــــەش حكومــــەتی هــــەرێمی كوردســــتان رایدەگــــەینێت كەمەبەســــت لەدروســتكردنی ئــەم نوێنەرایەتیــە باشــتركردنی پەیوەنــدی و هەماهــەنگی نێــوان هــەرێم و حكومــــەتی فیــــدرال بــــووە، بەتایبــــەتی لــــەبواری دادگاكــــان و تەندروســــتی و پــــەروەردەو خاڵەسنوریەكان و بەشداری نوێنەرانی هەرێم لە لیژنەكانی بەغدا و گونجاندنی سیاسەتی گشتی

لەگەڵ بەغدا لەچوارچێوەی دەستووردا، جگە لەمەش دەستووری عیراق کەبنەمای ڕێکخستنی پەیوەندی نێوان هەرێمەکان و حکومەتی فیدراڵە، هیچ ڕێگریەکی بۆ کردنـەوەی نوێنەرایـەتی هەرێم لە بەغدا تێدانییە، بەڵکو دەستووری عیراق لەماددەی ١١٧دا بەئاشکرا دانی بە گشت دامەزراوە و دەسەڵاتەکانی هەرێمی کوردستاندا ناوە، تەنانەت بەپێی مادەی ١٢١، ڕێگەشـی بەهەرێمەکان داوە لەناو باڵیۆزخانەکانی عیراق لـەدەرەوە نوێنەرایـەتیان هـەبێت بۆیـە جێـی سەرسوڕمانە ڕێگە نەدرێت لە پایتەخت دا نوێنەرایەتی هەرێم هەبێت.

لەکۆتایدا حکومەتی هەرێمی کوردستان داوادەکات نوسینگەی سەرۆك وەزیرانی عیراق بەم بڕیارەی خۆیدا بچێتەوە لەسۆنگەی پەرۆشی بـۆ پەیوەندیـەکی راسـت و دروسـت کەخزمـەتی بەرژوەندی هەردولا بکات بڕیاری دروست بدات.

سەرۆکایەتی ئەنجومەنی وەزیران

هەولێر

٢٠١٢/٨/١٦

# راگەیاندنی کۆتایی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێم لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان

ئەمڕۆ شەممە (٢٠١٢/٩/٨) بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین، بە ئامادەبوونی بەرێزان کۆسرەت رەسول عەلی جێگری سەرۆکی هەرێم و د.ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان و عیماد ئەحمەد جێگری سەرۆك وەزیران و جەعفەر شێخ مستەفا وەزیری پێشمەرگە و کەریم شنگالی وەزیری ناوخۆ و ژمارەیەك لە گەورە بەرپرسانی عەسکەری لەگەڵ سکرتێر و نوێنەرانی حزبە کوردستانییەکان کۆبووەوەو پاش تاوتوێکردنی چەند مەسەلەیەکی پەیوەست بە هەرێمی کوردستان و عێراقەوە، کۆبوونەوەکە راگەیاندێکی کۆتایی راگەیاند کە ئەمە دەقەکەیەتی:-

راگەیاندنی کۆتایی کۆبونەوەی سەرۆکی هەرێم لەگەڵ حیزبە کوردستانییەکان. نیوەرۆی (٢٠١٢/٩/٨) بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان، لەگەڵ سەرجەم حیزبە کوردستانییەکان، کۆبۆوە.

لە کۆبونەوەکەدا، جگە لە باسکردنی سەردانی دوو وەفدی کۆنگرێس و وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا و هەوڵۆێستیان لەسەر دۆخی سوریا، عێراق و کوردستان و کێشەکان....

خاڵی گرنگی کۆبوونەوەکە، باسکردنی بڕیاری مەترسیداری دروستکردنی (قیادەی عەمەلیاتی دجلە-دیالە)بوو لەلایەن بەرێز دەوڵەتمەداری عێراقەوە.

لایەن بە لایەنی بەشداربووی کۆبونەوەکە، بیروڕای خۆیان لەسەر دۆخەکە و مەترسییەکان و پێشینەی کێشەکان و ئەنجامەکانی دەربڕی.

سەرەنجامی گشتی بیروڕای کۆبوونەوە، جەخت کردنەوە بوو لەسەر پشتیوانی کردن لە بڕیاری ئەنجوومەنی شارەوانیی پارێزگای کەرکوك، کە رۆژی (٢٠١٢/٩/٧) دژی پێکهێنانی قیادەی عەمەلیاتی دجلە، پەسندیان کرد. ئەم گەمە سیاسی و ئەمنی و عەسکەرییانە، لە کێشەی خانەقینەوە، بۆ زومار، بۆ قەرەتەپە، چەندبارە بوونەتەوە.

ئەنجارەیان، بە دروستکردنی قیادەی عەمەلیاتی دجلە، باری ئەمنی و عەسکەری و سیاسی کەرکوك و باقی ناوچە کێشە لەسەرەکان، دەخەنە بەردەم مەترسییەکی زیاتر و ئاراستەی مەترسیدارەوە، بۆیە ، تەواوی هێزە کوردستانییەکان، داوا دەکەن ئەم بڕیارە هەڵبوەشێتەوە و جارێکی تریش، هەتا دوا برگەی مادەی (١٤٠) لە ناوچە کێشە لەسەرەکان جێ بەجێ نەکرێ و یەك لا نەکرێتەوە، ناکرێ ئەم سیناریۆ ئەمنی و عەسکەرییانە کە پێچەوانەی ڕێککەوتنەکانن و بە پاساوی جۆراوجۆرەوە دووبارە بکرێنەوە.

بۆیە لایەنە کوردستانییەکان، رایدەگەیەنن، کە هەتا زووە بریارەکە هەڵبوەشێتەوە، هەتا زەمینەش خۆش بکات کە کۆبوونەوەی حیزبە سیاسییەکانی عێراق، کە وا چاوەروان دەکرێ، بکرێ، باشتر ئەنجام بدرێ. بە تایبەتی ناشێ هەموو لایەك بیرمان نەبێ کە عێراقی فیدراڵ، عێراقی هاوسەنگیی نیشتمانی و پابەندبوون بە دەستور و پێکەوەسازان و راپەراندنی پێکەوەی ئەرکە هاوبەشەکانە. لەم پێودانگەوە، بە هیچ جۆرێك ناکرێ سوپای عێراق بۆ چارەسەری کێشە سیاسییەکانی ناوخۆ بەکار بهێنرێت، نەخوازەڵلا بەرامبەر بە مادە دەستورییەکان.

**١- پارتی دیموکراتی کوردستان**

**٢- یەکێتی نیشتمانی کوردستان**

**٣- بزوتنەوەی گۆڕان**

**٤- یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان**

**٥- بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان**

**٦- کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان**

**٧- حزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان**

**٨- نوێنەری ئەرمەنەکان**

**٩- حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان**

**١٠- بزوتنەوەی دیموکراتی تورکمان**

**١١- بزوتنەوەی دیموکراتی چاکسازی تورکمان**

**١٢- لیستی هەولێری تورکمان**

**١٣- بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشوری**

**١٤- ئەنجومەنی کلدان سریان ئاشوری**

**١٥- حزبی شیوعی کوردستان**

# روونكردنەوەیەك لە سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستانەوە

گوتەبێژی فەرمی سەرۆكایەتی هەرێمی كوردستان سەبارەت بە بڕیارێكی لیژنەی پێكهێنراو بۆ لێكۆڵینەوەی سەردانەكەی وەزیری دەرەوەی توركیا بۆ كەركوك روونكردنەوەیەكی بڵاوكردەوە، ئەمەش دەقەكەیەتی:
ئەنجوومەنی وەزیران لە بەغدا دوێنێ دووشەممە ٢٠١٢/٩/٣ چەند بڕیارێكی بەپێی ڕاسپاردەكانی ئەو لیژنەیە دەركرد كە بە بڕیاری دانیشتنی ٣٥ی رۆژی حەوتی هەشتی دوو هەزارو دوازدە وەریگرتبوو.

ئەو لیژنەیەیش بە سەرۆكایەتی دكتۆر حوسێن شەهرستانی پێكهاتبوو بۆ ئەوەی لە پێشهاتەكانی سەردانەكەی وەزیری دەرەوەی توركیا بۆ كەركوك بكۆڵێتەوەو راسپاردەكانی خۆی بە زووترین كاتی پێویست بۆ ئەنجوومەنی وەزیران بەرزبكاتەوە.

ئێمە راسپاردەكانی ئەو لیژنەیەو ئەو بڕیارانەیش رەت دەكەینەوە كە دوێنێ دووشەممە ٢٠١٢/٩/٣ بەپێی ئەو راسپاردانە وەرگیراون، چونكە ئەو بڕیارانە تەنگ بە هەرێم هەڵدەچنن و ڕۆڵی تەسك دەكەنەوە، جگە لە زیان گەیاندن بە پەیوەندی و پرەنسیپەكانی دراوسێیەتی باش لەگەل ولاّتانی ناوچەكەداو، مەبەست لەو بڕیارەی كە ئەنجوومەنی وەزیران وەریگرتووەو پێكهێنانی لیژنەی ناوبراو هەر لە سەرەتاوە روون و ئاشكرا بوو .

هەروەها هەڵبەستنی تۆمەت و درۆ و دەلەسەو پێکهێنانی لیژنەو دەرکردنی بڕیار دژ بە رژێم بریتین لە فرت و فێڵ کە هەندێك کەس لە بەغدا راهاتوون بۆ بەدیهێنانی نیازی دیکە بیانخەنە روو.

هەروەها دووپاتی دەکەینەوە باشتر وایە واز لە ورووژاندنی ئەم هەراو هوریای راگەیاندنە بهێنرێت، لەبەر ئەوەی ئەو سەردانەی ئەحمەد داوود ئۆغڵو وەزیری دەرەوەی تورکیا ئەنجامی دا بەپێی رێ و شوێنی یاسایی و بە ڤیزەی هاتنەژوورەوە لە باڵیۆزخانەی عیراق لە ئەنقەرە بوو.

**گوتەبێژی فەرمی بە ناوی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**
**٤-٩-٢٠١٢**

# راگەیەندراوێك لە سەرۆكی هەرێمی كوردستانەوە لەبارەی عەمەلیاتی دیجلەوە

بەپێویستم زانی رای گشتی خەلكی كوردستان و عێراق لەوە ئاگادار بكەمـەوە، كە هەر لە سەرتاوە ئێمە پێمان وابووە دروستكردنی فەرمانـدەیی عەمەلیاتی دیجلـە هۆكاری ناسەقامگیری زیاتر دەبێت و، خزمەت بـە رەوشـی جێبـەجێكردنی مـادەی ١٤٠ی دەستوور ناكات.

نیەت و ئامانج و شێوازی پێكهێنان و مامەڵەی فەرمانـدەیی عەمـەلیاتی دیجلـە دژی كورد و پرۆسەی دیموكراسی و پێكەوەژیان و، ئاساییكردنەوەی دۆخی ناوچە دابڕێندراوەكانی كوردستان بووە.

ماوەیەك چاوەڕێی ئەوەم كرد، دەرفەت بدرێت تا بزانرێ ئەو بەڵێنانەی كە بـە جـەنابی سەرۆك كۆمار درابوون، بۆ راگرتن و هەڵوەشاندنەوەی عەمەلیاتی دیجلە، بـەكوێ دەگـات. ئێمە لە هەرێمی كوردستان هەنگاوی دیكەمان نەگرتەبەر، تاكو رێگە بـدرێت لـە رێگـەی دیالۆگەوە عەمەلیاتی دیجلە هەڵبوەشێندرێتەوە.

ئێستا بە روونی دەركەوتووە كە هیچ پابەندییەك بە جێبەجێكردنی ئەو بەڵێنانـە نییـە كە پێشتر درابوون، بۆ راگرتنی بڕیاری پێكهێنـانی ئـەو فەرماندەییـە و ئاسـاییكردنەوەی بارودۆخەكە و چارەسەركردنی ئاشتییانەی كێشەكان.

دەمەوێ خەڵکی عێراق بە گشتی و خەڵکی کوردستان بە تایبەتی دڵنیا بکەمەوە، کە لەدوای پرس و راوێژ لەگەڵ جەنابی سەرۆك کۆمارو لایەنە پەیوەندیدارەکانی دیکە، بە جدی بەرامبەر بەو هەنگاوە نادەستوورییە هەڵوێستمان دەبێت و هەنگاوی پێویست دەگرینەبەر، بۆ رەتکردنەوەی هەر سیاسەت و هەنگاوو بریارێك کە ئامانجی سەپاندنی واقیعێکی نادەستووری بێت لە ناوچە دابڕێندراوەکانی کوردستاندا.

مسعود بارزانی
سەرۆکی هەریمی کوردستان
٢٠١٢/١١/١٢

# ڕاگەیەندراوێك لە سەرۆكی هەرێمی كوردستانەوە لەبارەی ڕووداوەكانی دووز خورماتوو

لەبارەی ئەو ڕووداوانەی دوێنێ هەینی ٢٠١٢/١١/١٦ لە شارۆچكەی دووزخورماتوو ڕوویاندا، پێویستە هەموومان ئاگاداری هەوڵی تێكدەرانەی ئەو لایەنانە بین كە عێراق بەرەو تەنگژەو ئاڵۆزكردن دەبەن، ژیانی هەر تاكێكی عێراقی وەكو مرۆڤ، بێ جیاوازی ڕەگەزو ئایین و ئایینزاوە بەنرخە. وێڕای ئیدانەكردنی ئەو ڕووداوە، پرسەو سەرەخۆشی خۆم ئاراستەی بنەماڵەی خوالێخۆشبوو (عیدان عزیز سلمان) دەكەم كە لەم ڕووداوەدا گیانی لەدەستدا.

هەوڵی وا لەئارادان كە شیرازەی پەیوەندی دۆستانەی كورد و عەرەب بەگشتی و كورد و شیعە بەتایبەت تێك بدرێت، ئەو پیلانە مەترسییەكی گەورەی بەدواوەیە، بۆیە داوا لە هاوپەیمانی نیشتمانی و برایانی شیعە دەكەم بە جدی ئاگاداری ئەو پیلانە بن و هەموو تواناكانیان بخەنە كار بۆ شكست پێهێنانی.

لەهەمان كاتدا، داوا لە گەلی كوردستان دەكەم ئامادەیی تەواویان هەبێت بۆ ڕوبەڕوبوونەوەی هەر ڕووداوێكی نەخوازراو و، كاركردن بۆ پووچەڵكردنەوەی ئەو پیلانانەی كە بەرامبەر كورد و ناوچە دابڕێندراوەكانی كوردستان ئەنجام دەدرێن.

هەرێمی كوردستان ئامادەباشی تەواوی هەیە بۆ ڕوبەروبوونەوەی هەر ئەگەرێكی نەخوازراو بۆ بەرگریكردن لە خاك و گشت هاووڵاتیانمان. لەهەمان كاتدا داوا لە پێشمەرگە ئازیزەكانیش دەكەم، كە وێڕای دان بە خۆداگرتن بەرامبەر بە كردەوە ئیستفزازییەكان، ئامادەباشی تەواویان هەبێت لەبەرامبەر هەر دەستدرێژی و كردارێكی دوژمنكارانە و، بۆ ئەم مەبەستە داوام لە وەزارەتی پێشمەرگە كردووە هەموو ئامادەكارییەكی پێویست وەربگرێت.

مسعود بارزانی

سەرۆكی هەرێمی كوردستان

٢٠١٢/١١/١٧

## لێدوانی وتەبێژی فەرمی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان لەبارەی بانگهێشتکردنی سەرۆك بارزانی لەلایەن بەڕێز موقتەدا سەدرِ

بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بانگهێشتنامەیەکی لەلایەن بەڕێز سەماحەتی موقتەدا سەدرِ پێگەیشت، بۆئەوەی لە شاری نەجەفی پیرۆز لەگەڵ بەڕێز نوری مالیکی سەرۆك وەزیرانی عێراق کۆببێتەوە، بەمەبەستی تاوتوێکردنی ئەو قەیرانەی لەئارادایە.

لەکاتێکدا بەڕێز سەرۆك مسعود بارزانی رێزو پێزانینی بۆ ئەم هەڵوێستەی بەڕێز سەماحەتی موقتەدا سەدری برای هەیە، بەڵام ئەو کێشە و قەیرانەی وڵاتی گرتۆتەوە کێشەی تایبەتی نێوان بارزانی و مالیکی نییە، بەڵکو کێشەی دەسەڵاتدارییە لە عێراقدا، کە خۆی لە پابەند نەبوون بە دەستووری هەمیشەیی و ئەو رێککەوتنانە دەبینێتەوە، کە بەهۆیانەوە حکومەتی ئێستای فیدرالی و چۆنێتی فەرمانڕەوایەتیکردنی لێ بەرهەم هات. پێمان باشە دووپاتی بکەینەوە کە سەرۆك بارزانی هەمیشە خۆشحاڵ دەبێت بە دیداری لەگەڵ بەڕێز موقتەدا سەدرِی برای.

**د. ئومێد صباح**

**وتەبێژی فەرمی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**

**٢٠١٢/١١/٢٤**

# راگەیەندراوی هاوبەشی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێم لەگەڵ لایەنە کوردستانییەکان

ئەمرۆ پێنج شەممە٢٠١٢/١١/٢٩ بەڕێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین لەگەڵ نوێنەرانی سەرجەم لایەنە سیاسییەکانی کوردستان کۆبووەوە بە مەبەستی هەڵسەنگاندنی پێشهاتەکان.

لایەنە سیاسییەکان نیگەرانی خۆیان لە دوا هەڵوێستی سەرکردایەتی گشتی هێزە چەکدارەکانی عیراق دەربڕی کە سەرەرای هەندێ ئاماژەی ئەرێنی لە کۆبوونەوە سەرەتاییەکانی نێوان خۆی و شاندە سەربازییەکەی هەرێم ، بەڵام لە دوا ساتدا لەویش پەشیمان بۆتەوە و پێداگیریشی لەسەر بەردەوامی ئۆپەراسیۆنەکانی دیجلە و لەشکەرکێشییەکەی بۆ سەر کەرکووك و دوز و ناوچە دابڕێندراوەکانی تر کردۆتەوە .

بەشداربووانی کۆبوونەوەکە یەك هەڵوێستی گەلی کوردستان لە پاراستنی هەرێم و مافە دەستوورییەکانی و بەرگریکردن لە پرۆسەی دیموکراسی سەرتاسەری عیراق بەرز نرخاند و پێداگیریشی کرد لە سەر رێگەگرتن لە سەرهەڵدانەوەی دیکتاتۆریەت و عەسکەرتاریەت لە بەغدا و بە پێویستیشی زانی کە هەموو لایەنە سیاسییەکانی عیراق رۆڵی خۆیان بگێڕن لە بەربەستکردنی ئەم نەهجە خەتەرناکەی حکومەتی بەغدا کە بەلایەکە نەك تەنها بۆ کوردستان ، بەڵکو بۆ هەموو عیراق و پێکهاتەکانی و تەئکیدیشی لەوە کردەوە کە یەکپارچەیی خاکی عیراق بەندە بە رێزگرتن لە دەستوور و، پێشێلکردنی ئەم دەستوورەش یەکپارچەیی خاکی عیراق دەخاتە مەترسییەوە.

نوێنەرانی لایەنە سیاسییەکان جەختیان لە سەر ئەوەش کردەوە کە هەرگیز بـوار نادرێتـە هـیچ شـالاوێکی شـۆفینی روو لـە کـەرکووك و ناوچـە دابڕێنـدراوەکانی دیکـە بکاتـەوە و دووپاتیشی کردەوە کە دەستوبرد لە دیالۆگی ناوخۆی هەرێم بکـرێ بـۆ بـرەودان بـە پرۆسـەی چاکسازی و بەهێزکردنی پێگەی حوکمرانی خۆبەخۆی کوردستان و سلاوی خۆیشـی بـە هێـزی پێشمەرگەی کوردستان راگەیاند و ئامادەیی خۆی و هەموو خەڵکی کوردستانیشی دەربڕی لە پشتیوانیکردنی بەرامبەر هەر ئەگەرێکی نەخوازراو.

**لایەنە سیاسییەکانی بەشداربووی کۆبوونەوەکە :**

**پارتی دیموکراتی کوردستان**

**یەکێتی نیشتمانی کوردستان**

**بزوتنەوەی گۆڕان**

**یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان**

**کۆمەڵی ئیسلامی کوردستان**

**بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان**

**حزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان**

**حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان**

**بزوتنەوەی دیموکراتی تورکمان**

**بزوتنەوەی چاکسازی تورکمان**

**لیستی ئەربیلی تورکمانی**

**ئەنجومەنی گەلی کلدان سریان ئاشوور**

**بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشووری**

**لیستی ئەرمەن**

**حزبی شیوعی کوردستان**

# سەرۆكی هەرێمی كوردستان سوپاسنامەیەكی ئاراستەی ئایەتوڵڵا سیستانی و مەرجەعەكانی دیكەی شیعە كرد

بەناوی خوای مەزن و دلۆڤان

سوپاسی سەماحەتی گەورە مەرجەعی شیعەكان ئایەتوڵڵا سەید عەلی سیستانی و لایەنەكانی دیكە دەكەم لە هەمبەر ئەو هەڵوێستە شەریفانەی كە سەبارەت بە قەیرانی ئێستای نێوان سەرۆك وەزیرانی عێراق و هەرێمی كوردستان نیشانیان داوە.

مێژوو خۆی دووبارە كردەوە و دووبارە سوپاسی ئێوەی بەڕێز دەكەم.

مەسعود بارزانی

سەرۆكی هەرێمی كوردستان،

٢٠١٢/١٢/٥

## لێدوانی گووتەبێژی ڕەسمیی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان
## ٢٠١٢/١٢/٩

ڕۆژنامەی (ڕەئی)ی کوێتی، چەند لێدوانێکی بەڕێز نوری مالیکی، سەرۆکی ئەنجوومەنی وەزیرانی عێراقی فیدراڵی بڵاوکردووەتەوە لە ژمارە (١٢٢١٢)ی ڕۆژی حەوتی کانوونی یەکەم/ دیسێمبەری ٢٠١٢ ز، لەبارەی ئەم تەنگژەیەی دواییەوە، ئێمە بڕێك خۆمان گرت و وەڵاممان نەدایەوە، ڕاوەستان بزانین بەڵکو نووسینگەکەی ڕوونکردنەوەیەك، یان ڕاستکردنەوەیەك بۆ بۆچوونەکانی بڵاو بکاتەوە، بۆیە وامان بەچاك زانی هەندێك تیشك بخەینە سەر ئەو لێدوناانەی بڵاو کراونەتەوە:

لەکاتێکدا کە بۆنی گەندەڵی بەهەموو لایەکدا بڵاوبووەتەوە و هەمووانی بێزار کردووە، لەوانە گەندەڵیی سەفقەکانی کڕینی چەك، هەر لە نوسینگەکەی بەڕێز مالیکییەوە بگرە تا دەوروبەرەکەی، کەچی ئا لەم کاتەدا، ئەم لێدوانانە دەدات کە زۆر دوورن لە واقیع و پێچەوانەی حەقیقەتن، ئاخر ئەو هێشتا لە تەنگژەیەك دەرنەچووە، تەنگژەیەکی تر درووست دەکات، تا بەخەڵك بڵێ ئەو، تەنگژەی تەنیا لەگەڵ هەرێمی کوردستاندا هەیە، کەچی ڕاستییەکەی ئەوەیە، تەنگژەکانی لە باکوورەوە تا باشوور، لە ڕۆژهەڵاتەوە تا ڕۆژئاوای تەنیوەتەوە، ئەوەشی بیر خۆی بردووەتەوە، لە سەرەتادا، لە پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، دەوڵەتی عێراق چۆن دامەزراوە؟ ئەم دەوڵەتە لەسەر بنەمای شەراکەتێك دامەزراوە کە ئەوانەی پێش ئەم نکوڵیان لێکردو و ئەمیش وەك ئەوان دەکات.

بەڕێز مالیکی کە دێتە سەر باسی ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان، دەستوور پێشێل دەکات، کاتێك ناویان لێ دەنێ (ناوچە تێکەڵەکان)، ئەو ناوچانەی ڕێژیمی پێشوو لە کوردستانی دابڕین و مالیکی دەیەوێ ئەو دابڕینە بکاتە واقیع، وێڕای ئەوەی مادەی ١٤٠ ، مادەیەکی دەستوورییە و دەستەواژەی ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان، دەستەواژەیەکی دەستوورییە، ئەمە، بێ

ئەوەی کەمترین گومانمان لە ناسنامەی کوردستانیی کەرکووك و ناوچە دابڕێنراوەکـان هـەبێ. جا بۆ ئەوەی گفتوگۆکەمان زۆر درێژ نەبێتەوە، چەند پرسیارێك دەکەین، کە پرسیاری هـەموو عێراقییەکانە، خۆزیا وەڵامی دەدانەوە:

- لەوەتەی حوکمت کەوتووەتە دەست، لە ڕێی تەوافوقی سیاسییەوە، نـەك بەهەڵبـژاردنی ڕاستەوخۆ یـان کۆدەتـای سـەبازی، تـۆ تـەنیا خـەریکی لێـدان و دوورخسـتنەوەی شـەریکە سیاسییەکانتی، ئەمەش ڕەفتارێکە، زۆر دوورە لە جێبەجێکردنی دەستوور و تەوافوق.

- زیاتر لە شەش سەد ملیار دۆلار لـە بوودجـەی عێـراق بەهـەدەر دراوە، تـا ئێسـتەش هاووڵاتی عێراقی، لە ژێر باری قورسی نەبوونی خزمەتگوزارییەکاندا دەژی، هەر لە ئاوەوە تا کارەبا، ڕێگەوبان، تەندرووستی و خوێندن زۆربەی ژێرخانی ئابووری، ئایە ئەو هـەموو پارەیـە بۆ کوێ چوو؟ دەشـتەوێ بەکۆمـەڵێك مەزنـدەی بێسـەروبەر، متمانـەی خـەڵك بـەئابووریی کوردستان لەق بکەی، لە کاتێکدا کوردستان پەرەدەستێنێ و گەشە دەکات، بەشایەتی هەموو عێراقی و عـەرەب و بیانییەکان و قەوارەی وەبەرهێنان لە کوردستاندا گەیشـتووەتە زیـاتر لـە ٢٣ ملیار دۆلار کە زۆربەی هی وڵاتانی عـەرەبییە و بەشی دەوڵەتی کوێتی برا، لـە هـەمووان زۆرترە.

- سوپایەکی ملیۆنی و بگرە زیاتریشـت دامەزرانـدووە، کەچـی تـا ئێسـتە لـە دەرەوەی هەرێمی کوردسـتان، هەسـت بەئـەمن و ئاسـایش نـاکرێ، دوای ئـەوە یـەك قائیـد فیرقـەت دانەمەزراندووە کە پەرلەمان ڕەزامەندی لەسەر دابێ وەك لە دەستووردا هاتووە، ئایـە باسـی کام سوپای عێراقی دەکەیت؟

- ئایە باش بیرت لە ئەنجام و لێکەوتـەوەکانی ئـەو قسـە خەتەرناکـە، زۆر خەتەرناکـەت کردووەتەوە کاتێك بانگەشە بۆ شەڕی عەرەب و کورد دەکەی؟

- ئەگەر هەستت بەبەرپرسیارێتی بکردایە، دەستت لەکار دەکێشایەوە لە کاتێکـدا حـاڵی عێراق وا خراپە، ئاخر بەهۆی "سەرەڕۆییەکانتەوە" وڵات بووەتـە گەنـدەڵترین وڵاتـی دنیـا و یەکێکە لە پاشکەوتترین وڵات لە ئەستۆپاکیدا، بەپێی پێوەرە جیهانییـەکان، بەغـداش، ئـەو پایتەختەی ناوی بەسەر زاری هەموو دنیاوە بـوو، بووەتـە بێبـەخترین شـار و تەنانـەت پـاش سۆمالیش دێ!، وەك ڕاگەیەندراوە نێودەوڵەتییە بێلایەنەکان دەستنیشانیان کردووە. دەوڵـەتی عێراق لەسەر دوو بنەمای پێکەوەلکاو دامەزراوە: هەردوو نەتەوەی برا، عـەرەب و کورد، کـە لەگـەڵ پێکهاتـەکانی تـردا برایانـە دەژیـن، بـەتورکمان و ئێزیـدی و سـابیئە، مسـوڵمان و

مەسیحی، هیچ حاکمێکی ستەمکاری عێراق، جگە لە تۆ، جەرائەتی نەکردووە هەرەشـە لـە پێوەندیی برایانەی هەمووان بکات، تۆ نەبێ، هەرگیز هێندەی ئێستە، سووکایەتی بەیـەکێتی نیشتیمانی و بەرژەوەندیی بالآی عێراق نەکراوە، هەرگیز بـەم شـێوەیە سـوپا کۆنەکراوەتـەوە لەسەردەمی تۆدا نەبێ کە ڕۆژ بەڕۆژ بەرەو داڕووخان دەچێ لە هەموو لایەنێکـەوە، سیاسـی، ئابووری و ڕۆشنبیری، باری ئەمنی تادێ خراپتر دەبێ و گیانی خەڵکی بێگوناح و موڵکومالّی هاووڵاتیان لە نێو دەچن، ئەمانە سەرەڕای سەرەڕۆییە نادەستوورییەکانت کـە سـووری لەسـەر بەردەوامبوونیان، بێ گوێدانە پەرلەمان و ئیرادەی گەل. ئێمـە لـە کاتێکـدا هەسـت بـەئازار دەکەین سەبارەت بەسووکسەرنجدانەکانتان بۆ گەلەکەمان، ناچارین بڵێین، کوردستانی برا لەگەڵ هەموو عێراقییەکان، لە دامەزراندنی دەوڵەتی عێراقەوە، هەرگیز کەس وەك تۆ هەوڵی نەداوە ئەو برایەتییەمان تێك بدات، بەمنەت نەبێ، کوردستان کە خێروبێـر و سـامانی ژێـر و سـەر خاکەکەی بەخشیوەتە تەواوی وڵات، ئێمە، ئەوسـا و ئێسـتەش، وەك برابەشـی نیشـتیمانێك هەڵسوکەوتمان کردووە و دەکەین، کە دەسـتورێك و مێـژوو و بەرژەوەنـدیی هاوبـەش کۆمـان دەکاتەوە، بەپێچەوانەی تەماع و دەسەلاتپەرستی ئێوەوە کە دەتانەوێ "پـواز"ێـك لـە نێـوان گەلەکەمان و براکانمان لە عێراقی فیدرالی و دیموکراتیدا لێ بدەن.

-دواجار، ڕاستیان گوتووە: خێر لە سکێکی برسی چاوەڕێ مەکە کە تێر بووبێ.

# الى الذين يباتون بلا سقف: بالوثائق.. كيف تمت عملية نقل مبالغ مخصصة لمشاريع إسكان في المحافظات ولإعمار بغداد لشراء طائرات رئاسية!!

علي عبد سلمان - ٢٠١٢/١٢/٠٩م - ٧:٣٨ م



جمهورية العراق
وزارة التخطيط

Republic of Iraq
Ministry of Planning

الى/ وزارة المالية - دائرة الموازنة
م/ مشروع شراء طائرات رئاسية

كشفت وثائق لوزارة التخطيط، عن تحويل وتخفيض مبالغ طائلة من عدد من الوزارات الخدمية وكذلك مشروع بغداد عاصمة للثقافة العربية إلى وزارة الدفاع بغرض شراء طائرات رئاسية.

وتوضح الوثائق التي حصلت عليها وكالة أنباء براثا أن وزير التخطيط "علي يوسف الشكري"، أمر بمناقلة مبلغ قدره(٥٠) مليار دينار من اجمالي التخصيصات السنوية لوزارة الاعمار والاسكان إلى اجمالي التخصيصات السنوية لوزارة الدفاع.

كما أمر الوزير بمناقلة مبلغ مقداره(٢٠) مليار دينار من اجمالي التخصيصات السنوية لوزارة الثقافة إلى اجمالي التخصيصات السنوية لوزارة الدفاع.

ويوجه وزير التخطيط بتخفيض مبلغ(٥٠) مليار دينار من التخصيصات السنوية لمشاريع وزارة الاعمار والاسكان لبناء مجمعات سكنية للمواطنين في الانبار وذي قار والمثنى والديوانية.

ويعود الوزير ليأمر بتخفيض آخر..(٢٠) مليار دينار من التخصيصات السنوية لمشروع (تهيئة مدينة بغداد كعاصمة للثقافة العربية لعام/ ٢٠١٣)..

ويوضح وزير التخطيط "علي الشكري" في كتابه الموجه إلى الوزارت ذات العلاقة، أن التخفيضات السابقة والمبالغ المنقولة، جاءت بسبب ادارج مشروع (شراء طائرات رئاسية) في جداول الموازنة الاستثمارية السنوية لعام/ ٢٠١٢ لوزارة الدفاع.

وكانت تقارير تحدثت عن توقف أعمال تطوير شارع الرشيد وتأهيل القشلة، بعدما سُحبت تخصيصاتها المالية بهذه الطريقة المفاجئة.

يُذكر أن وزارة الاسكان والاعمار وافقت على مناقلة الأموال المخصصة لبناء مساكن بكلفة ٥٠ مليارا، تمت مناقلتها إلى وزارة الدفاع لشراء الطائرات.

وبدوره وافق وزير الثقافة "سعدون الدليمي" والذي يرأس وزارة الدفاع بالوكالة، على عملية مناقلة الأموال، التي كانت مخصصة أصلاً لتطوير وتأهيل القشلة وشارع الرشيد، لشراء طائرات رئاسية.

# بڕیاری سەرۆکی هەرێمی کوردستان کە لە رۆژی ٢٠١٢/١٢/١٢ دەرچووە سەبارەت بەکارهێنانی دەستەواژەی ناوچە کوردستانییەکان لە دەرەوەی هەرێم لە جیاتی ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان

بە ناوی خوای گەورە و میهرەبان

**بڕیار**

**ژمـــارە ( ٢٦ ) ساڵی ٢٠١٢**

دوای ئەوەی ژمارەیەك لە بەرپرسانی باڵای حکومەتی عێراقی بەمەبەست وازیان لە بەکارهێنانی دەستەواژەی (ناکۆکی لەسەرەکان) هێناوە کە لە دەستوری عێراق وەك ئاماژەیەك بۆ ئەو ناوچانە هاتووە کە ماددەی ( ١٤٠ ) دەیانگرێتەوە، بە ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێمی کوردستانیشەوە و بە کار هێنانی دەستەواژەی تر لە جیاتی دەستەواژەی پێشوو لە نووسراو و لێدوانە فەرمییەکانیاندا، بە بێ هیچ پاڵپشتێکی یاسایی یان مێژوویی و جوگرافی، کە ئەمەش ئەوە دەگەیەنێ کە ئەو بەرپرسانە هیچ نیەت و ئارەزوویەکیان بۆ جێبەجێکردنی ئەم ماددە دەستورییە نییە.

ئەمەو لە پێناو پاراستنی مۆرکی کوردستانیەتی ئەم ناوچانە لە رووی دانیشتووان و کەلەپووری جۆرا و جۆریەوە و بە پێی یاسای سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستانی عێراق ژمارە (١) ساڵی ٢٠٠٥ی هەموارکراو، بڕیارماندا:

١.لەمەودوا دەستەواژەی ( ناوچە کوردستانییەکانی دەرەوەی ئیدارەی هەرێم) بەکار بهێنرێت بۆ ئەو ناوچانەی کوردستانی عێراق کە ماددەی ١٤٠ی دەستوری کۆماری عێراق دەیانگرێتەوە.

٢.پێویستە هەموو وەزارەتەکان و لایەنە فەرمی و نیمچە فەرمییەکان و لایەنە پەیوەندارەکانی هەرێم پابەندی ئەم بڕیارە بن.

٣.ئەم بڕیارە لە ڕۆژی دەرچوونیەوە کاری پێ دەکرێت.

مسعود بارزانی
سەرۆکی هەرێمی کوردستان- عێراق
هەولێر
٢٠١٢/١٢/١٢

## لێدوانی وتەبێژی فەرمی سەرۆکایەتی هەرێم

لە کەشی ئەو تەنگژە دروستکراوەدا، کەسانێکی نزیك لە بەڕێز مالیکی لێدوانی نامەسئول و ناهاوسەنگ دەدەن کە لە شێوە و کرۆکدا هەر هەموویان بێجگە لە بانگەشە کردن و بوختانبەستن هیچیتر نین. ئەمانە سەردانەکەی سەرۆك بارزانی بۆ کەرکوك بە شێوەیەك وەسف دەکەن کە بە راستی جێی گاڵتەیە. چونکە باش دەزانن کە سەرۆك بارزانی مافی سەردانی هەموو شوێنێکی هەیە و لەگەڵ ئەمەشدا ئەم سەردانەی بۆ دەرەوەی کوردستان نەبووە، بەڵکو بۆ کەرکوك بووە تا لەو شارە وەڵامی لێدوانە ترسناکەکانی بەڕێز مالکی بداتەوە کە تیایاندا هەڕەشەی هەڵگیرساندنی شەڕی کورد و عەرەبی کردبوو و کەرکوکیشی بە شارێکی ناکوردستانی دانابوو. سەرۆك بارزانی بەم سەردانەی، برایانی عەرەب و تورکومانی کەرکوکی دڵنیا کردەوە کە بە هیچ جۆرێك بوار نادرێت شەرێکی وا ڕووبدات و کەرکوکی روحی کوردستانیش شاری هەموو پێکهاتەکانیەتی و جێبەجێکردنی ماددەی ١٤٠ی دەستوریش باشترین زەمانەتە بۆ سەقامگیری و ئاشتی و پێشکەوتنی ئەو شارە، کە ئەمەیش پەیامێکی زۆر روونە بۆ هەموو ئەوانەی پەیوەندییان بەو مەسەلەوە هەیە کە هەر چارەسەرێك بەدەر لە ماددەی ١٤٠ بەتەواوی رەتدەکرێتەوە.

**د. ئومێد صباح**

**وتەبێژی فەرمی سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان**

**٢٠١٢/١٢/١٣**

## بەیاننامەیەك لە سەرۆكی هەرێمی كوردستانەوە دەربارەی دەرهاوێشتەی تەنگژەی ئێستا و راستكردنەوەی رێڕەوی پرۆسەی سیاسیی

ماوەیەكی درێژە عێراق بەهۆی فەرامۆشكردنی خزمەتگوزارییەكان بۆ هاووڵاتیان و پەراوێزخستنی شەریكەكان و جێبەجێ نەكردنی دەستوور و رێككەوتنەكانەوە بە تەنگژەیەكی گەورە تێدەپەڕێ و كاردانەوەیەكی هێناوەتە ئارا، كە گوزارشت لە بێزاری گەلی عێراق بە تەواوی پێكهاتە و زانایانی ئایینی و مەرجەعە بەڕێزەكان حزب و رێكخراوەكان دەكات.

لە كاتێكدا ئەركی حكوومەتی فیدراڵ دەستپێشخەری ئاقڵانە بكات بۆ دۆزینەوەی چارەسەر، بەڵام بۆ ئاڵۆزبوونی تەنگژەكە و فەرامۆشكردن و هەڕەشە و پەراوێزخستن كاری كردووە، بەهۆیەوە مەترسیەكە زیادی كردووە و لەوانەیە ئەنجامی خراپی لێ بكەوێتەوە.

ئێمە دووپات لە پشتیوانی تەواوی خۆمان بۆ داواكارییە رەواكانی خۆپیشاندەران دەكەینەوە، كە لەگەڵ دەستوور دێنەوە، هاوكات دووپات لە پێویستی پاراستنی ئاشتیانەی خۆپیشاندانەكان و پەنا نەبردن بۆ توندوتیژی دەكەینەوە، لەگەڵ ئاگاداربوون و وریایی لە هەوڵی كەسانێك یا لایەنە توندڕۆكان بۆ سواربوونی شەپۆڵ و گورزوەشاندن لە رەوای مافەكاندا.

تێپەڕاندنی ئەو تەنگژە دژوارە پێویستە بە راستكردنەوەی رێرەوی پرۆسەی سیاسی و پابەندبوون بە دەستوور و رێككەوتنەكان و كۆكردنەوە و زەرورەتی پێرەوكردن لە شێوازی دایەلۆگ دەكات لە پێناو بەدیهێنانی ژیانێكی ئازاد، كە شایەنی گەلی عێراقە.

مسعود بارزانی

سەرۆكی هەرێمی كوردستان

٢٠١٣/١/١٩

# سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی هەرێم کۆدەبێتەوە

ئەمرۆ چوارشەممە ٢٠١٣/٢/١٣ بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی هەرێم کۆبووەوە.

**لە کۆبوونەوەکەدا سێ تەوەری سەرەکی خرانە بەر باس :**

١- ئەنجامی دوا سەردانەکەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان بۆ ئەڵمانیا و بەشداریکردنی لە کۆربەندی ئابووری دافۆس و سەردانە فەرمیەکەی بۆ ئێرلەندای باکوور.

٢- دوا پەرەسەندنەکانی رەوشی سیاسی عیراق بە گشتی و خۆپیشاندانی پارێزگاکانی مووسڵ و کەرکووك و ئەنبار و سەلاحەدین و دیالە و ناوچەکانی دیکەی عیراق.

٣- دوا پێشهاتەکانی ناوچەکە بە گشتی و سوریا بە تایبەتی .

بەشداربووانی کۆبوونەوەکە یەك هەڵوێستی گەلی کوردستانیان لە پاراستنی هەرێم و مافە دەستوورییەکانی و بەرگریکردن لە پرۆسەی دیموکراسی سەرتاسەریی عیراق بەرزنرخاند و تەئکیدیشیان لە سەر چارەسەری ئاشتیانەی سەرجەم گیروگرفتەکانی عیراق کردەوە و خۆشحاڵی خۆشیان دەربڕی سەبارەت بە هەر دەستپێشخەرییەك کە دەبێتە مایەی هێورکردنەوەی بارودۆخەکە و دەستپێکردنی دیالۆگی جدیی و لێك تێگەیشتنی بنیاتنەر لە نێوان لایەنە عیراقیەکاندا بە ئامانجی هێنانە کایەی رێککەوتنێکی سەرتاسەریی کە کۆتایی بەو بارگرژەکەی ئێستای وڵاتدا بهێنێنت.

**لایەنە بەشداربووەکانی کۆبوونەوەکە :**

**١- پارتی دیموکراتی کوردستان**

**٢- یەکێتی نیشتمانی کوردستان**

**٣- یەکگرتووی ئیسلامی کوردستان**

**٤- بزوتنەوەی ئیسلامی کوردستان**

**٥- حزبی زەحمەتکێشانی کوردستان**

**٦-حزبی سۆسیالیست دیموکراتی کوردستان**

**٧- لیستی سەربەخۆ**

**٨- بزوتنەوەی دیموکراتی تورکمانی لە کوردستان**

**٩- لیستی چاکسازی تورکمان**

**١٠- لیستی هەولێری تورکمانی**

**١١- بزوتنەوەی دیموکراتی ئاشووری**

**١٢ - ئەنجومەنی گەلی کلدان سریان ئاشوور**

**١٣ - لیستی ئەرمەن**

**١٤- کەسایەتی سیاسی بەرێز فەخری کەریم**

**١٥- حزبی شیوعی کوردستان**

# کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ سەرۆک فراکسیۆنەکان و وەزیرە کوردەکانی بەغدا

ئەمرۆ یەك شەممە ٢٠١٣/٢/١٧ بەرێز مسعود بارزانی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لە سەلاحەدین لەگەڵ سەرۆك فراکسیۆنەکان لە ئەنجومەنی نوێنەران و وەزیرە کوردەکانی حکومەتی فیدراڵ کۆبووەوە.

لە کۆبوونەوەکەدا، کە بەرێزان کۆسرەت رەسول عەلی جێگری سەرۆکی هەرێمی کوردستان و ئەرسەلان بایز سەرۆکی پەرلەمانی کوردستان و نێچیرڤان بارزانی سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان ئامادەی بوون، پرسی گرنگی جیاجیا و ئەو کێشانەی کە رووبەرووی پرۆسەی سیاسی و دیموکراسی عیراق لە ئێستادا دەبنەوە و رێگا چارەکان و چۆنیەتی دەربازبوون لەو تەنگژەیەی کە دووچاری پرۆسەی سیاسی بۆتەوە باسیان لێوە کرا.

**لە سەر ئاستی عیراق ، ئامادەبووان :**

١- پشتگیری خۆیان بۆ هەوڵەکانی سەرۆك بارزانی دووپاتکردەوە بۆ کۆتایی هێنان بە تەنگژەکە و داوایان کرد کە بەرێزیان بەردەوام بێت لەو هەولانەی خۆی ، بە راوێژکردن لەگەڵ لایەنە سیاسییەکانی عیراقدا بە مەبەستی دانانی بنەماکانی دەوڵەتێکی فیدراڵی دیموکراتی دامەزراوەیی بە پشت بەستن بە دەستوور و پرەنسیپی پێکەوە ژیان و راستەقینە.

٢- تەئکیدکردن لە پرنسیپی تەوافوق بە پشت بەستن بە رێککەوتنەکانی هەولێر و رێککەوتنەکانی تری نێوان هێز و لایەنە سیاسییەکان.

٣- پەلەکردن لە دەرکردن و کارکردن بەو یاسایانەی کە پێویستن بۆ بەدامەزراوەیی کردنی دەوڵەتی عیراقی فیدراڵ و راستکردنەوەی رێرەوی حوکمرانی.

٤- خستنە رووی ئەگەرەکانی پەرەسەندنی بارودۆخی ناوچەکە و چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو ئەگەرانەدا.

٥- بـەهێزکردنی میکـانیزمی کـارکردنی نوێنـەرانی کـورد لـە بەغـدا و بـەهێزکردنی هەماهەنگی نێوانیان.

٦- جەخت لە یەك گوتاری گەلی کوردستان کرایەوە و هەموو لایەکیش کۆك بوون لە سەر بایەخی پاراستنی یەکریزی و یەکهەڵوێستی لایەنە سیاسییەکانی کورد.

لە سەر ئاستی هەرێمی کوردستانیش، ئامادەبووان تەئکیدیان لە سەر بەردەوامی پرۆسەی چاکسازیی لە هەرێمی کوردستان کردەوە.

# لێدوانی سەرۆك وەزیرانی هەرێمی كوردستان لەسەر ناساندنی جینۆسایدی گەلی كورد لە لایەن پەرلەمانی بەریتانیاوە

دوای ئەوەی كە پەرلەمانی بەریتانیا لە دانیشتنێكدا ئەو تاوانانەی بە جینۆساید ناساند كە دەرهەق بە گەلی كوردستان كراون، نێچیرڤان بارزانی سەرۆك وەزیرانی هەرێمی كوردستان لە لێدوانێكدا ئەم هەنگاوەی پەرلەمانی بەریتانیای بە ڕووداوێكی گرنگ و مایەی خۆشحاڵی لە قەڵەم دا، سوپاسی هەموو ئەو لایەنانەشی كرد كە لەم پێناوەدا هەوڵیان دا و سەرەنجامی هەوڵەكانیان بە ناساندنی جینۆسایدی كورد لە لایەن پەرلەمانی بەریتانیاوە“ تەواو بوو.

### ئەمەش دەقی لێدوانەكەی سەرۆك وەزیرانی هەرێمی كوردستانە

ئەمڕۆ پەرلەمانی بەریتانیا دەربارەی ئەوەی كە ئایا ئەو تاوانانەی كە دەرهەق بە گەلی كوردستان لە عێراق ئەنجام دراون“ وەك جینۆساید بناسێنێت“ گفتوگۆی كرد. خۆشحاڵ بووین“ نەك تەنها لەبەر ئەوەی ئەو گفتوگۆیە ئەنجام درا، بەڵكو لەبەر ئەوەی پەرلەمانی بەریتانیا بە فەرمی دانی بە جینۆسایدی کورددا نا. ئەوەش ڕووداوێكی گرنگە لە خەباتمان بۆ دادپەروەری و دانپێنان و قەرەبووكردنەوەی هەزارا ن پیاو ژن و منداڵ كە لەسەر دەستی ڕژێمی پێشوو بوونە قوربانی. هەروەها ڕووداوێكی گرنگە بۆ ڕزگاربووانی ئەنفال و چەكی كیمیایی و بۆ منداڵانی شەهیدان كە هەوڵ دەدن ژیانیان بنیاد بنێنەوە.

سوپاسی هەموو ئەوانە دەكەین كە هەوڵیان دا ئەو گفتوگۆیە ئەنجام بدرێت، هەزاران كورد لە بەریتانیا و بەریتانیەكانی دۆستی كوردستان كە واژوویان لەسەر داوكاریی ناساندنی جینۆساید كرد. ئەندامانی پەرلەمانی بەریتانیا و بە تایبەتی گرووپی سەرجەم پارتەكانی دۆستی گەلی كورد

له پەرلەمانی بەریتانیا کە کاریان کرد بۆ ئەنجامدانی ئەو گفتوگۆیە و نوێنەرایەتیی حکوومـەتی هەرێمی کوردسـتان لـە بـەریتانیا کـە ئـەو دەستپێشـخەریەیان کـرد و بـەردەوام بـوون تـا بـە سەرکەوتوویی بە ئەنجام گەیشت.

ناساندنی جینۆسایدی کورد لە لایەن پەرلەمانی بـەریتانیاوە" دوا بـەدوای ناسـاندنی سالّی ڕابردووی پەرلەمانی نەرویج و سوید هات. سوپاسـی هـەموو لایـەکیان دەکـەین و ئومێدەوارین ئەوە هانی دۆستانمان و دۆستانی مافەکانی مرۆڤ و ئازادی لە وڵاتانی دیکەش بدات بۆ ناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد. دەبێ هەموومان بـە یەکـەوە لـە دژی سـتەم بوەستین لە هەر کوێ ڕوو بدات.

**نێچیرڤان بارزانی**
**سەرۆك وەزیرانی هەرێمی کوردستان**
**٢٠١٣/٢/٢٨**

## پەرلەمانی بەریتانیا بە فەرمی پرسی بە کۆمەڵکوشتنی سەدەها هەزار کوردی بە فەرمی وەك جینۆساید ناساند

**SAT, ٢ MAR ٢٠١٣ ١١:٢٩ | KRG.org**

لۆرا پیتێل، ڕۆژنامەی تایمزی بەریتانیا

پەرلەمانی بەریتانیا دوێنێ بە فەرمی پرسی بە کۆمەڵکوشتنی سەدەها هەزار کورد لەسەر دەستی دیکتاتۆری پێشووی عیراق سەدام حوسەین بە فەرمی وەك جینۆساید ناساند.

لە دانیشتنێکی ئەو پەرلەمانە کە هاوکاتە لەگەڵ ٢٥ ساڵەی بۆمبارانکردنی هەڵەبجە بە گازی کیمیاوی، پەرلەمانتارانی بەریتانیا پرسی جینۆسایدی کوردیان بە فەرمی ناساند و داوایان لە حکومەتی وولاتەکەیان کرد بە هەمان شێوە ئەو پرسە بناسێنێت.

نازم زەهاوی پەرلەمانتاری بە ڕەچەڵەك کورد کە کاتی خۆی باوك و دایکی لە عیراق ڕایانکردووە بە ئەندامانی پەرلەمانی ووت کە ئەو هەڵمەتەی لەلایەن سەدام حوسەینەوە دژ بە گەلەکەی ئەنجامدرا بووە هۆکاری بزر بوونی زیاتر لە ملیۆنێك هاوولاتی، کە زۆربەیان چاوەڕوان دەکرێن کە کوژرا بن لە لایەن هێزەکانی ڕژێم.
نازم زەهاوی هەروەها ووتی: " هیچ دادگاییەکی نێودەولەتی بۆ لێکۆڵینەوە لە لەناوبردنی کورد دروست نەکراوە. تا ئێستا هیچ هەڵمەتێکی نێودەولەتی بەڕێوەنەچووە بۆ ئەوەی ئەوانەی کە بەرپرسن لە ئەنجامدانی ئەو بە کۆمەڵکوژیانە بدرێنە دادگا. حکومەتی بەریتانیا تا ئێستا بە فەرمی ئەو کارانەی سەدام و ئەفسەرەکانی وەك جینۆساید نەناساندووە. ئەوە شتێکە کە پێویستە ئەنجام بدرێت."

گفتوگۆکانی پەرلەمانی بەریتانیا کە قوربانیانی گازی کیمیاوی هەڵەبجەش تیایدا ئامادە بوون دواتر بە داواکاریەکی پەرلەمانتارەکان بە کۆتا هات کە تیایدا داوای ناساندنی پرسی جینۆسایدی کوردیان دەکرد و ئەو داوایەیان قەبوڵ کرا و پرسەکە ناساندرا. لەو کاتەی کە حکومەتی بەریتانیا مەرج نیە پابەندی ئەو بڕیارەی پەرلەمان بێت، بەڵام هەنگاوێکی مێژووییە و لە لایەن گرووپە کوردیەکان بە هەڵوێستێکی گرنگ ناوزەد کرا.

وەزیری دەوڵەتی بەریتانیا بۆ کاروباری ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و باکوری ئەفریقیا ئەلیستەر بێرت لە ووتارێکیدا لە دانیشتنەکەی پەرلەمان ووتی کە ئێمە تا ئێستاش بڕوامان هەیە کە حکومەت ناتوانێت ئەو پرسە بناسێنێت، بەڵام جەختیشی لەسەر ئەوە کردەوە کە حکومەتەی هاوخەم و هاوسۆزە لەگەڵ ئەو نەهامەتیانەی کە لە دانیشتنەکە باسکران.
خاتوو بەیان سامی عبدالرحمان نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە بەریتانیا خۆشحاڵی خۆی بەو ئەنجامە دەربڕی و ووتی: " ئەو ناساندنەی پرسی جینۆساید هەنگاوێکی مێژووییە و دەبێتە هۆکاری خێراترکردنی پەیوەندیە بەرهەمدارەکان لە نیوان هەردوو گەل. هەروەها هاریکار دەبێت بۆ قوربانیانی جینۆساید بۆ ئەوەی هەست بەوە بکەن کە گومان لەوەدانیە بەریتانیا لەدژی بەکۆمەڵکوشتنی خەڵکی بۆ گوناه ڕادەوەستێت."

## راگەیەندراوی حکومەتی هەرێمی کوردستان سەبارەت بە پەسەندکردنی بودجەی ٢٠١٣ی عیراق و فەرامۆشکردنی داواکاریەکانی هەرێم

FRI, ٨ MAR ٢٠١٣ ١٨:٥٤ | KRG.org

لە دوای ململانێیـەکی یاسـایی و سیاسـی لـەنێوان سـەرجەم لایەنـە سیاسـیەکانی نێـو پەرلەمانی عیراق لەڕۆژی ٢٠١٣/٣/٧ پڕۆژە یاسای بودجەی عـیراق بـەبێ بەشـداری کردنـی پەرلەمانتارە کوردەکان بە ناتەواوی پەسند کرا.

گفتوگۆکردن لەسەر ئەم یاسایە ماوەیەکی زۆری برد، چونکە ئەنجومەنی وەزیرانـی فیـدڕاڵ پڕۆژە یاسای بودجەیەکی رەوانە کردبوو کە پڕبوو لە کێشە و بڕگەی نادروسـت و نادەسـتووری سەرەڕای ڕێگەنەدان بە هەرێم لە بەشداریکردنی داڕشـتنی بودجـە وەك مـافێکی دەسـتووری خۆی، هەرچەندە ئێمە وەك حکومەتی هەرێم زۆر هەوڵماندا کە ئەو کێشـانە پێشـووەختە بـە دیالۆگ چارەسەربکرێن، بۆ ئەو مەبەستەش چەندین شاندمان رەوانـەی بەغـدا کـرد و لەگـەڵ بەرپرسانی بەغدا کۆبوونەوە، دواجاریش شاندێکی هەرێمی کوردستان لەژێر چاودێری سەرۆکی پەرلەمان کۆبوونەیەکی تێروتەسەلیان ئەنجامدا بەڵام بـە داخـەوە هەوڵـەکان نەگەیشـتە ئـەو ئاکامەی کە بودجەیەکی پوخت کە لە خزمەت تەواوی گـەلانی عـیراق بێـت، بخرێتـە بـەردەم ئەنجوومەنی نوێنەران. لەگەڵ ئەوەشدا لە ئەنجومەنی نوێنەران پـڕۆژە یاسـاکە پەسـندکرا. لـە گفتوگۆکان ئامانجی هێزە سیاسیەکانی کوردستان ئەوە بوو کە بودجەیەك ئامـادە بکرێـت لـە خزمەت تەواوی خەڵکی عیراق بێت و مافی گەلی کوردستان و پێشـکەوتنەکانی تێـدا رەچـاو بکرێت.

بەڵام ئەوەی جێگەی داخە چەند خاڵێك کە لە یاساکە پەسندکراوە نەك هەر لە بەرژەوەندی خەڵکی کوردستان نییە، بەڵکو لە دژی هاوڵاتیانی هەرێم و بەرنامەکانی حکومەتی هەرێمـە. بۆیە وەك حکومەتی هەرێم چەندین بڕگەی یاسای بودجەی ئەمساڵی عیراق رەت دەکەینەوە. و تەئکیدی ئەوەش دەکەینەوە کە ئەوان بە پشت بەستن بە پرەنسیپی زۆرینـە و فەرامۆشـکردنی

پێشنیازو تێبینی و مافەکانی خەڵکی کوردستان لەبودجەدا، بەکردەوە بنەمای تەوافقی نیشتمانی و هاوبەشی کردنی راستەقینەیان لە دەسەڵات پەکخست کە بەگوێرەی دەستور، عیراقی تازەی لەسەر بیناکراوە، لەم یاسایە نەفەقاتی حاکیمەو سیادی و پێشمەرگەو پەرەپێدانی پارێزگاکان و پیترۆ دۆلارو موستەحەقاتی کۆمپانیاکانی نەوت بەهیچ شێوەیەك لەبەرچاو نەگیراوە.

ئەم هەنگاوەش لێدانە لە پێگەو مافی سروشتی و دەستوری کورد وەك پێکهاتەیەکی سەرەکی، لە رۆژانی داهاتووش زنجیرەیەك کۆبوونەوە لە نێوان هێزە سیاسیەکانی هەرێمی کوردستان و پەرلەمانتارو بەرپرسانی کورد لە بەغدا ئەنجام دەدرێت بۆ ئەوەی هەڵوێستی هەرێمی کوردستان بە ڕاشکاوی بخرێتەڕوو. حکومەتی هەرێمی کوردستان سەرەڕای دەربڕینی نارەزایی توندی خۆی بەرامبەر ئەو پێشێلکاریە، راشیدەگەینێت کە مافی خۆیەتی ئیلتزام نەکات بەو بڕگانەی کە دژی دەستووری عێراقن و سەرجەم رێگە قانونی و دەستوریەکان دەگرێتەبەر بۆ رێگریکردن لەم هەوڵەی دژ بە بەرژەوەندی و ژیان و گوزەرانی خەڵکی کوردستان و عیراق بەگشتی گیراوەتەبەر.

لەکۆتایدا حکومەتی هەرێمی کوردستان پێزانینی خۆی بۆ سەرجەم ئەو فراکسیۆن وپەرلەمانتارانە دوپاتدەکاتەوە کە هەوڵیاندا ئەنجومەنی نوێنەران بودجەیەك پەسەند بکات کە لەبەرژەوەندی هەموو گەلانی عیراقدا بێت و ئامادەش نەبوون بەم شێوەیەی ئێستای دەنگی پێبدەن، بەتایبەتیش دەستخۆشی لە پەرلەمانتارە کوردەکان دەکات کە هەموویان کۆك و یەك دەنگبوون لەسەر پاراستنی بەرژەوەندیەکانی هەرێمی کوردستان و دەنگ نەدان بۆ یاسای بودجەی ئەمساڵ.

حکومەتی هەرێمی کوردستان

# سەرۆكایەتی پەرلەمانی كوردستان هەڵوێستی مرۆڤدۆستانەی پەرلەمانی بەریتانیا بەرز دەنرخێنێت

پەرلەمانی بەریتانیا لەدانیشتنی رۆژی ٢٠١٣/٢/٢٨ تاوانەكانی كۆمەڵكوژی لـەدژی گەلی كوردستان بەتاوانی جینۆساید ناساند، بەرەسمیش داوای لە حكومەتی بەریتانیا كـرد كە تاوانەكانی دژ بەگەلی كوردستان بە تاوانی جینۆساید بناسێنێ.

وێـڕای پیرۆزبـاییكردن لەكەسـوكاری سـەربەرزی شـەهیدان وقوربانیـانی تاوانـەكانی جینۆسایدی دژ بەگەلەكەمان، بەناوی پەرلەمان وگـەلی كوردسـتانەوە سـوپاس وپێـزانینی خۆمان ئاراستەی سـەرۆكایەتی وسـەرجەم ئەنـدامانی پەرلـەمانی گروپـی كوردسـتان لـە پەرلەمانی بەریتانیا وچالاكوانانی كوردو دۆستانی بەریتانی دەكەین كەدلسۆزانە بەشداریان لە سەرخستنی ئەم هەڵمەتە ودەركردنی ئەم بریارە گرنگەدا كرد.

ئەم هەڵوێستە بوێر ومرۆڤدۆستانەی پەرلەمانی بەریتانیا لەگـەل هەڵویسـتی پێشـتری هەردوو پەرلەمانی سوید ونەرویج زەمینەیەكی لەبارتر دەرەخسێنی بۆ ئەوەی لەسەر ئاستی نێودەولەتی تاوانەكانی دژ بەگەلی كوردستان بـەتاوانی جینۆسـاید بناسینرێـت، هـەروەك زەمینەیـەكی یاسـایی لـەباریش دەرەخسـێنێ بـۆ گێرانـەوەی مـافی قوربانیـەكان وقەرەبۆكردنەوەی ماددی ومەعنەوی رزگـاربوانی ئـەنفال وچـەكی كیمیـاوی وتاوانـەكانی جینۆساید لە كوردستاندا.

هاوكـات داواش لەپەرلەمانـەكانی ولاتـانی تـر ونەتەوەیـەكگرتووەكان وئەنجومـەنی ئاسایشی نێودەولەتی دەكەین رۆڵ وئەركی بەرپرسیارێتی یاسـای ومرۆڤدۆسـتانەی خۆیـان ببینن بۆ ئەوەی تاوانەكانی كۆمەلكوژی لەدژی گەلی كوردستان لەسەر ئاستی نیودەولەتی بەتاوانی جینۆساید بناسێندرێت، تاچیتر هیچ دەسەلاتیك نـەتوانێ تـاوانی كۆمـەڵكوژی و جینۆساید لەدژی میللەتەكەی وسەرجەم مرۆڤایەتی ئەنجام بدات.

سەرۆكایەتی پەرلەمانی كوردستان
٢٠١٣/٣/٢

# راگەیەنراوی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ نوێنەرانی فراکسیۆنە کوردستانیەکان لە حکوومەتی فیدراڵ و ئەنجومەنی نوێنەرانی عێراق

لە رەفتارێکی زەقدا پرۆژە یاسای بودجەی عێراقی فیدراڵ لەلایەن دەوڵەتی یاسا بە سەرکردایەتی مالکی تێپەڕێنرا و بە داخەوە هاوپەیمانیی نیشتمانییش بەهەمان ئاراستەدا هەنگاوی نا، کە رەفتارێکی لەم چەشنە لە لایەنەکانی نێو ئەو هاوپەیمانێتییە چاوەڕوان نەکراو بوو، ئەمەش یەکڕیزیی نیشتمانیی عێراقی ناچار بە دابەشبوون کرد و دەسەڵاتی سیاسی و سەرکردایەتیکردنی دەوڵەت زۆر بە ئاشکرا تاکڕەویی بەسەردا سەپێنرا، کار گەیشتە ئەوەی تەنانەت رەچاوی دید و پێگەی پێکهاتەیەکی سەرەکییش نەکرێ، کە وا پێویستی دەکرد وەك هاوبەشێکی دامەزرێنەری پرۆسەی سیاسی و سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی دەوڵەت و نەتەوەیەکی سەرەکی وبڕیاردەر لە دەستنیشانکردنی ئاراستەی وڵات وەك لە دیباجەی دەستووردا هاتووە حیساب بۆ رۆڵ و پێگەی بکرێ" هەڵبەت ئیرادەی هێزە هاوبەشەکانی دیکەش رەزامەندییان لەمەڕ پرسەکە فەرامۆشکرا و بوونیان لەبەرچاو نەگیرا.

وەرگرتنی ئەم بڕیارە بە شێوەیەکی تاکڕەوانە و پشت بەستن بە دەنگدان بە گوێرەی ژمارە، پێشێلکردنێکی قبووڵنەکراوی دژ بە هەموو ئەو بنەمایانەیە پرۆسەی سیاسی لەسەری وەگەڕخرا، هاوکات دژ بەو رێسایەیە دەستووری لەسەر داڕێژرا و پێچەوانەی پێکەوەسازانەکان و گشت رێککەوتنەکان و چەمکی پێکەوەسازانی نیشتمانییشە.

پەسەندکردنی بودجە خۆی لەخۆیدا جەوهەری پێشێلکردنەکە نیە کە زۆر ئاست و بوار دەگرێتەوە، بەڵکو دەربڕی زۆر لە ئادگار و دەرکەوتەی دژ بە سیستەمی دیموکراتی و زەوتکردنی ئیرادەی نیشتمانییە کە سازان لە نێوانیاندا کرا بۆ دەربازبوون لە پاشماوەی سیستەمە دیکتاتۆریە یەك لەدوای یەکەکان و هێنانەئارای عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵ لەسەر بنەمای شەراکەت و پێکەوەسازان و هاوسەنگیی لە چوارچێوەی رێزگرتنی دەستوور.

دەوڵەتی یاسا و سەرۆکەکەی زیادەڕۆیی زۆریان کرد لە خۆدزینەوە لە گشت ئەو پابەندبوونانەی گەرەنتین بۆ بەردەوامیدان بە تەواوکردنی پرۆسەی بنیاتنانی دامەزراوەکانی دەوڵەتی دیموکراتی و پاکتاوکردنی ئەو دەرکەوتە مەترسیدارانەی پێیەوە دیاربوو، بە تایبەتییش لەسەردەمی ویلایەتی دووەمی حکوومەتەکەی مالکی کە تاکڕەویی و خۆسەپاندن و پەراوێزخستن تێیدا ڕەنگی دایەوە و زیادەڕۆیی لێ بەدی کرا لە رووی وەرگرتنی ڕێوشوێن و ڕێکاری نادەستووریانە لە گشت بوارەکاندا، هەڵبەت ئەویش بە تەسکردنەوەی مەودای ئازادییە دیموکراتییەکان و گرتنەبەری رەفتاری توندوتیژی پۆلیسیانە لە بەرامبەر نارەزایی و داواکارییەکانی جەماوەر و بەکارهێنانی سوپا لە ململانێ سیاسییەکان و رووبەڕووبوونەوەی جەماوەر و داواکانیان بۆ دابینکردنی خزمەتگوزاری و ئەنجامدانی چاکسازیی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی. هەر بەم ئاراستەیەشدا، سەرۆکی دەوڵەتی یاسا برەو بە بەرهەمهێنان و وەبەرهێنانی قەیرانەکان و بەرزکردنەوەی ئاستی شڵەژاندن و ئاڵۆزکاریی دەدات، بەردەوامە لەسەر تەنگەتاوکردنی هاوبەشانی نێو پرۆسەی سیاسی و داتاشینی پاساوی بێ بنەما بە مەبەستی ڕێگرییکردن لەهەر هەوڵێك بۆ هەڵوەشاندنەوەی هەر قەیرانێکی لەپڕ. ئەم دیاردەیەش نیازگەلێکی شاراوە بەدیاردەخات کە بە ئاشکرایی ئاماژە بۆ دۆخی وڵات دەکات کە لە دووڕیانێکدایە و دوور نیە یەکێتییەکەی تووشی پارچەبوون بکات و هەوڵی هێزەکانی لەبەریەك هەڵوەشێنێ و ئیتر لە تواناییاندا نەمێنێ دەستکەوتەکانی یەکڕیزیی خۆیان بپارێزن.

ئەو بژاردەیە کە لە چەندین بۆنەدا بە ئاشکرایی خرایەڕوو، دەربڕی ئەو خواستە نابەجێیەیە بۆ هەڵکوتانەسەر سیستەمی دیموکراتی و کۆڵەکە و بنەماکانی و بەزۆر خۆداسەپاندن و گرتنەبەری شێوازێك لە تاکڕەویی کە داتەپین و داڕمان و لەبەریەکهەڵوەشانی زیاتر بەدوای خۆیدا بێنێ.

هێزە کوردستانییەکان کە هەمیشە فاکتەری یەکخستن و پێکەوەسازان بوون، لە هەموو ساتە ناهەموارەکان ئامادە بوون رووبەڕووی ئەو مەترسییانە ببنەوە کە هەڕەشە بوون بۆ سەر عێراق، بەر لە دوو مانگیش هەمان شتیان کرد کە نامەیەکیان ئاراستەی هاوپەیمانیی نیشتمانیی و لایەنەکانی نێو ئەو هاوپەیمانییە کرد، نامەکە چەند دید و بۆچوونێکی لەخۆ گرتبوو بۆ تەندروستبوون و چاکبوونەوەی ژیانی سیاسی و ڕێگانەدان بە هەڵوەشان و ترازانی بنچینەکانی پرۆسەی دیموکراتی، دید و بۆچوونەکانیش تەنیا و تەنیا دەربڕ و بەرجەستەکردنی خواستگەلێکی عێراقیانە بوون و لە سۆنگەی دەستوور و پێکەوەسازانی نیشتمانیی و

ڕێککەوتنە مۆرکراوەکـان هـەڵقوڵابوون. بـەڵام بەداخـەوە" نامەکـە ئـەو بایـەخ و گرنگییـە پێویستەی پێ نەدرا.

ئێمە لەوکاتەی کە هەست بە مەترسیی دۆخەکە و لێکەوتەکان و ئەگەرە چاوەڕوانکراوەکان دەکەین، کە بوونەتە هۆی غەڕابوون بۆ بەردەوامیـدان بـە ڕەوتـی تـاکڕەویی لەسـەر بنـەمای زۆرینە و کەمینـە، هەڵبـەت ئەمەشـیان بـە گرتنەبـەری ئامرازگـەلێکی بـەدەر لـە بنـەما دیموکراتییەکان و دژ بە دەستوور" عێراق بۆ نێو تەڵەزگـەی ڕووبەڕووبوونـەوەی تایەفەگـەریی پەلکێش دەکات، بۆیە بە ئەرك و لێپرسراوێتی مێژوویی خۆمانی دەزانین ڕوو لە سەرجەم ئـەو هێزە نیشتمانیانە بکەین کە پەرۆشی پاراستنی سیستەم و ڕێبازی دیموکراتی و ڕێگریکردنن لە داتەپین و داڕمان، و بە تایبەتیش ڕوو لە هێزەکانی نێو هاوپەیمانیی نیشـتمانیی دەکـەین کـە هەڵوێستێکی ڕاستەوخۆی ڕوون و ڕاشکاوانە دژ بەو سیاسـەتە بنـوێنێ کـە دەیـەوێ هـەموو دەستکەوتەکان لەبار ببـات و کۆتـایی بـە شـەراکەت و پێکەوەسـازانی نیشـتمانیی بـێنێ و هەڵکوتێتە سەر پرۆسەی سیاسی و دیموکراتی لە وڵاتدا.

لەم سۆنگەیەوە" ڕایدەگەیەنین کـە بانگهێشـتی نوێنـەرانی هێـزە کوردسـتانییەکانمان لـە حکوومەتی فیدراڵ و سەرکردەکانی فراکسیۆنە کوردستانیەکانی نێـو ئەنجومـەنی نوێنـەرانمان کردووە بۆ ئەوەی وتوویژ و ڕاوێژ لەبارەی گرتنەبـەری هەڵوێسـتێکی گونجـاو بکـەین هاوتـای خواسـتەکانمان بـێ و هاوکـات کـار لـەو پێنـاوەدا بکـەین ڕێگـا بـە ڕەوتـی خۆسـەپاندن و بنجداکوتانی سیاسەتی تاکڕەویی و پەراوێزخستن نەدەین. هەر لـەو چوارچـێوە و ئاراسـتەیەدا ڕاویژ و ڕاگۆڕینـەوەی فـراوان لەگـەڵ تێکـڕای هێـز و لایـەن و پێکهاتەکانیشـدا بکـەین بـۆ گەڵاڵەکردنی هەڵوێست و گەیشتن بەو بژاردەیەی عێراقـی دیمـوکراتی بپـارێزێ و کۆتـایی بـە دۆخی تاکڕەویی و سەرکێشی بێنێ.

ئێمە لەو کاتەی بە ناچاری ئەم هەڵوێستە دەگرینەبەر کە هەموو بـژاردەکانی لەبەردەمـدا کراوەیە، ئەوباڵی هەر ئەگەرێك دەخەینە ئەستۆی دەوڵەتی یاسـا و سـەرۆکەکەی (مـالکی) و هاوکارانیان و لە بەرامبەر هەر پێشهات و هەڵوێستێك ئەوان بە بەرپرس دەزانین.

سەرۆکایەتی هەرێمی کوردستان

٢٠١٣/٣/٩

# ڕاگەیێندراوی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ وەزیران و سەرۆکی فراکسیۆنە کوردستانییەکان لە بەغدا

لەسەر بانگهێشتی سەرۆکی هەرێمی کوردستانەوە هێزە کوردستانییەکان، دووەمین کۆبوونەوەیان ئەنجام دا بۆ تاوتوێکردنی پێشهاتەکان و ئەو پەیوەندییانەی لەبارەی ڕەوشی گشتیی سیاسییەوە ئەنجام دراون و لێکەوتەوەکانی لەسەر پەیوەندیی نێوان هەرێم و حکوومەتی فیدراڵی. هەروەها ئەو کارلێکە سیاسییانەی بوونە هۆی خولقاندنی ڕەوشی ئێستا کە بەپێچەوانەی تەوافوق و هاوبەشی و ئەو ڕێککەوتنانەیە کە بوونە بناخەی پرۆسەی سیاسی و دیموکراتی دوای ڕووخاندنی ڕژێمی دیکتاتۆریی پێشوو.

لە کۆبوونەوەکەدا بیروبۆچوون ئاڵوگۆڕ کرا لە بارەی چۆنێتیی ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسییانەی کە تادێ زیاد دەبن. هەروەها کۆبوونەوەکە ئەو سیاسەتەی ڕەتکردەوە کە لە بەغدا پەیڕەو دەکرێت کە ئەگەر بەردەوام بێت دەبێتە هۆکاری داڕمانی سەرلەبەری پرۆسەی سیاسی کە ئەوەیش لە ئەنجامی پابەندنەبوون بە پرەنسیپی تەوافوق و هاوبەشی و دەستوور و هەروەها پێشێلکردنی تێکڕای ئەو بنەما سیاسی و سازان و لێکتێگەیشتنانەی کە بناخەی بنیاتنانی عێراقی نوێ بوون، هاتووەتە کایەوە. کۆبوونەوەکە جەختی کردەوە، ئەو نەهجەی ئێستا کاری پێدەکرێت تەنیا پەیوەست نییە بەپەیوەندییەکانی هەرێمەوە کە تادێ خراپتر دەبێت، بەڵکو مەترسییەکی جیدییە لەسەر داهاتووی وڵات و ئەو ئامانجانەی ڕۆڵەکانی گەلی عێراق لە چوارچێوەی قووڵکردنەوەی سیستمی دیموکراتی و کاملکردنی بنیاتنانی دامودەستگەی دەوڵەتی فیدراڵیدا چاویان لێیەتی.

بەشداربووانی کۆبوونەوەکە لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە کۆبوونەوەکان بەکراوەیی بمێنێتەوە و درێژەپێدانیش هەبێت بە ڕاوێژکردن لە پێناو گەلاڵەبوونی کۆمەڵێك بژاردەی پێویست. هاوکات دیدار و گفتووگۆیش لەگەڵ هەموو لایەنە پەیوەندیدارەکانی پرسی عێراق بەردەوام بێت بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو مەترسی و تەحەدییانەی عێراقی گرتووەتەوە.

سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان

٢٠١٣-٣-١٨

## بەیاننامەیەك لە سەرۆكایەتی پەرلەمانی كوردستان – عێراقەوە

لە كاتێكدا گەلەكەمان یادی بیرەوەری بیست و دوو ساڵەی راپەڕینە مەزنەكەی دژی رژێمی دیكتاتۆری دەكاتەوە، و لە دوای بەسەرچوونی حەوت ساڵ بەسەر دامەزراندن و دانانی دەستووری عێراقیی ئیتیحادی بە ئامانجی پێكهێنانی عێراقێكی كۆماریی ئیتیحادیی فرەلایەن و دەست لەناو دەست بۆ پتەوكردنی یەكپارچەیی نیشتیمانییەكەی و دروستكردنی دەوڵەتێكی نوێ كە جیاكاریی و دوورخستنەوەی تیادا نەبێت و شێوازی دابەشكردنی دادپەروەرانەی سەروەت و سامان و بەخشینی هاودەرفەتی بۆ هەموان لەخۆ بگرێت، دەوڵەتێك بێت تیایدا دادپەروەری و یەكسانی سەروەر بێت و دوور بێت لە سیاسەتی دوژمنكارانە، ئەمانە هەموویان لە دیباجەی دەستوردا هاتوون كە بەشێكی جیانەكراوەیە لە حوكمی ماددەكانیدا، و سەرەرای ئاگاداربوونی هەمووان، بە كاربەدەست وهاولاتیانەوە، كەوا ئەمانە گشتیان بەبێ هاریكاری نێوان هێزە عێراقی و پێكهاتە نیشتیمانیەكانی لە سەر بنەمانی هاوبەشی راستەقینەی كردارەكییدا، دەستەبەر ناكرێن.

بەلام ئەوەی جێگەی داخ و پەژارەیە رێڕەوی حكومەتی عێراقی لە خولی دووەمیدا بە سەرۆكایەتی بەرێز نوری مالیكی دوورەپەرێزی گرتووە لە رێبازی دەستوری و كەشتی حوكمڕانی لە عێراقدا بەرەو كەناری نادیار ئاراستە كردووەو فەرماندەكردنی كردارییی ڕادەستی هەردوو نووسینگەی تایبەت بە فەرماندەی گشتی هێزە چەكدارەكان و سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیران كراوە، ئەمەش سەرپێچیە بۆ سادەترین رێسای حوكمڕانی لە رژێمە سیاسیە هەرە دواكەوتووەكاندا، و پشتگوێخستن و پەراوێزكردنە بۆ مافی هێزە سیاسیە دامەزرێنەرەكانی بونیاتنەر بۆ عێراقی نوێ و پشتگوێخستنە بۆ رۆڵ و قوربانیەكانیاندا لە پێناو لەناوبردنی دیكتاتۆریەت و دامەزراندنی سیستەمی دیموكراسیدا، بە جۆرێك رێبازێكی تاكڕەوانەی بۆ خۆی دارشتووە كە سیستەمی تاكەحیزب دادەمەزرێنێت و هاوبەشی هێزە سیاسیەكان دەخاتە

قاڵبێکی ڕواڵەتکارییەوە ئەویش بۆ دابەشکردنی بەرپرسێتی و نەریکانی سیاسەتە تاکڕەوە چەوتەکانی و، لە هەمان کاتدا، بێ بەشیان دەکات لە مافی حوکمڕانی وەك هاوبەشی ڕاستەقینەو کردارەکیی.

لە خوێندنەوەی سەرۆکایەتی پەرلەمانی کوردستان و ئەندامەکانی بۆ ئاراستەکانی بۆسەلەی سیاسەتی تاکڕەوانەی بەڕێز مالیکی ئەوا بۆ دوورو نزیك زۆر بەڕوونی بەدەر دەکەویت کەوا عێراق بە وەرچەرخانی قۆناغێکی سیاسی مەترسیدار گوزەر دەکات کە لەوانەیە یەکپارچەیی نیشتیمانی و خەونەکانی گەلەکەی لە چەسپاندنی حوکمی یاساو دیموکراسی و دەستەبەرکردنی دادپەروەری و یەکسانی ڕابماڵێت، ئەویش لە ڕێگەی بەخشینی دەسەڵاتی فراوان بە هەردوو نووسینگەی ئاماژە بۆکراو کە خودی خۆی بەپێی یاساو دەستور ئەم دەسەڵاتانەی نیە، ئەمانە هەمووی لە سەر حیسابی دەست بەسەرداگرتنی دەسەڵاتەکانی ئەنجومەنی وەزیران و دەسەڵاتی دادگەریی و ئەنجومەنە خۆجێیەتیەکاندا بە پشتگوێخستنی پرنسیپی یاسایی (ئەوەی شتێکی نەبێت ناتوانێت بیدات) و خزاندنی هەزاران کەسی بێ تاوان بۆ ناو بەندیخانەکان بەبێ لێکۆڵینەوە یان دادگایی کردن و بۆ ماوەی دوورو درێژ، هەر وەك لەم دواییانەدا سەلمێنرا کاتێك لە ژێر پاڵەپەستۆی جەماوەردا ئازادکران و ئەوەی لە لایەن ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکانی مافی مرۆڤ سەلمێنران کەوا ئەشکەنجەدان ڕێبازێکی چەسپاوە لە گرتووخانە عێراقیەکاندا و بەرپرسیارێتی ئەمەشیان خستە ئەستۆی بەڕێز مالیکی.

لە دوای پرۆسەی ئازادکردنی بێ تاوانەکان لەوانەی تۆمەتی تیرۆریان خراوەتە پاڵ وا دەرکەوت کەوا بەڕێز مالیکی لەو پرنسیپە دەستورییەی کە دەڵێت: (تۆمەتبار بێ تاوانە تاوەکو تۆمەتەکەی دەسەلمێنرێت) هەڵگەراوەتەوەو گۆڕیویەتی بۆ (هاوڵاتی تاوانبارە تاوەکو بێ تاوانیی دەسەلمێنرێت).

ئێمە لێرەدا مەبەستمان باسکردنی پێشێلکارییە یاسایی و دەستورییەکان نیە کە لە ئێستادا لای کەس شاراوە نین، بەڵام ئەوەی وای کرد ئێمە ئەم بەیاننامەیە دەربکەین ئەوەیە کەوا بەڕێز مالیکی سوورە لە سەر ڕێبازی سیاسەتەکەی بۆ چەسپاندنی تاکڕەوی لە حوکمداو پەراوێزکردنی ڕۆڵی هاوبەشە سیاسیەکانی تری و پشت بەستن بە زۆرینەی

ژمارەیی لایەنگیرو پشتیوانانی و گـوێ نـەدان و بـەهیچ نـەزانی پرنسـیپەکانی دەسـتوری ئیتیحادی و ئەو قۆناغەی عێراق و ناوچەکە تیایدا تێدەپەرن، ئەو دەرئەنجامـە ترسـناکەی کە لەم ڕێبازەدا دەکەوێتەوەو هەڕەشە دەکات لە قەوارەی دەوڵەتی عێراقی و یەکپارچـەیی هێزە نیشـتیمانیەکانی، بـە شـێوەیەك کـە مامەڵـەکردنی لەگـەڵ هـەرێمی کوردسـتانداو تێڕوانینی بۆی لە پرنسیپی هەرە دواکـەوتووترین و مەرکـەزیترین رژێمـەکان سەرچـاوەیان گرتووە وەك ئەوەی هەرێم پارێزگایەك بێت لـەم چەشـنە رژێمانـەو ئـەو دەسـەڵاتانەی کـە هەیەتی وەك بەخشینێکن بـە فـەرمانی وەزاری بڕیـار دراون و بـەپێی خواسـت و ویسـتی سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیـران هەڵدەوەشـێندرێنەوە! بـاری ڕووداوەکـان و پـەیڕەوی ڕۆژانـە هەموویان ئەم ڕاستیە دەسەلمێنن، خاواندنی لە جێبـەجێکردنی پێداویسـتیەکانی مـاددەی (١٤٠) و پاشگەزبوونەوەی لە ئەنجامدانی سەرژمێریی گشتی بە بیانووی نەشیاو لـە ڕووی یاساوەو خۆگرتنی لە پێدانی شایستەکانی کۆمپانیا بەرهەمهێنـەرەکانی نـەوت و گـاز لـە کوردستانداو خۆدزینەوەی لە جێبەجێکردنی ئەوەی یاسـاکانی بودجـەی سـاڵانی پێشـوودا دەقیـان لەسـەر کـردووە دەربـارەی شایسـتەکانی پێشـمەرگەو زێـدەکردنی بـۆ خەرجیـە سیادییەکان بە شێوەیەکی هەرەمەکیانەو هەوەسـتیانە بـەبێ بنـەمای لەسـەر پێکهـاتوو، خۆگرتنی لە بەشداری پێکردنی هەرێم لە گفتوگۆکانی بودجەی گشتی بەر لە بڕیاردانی لـە لایەن حکومەتی ناوەندییەوە، هەر چەندە ئەگەر دانانی بودجە لـە دەسـەڵاتە تایبەتـەکانی حکومەتی ئیتیحادیش بێت بەپێی بڕگەی (سێیەم)ی مـاددەی (١١٠)ی دەسـتوردا، بـەڵام ئەمە ڕێگر نابێت لە بەشداری کردنـی هـەرێم لـە دەربـڕینی بـیروڕای خـۆی لـە قۆنـاغی ئامادەکردنی بودجەدا چونکە ئەمـە بـە بڕگـەی (چـوارەمی) مـاددەی (١١٤)ی دەسـتور پەیوەستە کە تایبەتە بە کێشانی سیاسەتەکانی گەشەپێدان و پلانـدانانی گشـتی، چـونکە ئامادەکردنی سیاسەتی گەشەپێدان و پلاندانانی گشتی لە دەسەڵاتە هاوبەشەکانەو ناکرێـت ئەم پەیوەندییەی بە بودجەی گشتی پشتگوێ بخرێت.

لەم دواییانەشـدا، وەك هـەنگاوێك بـۆ چەسـپاندنی حاڵـەتی تـاکڕەوی لـە حوکمـدا و پەراوێزکردنی ڕۆڵی هاوبەشە راستەقینە دامەزرێنەرەکانی تر، ئەوا هاوبەندی نیشـتیمانی، کە زۆرینەی لە حیزبی بەرێز سەرۆك وەزیرانە، ڕوویان کردۆتە دەنگدان لە سەر بودجە بەبێ گوێدانە رۆحی ڕێکبوون و خۆگونجاندن و هەماهەنگی لەگەڵ فراکسـیۆنە پەرلەمانییـەکانی

تردا كە لە حوكمڕانی و پرۆسەی سیاسیدا هاوبەشن، بە چاوپۆشین لەو نەرێیانەو زیانانەی ئەم هەنگاوە بۆ سەرتاپای پرۆسەی سیاسی كەوا كاروبارەكان زیاتر ئاڵۆزو درزەكە فراوانتر دەكات، بۆیە داوا لە گشت خەمخۆرانی بەرژەوەندی عێراق و یەكپارچەیی و داهاتووی نەوەكانی دەكەین كەوا هەڵوێستی ڕوون و ڕاشكاوانە دەربارەی ئەم ڕێبازە بگرنەبەرو لە هەمان كاتدا پشتگیریی لە هەڵوێستی فراكسیۆنە كوردستانیەكانی پەرلەمانی عێراق و ڕێبازی سەرۆكایەتی هەرێم دەكەین بۆ گەیشتن بە یەك هەڵویست لەگەڵ قەوارە سیاسیەكانی عێراق و هەرێم و حكومەتەكەی لە پێناو ڕاستكردنەوەی ئەم ڕێبازە چەوتەو سیاسەتە لارەی سەرۆكی ئەنجومەنی وەزیرانی عێراق و ناچاركردنی بە ڕێزگرتن لە حوكمەكانی دەستوری ئیتیحادی و پرنسیپەكانی سەروەری یاساو پرنسیپی جیاكردنەوەی دەسەڵات و تایبەتمەندییە یاساییەكانی هەرێم و ئەنجومەنە خۆجێیەتیەكان و پاراستنی پایەمەندی و سەربەخۆیی دادگەریی و سەربەرزی هاوڵاتی عێراقی و مافە مرۆییەكانی.

سەرۆكایەتی پەرلەمانی كوردستان – عێراق

٢٠١٣/٣/١٣

## بەلاغی کۆبوونەوەی سەرۆکی هەرێمی کوردستان لەگەڵ نوێنەرانی هێزە کوردستانییەکان لە حکوومەتی فیدرالی و ئەنجوومەنی نوێنەرانی فیدرالی

ئەمڕۆ، دووشەممە، بەڕێز مەسعوود بارزانی، سەرۆکی هەرێمی کوردستان، لە سەلاحەدین، لەگەڵ نوێنەرانی هێزە کوردستانییەکان لە حکوومەتی فیدرالی و ئەنجوومەنی نوێنەرانی فیدرالی کۆبووەوە. لە کۆبوونەوەکەدا، لەبارەی چەندین پرسی پەیوەست بەگۆڕەپانی سیاسی عێراقەوە گفتوگۆ کرا.

دوای گفتوگۆی پێشهات و گۆڕانکارییەکانی ڕەوشەکە، کۆبوونەوەکە بڕیاری دا، نامەیەك ئاراستەی هاوپەیمانی نیشتیمانی بکات، تێیدا جەخت لە بۆچوونەکانی پێشوویان بکرێتەوە، لە بەتەنگەوەهاتنی پاراستنی دەستوور و چەسپاندنی بەهاکانی هاوبەشێتی و هاوسەنگی و سازانی نیشتیمانی، خۆ ئەگەر هەنگاوی پێویست و پراکتیکی نەنرا، سەرکردایەتی کوردستان، پەنا بۆ بژاردەگەلی گونجاو دەبات.

سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان
٢٠١٣/٤/١

# دەقی ڕێککەوتنی حەوت خاڵیی نێوان سەرۆك وەزیرانی هەرێم و سەرۆك وەزیرانی عێراقی فیدڕاڵ

ڕۆژی ٢٠١٣/٤/٢٩ سەرۆکی حکومەتی هەرێمی کوردستان نێچیرڤان بارزانی بەیاوەری شاندێك سەردانی بەغدای کردو لە دانیشتنێکدا لەگەڵ سەرۆك وەزیرانی عێراقی فیدڕاڵ بە ڕێککەوتنێکی حەوت خاڵی گەیشتن بۆ چارەسەری کێشە هەڵواسراوەکانی نێوان هەرێم و بەغدا، کە ئەمانەن:

١- ئامادەکردنی پڕۆژەیاسایەکی تایبەت بە (قەرەبووکردنەوەی قوربانیانی شاڵاوەکانی ئەنفال و چەکی کیمیایی و ڕاپەڕین و گۆڕە بەکۆمەڵەکان) و حکوومەتی فیدراڵ بۆ یارمەتیدانی ئەو ئاوارە و پەنابەرانەی لە هەرێمی کوردستانن" بڕە پارەی پێویست تەرخان دەکات.

٢- پێکهێنانی لیژنەیەکی باڵای ئەمنی بۆ هەماهەنگیی ئەمنی.

٣- پێکهێنانی لیژنەیەك لە هەردوولا بۆ لێکۆڵینەوە لە وردەکاریی بەڕێوەبردنی ئەمنیی هاوبەش لە ناوچە ناکۆکی لەسەرەکان کە بە میکانیزمێکی تایبەت و بێ لە فەرماندەکانی ئۆپەراسیۆنەکان، لە نێویشیاندا ئۆپەراسیۆنی دیجلە" بەڕێوە دەبردرێ.

٤- پێکەوەکارکردن لەپێناو دانانی یاسای دیاریکردنی سنووره ئیدارییەکان بۆ پارێزگاکان وەك ئەوەی لە لایەن سەرۆکایەتیی کۆمارەوە پێشکەش بە ئەنجومەنی نوێنەران کراوە، هەروەها پڕۆژەیاسای هەڵوەشانەوەی بڕیارەکانی (ئەنجومەنی سەرکردایەتیی شۆڕش) کە لە لایەن ئەنجومەنی وەزیرانەوە پێشکەش کراوە.

٥- پێکهێنانی لیژنەیەکی هاوبەش بۆ لێکۆڵینەوە لە کێشەکانی قەزا و گومرگ و سەفەر و دەروازە سنوورییەکان و هاوشێوەکانیان لە هەردوو حکوومەتی فیدراڵ و حکوومەتی هەرێم.

٦- داواکردن لە ئەنجومەنی نوێنەران بۆ چاوخشاندنەوە بە یاسای بودجەی فیدرالی ساڵی ٢٠١٣ و پاشکۆکانیدا، بە شێوەیەکی ئسووڵی.

٧- پێکهێنانی لیژنەیەکی هونەری لە هەردوولا بۆ رێککەوتن لەسەر پرۆژەیاسای نەوت و غاز و پرۆژەیاسای دابەشکردنی داهاتەکان.

# قرار مجلس الأمن الدولي رقم ٦٨٨ لسنة ١٩٩١

طلب قرار مجلس الأمن الدولي رقم ٦٨٨ لسنة ١٩٩١ من العراق بوقف ما وصفه بالقمع الذي تمارسه السلطة بحق المدنيين في العراق، خاصة في المناطق الكردية وناشد جميع الدول الأعضاء المساهمة في جهود الإغاثة في تللك المناطق. وفي ما يلي نص القرار

## القرار ٦٨٨ (١٩٩١) الصادر في ٥ أبريل/ نيسان ١٩٩١

**إن مجلس الأمن**

**إذ يضع** في اعتباره واجباته ومسؤولياته بموجب ميثاق الأمم المتحدة بالنسبة لصون السلم والأمن الدوليين،

**وإذ يساوره** شديد القلق إزاء القمع الذي يتعرض له السكان المدنيون العراقيون في أجزاء كثيرة من العراق والذي شمل مؤخرا المناطق السكانية الكردية وأدى إلى تدفق اللاجئين على نطاق واسع عبر الحدود الدولية وإلى حدوث غارات عبر الحدود بما يهدد السلم والأمن الدوليين في المنطقة،

**وإذ يشعر** بانزعاج بالغ لما ينطوي عليه ذلك من آلام مبرحة يعاني منها البشر هناك،

**وإذ يحيط** علما بالرسالتين الموجهتين إلى رئيس مجلس الأمن من الممثلين الدائمين لتركيا وفرنسا لدى الأمم المتحدة والمؤرختين ٣و٤ أبريل/ نيسان ١٩٩١ على التوالي ﴿١﴾،

**وإذ يحيط** علما أيضا بالرسالتين الموجهتين إلى الأمين العام من الممثل الدائم لجمهورية إيران الإسلامية إلى الأمم المتحدة والمؤرختين ٣ و٤ أبريل/ نيسان ١٩٩١ ﴿٢﴾،

**وإذ يعيد** تأكيد التزام جميع الدول الأعضاء تجاه سيادة العراق وجميع دول المنطقة وسلامتها الإقليمية واستقلالها السياسي،

بسم الله الرحمن الرحيم

بعد أن رفض التحالف الوطني الإصلاحات التي طرحت عليه، وجب علينا نحن المجتمعون في أربيل ثانياً استبدال رئيس الوزراء دون غيره عن طريق سحب الثقة، و استبداله بمرشح آخر من قبل التحالف الوطني [illegible] يلتزم بالدستور و يطبق ما أتفق عليه مع الكتل السياسية الأخرى.



مسعود بارزاني
٢٠١٢/٦/١٠

أسامة النجيفي
٢٠١٢/٦/١٠

مقتدى الصدر
١٩ رجب ١٤٣٣

بسم الله الرحمن الرحيم

REPUBLIC OF IRAQ

Prime Minister's Office



جمهورية العراق

مكتب رئيس الوزراء

No.:
Date: / /

العدد: م.ر.ن/ ٢٠/ ٧٨/ ٨٥٣٩
التاريخ: ١٩/ ١٠/ ٢٠١١

أمــر ديواني / ٩٤٠٦

حصلت موافقة دولة رئيس الوزراء على ما يأتي :-

أولاً :- تكليف الدكتور عامر حسان حاشوش الخزاعي / مستشار رئيس الوزراء لشؤون المصالحة الوطنية بالإشراف على كل من :-

١- دائرة نزع السلاح ودمج الميليشيات.

٢- لجنة متابعة وتنفيذ المصالحة الوطنية

مع استمرار السيد جعفر عبد الزهرة حسين الصميني برئاسة اللجنة.

ثانياً :- استمرار تكليف الدكتور عامر حسان حاشوش الخزاعي / مستشار رئيس الوزراء لشؤون المصالحة الوطنية بإدارة مؤسسة الشهداء.

ثالثاً :- استمرار تكليف الدكتور عامر حسان حاشوش الخزاعي / مستشار رئيس الوزراء لشؤون المصالحة الوطنية برئاسة لجنة إعمار ديالى.

رابعاً :- ينفذ هذا الأمر اعتباراً من تاريخ صدوره.

د. ضياء الدين جحيف محمد القريشي
مدير مكتب رئيس الوزراء وكالة
٢٠١١/٩/ ٢٩

صورة عنه إلى /

- مكاتب السادة نواب رئيس الوزراء / للتفضل بالعلم ... مع التقدير.
- محافظة ديالى – مكتب المحافظ / للعلم ... مع التقدير.
- مجلس محافظة ديالى – مكتب رئيس المجلس / للعلم ... مع التقدير.
- مؤسسة الشهداء – مكتب رئيس المؤسسة / للعلم ... مع التقدير.
- الأمانة العامة لمجلس الوزراء / مكتب الأمين / للعلم ... مع التقدير.
- مكتب القائد العام للقوات المسلحة / للعلم ... مع التقدير.
- لجنة متابعة وتنفيذ المصالحة الوطنية / للعلم ... مع التقدير.
- دائرة نزع السلاح ودمج الميليشيات / للعلم ... مع التقدير.
- الدكتور عامر حسان حاشوش الخزاعي المحترم / مستشار رئيس الوزراء لشؤون المصالحة الوطنية / للعلم ... مع التقدير.
- السيد جعفر عبد الزهرة حسين الصميني المحترم / رئيس لجنة متابعة وتنفيذ المصالحة الوطنية / للعلم ... مع التقدير.
- مديرية الموارد البشرية.
- إضبارة العقود.
- إضبارة الكتب الصادرة.

# سەرۆکایەتیی هەرێم هیوادارە دەرچوونی عێراق لەژێر بەندی حەوتەم ببێتە هۆی سەقامگیریی عێراق و ناوچەکە

رۆژی (٢٧)ی حوزەیرانی ٢٠١٣ ئەنجوومەنی ئاسایشی نێودەوڵەتی بڕیاری ژمارە (٢١٠٧)ی پەسەند کرد کە تایبەتە بە دەرکردنی عێراق لەژێر بەندی حەوتی میساقی نەتەوەیەکگرتووەکان.

سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان هیوادەخوازێ دەرچوونی عێراق لەژێر بەندی حەوتەم ببێتە هۆی چەسپاندنی ئاشتی و سەقامگیریی بۆ گەلی عێراق و ناوچەکە.

**دکتۆر ئومێد سەباح**
**گوتەبێژی فەرمیی سەرۆکایەتیی هەرێمی کوردستان**
**٢٠١٣/٦/٢٨**

# دەقی ماددەی ١٤٠ ی دەستووری عێراق

**المادة(١٤٠):**

اولاً ـ تتولى السلطة التنفيذية اتخاذ الخطوات اللازمة لاستكمال تنفيذ متطلبات المادة (٥٨) من قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، بكل فقراتها.

ثانياً ـ المسؤولية الملقاة على السلطة التنفيذية في الحكومة الانتقالية، والمنصوص عليها في المادة (٥٨) من قانون ادارة الدولة العراقية للمرحلة الانتقالية، تمتد وتستمر الى السلطة التنفيذية المنتخبة بموجب هذا الدستور، على أن تنجز كاملةً (التطبيع، الاحصاء، وتنتهي باستفتاء في كركوك والمناطق الاخرى المتنازع عليها، لتحديد ارادة مواطنيها) في مدةٍ أقصاها الحادي والثلاثون من شهر كانون الاول سنة الفين وسبعة .